İSMAIL BEŞIKÇI

# یادەوەرییەکان

ئەگەر پرسەکە نیشتمان بێت، زانست لاوەکییە

**ئیسماعیل بێشکچی**

چاپی دووەم

فەرهاد پیرباڵ
پێشەکیی بۆ وەرگێڕانە کوردییەکە نووسیوە

لە تورکییەوە:
**محەمەد عزەدین**

**دەزگای فام**

بۆ چاپ و بلاوکردنەوە

FAMpublication

**بەڕێوەبەری گشتی: سەنگەر زراری**

**ANILAR**

"SÖZ KONUSU VATANSA, BİLİM TEFERRUATTIR"

İSMAİL BEŞİKÇİ

Publisher : İsmail Beşikçi Vakfı Yayınları

İSBN: 978-605-9073-48-6





**چاپی دووەم - ٢٠٢٤**


## یادەوەرییەکان

**ئەگەر پرسەکە نیشتیمان بێت، زانست لاوەکییە**

نووسینی

# ئیسماعیل بێشکچی

لە تورکییەوە

**محەمەد عزەدین**


بابەت: بیرەوەریی

**پێوانە**

١٣.٥*٢١سم (٦٨٠) لاپەڕە

ISBN: 978-9922-709-25-3

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان/ هەرێمی کوردستان ژمارە سپاردنی (٣٨٠)ی ساڵی٢٠٢٢ی پێ دراوە.

"له پێشکچیی زیاتر، کەسی دیکەم پێ شـك نـایەت، بـۆ ئەوەی ئەم وەرگێڕانەی پێشکەش بکەم"

محەمەد عزەدین

"له دڵی هەموو کوردێکی شەرەفمەنددا، دەبێت شوێنێکی تایبەت بۆ خۆشەویستیی ئیسماعیل بێشکچی هەبێت"

**عوسمان بایدەمیر**

"ئیسماعیل بێشکچی، قارەمانێکی دنیای زانستە؛ سیمبوڵی ئازایەتی و نەبەردییە. بۆ کورد لە گالیلۆ زۆر زیاترە"

**نعۆم چۆمسکی**

"تورکیا و ئیران و عێراق و سووریا، کوردستانیان هەیە؛ تەنیا کورد نەبێ، بێ کوردستانن"

**ئیسماعیل بێشکچی**

# ناوەڕۆك

## بەشی سێیەم



## بەشی چوارەم

## بەشی پێنجەم

## بەشی شەشەم

## بەشی حەفتەم

## بەشی هەشتەم



## بەشی نۆیەم

## بەشی دەیەم

## بەشی یازدە

## کۆمەڵناسێکی پیاوکوژ

ئیسماعیل بێشکچی، کوڕی سێ بیرمەندی عوسمانییە؛ پێش ئەوەی جەنگی خۆی دژی تیۆری کەمالیزم ڕابگەیەنێت، لە جەنگێك گەڕابۆوە، سێ پیاوی تێدا کوشتبوو. ئەو پیاوانەی کوشتبوونی، دوو کورد و تورکێك؛ ئەمانە بوون:

١- زیا گۆکئالْپ Ziya Gökalp (١٨٧٦-١٩٢٤) کوردێکی دیاربەکری بوو؛ یەکەمین کۆمەڵناسە لە تورکیا، کە بناغەکانی ناسیۆنالیزمی تورکی دامەزراند. گەلێك لە ڕۆشنبیرە تورکەکان، ئەم نووسەرە کوردە بە (باپیری ناسیۆنالیزمی تورکی) لەقەڵەم دەدەن.

٢- دکتۆر عەبدوڵڵا جەودەت Abdullah Cevdet (١٨٦٩-١٩٣٢) ئەویش هەر کوردە. ئەو کۆمەڵناس نەبوو، بەڵکو بیرمەندێکی لیبراڵ و دامەزرێنەری (ئیتیحاد و تەرەقی) بوو لە ساڵی ١٨٨٩. کە پاشان، ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەناو برد. عەبدوڵڵا جەودەت ڕۆڵێکی مەزنی هەبوو لە دامەزراندنی سۆسیۆلۆژیا لە تورکیا و گەیشتن بە قۆناغی سەرکەوتنی ناسیۆنالیزمی تورکی و دامەزراندنی دەوڵەتی تورکیای مۆدێرن، دژی کورد، لە ساڵی ١٩٢٣.

٣- یوسف ئاکجورا Yusuf Akçura (١٨٧٦-١٩٣٥) بە پێشەنگی دامەزرێنەرانی کۆمەڵناسی نەژادی تورك دەژمێردرێ و ڕۆڵی هەبوو لە سەرهەڵدانی نەتەوەگەرایی تورکی تورانیزمی.

ئەم سێ ڕووناکبیرە عوسمانییە، دوویان کورد و ئەوی تر

تورك؛ سێ پایەی پتەو بوون بۆ ئەوەی:

١- یەکەمین بناغەکانی کۆمەڵناسیی تورکیا و نەتەوەن بۆ ئەوەی باوەڕبوون بە نەژادی تورکی Turanism سەر هەڵبدات. جێگەی تێبینییە، یەکەمین کتێبی کۆمەڵناسی بە زمانی کوردی، دەگەڕێتەوە پێش لەدایکبوونی ئەو سێ پیاوە.

٢- وایان کرد، حیزبی (ئیتیحاد و تەرەقی) لە ساڵی ١٩٠٨ بەم لاوە، مل بەرەو تورانیزم و تورکایەتی توندڕەوی بنێ.

٣- ئەو سێ کەسە ڕۆڵیان هەبوو لە سەرهەڵدانی کەمالیزم لە لایەن، کەمال ئەتاتورکەوە و بنیادنانی دەوڵەتی دژە کوردی لە تورکیا.

زیا گۆکئالپ و یوسوف ئاکجورا، ئەگەرچی لە هەندێ ڕووەوە، دیدە کۆمەڵناسییەکانیان لە یەك جیاواز بوو، بەڵام لەمەدا یەکیان دەگرتەوە کە هەردووکیان، دژی کورد، باوەڕیان بە دەسەڵاتی باڵای نەژادی تورك هەبوو لە دەوڵەتڕانی؟؟؟ مۆدێرندا. هەرچی دکتۆر عەبدوڵڵا جەودەت بوو، باوەڕی بە ئازادی و مافە نەتەوەییەکانی کورد و ئەرمەن هەبوو، بەڵام لە چوارچێوەی دەوڵەتی تورکیای یەکگرتوودا.

ئیسماعیل بێشکچی پاش ئەوەی لە هەناوی ئەو سێ فەیلەسووفە هاتە دەرەوە، تەمەشای کرد، ئەگەرچی هەرسێکیان کۆمەڵناسی هەمان وڵاتی ئەون، بەڵام تیۆرەکانیان، لەگەڵ تیۆرەکەی ئەو ناگونجێ، کە بەرگری لە مافی گەلانی ژێردەستەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دەکرد. ئەمە جگە لەوەی بێشکچی

باوەڕی بەوە هێنابوو، کورد دەبێ دەوڵەتی سەربەخۆی هەبێ.

ئیسماعیل بێشکچی، هەر لە سەرەتای ساڵانی زانکۆوە، بۆی دەرکەوت، ئەم سێ کۆمەڵناسە، نەك هەر دژی کوردن، بەڵکو تیۆرەکانیان، ئەگەر بە قوتابخانە و زانکۆکان بڵاو ببێتەوە، ئەوا دەبنە هۆی بڵاوبوونەوەی ڕاسیزمی تورکی و بیری دژە کورد لە تورکیادا. ئەمەش مەترسییەکی گەورەیە، کە کۆمەڵناس و فەیلەسووف، بە بۆچوونی بێشکچی نابێ پەسندی بکات. چونکە ئەمە ڕێبازی زانستییە لای ناوبراو.

بێشکچی لە بیستەمین ڕۆژی مانگی حەفتی ساڵی ١٩٧٠، چوو هەر سێ کۆمەڵناسی کوشتن. ئەسڵەن پارچە پارچەی کردن؛ ئەمەش بووە هۆی ئەوەی لە هەمان ڕۆژدا، لە مامۆستایەتیی زانکۆ دەربکرێ و مافی توێژینەوەی ئەکادیمی لێ بسەندرێتەوە.

دوورخرانەوەی بێشکچی لە زانکۆ، جگە لە کوشتنی سێ فەیلەسووفەکە، ئەم هۆکارەشی لە پشت بوو:

کاتێك بێشکچی لە ساڵی ١٩٥٨ چووە زانکۆی ئەنقەرە، بۆ ئەوەی لە کۆلێژی زانستە سیاسییەکان بخوێنێ، هەر لە سەرەتای ساڵی یەکەمییەوە، زیرەکانە سەرنجی دابوو، لەژێر زەبری سیستەمی دەوڵەتی تورکیدا، زانست بێلایەن نییە! جا ئەمە لە زانکۆکانی تورکیادا، هەر لە زانستە سیاسی و کارتۆگرافی و کۆمەڵناسییەوە بگرە، تا دەگاتە زانستی فیزیا و پەروەردە و توریزم هەر وایە. چونکە لە تورکیا پێویست وایە، زانکۆ و ئەکادیمیا و توێژینەوەکان، ڕاستەوخۆ لە خزمەت "دەوڵەتی تورك" کار بکەن.

ئەمە لە کاتێکدا، بێشکچی، گەنجی یاخی، نەیدەتوانی تەنیا بۆ

بەدەستهێنانی نمرە و بڕوانامەی زانکۆ کار بکات، بەڵکوو ئەو چووبووە زانکۆ بۆ ئەوەی، لە نهێنییەکان و نەزانراوەکان تێبگات و بە هۆی توێژینەوەکانی زانکۆوە بگاتە حەقیقەتگەلێک، تا خزمەتی مرۆڤی تورکیا و هەموو مرۆڤایەتی پێ بکات.

کەواتە بێشکچی هەر لە سەردەمی زانکۆوە، لە سیستەمی زانکۆ و ئەکادیمی ئەنقەرە یاخی بوو. ئەمەتا خۆی بەم شێوەیە باس لەو یاخی بوونەی خۆی دەکات:

"لەبری ئەوەی گوێڕایەڵی دەوڵەت و باوەڕە فەرمییەکان بم، زیاتر پابەندی زانست و ڕێکارەکانی بووم. کورد، کە یەکێک بوو لە کێشە بنچینەییەکانی تورکیا، ئەو ئاریشەیەی هیچ کەسێک نەیدەویست خۆی لە قەرەی بدات و لە هەمبەری چاویان لێ دەنووقاند؛ وەك ئەوەی پرسگرێکی وەها نەبووبێت، یاخود با بڵێین، جەسارەتی ئەوەیان نەدەکرد، لە مژارەکە بچنە پێشەوە؛ بەڵام من پرسی کوردم بردە ناو زانکۆ تورکیەکان".

کەواتە (پرسی کورد) لای ئیسماعیل بێشکچی، پرسێك بوو پەیوەندی بە ئەکادیمیەت و توێژینەوە زانستییەکانی ناو زانکۆوە هەبوو، کە لە زانکۆی وڵاتی ئەودا، بە شێوەیەك دەخوێندرا، تیرۆر بەرهەم بهێنێت! جگە لەمەش، ئەم پرسە زانستییە مرۆڤایەتییە، لە زانکۆکەی ئەودا، بە هیچ شێوەیەك بۆی نەبوو پەنجەرە بەسەر ئازادی و مافە نەتەوەییەکانی کورد و ئەرمەن و ئاشووری و عەرەب و تاد... بکاتەوە. بۆچی؟ چونکە ئەم کارە، لای حکوومەتی تورکیا، هەڕەشەیەکی ڕاستەوخۆ بوو بۆ سەر "ئاسایشی نەتەوەیی تورك". بۆیەش بەو فەیلەسووفەیان گوتبوو: "ئاگادارت دەکەینەوە و باش بزانە: ئەگەر پرسەکە نیشتیمان بێت،

زانست لاوەکییە!". لە وەڵامی ئەوەدا، ناوبراویش چاوی لەناو چاوی دەسەڵاتی زانکۆ نابوو و ئاوا بەرسڤی دابوونەوە: "من کە سۆسیۆلۆگ و ئەکادیمیم، زانست و بەهای پرسە ئەکادیمییەکان لای من، بە پلەی یەکەم دێن و گرنگترن لەچاو ئاسایشی نیشتیمانی!"

- دەبێ وسکت بیت، ئەی ڕۆشنبیر، ئەی کۆمەڵناس!

بێشکچییان زیندان کرد. نازانم چەند مانگ؟

هەر سوودی نەبوو، دەستی پێ کردەوە.

دیسان گرتیان و خستیانەوە زیندان. نازانم چەند ساڵ؟

هاتە دەرەوە و هەر وسکت نەبوو.

- دەبێ وسکت بیت ئەی سۆسیۆلۆگ!

هەر وسکت نەدەبوو.

- باشە چ بکەین؟

ئەو پرسیارەی ڕۆژێک لە کۆمەڵناسێکی ناوداری تورک کردبوو.

Nihad Atsiz نیهاد ئاتسز، (١٩٠٥-١٩٧٥) کە سۆسیۆلۆگ و بیرمەندێکی سالانی خوێندکاری بێشکچی بوو، بەم شێوەیە وەڵامی پرسیارەکەی دابۆوە:

"باشترین شت وایە، کە تۆش و منیش و هەموو کۆمەڵناس و ڕۆشنبیر و ئەکادیمییەکان، خزمەتی یەك ئامانج بکەین، بە دەوری ئاگردانی نەتەوەیی تورکیدا، ئەویش ئامانجی پیرۆزی کەمال ئەتاتورکە دەڵێ: Turkiye Turklerindir".

ئیسماعیل بێشکچی، لەناو هەموو سۆسیۆلۆگ و ئەکادیمی و فەیلەسووفە تورکەکانی سەردەمی خۆی، بێوێنە و جەسوورانە و بێهاوتا بوو، لە داهێنانی بواری توێژینەوە مرۆڤناسی و کۆمەڵناسییەکاندا.

بێشکچی، توانی پایە و پلەیەکی باڵا و درەوشاوەی هەبێت لە مێژووی فەلسەفە و بیری کۆمەڵناسی لە تورکیای سەت ساڵی بەر لە سەدەی بیست و یەك. فەلسەفەی مافی مرۆڤ و کۆمەڵناسی، لەسەر دەستی بێشکچی، پێشکەوتن و گۆڕانکارییەکی مەزنیان بەخۆوە بینی. تەنانەت بەرهەمەکانی بوونە سەرچاوە، نەك تەنیا بۆ کوردناس و ڕۆژهەڵاتناس و ئەکادیمییەکانی وەك چۆمسکی و مارتین ڤان برۆنسۆن و کریس کۆچێرا... بەڵکوو بۆ سەرۆك دەوڵەتەکانیش، بێشکچی ناوێکە، سام و سۆزی خۆی هەیە.

ئیسماعیل بێشکچی چوارەم تاوانی کوشتنیشی، بە کوشتنی تیۆری؟؟؟ کەمال ئەتاتورك ئەنجام دا، ئەمەش لە ڕێگای بڵاوکردنەوەی چەند کتێبێکی بە ناونیشانی (کوردستان کۆلۆنییەکی نێودەوڵەتی) و چەندانی دیکە... بۆیە ئیسماعیل بێشکچی لەسەر ئەو چوار تاوانە، سەد و نازانم چەند ساڵ بڕیاری زیندانیکردنی بۆ دەرچووە لە تورکیا.

هیوادارم خوا سەلامەتی بکات لەدەست (شەڕ).

فەرهاد پیرباڵ
هەولێر
٢٠٢٢-٠٤-٢٤

بۆ ئیسماعیل بێشکچی
شێرکۆ بێکەس

**بۆ ئیسماعیل بێشکچی**

داری وتی؛

ئێمە ئێستاکە ناتوانین شەقامێکی دیاربەکر

بەناوی تۆوە ناو بنێین.

گوڵێ وتی؛

ئێمە ئێستاکە ناتوانین باخچەیەکی نێو قامیشلی

بە ناوی تۆوە ناو بنێین.

شیعرێ وتی؛

ئێمە ئێستاکە ناتوانین کتێبخانەیەکی سابلاخ

بەناوی تۆوە ناو بنێین.

بەردێ وتی؛

ئێمە ئێستاکە ناتوانین پەیکەرێکت

لە سنگی بابەگوڕگوڕدا بۆ داتاشین

دوایی کوردستانیش وتی؛

ئەوەی ئێستاکە ئێمە ئەتوانین بیکەین

هەر ئەوەیە

وەک گوڵ و شیعر و ئازادی

لە گیانماندا هەڵتگرین!

بە داخەوە بێشکچی لە نزیکەوە ناناسم. حەیف تاکوو ئێستا دەرفەتی ئەوەم بۆ نەڕەخساوە لە نزیکەوە ئەو مرۆڤە ببینم. بەڵام زۆرێک لە نووسین و وتارەکانیم خوێندوەتەوە. لەوانەیش گرنگتر کەسایەتی سەربەرزی بێشکچی و هەڵوێستی ئازایانەی لە دڵی گەلی کورددا سەکۆیەکی بۆ خۆی دەستەبەر کردووە. بە بڕوای من لەم ڕۆژگارەدا و لە ناو نەتەوە سەردەستەکاندا نموونەی مرۆڤی وەکوو بێشکچی یەکجار دەگمەنە. مرۆڤێکی وەها کە ژیانی خۆی پێشکەش بە پاراستنی نەتەوەکەی من کردووە، هەردوو چاوی خۆمی پێشکەش بکەم هێشتا هیچم نەکردووە. ئەم جۆرە مرۆڤانە لە داستانە گەورەکان، لە گەورە کەسایەتییەکانی ناو مێژوو دەچن. ئەو مرۆڤە خۆی لە خۆیدا، ژیانی خۆی ڕێکترین و جوانترین شیعرە.[١]

---

[١] دارستانی شیعر (شێرکۆ بێکەس ١٩٤٠-٢٠١٣)، نووسینی سیروان ڕەحیم، لە بڵاوکراوەکانی تۆڕی میدیایی ڕووداو، ٢٠٢٢.

## پێشەکی

چۆن سەیری ڕابردوو دەکرێ؟ چۆن ڕاڤەی گوزەشت دەکەین؟ هەر مرۆڤێك، لە ڕابردوویدا زۆر یادەوەری و چیرۆکی هەیە. ئایا ئەوانە چۆن تۆمار و گەنگەشە دەکرێن؟ چونکە ئەو بیرەوەریی و حیکایەتانە، لە هۆشی ئینساندا بە شێوەیەکی تێکهەڵپرژاو ماونەتەوە. لەبەر ئەوەی، ئەوانە وەك بەندکراو وان، لە مێشکی مرۆڤدا. بۆیە نووسینەوە، ڕاستترین و ساغڵەمترین ڕێگایە بۆ ئەوەی گیان بەبەر یادەوەرییەکان بخەینەوە و تۆماریان بکەین.

ساتێ دەست بە نووسینەوەی یادگاریی و چیرۆکەکانمان دەکەین، ئەو بەشەی مێشکمان کە ئەمانەی تێدا پاریزراوە، دەرگایان بە ڕوودا دەکرێتەوە و، یادەوەرییەکان، یەك لە دوای یەك لێیەوە دەردەچن. چەندی زیاتریش بنووسینەوە، دەرگاکە زیاتر دەبێتەوە و یادەوەری و بەسەرهاتی ئەو بوویەرانەی بەسەرمان هاتوون، لە پشت هەڤدوو، خێراتر سەر دەردەهێنن. چونکە دەشێ بە نووسینەوە، خۆمان بگەیەنینە قوڵایی بیری زیهنمان و تەواوی یادەوەرییەکانمان زیندوو بکەینەوە.

لە پێڤاژۆی ئەو نووسینەوەدا، بەشێوەیەکی سروشتی، بەڵگەکانیش وەبیردەهێنینەوە و دەیانخەینەوە ناو ڕۆژەڤ. بەو شێوەیە، یادەوەرییەکان لە ماوەی نووسیندا خۆیان فرەتر دەکەن. نووسین و بیرئانین و بەڵگاندن، بە کارلێککردنیان لە یەکتر، وا دەکات ڕێگایەکی ڕاستتر و چاکتر بدۆزینەوە، بۆ هەڵسەنگاندن و سەیرکردنی ڕابردوو.

لەم پەرتووکەدا، بیرەوەریەکانی سەردەمی منداڵیم و لاویەتیم نەنووسیوەتەوە. لەگەڵ ئەوەی بێ دوودڵی ئەوانیش گرنگن. لێ شوێنی ئەوان لە کیتابێکی دیکەدا دەکەمەوە.

ئەو یادەوەرییانەی بەردەستتان، لە نێوان ساڵانی ٢٠١٩-٢٠٢٠ ئامادە کراوە. شێوەی خامی نووسینەکە، بە چەندان شێواز؛ چەندان جار، بۆ هەریەکە لە ئیبراهیم گوربز و ڕوشەن ئارسلان و جەلال تەمەل و تەڵعەت ئینانچ و ئیبراهیم کورەکەن نێردراوە و، دواتریش بیر و بۆچوون و هەڵسەنگاندنی ئەوانی لەسەر وەرگیراوە.

دەمەوێ لێردا ئاماژە بە خاڵێك بکەم، سەبارەت بە ناوی پەرتووکەکە.

زیاتر لە پەنجا ساڵ، لە ماوەی دادگاییەکاندا، بەردەوام گرنگی و گەورەیی زانستم دووپات کردووەتەوە. جا ئەمەم لە بەشی زانستە مرۆڤایەتییەکان و زۆر بەشی دیکەش گوتوتەوە. بەردەوام ڕۆڵ و کاریگەری زانستم لە دانیشتنەکانی دادگا دا هێناوەتە زمان و ڕۆڵیانم بەرز نرخاندووە. بۆیە لەو چوارچێوەیەدا، هەردەم پەنجەم خستۆتە سەر ئەوەی، کورد و کۆمەڵگای کوردی و کولتوورەکەی، دەکرێ بە ڕێگا و ڕێکارە زانستییەکان توێژینەوەی لەبارەوە بکرێ و شرۆڤەی دۆخەکەی بکەین. وەلێ لەو سەروبەندەدا، هەر یەکێك لەوانەی زمانیان لێدام، یان هێزە ئەولەکارییەکان و داواکارە گشتییەکان، یانیش دادگاکان، یان ئەوەتا ئەوانەی بە هۆی ئەوەی باسی کوردم کردووە و ناڕەحەت بوونە، یان ئەوانەی بە هۆی پرسی کوردەوە کاردانەوەیان هەبووە، دەستیان بە گوتنەوەی ئەوە کرد (ئەگەر پرسەکە نیشتیمان بێت، زانست لاوەکییە). بەمەش لە هەوڵ و تەقەلای ئەوەدان ئاست و گرنگی زانست کەمبکەنەوە. بۆیە لە زۆر بەشی ئەو پەرتووکەدا

وەڵامی ئەو ڕەخنانە دراونەتەوە و، دژی ئەو تاوانبارکردنە چەندان بەرگری جیاواز دەکەوێتە بەرچاو. سا لەو مژارەدا ڕوانین لە تیۆری نکۆڵی کردن لە کورد و دۆخی کۆمەڵایەتی و پەیوەندییە سیاسییەکانی بەر لە پەنجا، شێست ساڵەی، هاوکارمان دەبێت بۆ ڕۆشنکردنی ئاسۆی بەردەممان. بۆیە یادەوەرییەکان، بریتییە لە ڕەخنەگرتن و بەرگری کردنی زانست بەرامبەر بە هەڵسوکەوتی ئەو ئایدۆلۆژیا فەرمییە.

دکتۆر عەبدولڕەحیم ئۆزمەن کەدێکی زۆری لە ئامادەکردنی ئەو پەرتووکە کێشاوە و ڕەنج و ماندووبوونی پشتگوێ ناخرێ. بۆیە بەو بۆنەیەوە، سوپاسگوزاریانم...

لە ئامادەکردنی بەشەکان و ڕیزبەندیاندا، دکتۆر جان شەکەر زۆر ماندوو بوو. سوپاسی ئەویش دەکەم.

هێزی من لە تێپەڕاندنی هەموو ئەو ڕووداو و ماف خوراوییەی بە هۆی نووسین و پەرتووکەکانم بەسەرم هاتوون، هەر لە ئامادەکردنیانەوە تا دوای بڵاوبوونەوەیان و کاردانەوەکانی، لە سایەی لەمان بێشکچی هاوژینم بووە. ئەو گوڕ و تینەی وای کرد بەسەر ناحەقی و بوویەرەکاندا سەربکەوم، بێ شك بۆ ئەو دەگەڕێتەوە، چونکە بەرگەی زۆر ڕووداوی گرت، کە بەو هۆیەوە پێیدا تێپەڕین. ئەو پەرتووکەش پێشکەشی ئەو دەکەم، کە ماوەیەکی زۆر کەم بەر لە ئێستا، هاوسەری خۆشەویستم لەمان بێشکچیم لە ١٢-٠٤-٢٠٢١ لە دەستدا.

**ئیسماعیل بێشکچی**

**ئەنقەرە - ٢٠٢١**

ئەنقەرە، ساڵی ۱۹٦۱، بەشداری ئیسماعیل بێشکچی لەگەڵ چەندان کەسی دیکە لە رێپێوانی ئیدانەکردنی فەڕەنسا، دژی جەنگی سەربەخۆیی جەزائیر

## ئەوەی لە سەربەخۆیی زانکۆوە لەسەرمە!

بەراوردی ئەوە ناکرێ لە نێوان ساڵانی ١٩٥٠–١٩٦٠، ڕێژەی خوێندنی منداڵ و گەنج، لە قۆناغەکانی خوێندنی ناوەندی و ئامادەیی و زانکۆکان، بەراورد بە ئەمڕۆ، چەند کەمتر بوو. بە تایبەتی شتێکی زۆر دەگمەن بوو لە شار و شارۆچکە بچووکەکانی ئەنادۆڵوو، ئەگەر کەسێك لە زانکۆبا، یاخود بەشی زانستە مرۆڤایەتییەکانی خوێندبا. قوتابیانی ئەوێ سەردەمێ، بە تایبەتی ئەوانەی لەسەر ئەرکی دەوڵەت خوێندبایان، بە ڕێژەیەکی بەرز، (کەسانی ڕاستگۆ و بە نمەك بوون بۆ گەل و وڵاتەکەیان). ئەوان بەو شێوەیە دەردەچوون و خوێندنیان تەواو دەکرد. بۆیە لە دام و دەزگا جیاوازەکانی دەوڵەت، دەبوونە فەرمانبەر و ئەرکەکانیان وەك پێویست جێبەجێ دەکرد.

من لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٥٠، لە شارەدێیەکی بچووکەوە، بۆ خوێندنی کۆلێژی زانستە سیاسییەکان، چوومە زانکۆی ئەنقەرە، لە پایەتەختی تورکیا و، لە کاتی خۆیشی خوێندنم تەواوکرد. بەرامبەر بەو دەرماڵەیەی بۆ خوێندنی زانکۆ وەرم دەگرت، ڕاستەوخۆ دەستم بە خزمەتی ناچاری کرد. دوای ماوەیەکی کەم، ئەرکی سەربازی ناچاریشم تەواو کرد. وەلێ لە بری پۆستە کارگێڕی و دیپلۆماسییەکان، بەو ڕوانینەی زانست هێمای بۆ کردبوو، بۆ ڕووداوەکانی دەوروبەرم، بە میتۆدێکی زانستییانە، ویستی تێگەیشتن و ڕۆشنکردنەوە، پاڵی پێوەنام بۆ هەڵبژاردنی هەوەس و مەراقی کاری ئەکادیمی. وەلێ لە توێژینەوە زانستییەکانمدا، جگە

لە بابەتە باوەکان، پرسە مەترسیدارەکان زیاتر سەرنجی منی بەلای خۆیدا کێش دەکرد. لە بری ئەوەی گوێڕایەڵی دەوڵەت و باوەڕە فەرمییەکان بم، زیاتر پابەندی زانست و ڕێکارەکانی بووم. کورد، کە یەکێك بوو لە کێشە بنچینەییەکانی تورکیا، ئەو ئاریشەیەی هیچ کەسێك نەیدەویست خۆی لەقەرەی بدات و لە هەمبەری چاویان لێ دەنووقاند، وەك ئەوەی پرسگرێکی وەها نەبووبێت، یاخود با بڵێین جەسارەتی ئەوەیان نەدەکرد لە مژارەکە بچنە پێشەوە؛ بەڵام من پرسی کوردم بردە ناو زانکۆ تورکییەکان. بە دڵنیاییشەوە، ئەوانەی بە مژارەکەوە پەیوەست بوون یان نا، لەگەڵ دام و دەزگا فەرمییەکان بەرامبەر بەو هەنگاوە دەستەوەستان نەبوون. بۆیە دوای یەك دوو هەوڵی زانستی لەو شێوەیە، کۆتایی بە ژیانی ئەکادیمیم هێندرا. کاتێك وەکو قوتابییەکی دژە باوی بەشی زانستە سیاسییەکانی زانکۆی ئەنقەرە لە دادگایەکەوە بۆ دادگایەکی دیکە بەرگریم لە دۆسیەکانم دەکرد، لە بەندینخانەیەکەوە دەگوازرامەوە یەکێکی دیکە؛ زۆرینەی هاوڕێکانی خوێندن و هاوپیشە ئەکادیمستەکانم، لە زۆر دام و دەزگای جیاواز، پلەی باڵایان وەرگرتبوو. هەندێکیان ناونیشانی باڵای ئەکادیمی و هەندێکیشیان ببوونە بەرپرسی باڵای کارگێڕی حکومی و تایبەتی. بەشێکیشیان ببوونە دیپلۆماتی باڵای وڵات.

ئەو یادەوەرییانەی لەم پەرتووکەدا نووسیومەتەوە و خستوومەتە بەر ڕۆشنایی، وەك ئەوەی لەسەرەوە سەرنجم خستەسەر، بەشێکی کورتن لەو بەسەرهاتانەی لە ڕێگای ژیانی ئەکادیمی بەسەرم هاتووە. چونکە نووسینەوەی ئەو پێڤاژۆ درێژە، بە ورد و درشتییەوە زۆر ئەستەمە؛ بە تایبەتیش، کە بەشێك لەو

دادگاییکردنـــانەم لەگەڵ بەشـــێك لە ڕووداوەکـــان لە بەشـــێك لە پەرتووکەکانی پێشووترم نووسیوەتەوە. ئەوانەی لێرەدا دەیخوێننەوە، لەگەڵ ئەوەی لە هـیچ شـوێنێکی دیـکەدا نەنووسـراوەتەوە، بەڵام بەشێکیان هەندێك لە نووسینی ئەم دواییانەمن، دوای دووبارە لە بێژینـگ دانەوەیـان، هەمدیسـان لێرە شـوێنم بـۆ کـردوونەتەوە. بەر لەوەی بچمە سـەر بیرەوەرییەکـان، مژاری سـەربەخۆیی زانکۆکـان، کە لە تورکیـا زوو زوو دێتە بەر بـاس، سـەبارەت بەو بەشـەی بەر من دەکەوێت، دەمەوێت بە دوو نموونەی دژبەر، باسیان بکەم.

دوو کەڕەت، ســـەربەخۆیی زانکـــۆ بەرامـــبەرم خـــرا بـــواری جێبەجـــێ کـــردنەوە، هەردوو جـاریش بـوومە گەواهیـدەری دوو جۆرە جیاوازەکەی:

## یەکەم

لە بیستەمین ڕۆژی مانگی حەفتی[1] ساڵی ١٩٧٠ کاتێك بڕیاری کۆتایی پێهێنانی ژیانی ئەکادیمیم دەرچوو، یانی کاتێك فەرمانی دەرکردنم لە زانکۆ دەرکرا؛ دۆسیەیەکمان کردەوە بۆ ئەوەی تانە لە بڕیـارەکە بـدەین، بـۆ ئەوەی داوای وەسـتاندن و ڕەتکـردنەوەی

---

[1] خوێنەری بەڕێز، لە دەقە تورکیەکەدا ناوی مانگەکان، بەناو هاتووە نەك ژمارە، بەڵام لە باشـوور و ڕۆژهەڵاتـی نیشـتیمان، هەم لە ئاخـاوتن، هەمـیش لە نووسـین زۆربەی کات ناوی مانگ بە ژمارە دەنووسرێ، بۆیە منیش گەر هاتبا و ژمارەم دانابـا، پێم وابـوو دەقەکەی ناشـرین دەکـرد، گەر هاتبـا و نـاوی مانگەکانیشـم بە کوردی نووسیبا، کەسێکی زۆر نەیاندەزانی کامە مانگە، لە کاتێکدا لە کوردیدا بـۆ هەر مانگێـك چەنـد ناوێکمـان هەیە؛ جـا گەر نـاوی مانگەکـانم بە عەرەبـیش بنووسیبا هەمان کێشەمان هەر دەبوو. بۆیە من لەو کتێبە ویستم بەو شێوازە کار لەسەر نووسینەوەی ڕۆژژمێرەکان بکەم. (وەرگێڕ).

داواکەی سەرم بکەین لە دادگای باڵای کارگێڕی. لەسەر ئەو بنەمایە، دادگای باڵای کارگێڕیش بڕیاری وەستاندنی پێڤاژۆی دۆسیەکەی دەرکرد. بەڵام زانکۆکەم ئەو بڕیارەی نەخستە واری جێبەجێکردنەوە.

ساڵی ١٩٧٠، لێکۆڵینەوەیەکی کارگێڕیم لەسەر بوو. بەڵام هیچ دۆسیەیەکی لێکۆڵینەوەی دادگای تاوانیم لەهەمبەر نەکرابووەوە. لەوێ سەردەمێدا ماددەی ژمارە ٤٩٣٦ قانوونی زانکۆ جێبەجێ دەکرا. لەوێ دەمێدا بە پێی یاساکە هیچ ڕێگایەك نەبوو بۆ ئەوەی کۆتایی بە ئەرکی ئەکادیمیم بهێندرێت. وەلێ بە پێی ماوەی دیاری کراوی دۆسیەکەم، ئاماژەیان بە بەربەستەکانی تەواو نەکردنی دکتۆراکەم کردبوو؛ چونکە ئەگەری ئەوە هەبوو پرسی دەرکردنم لە زانکۆ بێتە پێشەوە و ببێتە ڕۆژەڤی ژیانی زانکۆم. لە داواکاری ڕەتکردنەوی دۆسیەکەمدا، ئەوانە بە ڕوونی، نووسرابووەوە و باسیان لێوە کرابوو.

لە سەروبەندی دۆسیەکەدا، دادگای باڵای کارگێڕی، بەو شێوەیە بەرگری لە پرسەکە کرد "بە پێی ماددەی ٤٩٣٦ لە یاسای زانکۆکان، زانکۆکان پەیوەستی لایەنی دیکە نین، جگە لە وەزارەتی پەروەردە. هەروەها سەربەخۆش نین، بۆیە لەم ڕوانگەیەوە دەشێ هەموو کردە و لێپێچینەوەیەکی کارگێڕی ئەنجام بدرێت".

**دووەم**

لە سەردەمی ڕژێمی دوازدەی ئازار[1]دا، لە فەرمانڕەوایی دۆخی

---

[1] یەکێکە لە کودەتا سەربازیەکانی تورکیا. لە دوازدەمین ڕۆژی مانگی سێی =

لەناکاوی سەربازی دیاربەکر دەستبەسەر بووین. لەوێ لەگەڵ بوونی چەندان مامۆستا و فەرمانبەری فەرمانگەی ناسنامە و بەڕێوەبەرایەتی تاپۆ و تەندروستی، برادەرێکی زانکۆی ئەتاتورك لەوێ بوو، بە ناوی ناجی گورشین. ئەویش لەوێ، وەك ئێمە دەستبەسەر بوو. لەوێ سەردەمێدا بە پێی ماددەی ژمارە ٦٥٧ی یاسای فەرمانبەرانی حکومی، ئەوانەی دەستبەسەرن، تا بڕیاری دادگایان بەسەردا دەسەپێندرێت، دەبێ دوو لەسەر سێی مووچەکانیان وەرگرن. منیش لەوێ ئەو ڕێکارەم زانی. وەك برادەرانی دیکە، ناجیش مووچەکەی خۆی بەو شێوەیە وەردەگرت. دوای ئەوەی لە برادەرانەوە بەو مافەی خۆم کەوتمەوە، منیش نامەیەکی داواکاریم بۆ ڕاگری کۆلێژی زانستە سیاسییەکانی زانکۆی ئەنقەرە نووسی. لەوێدا نموونەکانی ئەوێشم باسکرد و داوای پێدانی مووچەکەم کرد. دوای نزیکەی دوو هەفتە، وەڵامی نامەکەم بەم شێوەیەی خوارەوە بۆ هاتەوە:

"ئێمە زانکۆیەکی سەربەخۆین. وەلێ ئەو نموونانەی تۆ لە نامەکەتدا باست کردەوە، تایبەتە بەو دام و دەزگایانەی سەربەخۆ نین. لە زانکۆ سەربەخۆکەی ئێمە هیچ ڕێکارێکی لەو شێوەیە نییە

---

ساڵی ١٩٧١، هەریەکە لە مەمدوح تاغماچی سوپاسالاری تورکیا و فاروق گورلەری فەرماندەی هێزی وشکانی و جەلال ئەیجەئۆغلووی فەرماندەی هێزی دەریایی و موحسین باتووری فەرماندەی هێزی ئاسمانی تورکیا، فەرمانی دەستلەکارکێشانەوە و هەڵوەشاندنەوەی سیی و دووهەمین حکومەتی تورکیایان بۆ جەودەت سونای سەرۆك کۆماری ئەوسای تورکیا نارد. لە ئەنجامدا سولێمان دەمیرەڵی سەرۆك وەزیران و سەرۆك کۆمار، دەستیان لە پۆستەکانیان کێشاوە و دۆخی نائاسایی لەسەرتاسەری تورکیا ڕاگەیەندرا. (وەرگێڕ).

بۆ جێبەجێ کردن. وەلێ ئەگەر لە کۆتایی دادگایی کردنەکەتدا، بڕیاری ئازادکردنت دەرچوو، دەتوانی تەواوی مووچەی کەڵەکە بووت بەیەکەوە وەربگریت..."

وەك ئەوەی ئێوەش خوێندتانەوە، زانکۆی ئەتاتورك بە گوتنی "ئێمە سەربەخۆ نین و سەر بە وەزارەتی پەروەردەین" لە زانکۆ بڕیاری دەرکردنم دەدەن و بڕیاری دادگای باڵای کارگێڕی جێبەجێ ناکەن. هەرچی زانکۆی ئەنقەرەیە بە گوتنی "ئێمە زانکۆیەکی سەربەخۆین و لای ئێمە هیچ ڕێکارێکی لەو شێوەیە نییە بۆ جێبەجێکردن" ئەوەیان ڕەتکردەوە ، تا دوو لەسەر سێی مووچەکەم پێبدەن. ئەگەر دام و دەزگا نا سەربەخۆکان ئاوا مامەڵە لەگەڵ فەرمانبەرانیان بکەن، ئەو کارەی دەزگا سەربەخۆکان دەیکەن زۆر سەرسوڕهێنەرە... ڕەنگە بە ئەگەرێکی زۆر ئەو جۆرە بڕیارە میزاجییانە، تەنیا بۆ من و کەسانی وەك من جێبەجێ بکرێت!

لە سەردەمی ڕژێمی دوازدەی ئازار، دادگای سەربازی و دۆخی لەناکاو لە ئیستانبووڵ و ئەنقەرە و ئیزمیر و ئەدەنە هەبوون. لەو دۆسیانەی لەو دادگایانە دادگایی کردنیان بە ڕێوەچوو، زۆر دۆست و برادەر دەستبەسەرکران. بەڵام زۆربەی سزاکانی ئەو برادەرانە لە دادگای باڵای سەربازی بوو، بۆیەش بڕیارەکانیان یەکلایی نەکرانەوە. کاتێکیش لە هاوینی ١٩٧٤ بڕیاری لێخۆشبوونی گشتی دەرچوو، هەموو دۆسیەکان لە دادگای باڵای سەربازی بوو. یانیش لەبەر تێکچوونی دۆسیەکانیان، سەرلەنوێ فایلەکانیان لەبەردەم دادگا بوو. هەرچی تایبەت بوو بە دۆخی من، وەك کەسێك کە تازە دەرکرابووم و ئەوانەشی سزاکەیان یەکلایی نەکرابووەوە، دوای ئەو لێبووردنە گشتییە، دەیانتوانی بگەڕێنەوە

سەر کارەکانی خۆیان. وەلێ من تاوانبار کرام و سزاکەم دەرکرا، لەگەڵ ئەوەشدا، بە هۆی ئەوەی لە دوو زانکۆی جیاواز، بە هۆی جیاوازی شێوەی سەربەخۆیی ئەوان لە سەربەخۆیی کارگێڕی، لە مافە تایبەتییەکانم بێبەش کرام و نەمتوانی بگەڕێمەوە سەر کار و پیشەی خۆم.

لێرەوە دەمەوێ باسی جیاوازی بابەتی زمان لێدانم بکەم لەو دوو زانکۆیەدا. لەو پەرتووکەدا لە ژێر ناونیشانی (زانست و سیخوڕەکان، سیخوڕ و گەواهیدەرەکان) لەگەڵ ( جوڵانەوەی نەتەوەیی ڕزگاری بەنگلادیش و کورد) باس لە زمانلێدان و سیخوڕیەکانی کۆلێژی زانستە سیاسییەکانی زانکۆی ئەنقەرە و ئەتاتورك دەکەم. وەلێ لە نێوان وان دوو زمان لێدانان، جیاوازییەکی گرنگ هەیە:

ئەوانەی لە زانکۆی ئەتاتورك زمانیان لێدام، بە شانازییەوە ناسنامەکانی خۆیان ئاشکرا کرد. وەلێ ئەوانەی لە کۆلێژی زانستە سیاسییەکانی زانکۆی ئەنقەرە زمانیان لێدام، پێداگیری ئەوەیان دەکرد تا، ناسنامەکانیان بلاو نەکرێتەوە. بۆیە نازانین ئەوان کێ بوون. بەڵام بەو شێوەیە کەسانی سەر بە زانکۆکان و ئەو زانکۆیە تەنیا لە پرسی سەربەخۆیی نا، بەڵکو هاوکاتدا، لەسەر توێژینەوەکان و نووسینەکانیاندا، لەژێرخانی خۆیاندا، دیار نییە زمان لە چ ئەکادیمیستێك دەدەن بۆ لایەنی کارگێڕی و حکوومەت و داواکارە گشتیەکان. چونکە ئەوان دەربارەی زمان لێدان، خاوەنی دابونەریتی جیاوازن.

بەشداریکردنی ئیسماعیل بێشکچی لە ڕێپێوانێک، لە کۆلێژی زانستە
سیاسیەکانی ئەنقەرە لە ساڵی ١٩٦١

# بەشی یەکەم
# زانین دەڕوات بەرەو ئەو ڕێگایەی پێویستە نەزانرێ

## لە ئەنقەرەوە بۆ ناوچەی کەبان
## ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ نەبوونی زمانی کوردی

دوای بیستو حەفتەمین ڕۆژی مانگی پێنجی ساڵی١٩٦٠ لە تورکیا دەست بە گەنگەشە و نیقاشی چەندان مژاری جیاوازی کۆمەڵایەتی و سیاسی و کولتوری، وەك چاکسازی زەوی و زار، ئاغایەتی و شێخایەتی و ٥٥ ئاغاکە کرا... وەلێ کاتێك باسی چاکسازی زەوی و زار و ئاغایەتی دەکرا، بۆ ئەو پرسە ناوچەکانی ڕۆژهەڵات زیاتر دەهاتنە خەیاڵ. یەکێك لەو بابەتانەش هەژمارکردنی هەموو دانیشتوانی تورکیا بوو بە تورك، لە پاڵ کێشەی کورد و تورك. لە دەزگاکانی ڕاگەیاندن و زانکۆکان، بە بێ پچڕان ئەوە چەند بارە دەکرایەوە کە ڕەگ و ڕەچەڵەکی کورد تورکە و زمانێك نییە بەناوی کوردی. بۆ پشتڕاستکردنەوەی ئەو بۆچوون و دەنگۆیانە، دادگا بڕیاری فەرمی دەرکرد. ئەوانەی باسی کورد و زمانەکەیانی دەکرد، لە ڕێگای یاساوە، بە توندی سزا دەدران و دەخرانە کونجی زیندانەکانەوە. بۆیە لەو چوارچێوەیەدا، پەیوەست بوونم بە کێشەکەوە، لە خواستێکی زانینەوە سەرچاوەی گرتبوو. ساڵی ١٩٦١ بۆ دەرچوونم لە

بەرنامەی جێبەجێکاری زانکۆدا، شاری خارپێتم لە ڕۆژهەڵات هەڵبژارد، وەك چۆن لە کاتی هەڵبژاردنی قورعەی سەربازی، بەهەمان بۆنەوە چوومە بەدلیس. دوای تەواو کردنی ماوەی سەربازیشم، هەڵبژاردنی زانکۆی ئەتاتورکیش بە هەمان شێوە شرۆڤە دەکەم.

مەهمەت شەریف فورات، لە پەرتووکی (شارەکانی ڕۆژهەڵات و مێژووی ڤارتۆ)[1]دا بانگەشەی ئەوە دەکات، بنەچەی کورد تورکە و زمانێك نییە بەناوی کوردی و، هەروەها ئەوەی پێی دەڵێن زمانی کوردی، ئەویش هەر زمانی تورکییە. پەرتووکەکە لە قوتابخانە ئامادەییەکان و زانکۆکان بە بێ بەرامبەر بڵاو دەکرایەوە و بە ڕاست و چەپدا دەبەخشرا. هەمان کیتاب، لە کۆلێژی زانستە سیاسییەکانی زانکۆی ئەنقەرش بڵاوکرابووەوە. بە شێوەیەك لەو زانکۆیە، پەرتووکەکە لەسەر مێزی هەموو مامۆستایەکی ئەوێ دەبیندرا. کاتێك دەربارەی ناوچەکانی ڕۆژهەڵات پرسیارێکمان لە مامۆستاکان دەکرد، ڕاستەپێ ئەو پەرتووکەیان بۆ پێشنیاز دەکردین تا بیخوێنینەوە و دەیانگوت "ڕاستییەکان لەو پەرتووکەدا نووسراوە و بیخوێننەوە...".

لە نێوان سالآنی پەنجا تا سەرەتای شەستەکان، لە کۆلێژی زانستە سیاسییەکان پرۆگرامێکی مەشقکاری خوێندن هەبوو بۆ دەرچوون لە زانکۆ. ئەو خوێندکارانەی لە قۆناغی سێیەمەوە

---

[1] لە دوای بیست و حەفتەمین ڕۆژی مانگی پێنجی ساڵی١٩٦٠، جەمال گورسەلی سەرۆکی جونتا، پێشەکی بۆ ئەو پەرتووکە نووسیی و جارێکی دیکە لەلایەن وەزارەتی پەروەردەوە چاپ و بڵاو کرایەوە لە تورکیا. (نووسەر).

دەچوونە قۆناغی چوارەم، بەشی کارگێڕی قوتابیان، لە مانگەکانی هاوین، خوێندکارانیان دەناردە شارە جیاوازەکانی تورکیا. هەر خۆشیان لیستێکی شارەکانیان ئامادە دەکرد کە قوتابی بۆیان هەبوو بۆی بچن، بەڵام خوێندکار دەیتوانی لەناو ئەو شارانەی لە لیستەکەدا هاتوون، دانەیەکیان هەڵبژێرێ. دوای چوونیان، قوتابییەکان لە پاڵ پارێزگار و قائیمقامەکان لە ماوەی ئەو سێ مانگەدا، دەبوون بە خاوەنی بیرۆکەیەکی سەرەتایی دەربارەی کاروبارە کارگێڕیەکان. ماوەی تەتبیقەکە بەوێ شێوەیێ بوو.

من و هاورێیەکم بەیەکەوە خارپێتمان هەڵبژارد. دوای ئەوەی ماوەیەك لە ناوەندی شار لە پارێزگا کارم کرد، پاشان چوومە ناوچەی کەبان. لەوێ سەردەمێدا لە نێوان لادێنشینەکان، کێشەی زەوی و زار هەبوو لە ناوچەکە. بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە، قائیمقامەکان زوو زوو سەردانی لادێکانیان دەکرد. لەگەڵ قائیمقامی کەبانی، منیش دەچوومە لادێکان. لە گوندەکان قائیمقام کۆبوونەوەی لەگەڵ گوندەوارییەکان دەکرد. لە هەندێك کۆبوونەوە و سەرداندا، هەستم بە بوونی وەرگێڕ کرد. وەرگێڕەکە کەسێك بوو لەبەشی نووسراوەکانی قائیمقامیەت فەرمانبەر بوو. فەرمانبەرەکە، وتەکانی قائیمقامی بۆ لادێنشینەکان و ئاخافتنی ئەوانیشی بۆ قائیمقام وەردەگێڕا. واتە گفتوگۆی نێوان قائیمقام و خەڵکی ناوچەکە لە ڕێگای وەرگێڕێکەوە بەڕێوەدەچوو.

بۆچوونی ئەنقەرە و ناوەندەکانی میدیا و زانکۆکان، دەربارەی ڕووداوی وەرگێڕەکە، سەبارەت بە زمانی کوردی لای من گومانی دروست کردبوو. دۆخەکەم لە ناوچەی دەپ و پالۆ هەست

پێکرد. لەوێ لە چوارچێوەی سەردانەکانمان بۆ چارەسەرکردنی کێشەی زەوی و زار، لەگەڵ قائیماقام چووبووینە ئەو لادێیانە. لە دەپ و پالۆ وەرگێڕمان لەگەڵ بوو. یەکەم بەریەککەوتنم لەگەڵ کورد و زمانەکەیان بەوێ شێوەیێ بوو. بە شێوەیەکی سروشتیش، بۆ ڕەواندنەوەی ئەو گومانەی لە هزری مرۆڤدا دروست دەبێ لەو بارەیەوە، دەگەڕاینەوە بۆ ئینسکلۆپیدیا و پەرتووك و گفتوگۆکردن لەگەڵ مامۆستاکانمان. ئیدی بەو شێوەیە.و لەو ڕێگایەوە ئاشنای پەرتووکی شارەکانی ڕۆژهەڵات و مێژووی ڤارتۆ دەبی. وەلێ ئەمانە بەس نین بۆ ڕەواندنەوەی ئەو گومانەی دروست بووە، بۆیە دەست بە لێکۆڵینەوە و گەڕان و سوڕان دەکەی بە پێی تواناکانی خۆت.

## شوێنپێی ئەرمەنییەکان لە خارپێت

لە ماوەی جێبەجێکردنی تەتبیقاتەکەم، هەستم بە بوونی پەیوەندییەکی دیکەش کرد لە نێوان کەبان و دەپ. لە هەردوو ناوچەکە، گوندنشینەکان، چەندان مەکتووبیان پیشانی من دەدا. نامەکان لەناو زەرفێکی زۆر جوان بوون، کە پولی تایبەتیان بەسەرەوە بوو... "ئەو مەکتووبانەمان لە ئەمریکاوە بۆ دێت. ئەوانەی ئەو نامانەمان بۆ دەنووسن، خزم و ناسیاوی ئێمەن. ئەوان پارەشمان بۆ دەنێرن. هەروەها داوەتمان دەکەن تا بچینە ئەمریکا. بەڵام ئێمە مەکتووبیان بۆ نانووسین... ". ئەوان لەوێ ئاوایان پێگوتم. لە خارپێت هەستم بەوە کرد مژارێکی وەهاش دەهێننە

زمان. ساڵانێك دواتر، ڕاسترە ئەگەر بڵێم ساڵی ١٩٧٣ هەستم بەوە کرد و زانیم، ئەوان ئەرمەنی بوون. وەلێ لەوێ ڕۆژێدا، هیچ بیر و بۆچوون و زانیارییەکم نەبوو لەسەر ئەرمەنییەکان.

## لە ئارپاچایەوە بۆ برادۆست
## زمانی ئەو خاکەی نەچووەتە ناو پاسەپۆرتەوە

لە مانگی دەی ساڵی ١٩٦٢، تا مانگی یازدەی ١٩٦٤، ماوەی ئەرکی سەربازیم جێبەجێکرد. دوای وەرگرتنی خولی جێگری ئەفسەری، بۆ ماوەی شەش مانگ لە قوتابخانەی سەربازی پیادەی توزلا، لە ئیستانبووڵ؛ لە نیسانی ساڵی ١٩٦٣ لە بەدلیس لە فەوجی پیادە دەستم بە ئەرکی سەربازیی کرد.

لە بەهاری ساڵی ١٩٦٣، بەشێك لە بەتالیۆنی هێزی پیادەی فەوجەکەمان، وەکوو هێزی پاڵپشتی، گوازرابینەوە بۆ ناوچەی شەمزینان لەسەر سنووری نێوان عێراق و تورکیا. منیش لەناو ئەو بەتالیۆنەدا بووم، کە فەرمانی گوێزرانەوەمان دەرچووبوو. وەك چۆن لەناو هەریەکە لە فەوجەکانی پیادەی موش و چەولیگ و ئەردیشیش، چەند بەتالیۆنێکی وەك ئێمە، وەکوو هێزی پاڵپشتی نێردرابوونە دەور و بەری دەڤەری جۆلەمێرگی نزیك لە سنوور.

لەوێ سەردەمێدا، کوردەکان بە سەرکردایەتی مەلا مستەفا بارزانی، لە ناوچەکانی نزیك سنووری عێراق و تورکیا، دژ بە حکوومەتی بەغدا لە جەنگدا بوون. سوپای عێراقیش دەیویست ئەوان لە سنوور عاسێ بکات، تا ناچاری ئەوە بن، نەگەڕێنە دواوە و بەرەو تورکیا کۆچ بکەن. بۆیە داوای ئەوە دەکرا، تا پاڵپشتی

زیاتر بۆ هێزەکانی سەر سنوور بنێردرێت، تا بتوانن بەو شێوەیە، ڕێگا لەبەردەم ئەوانە بگرن کە دەیانەوێت لە سنوور بپەڕنەوە و ئەوانەش دەستگیر بکەن کە دێنە ناو تورکیا.

لە کۆتاییەکانی مانگی پێنجی ساڵی ١٩٦٣، بەتالیۆنەکەمان بەرەو ناوچەی ئەلباکی سەر بە شاری وان دەستی بە جوڵە کرد. دوای تێپەڕینی شاری وان و ناوچەکانی وەستان و پایزئاڤا، گەیشتینە ئەلباك. دوای ئەوەی چەند ڕۆژێك لەوێ ماینەوە؛ بەرەو گەوەڕ بەڕێکەوتین. لەوێش نزیکەی دوو تا چوار ڕۆژ ماینەوە. لە ماوەی مانەوەمان لەوان ناوچانەدا، زوو زوو، فەرماندە سەربازییەکانی ئێران دەهاتنە کامپەکانمان و لەگەڵ فەرماندە و ئەفسەرە تورکەکان دیدار و کۆبوونەوەیان دەکرد.

دوای چەند ڕۆژێك بەرەو شەمزینان دەستمان بە جوڵە کرد. لە ڕێگا، نزیك گوندی هاڕون وەستاین و چەند ڕۆژێك، لەوێش ماینەوە. لادێکە لەوێ دەمێدا گوندێکی بچووك و نزیك لە سنووری ئێران بوو. لەوێ قەرەقۆڵێکی بچووك دروستکرابوو.

بەیانییەکی زوو بەرەو شەمزینان دەستمان بە جوڵە کردەوە. لە ڕێگا، لە سێ ڕیانی دەرەبانی و سیرنوس و شاپاتان، نزیکەی هەفتەیەك ماینەوە و جێگیر بووین. ئەو ڕێگایەی بەردەممان کە بەرەو شەمزینان دەڕۆی، تا زیاتر بەرەو پێشەوە دەچووین، هێ هەورازتر دەبوو. دوای ئەوەی گەیشتینە ترۆپکی بەرزی ناوچەکە، پاشان ڕێگا ڕوو لە لێژی بوو.

دوای ئەوەی شەوێك لە شەمزینان ماینەوە، بەسەر شاپاتانەوە بۆ گەیشتن بە ناوچەی نەهری، ملی ڕێگامان گرتەوەبەر. ڕێگای

شـاپاتانیش، هەورازێکـی ڕکـی نەبـڕاوە بـوو، بـۆ گەیشـتن بە نـاوچەکەش، دەبـوو یەخەی ئەو ڕێگـا سـەختە بەرنەدەیـن. دوای ئەوەی شـەوێکیش لە نەهـری مـاینەوە، دوای تێپەڕینـی نـاوچەی بەناڤیك، گەیشتینە بەسوسین. تا گەیشتینە ئەوێش چیایەکی بەرز و ڕکمان بە زەحمەت بڕی و دواتریش لێژبووینەوە بەرەو ئەوێ. ئەو سـەرکەوتن و دابەزیـنە چەنـدین جـار تـاقیێ کـرایەوە، چـونکە کـارێکی ئاسـان نەبـوو، کە چەك و سـیلاح و هاوەنەکانمـان بە هێسـتر، بەو ڕێگـا ڕك و سـەختانە بەسـەر بخەیـن و بە ئاسـانی بیانهێنینە خوارەوە.

دوای گەیشـتنمان، شـەوێکیش لە بەسـنوس مـاینەوە. لە ڕێگـا هەمدیسـان، دوای بڕینـی چەنـدان کـوێرە ڕێ و هەڵگەڕان بەسـەر چیاکـان و پەڕیـنەوە لە دۆڵەکـانی بەردەممـان، گەیشـتینە نـاوچەی زەری و دواتریش لە ماڤانە ماینەوە. ناوچەی ماڤانە، دواین مەڵبەند بوو، چونکە کەوتبووە خاڵی سفری سەر سنوور. لادێنشینەکانی ئەوێ، بە "مەرەزە"وە مژوول بوون. لەو دیوی سنووریش، ناوچەی برادۆسـت بـوو. خەڵکـی دەڤەری هەردوو دیـوی سـنوور، زۆر بە ئاسانی، لەگەڵ یەکدی دەئاخڤین و لەیەك تێدەگەیشتن.

دوایـین خـاڵی گەیشـتنمان نـاوچەی ڕووبـارۆك بـوو. لە نێـوان نـاوچەی ماڤـانە و ڕووبـارۆك، دارسـتانێکی دار بەڕوو هەبـوو، ڕێگـاش بەراورد بە ناوچەکـانی پێشـتر، ڕاستەڕێ بـوو. ڕووبـارۆك گونـدێکی بچـووك بـوو، لەوێ قوتابخـانە نەبوو، بەڵام بنکەیەکـی سـەربازی بچـووکی لێبـوو، لەگەڵ مزگەوتێکـی چکـۆلانە، لادێنشینەکان لەوێ عیبادەتیان دەکرد.

چەند جارێك، چەندان کەلوپەلی لۆجیستی سەربازی بە هەلی کۆپتەر هاتبوو. کاپتنی هەلیکۆپتەرەکە دەیویست لە تەختە زەوییەکەی نێوان ماڤانا و ڕووبارۆك بنیشێتەوە. چەندجارێکیش لە ئاسمانەوە، خواردن و پێویستی ڕۆژانەیان بە گونییە بۆ هەڵدابووین. لەوێ، ناوچەیەکی تەختیان دروست کردبوو، بۆ ئەو جۆرە کارانەی بۆ بەتالیۆنە سەربازییەکان گەرەك بوو.

* * *

ڕووبارۆك وەك ماڤانە، نەکەوتبووە سەر خاڵی سفری سنوور؛ بەڵکوو تۆزێك لە دواوە تر بوو. من بە پلەی جێگری ئەفسەر، لەناو بەتالیۆنەکەم، فەرماندەی حەزیرە بووم. لەسەر سنوور ناوچەیەکی ٨ کیلۆمەتریم پێ سپێردرابوو؛ بۆ ئەوەی ئەو بەشە بخەمە ژێر چاودێری سەربازی خۆمان. لەوێ دەبوو ڕێگا لەبەردەم ئەوانە بگرم کە دەیانەوێت لە سنوور بپەڕنەوە، بۆ ئەمەش دەبوو بێ بڕانەوە، لە دەڤەرەکە کەشفی سەربازی بکەم. بۆ ئەمەش من و ١١ سەرباز ئەو کارەمان بەیەکەوە بێ پچڕان دەکرد.

لەوێ دەمێدا هێڵی جیاکردنەوەی سنوور زۆر جێگیر و دیار نەبوو. هیچ شتێکی وەك تەلبەند نەبوو بۆ نیشانکردنی سنووری نێوان دوو وڵات. جگە لەوەی بە درێژایی چەند کیلۆمەترێك، هەندێك تاشە بەردی گەورە گەورە داندرابوو، وەك کۆتا خاڵی سنووری هەردوو وڵات. یەکێك لەو ڕۆژانەی بۆ کەشفی ناوچەکە دەرچووبووین، بێ ئاگایی خۆمان سنوورمان تێپەڕاندبوو. دوای ماوەیەك ڕێکردن، تووشی کۆمەڵە کەسێك بووین. ئەوان دەیانویست هەندێك شتمان پێبڵێن، وەلێ من هیچیان لێ حاڵی

نەدەبووم. لەناو ئەو یازدە سەربازەی لەگەڵم بوون، برادەرێك هەبوو خەڵکی ناوچەی ئارپاچای شاری قارس بوو. ئەو هاتە قسە و پێی گوتم "جەنابی جێگری ئەفسەر من دەتوانم قسە بکەم؟". ئەو هاتنە پێشەوەی سەربازەکە شاگەشکەی کردم. چونکە گەلەك مەراقم کرد کە چۆن قسەیان لەگەڵ دەکا و چی دەڵێت؟ بۆیە بە بەڵی، وەڵامی پرسیارەکەیم دایەوە. ئەویش بۆ ماوەی دوو سێ خولەك، لەگەڵیان دەستی بە ئاخافتن کرد. ئەو برادەرە سەربازەی خەڵکی ئارپاچای زۆر بە ئاسانی و بێ گرێ و گۆڵە قسەی لەگەڵ کردن و بە هێسانی لە هەڤدوو حاڵی دەبوون. پاشان سەربازەکە ڕووی لە من کرد و گوتی "پێم دەڵێن ئێوە سنوورتان بەزاندووە. ئەوانیش سەربازن، بەڵام ئەوان دەڵێن (پێشمەرگە) ". دوای ئاگادارییەکەی ئەوان، ئێمەش گەڕاینەوە دواوە.

ڕووداوەکە بۆ من، جەڕباندنێکی زۆر سەرسوڕهێنەر بوو. چونکە لە دوای بیستوحەفتەمین ڕۆژی مانگی پێنجی ساڵی ١٩٦٠، دەنگۆ و گەنگەشەیەکی زۆر لە تورکیا بڵاو دەکرایەوە لەسەر ئەوەی گوایە، کوردیش تورکن و زمانێك نییە بەناوی کوردی و، ئەوانە دەیانەوێت زمانی تورکی بشێوێنن، بۆیە بەو شێوازە دەپەیڤن؛ ئەگەر سەرنجیشیان لێ بدەی، دوو مرۆڤی دوو ناوچەی جیاوازی سەر دوو شاخ و داغ لەیەك تێناگەن. لە هەمووشی زیاتر، میدیای تورکی لەسەر ئەو پرسە پڕوپاگەندەیەکی فرە زۆری لەوبارەیەوە بڵاو دەکردەوە. سا ئەو بیروبۆچوونانە لە ناوەندەکانی ئەکادیمی و زانکۆش باوەڕیان پێدەکرا و دووبارە دەکراوە. بۆ پشتڕاستکردنەوەی دەنگۆکانیش دادگا و دامەزراوە یاساییەکان، لە ڕێگای دەرکردنی قانوونەوە دەنگۆکانی لای خەڵك بەهێزتر دەکرد. لە دوای بیستوحەفتەمین ڕۆژی مانگی پێنج، گۆڤاری (بارش

دوونیاسی) بڵاو کرایەوە. لەوێ هەم چەندان وتار باسی لە کورد دەکرد، هەمیش بڕیارەکانی نکۆڵی کردنی دادگای لەو بارەیەوە دەخستە بەرچاوی خوێنەران.

هەرچی لای ئێمە بوو، بویەرێکی جیاواز ڕوویدابوو؛ سەربازێکی خەڵکی ئارپاچای، لەگەڵ ئەو مرۆڤانەی ئەوێ زۆر بە هێسانی گفتگۆی کرد. چەند ڕۆژێك بەر لە ڕووداوەکە، هەستم بەوە کردبوو، خەڵکی گوندی ماڤانە، زۆر بە ئاسانی لەگەڵ خەڵکی ناوچەکانی ئەودیووی سنوور قسەیان دەکرد. ئەمەش دەرخەری پووچبوونەوەی ئەو بیرۆکە و دەنگۆیانە بوو کە لەلایەن میدیاوە بڵاو دەکرانەوە و لە ناوەندەکانی ئەکادیمی و زانکۆکان باوەڕیان پێدەکرا. ئاخر ناوچەی ئارپاچای قارس لە کوێ و، برادۆستی شەمزینان لەکوێ؟ ئەو دوو ناوچەیە نزیکەی ٦٠٠ کیلۆمەتر لە یەکدی دوورن؛ ڕەنگیشە ئەو ژمارەیە زۆر زیاتر بێت. بەو بۆنەیەوە هەستم بە بوونی پەیوەندییەکی دیکەش کرد لەوێ؛ بەوەی بینیم زمان و جل و بەرگ و پۆشاکی خەڵکی گوندی ماڤانە لەگەڵ خەڵکی ناوچەکانی ئەودیووی سنوور وەکوو یەکە. جوگرافیاش هەمان جوگرافیا بوو. سروشتیش هەمان ڕووەك و سەوزەی لێ شین دەبوو، هەردوو شوێن، هەمان ناوچە و پەناگە بوون لە دەڤەرەکە.

ئەوێ ڕۆژی، تایبەتمەندیەکی گرنگ فێربووم. بۆیە لەوێ دەمێ بەدواوە، بیر و بۆچوونم بۆ ڕووداو و پێشهاتەکان بە شێوەیەکی ڕیالیستانە لەژێر باندۆری بویەرەکەی ئەوێ ڕۆژێدا بوو.

## کڵێسا بێ جەماعەتەکانی ناوچەی خیزان و مۆتکی

لە نێوان ساڵانی ١٩٦٣-١٩٦٤ کاتێك جێگری ئەفسەری فەوجی هێزی پیادەی ٣٤ی بەدلیس بووم، لە ماوەی سەربازییەکەمدا، کۆتا ڕۆژەکانی هەفتە، لەگەڵ برادەران زوو زوو دەچووینە ناوچەکانی خیزان و مۆتکی و خێلات و تاتوان و چەند ناوچەیەکی دیکە... لەوێ هەندێکجار مەشقی سەربازی تەقەکردنیش ساز دەکرا. بە شێوەیەکی سروشتی بەشداری مەشقەکانیشم دەکرد. لەسەروبەندی ئەو سەردانەدا، چەندان کڵێسا و خانوو و شوێنی سووتێندراو و ڕووخێندراو و کەلاوەم، لە ناوچەکانی خیزان و مۆتکی و گوندەوارەکانی ناوچەکە دەبینی. بە تایبەتی لە لادێکانی ناوچەکە زیاتر شوێنەواری داڕوخێندراوم دەکەوتە بەر دیدە. لەو خانە کۆنە داڕمێندراوانە، ژێرخانەکانیشیان وێران کرابوون.

هەر لەوێ سەردەمێدا، گوێبیستی ئەوە بووم، لەو شوێنە ڕووخێندراوانە، کەسانێك بە دوای خەزێنەدا گەڕاون. جگە لەوەی، ئەوەشم دەهاتە بەر گوێ کە بەو هۆیەوە، بناغەی خانووەکانیان هەڵتەکاندووە و ژێر دارە بەتەمەنەکانی ناوچەکەشیان هەڵکۆڵیووە.

ئەو کوردانەی لە ناوچەکە دەژیان، لەوبارەیەوە خاوەنی زانیارییەکی زێدە نەبوون؛ یانیش نەیاندەویست لەوبارەیەوە زاریان بکەنەوە و شتێك بڵێن. بەشێك لەو بەردە گەورانەی بۆ

دروستکردنی ژێرخانی کڵێساکان بەکار هێندرابوون، دوای دەرهێنانیان، لە دروستکردنی ئاخوڕی حەیواناندا بەکارهێندرابوون.

"باشە ئەی جەماعەت و سەردانیکەرانی ئەو کڵێسایانە لە کوێن؟" بەر لە کردنی ئەو پرسیارە، سەرەتا پێویستیم بە کۆکردنەوەی زانیاری و زانین بوو، دواتر پرسیار کردن لەسەر دۆخەکە. کەچی لەوێ دەمێدا خاوەنی زانیاری نەبووم لەسەر ئەرمەنی و سووریانی و کلدانی و یەهوودییەکان.

لەلایەکی دیکەشەوە، کێ پارە و جەوهەری خۆی حەشارداوە؟ جا هیچ زانیارییەکم لەو بارەوەش نەبوو، ئەی ئاخۆ ئەوانە دواتر هاتوونە و پارە و جەوهەرەکانی خۆیان بردووەتەوە یان نا؟

ماوەیەکی زۆر دواتر زانیم، کڵێساکان، هی ئەرمەنی و ئاشوری و کلدانییەکان بووە. چونکە بیروبۆچوون و زانیارییەکانم سەبارەت بە ئەرمەنی و ئاشوری و کلادنی و یەهوودی و ڕۆمەکان لە دوای ساڵی ١٩٧٣ دەستی پێکرد.

لە هاوینی ساڵی ١٩٦٣، لەگەڵ یەکینەیەکی فەوجەکەم، چووینە ناوچەکانی وان و پایزاڤا و ئەلباك و گەڤەڕ و گوندەواریەکانی شەمزینان. لەوێ چەندان کڵێسا و سیناگۆری سووتێندراو و ڕووخێندراوم بە کەلاوەیی بینی. بەڵام زۆر دواتر زانیم، کڵێساکان تایبەت بوون بە ئەرمەنیی و سووریانی و کلدانییەکان. سینگۆرەکانیش هی یەهوودییەکان بوونە.

لە ناوچەی یوسوف ئەلی ئارتڤینیش[1] چەندان کڵێسام بینی، وەلێ ئەوان هی جۆرجییەکان بوون. کڵێساکان زۆر بەباشی تا ئەوساش لەسەر پێی خۆیان مابوونەوە. وەلێ لەبەر ئەوەی کەسی بۆ نەدەچوو، وەکو کڵێسا بەکار نەدەهێندرا و چەند بەشێکی لەلایەن شوانەکانەوە وەك ئاخوورِی مەرومالاّت سوودی لێ دەبیندرا.

## کورد و سنوور - ئاوارەکانی ماڤانە

لەگەڵ ئەوەی یەکینەکەی من لە بەدلیس بوو، لێ لە مانگی حەفتی ساڵی ١٩٦٣ لە شەمزینان، لە خاڵی سفرِی سەر سنوور، ماوەی سەربازییم بە جێ دەهێنا. ئەو یەکینەیەی لێی بووم، بە تێپەرِینی ناوچەکانی بەنەڤیك و بەسوسین و زەری و ماڤان، دەچووە گوندی رِووبارۆك. ماڤانیش گوندێکی زۆر نزیکی سەر سنوور بوو. کاتێك لەوێ بووم، رِۆژێك هەستم بەوە کرد، لە پێدەشتێکی تەختی ماڤانە، دەستەیەکی قەرەباڵغ لەوێ، هەوڵی هەڵدانی چادر دەدەن بۆ نیشتەجێبوون. دەگوترا دەستەکە عەشیرەتێکن، لەلایەن کۆمەڵێك چەتە و رِێگرەوە بەرەو ناوچەکانی سنوور بە زۆر لێکردن پاڵیان پێوە دەنێن.

لەوێ سەردەمێدا، رِادیۆی بەغدا، رِۆژانە لە کاتێکی دیاریکراو، ١٥ خولەك پەخشی بە تورکمانی بلاّو دەکردەوە. لەوان پەخشاندا، زانیاریان لەسەر هەندێك لە رِووداو و پێشهاتەکانی

---

[1] یەکێکە لە شارەکانی هەرێمی دەریای رەش لە تورکیا (وەرگێر).

باشوور بۆ گوێگرانیان دەگواستەوە. لە هەواڵەکانی ڕادیۆکەدا مەلا مستەفا بارزانی بە (ئەشقیا و ناپاك و سەرگەردان و سیخوڕی ئەمپریالیزم لە قەڵەم دەدرا).

لە هەمان سەردەمدا، عەشیرەتی برادۆست، دژی عەشیرەتی بارزان و ئەو عەشیرەتانەی لە ڕیزی مەلا مستەفا بارزانی بوون دژی سوپای عێراق، لە بەرەدا بوون. واتە عەشیرەتی برادۆست، بەو هێزەی لە حکوومەتی بەغدای وەرگرتبوو، دژی مەلا مستەفا و عەشیرەتی بارزان شەڕی دەکرد. هەوڵی سووتاندنی گوندەکانی بارزانی دەدا. سەبارەت بەو پێکدادانە، زانیاری زۆر و زەوەند لە ڕادیۆی بەغدای بەشی تورکمانی بڵاو دەکرایەوە.

لە تورکیای وێ سەردەمێدا، بۆچوونی گەلێك نییە بە ناوی کورد و زمانێك نیە بەناوی کوردی، پشتگیری زۆری هەبوو و بۆ ئەمەش گەلێك گفتوگۆی لەبارەوە دەکرا. بیرۆکراتەکانی دەوڵەت، لە پاڵ ئەوانەی ناو سوپا، لە پاڵ ئەوانیش میدیا و زانینگە و دادگاکان، وەکوو ژێرخانی دام و دەزگاکانی وڵات، پشتگیریەکی کوێرانەیان لەو بۆچوونە دەکرد. وەلێ شەقێکی گەورە لە نێوان، زانیارییە ڕاستییەکان و ئەو بۆچوونانە هەبوو، کە دژ بە یەك بوونی دەردەخست. منیش لای خۆمەوە هەوڵی ئەوەم دەدا، بتوانم گرێکوێرەی ئەو دژ بەیەکییە بکەمەوە. بۆ ئەمەش بەردەوام لەگەڵ ناوەوەی خۆمدا لە وتوویژ و حیساب و کیتابدا بووم. واتە ئەو مژارە لە ڕادیۆی بەغدای بەشی تورکمانیەکەش، بە ئاشکرا هەستی پێدەکرا. لەوێ هەست بەوە دەکرا کە برادۆستییەکان و بارزانییەکان هەمان نەتەوە و خەڵکی سەر بە دوو دەستەی جیان.

لەنــاو ئەو هەواڵ و بــویەرانەدا، هێرشــی بارزانییەکــان دژی برادۆستیەکان زیاتر ببوو. چونکە ئەوانیان تا سەر سنوور ڕاوەدوو نـابوو. برادۆسـتیەکانیش لەنـاوچەی نێـوان ڕووبـارۆك و ماڤـانە، لە دەڤەری گەردییــان، بەرەو تورکیــا کۆچیــان کردبــوو. لەنێــوان ئاوارەکانـدا، دەگوترا کە شێخ ڕەشـیدیش[1] هەیە. شێخ ڕەشـید بە هەلیکۆپتەرێك بردرایە وان و لەوێشەوە بە هەلیکۆپتەرێکی دیکە گەیاندرایە ئەنقەرە.

ئاوارەکـان لەنـاو کـار و کردەوەیەکـی تـژی وزەی گەرموگـوڕ بوون. پیاوەکان هەوڵی هەڵدانی چادریان دەدا، چەند ئافرەتێکیش دوو سێ بەردیان دۆزیبۆوە و سێڵیان لەسەر دانابوو. چەند ژنێکی دیکەش لەسەر چەند بەردێکی دیکە، مەنجەڵیان بەسەر ئاگرەوە نابوو. لەولاوە، لەناو تەشتێکی فافۆنی گەورە، ئافرەتێك هەویری دەشێلا. لەلایەکی دیکە، خاتوونێ لەناو سەتڵێکی گەورە سەرقاڵی شوشتنی منداڵێك بوو. کچە جحێڵەکانیش، بە پەقرەجی جیا جیا،

[1] ڕەشـید مـحەمەد شـەریف (١٨٨٢-١٩٦٤) یەکـێکە لە شـێخەکانی عەشـیرەتی برادۆست. شێخ ڕەشید لۆلانی لەسەرەتای تەمەنیدا بۆ خوێندن چووە بۆ ئێران و دواتر گەڕاوەتە بۆ گوندی لۆلان لەدەڤەری برادۆست. سـاڵی ١٩٢٠، لە گونـدی شۆشنەیی گەلیی خواکورك، تەکیەی دامەزراندووە. لە تەکیەی تایبەتی وانەی بە فێرخـوازانی وتـوەتەوە و بـوون بە سۆفی. سـاڵی ١٩٥٩، دەچێـتە تورکیـا و چەنـد ساڵێك دواتر، بەهۆی ناهەمواری باری سیاسی ناوچەکە دەگەڕێتەوە عیراق ودێتە هەولێر و لەگەڕەکـی ئیسـکان و باداوە نیشـتەجێ دەبێت. شـێخ ڕەشـید لۆلانی لە شـاری هەولێر کۆچی دوایـی کـردووە و لەسـەر داوای سـەرۆککۆماری ئەوکـاتی عێراق، لە شـاری موسڵ لە نزیـک گۆڕی نەبـی یونس نێژرا. لە ڕێکەوتـی ٢٤ی مـانگی ٧ی ٢٠١٤ لەگەڵ کـۆمەڵێکی تـر لە شـوێنەوار و مەزارەکـانی نـاوچەکە، لەلایەن چەکدارانی داعشەوە مەزارەکەی ئەویش تەقێندراوەتەوە. (وەرگێڕ).

خەریکــی هێنــانی ئــاو بــوون لە کــانی و ســەرچاوەکانی ئــاوی ناوچەکە. هەرچی پیرێژنەکان بوون، ڕێگایان بە کچە عازەب و ئافرەتە گەنجەکان نیشان دەدا، تا لەو کارە وا بکەن و لەوەی دیکە وەهالە. ئەوان سەرقاڵی ئاراستەکردنی ژنەکانی ئەوێ بوون یانی.

ئاوارەکــان لەگەڵ خۆیــان، مەڕ و مــاڵات و هێســتر و کەر و سەگ و پسیکەکانی خۆشیان هێنابوو. زارۆکەکان بە دوای مەڕ و بزن و سەگەکان دەکەوتن و، هەریەکە و بۆ لایەك ڕاویان دەنان. واتە هەرکەسە و لای خۆ، خەریکی کەدێك بوو. چ بێزاری و بێ هیوایی لە ڕوویاندا نەدەبیندرا. هەروەهـا هەستی خۆ بە بێگـانە زانینیشیان لا نەبوو. هیچ هێمایەکی نا ئارامیش لە چاویاندا بەدی نەدەکرا. واتە ئەو ئارامی و ڕەحەتییەی لەو ئاوارانە هەبوو، زۆر جێگای سەرنج بوو، ئەمە دۆخێکی زۆر گرنگ بوو بەلامەوە.

ڕێگا نەدەدرا بە گوندنیشانی ماڤان و ڕووبارۆك، تا پەیوەندی و ئاخــافتن لەگەڵ ئاوارەکــان بــکەن. وەلــێ هەردوو لا زۆر لە نزیکەوە یەکدییان دەناسی. بەهەمان زمان دەدوان، وەك چۆن جل و بەرگیشیان هەمان دەستوور بوو.

ئاوارەکان چەند مانگێك لەوێ مانەوە، دواتر لە ڕێگای شاری گیرگــێ ئــامۆ ڕادەســتی حکــوومەتی عێراقــی کــرانەوە. ئەوان دەستەیێکی نزیك و دۆستی بەغدا بوون.

ئیسماعیل بێشکچی بە گەنجی

لە ڕاستەوە: ئەندامێکی عەشیرەتی ئالیکان و حاجی گەرەڤان و
ئیسماعیل بێشکچی، لە زۆزانەکانی (سوتە) ساڵی ١٩٦٦

# بەشی دووەم
# توێژینەوە بەرابیەکان و واقوڕمانەکانی سەرەتا

## عەشیرەتی گۆچەبە ئالیکان

له مانگی چواری ساڵی ١٩٦٣، وەك لەسەرەوە باسم کرد، لەو ناوچەیەی لێی بووین، بەردەوام بووم لەسەر جێبەجێکردنی ماوەی سەربازیم. ڕێگای نێوان بەدلیس و تاتوان، بەناو فەوجەکەی ئێمەوە تێپەڕ دەبوو. ڕۆژێك، لەگەڵ سۆری سبەینێ، بینیم دەستەیێك ڕەوەندی زۆر قەرەباڵغ، بەرەو تاتوان ڕێدەکەن. ئەوان ئافرەت و پیاو و گەنج و پیر و ماڵ و منداڵیشیان لەگەڵدا بوو. ژمارەیان ئێجگار زێدە بوو؛ جگە لەمە، مێگەلێك مەڕ و ماڵاتیشیان بە پێش خۆیان خستبوو. بار و بارگەشیان لە هێستر و بارگینان بار کردبوو. لەسەر یاتاغ و ماڵە بارکراوەکانی سەر هێسترەکانیش، زارۆکی بچووك و، کار و بەرخی تازە زاو دەبیندرا؛ چەند ئیختیارێکی ناو ڕەوەندەکەش، بە گۆپاڵەکانی دەستیانەوە، حەچەیان لەو گوێدرێژانە دەکرد، کە سواری سەر پشتیان ببوون. ساتێ ڕەوەندەکان بەناو فەوجەکەمان تێپەڕ دەبوون، بینیم بە ئاگاداری فەرماندەکانیان، چەند سەربازێکمان دوو سێ مەڕیان لە مێگەلەکە دابڕی و بۆ سەرِ بڕین دزییان. شوانەکان، ئاگایان لە کارەکە بوو، وەلێ هیچ دەنگیان نەکرد و خۆیان لێ گێل کردن...

بیرۆکەی بنکۆڵیکردنی ژیانی ئەو ڕەوەند و کۆچەرییانە، بە ڕێگای توێژینەوەی زانستی، لەوێ ڕۆژێوە کەوتە کەلەم. تێزی بەدەستهێنانی بڕوانامەی دکتۆراکەشم، ئیدی لە ڕووداوەکەی وێ ڕۆژێوە سەرچاوەی گرت.

دوای ئەوەی لە ساڵی ١٩٦٤، ماوەی خزمەتی سەربازییم تەواو کرد؛ لە قەزای هۆزاتی سەر بە شاری دێرسیم، کاتێك فەرمانبەر بووم وەك جێگری بەڕێوەبەر؛ تاقیکردنەوەی کۆلێژی ئادابی زانکۆی ئەتاتورکم لە ئەرزەرووم بە سەرکەوتوویی تێپەڕاندوو و، لەبەشی کۆمەڵناسی، وەك مامۆستای یاریدەدەر دامەزرام. دوای ئەوەی دەستم بە دەوامی فەرمی زانکۆ کرد، بۆ نووسینی تێزی دکتۆراکەم، بۆ کۆ کردنەوەی زانیاری، قۆڵ و باسکم، بۆ سازکردنی لێکۆڵینەوەی مەیدانی هەڵکرد. بۆ ئەوەش نزیکەی دوو ساڵ چاودێری ژیانی ڕەوەندەکانم کرد و بەشدار بووم لە کۆچکردنەکانیان لە شوێنێکەوە بۆ دەرێکی دیکە. لە ئەنجامدا لەژێر ناونیشانی (ڕێکخستنە کۆمەڵایەتییەکانی عەشیرەتێکی ڕەوەند، لە زستانی پێدەشتەکانی سیلڤان و هاوینی زۆزانەکانی نەمروت). توێژینەوەکەم پێشکەشی سەرۆکایەتی زانکۆکەم کرد. لێکۆڵینەوەکە بەسەرکەوتوویی لە ساڵی ١٩٦٩ لە دوو توێی پەرتووکێکدا، بە ناونیشانی (گۆڕانکاریەکانی ڕۆژهەڵات و کێشە بنچینەیەکانی – عەشیرەتی ئالیکانی ڕەوەندی) لەلایەن، دەزگای بڵاوکردنەوەی دۆغان چاپ و بڵاو کرایەوە.

شوێنی مەیدانی لێکۆڵینەوەکەش لە هاوینی ١٩٦٨ هەریەکە لە ناوچەکانی کیلیس و نسێبین و جزیرێ و شەمزینان و ئەلباك و

بازیـد و دوخـورِ بـوو. وەك لە پەرتـووکەکەش بە وردی بـاس دەکرێـت، لێکـۆڵینەوەکە زۆر بە ئاریشـە گەیشـتە ئەنجـام. هۆکـارە بنچینەیەکانیشـی بـۆ ئەو کـاردانەوەیە دەگەڕێـتەوە کە لە دوو سـەردەمدا لە هەمبەر ئایـدۆلۆژیای فەرمـی ڕوویانـدا. لە سـەردەمی ئەنجامـدانی تـوێژینەوەکە لەسـەر عەشـیرەتی ئالیکـان، کە لە ناوەڕاسـتی سـاڵی ١٩٦٠ بـوو؛ دەورانێـك دەگـوزەرا کە هـیچ بۆچوونێك گەرای نەکردبوو لە هەمبەر ڕەخنەگرتن لە ئایدۆلۆژیای فەرمـی؛ یـانیش ڕاسـتتر بڵێـین، لەوێ دەمێـدا وەسـتانەوە بەرامـبەر بۆچوونی فەرمی بوونی نەبوو. چەکەرەکردنی هزری دژ بە هێڵی فەرمی لە نێوان ساڵانی ١٩٦٧-١٩٦٨ دەستی پێ کرد.

لە ڕووی هـزر و بۆچـوونەوە، نـاوەڕۆکی ئەو پەرتـووك و نووسـینانەی بەر لە سـاڵی ١٩٧٠ دەردەچـوون، بەراورد بە بڵاوکراوەکـانی دوای ١٩٧٥ گـۆڕانێکی گرنـگ دەبینـدرا. هۆکـاری بنچینەییی ئەوەش، بۆ ئەو بەرگریکـردن و سکاڵانامانە دەگەڕێتەوە لە دۆسیەی دادگـایی کردنەکـانی سـاڵی ١٩٧١ لە دادگـای دۆخـی لەناکـاوی سـەربازی دیـاربەکر. ڕەخنەگـرتن لە بۆچـوونی فەرمـی لەوێ سەردەمێوە نەشونمای کرد.

## پێکدادانی نێوان ڕەوەندییەکان و لادێنشینەکان - "توێژەر" و "مرۆڤ"

لە مانگەکانی هاوینی ساڵی ١٩٦٥، مژوولی کارکردن بووم لەگەڵ عەشیرەتی ئالیکانی کۆچبەر. لەوێ دەمێدا عەشیرەتی ئالیکان، لە زۆزانەکانی سوتە بوون، لە باکووری ناوچەکانی خێلات-ئادیل جەڤیز. کوێستانی سوتە کەوتبووە سێگۆشەی ناوچەکانی خێلات – ئەلجەواز - مەلەزگرت، نزیك لە دەریاچەی وان.

گوندەوارییەکانی ناوچەی ئەلجەواز، زۆر بە گلەیی و گازاندە بوون لە عەشیرەتی ئالیکانی ڕەوەندنشین. "مێگەلی ڕەوەندەکان، دێنە ناو بیستان و شینایی و ڕەز و باخەکانمان، بەروبوومەکانمان دەخۆن و ئەوانی دیکەش دەقڵیشێننەوە" لادێنشینەکان ئاوا دەردی دڵی خۆیان بەیان دەکرد. لە هەمبەرئەم پێشهاتەش، خەڵکی ناوچەکە، زوو زوو، وەکوو تۆڵەکردنەوەیەك، چەند سەر مەڕێکیان دەگرت و لای خۆیان گلیان دەدانەوە...

لە مانگی حەفتی ساڵی ١٩٦٥، هەمدیسان بوویەرێکی وەها ڕووی دا، کاتێك بەشێك لە مێگەلی مەڕەکانی ڕەوەندییەکان، ملیان نابووە ناو بیستان و شینایی گوند نشینەکانی ناوچەکە. وەلێ شوانەکە، چاپووك، بەر لەوەی مێگەلەکەی زەرەر و زیانێکی زۆر بە ڕەز و باخەکە بدات، مەڕەکانی لەوێ دوور خستبۆوە. واتە بە جۆرێك لە جۆرەکان، توانیبووی دۆخەکە بخاتەوە ژێر ڕکێفی

خۆی. لێ بەرامبەر بەم پێشهاتە، گوند نشینەکان، وەك قەرەبووی زیانەکانیان، دەستیان بەسەر ٤٠ سەر مەڕدا گرتبوو و لەگەڵ خۆیان بردبوویانن. ئەمەش ببووە هۆی ئەوەی پرسگرێکێك لە نێوان ڕەوەندییەکان و گوندەوارییەکانی ناوچەی ئەلجەواز بخولقێنێ.

کاتێك شوانەکە ئەو هەواڵەی گەیاندە چادرەکانیان، لەناو ڕەوەندییەکان جولاّنەوە و مقۆمقۆ چێبوو. لە هیکرا، گەورە و بچووك و ژن و پیاو، دەستیان دا دار و قازمە و، ڕاستەپێ بەرەو شوێنی ڕووداوەکە کەوتنەڕێ. لە ڕێگا بە ڕاکەڕاك، هەر زوو خۆیان گەیاندە شوێنی مەبەست. لەگەڵ دوو مامۆستای ناوچەکە، لە پاڵ چەند ڕیش سپیێکی عەشیرەتەکە، ئێمەش چووینە ئەوێ.

کاتێك گەیشتینە شوێنی ڕووداوەکە، ئەندامانی عەشیرەتی ئالیکانی ڕەوەند، لەگەڵ گوند نشینەکان، دەمەوەرییان دەکرد. لەگەڵ مامۆستاکان، چووینە لای ئەوانەی دەمەقالێیان بوو. گوند نشینەکان باسی ئەو زیانانەیان دەگێڕایەوە، کە کشتوکاڵەکانیان، بە هۆی مێگەلی مەڕی ڕەوەندییەکانەوە بەسەری هاتبوو. ڕەوەندییەکانیش خەریکی ئەوەبوون، تا ئەوە بە لایەنی بەرامبەر بڵێن، چەند لە هەوڵ و تەقەلای ئەوەدانە، تا مەڕ و مالاّتەکانیان، زیان بە باخ و بیستانی ئەوان نەگەیەنێت. لەو سەروبەندەدا، منیش لە هەوڵی گوتنی ئەوەدابووم بڵێم، دەست بەسەرداگرتنی ٤٠ سەر مەڕ، بەرامبەر بە خراپ کردنی کشتوکاڵی لادێنشینەکان، کارێکی هەڵەیە. گوندنشینێکی حەیزەران بەدەست لێم ڕاست بۆوە و گوتی "تۆ بۆ خۆت لە بابەتەکە هەڵدەقورتێنی؟ ئەسڵەن تۆ کێی؟". جا کابرا قسەکانی هێشتا تەواو نەکردبوو، کەوتە دارکاریکردنم. دوای ئەوە، عەشیرەتی ئالیکان، بەرامبەر بە گوندنشینەکان زۆر

زیاتر و فراوانتر دەستیان بە هێرشکردن و وەڵامدانەوەیان کرد. بووە شەڕە بەرد و دار، تا گەیشتە ئاستی بەکارهێنانی چەکیش.

لەوێ دەمێدا، لە باخەڵی دواوەی بانتۆڵەکەم، ئاوێنەیەکی خڕی بچووکم لەگەڵ خۆم دەگێڕا. دوای ئەوەی بە دار زۆرم پێکەوت، ئاوێنەکە لە گیرفانمدا شکا و لە برین و ژانی کوتکەکان زیاتر، پارچە ورد و خاش بووەکانی ئاوێنەکە، زیانێکی زیاتری بە جەستەم گەیاند.

نزیکەی نیو دەمژمێر، لەوێ کەس نەبووە برای کەس، هەر لایە و بابا بوو، لەوەی بەرامبەرە خۆی دەوەشاند. وەلێ لە کۆتایدا توانیمان ناوبژی لە نێوان ڕەوەندییەکان و گوندنشینەکان بکەین و دۆخەکە هێور بکەینەوە.

* * *

ئەو دیاردەیە هەندێکجار، لە نێوان کۆمەڵناسان ببووە بابەتی ڕەخنەیان و دەیانگوت "توێژەر تەنیا چاودێری ڕووداو و پێشهاتەکان دەکا و ئەوە ڕاست نییە کە لێکۆڵینڤانێك خۆی بخاتە ناو ئاڕاستەی تەوژمی بویەرێکەوە". لە ڕاستیشدا بەشێکی ڕەخنەکە ڕاست و حەقە؛ وەلێ شتێکیش هەیە کە لە مەیداندا دەگوزەرێ. چونکە لە ساتەوەختی ئەنجامدانی توێژینەوەدا، هەندێك ڕووداو و پێشهات هەیە کە پێویست دەکات خاڵێك بۆ ناحەقییەکانی دابنێین. بۆیە لەوەها بار و حاڵێکدا، توێژەر هەندێك جار ناتوانێ تەنیا بینەری ڕووداوەکە بێ، بۆ ئەوەی بیر لەوە بکاتەوە، دەبێ بۆ کارەکەی چۆن و لە کوێی پێشهاتەکە بوەستێ.

## ڕێگریکردنی توێژینەوە
## (زانکۆ - فەرماندەیی سڤیل - هاوکارانی پۆلیس)

لە مانگەکانی هاڤینی ساڵی ١٩٦٨، لە قەزا و ناحییە و شارۆچکەکانی دەڤەری ڕۆژهەڵات و باشووری ڕۆژهەڵات و ئەنادۆڵوو، پلانمان دانا بە مەبەستی توێژینەوە لە بارەی (لێکۆڵینەوەی بەراوردکاری ژێرخانی کۆمەڵناسی ئابووری – سۆسیۆ ئیکۆنۆمی). ئەو ڕووپەلەی بۆ ڕاپرسی ئامادەمان کردبوو، لە ناوچەکانی کیلیس و نسێبین و جزیرێ و شەمزینان و ئەلباك و بازید و دوخوڕ بڵاومان کردەوە، چونکە ئەو ناوچانە، نموونەی هەڵبژێردراوی بەشی مەیدانی لێکۆڵینەوەکەمان بوون. بە لەبەرچاوگرتنی جیاوازی کەش و هەوای دەڤەرەکانی ڕۆژهەڵات و باشووری ڕۆژهەڵات و باکووری ڕۆژهەڵات، بە تایبەتیش بۆ خۆ پاراستن لە تینی گەرما، ڕاپرسیەکەمان لە کیلیسەوە دەستپێکرد و بە ڕیزبەندی یەك لە دوای یەك بەرەو ناوچەکانی دیکە هەنگاومان نا. وەلێ لە ماوەی توێژینەوەکەدا، چەندان هەڕەشە و پێشگیری و کێشەمان هاتە ڕێگا، کە بە خەون و خەیاڵی کەسدا نەدەهات. لێرەوە دەتوانم ئەوەتان بە پوختی بۆ باسکەم، کە لەسەرەتاوە تا کۆتایی چیمان بەسەرهات و ڕووبەڕووی چی بووینەوە.

## کۆلێژ، وەك یەکەم لەمپەری بەردەم توێژینەوەکە

لەسەرەتای لێکۆڵینەوەکە، بەر لەوەی بچینە دەرەوەی حەرەمی زانینگەکەمان، کۆلێژی ئادابی زانکۆی ئەتاتورك، وەك ڕێگرێك لەبەردەم کارەکەمان خۆیان قوت کردەوە. بە بێ ئەوەی هیچ هۆکارێکمان پێ بێژن، یان بەڵگەیەك بخەنە بەرچاومان، بە میجازێکی کەسی، باسیان لەوە کرد، پرۆژەکە کارێکی زانستی نییە و دژی بەرژەوەندیەکانی دەوڵەتە. بۆیە بە بێ هیچ بێنە و بەردەیەك توێژینەوەکەیان ڕەتکردینەوە.

دوای تێپەڕینی ماوەیەك بەسەر پێشهاتەکە، لە زانکۆ هەمان پرۆژەمان پێشکەشی هەمان لایەن کردەوە. دیسان دەستمان بە بەرگری کردن کردەوە لە لێکۆڵینەوەکەمان. خۆشبەختانە ئەو جارەیان پەسند کرا. لە کاتێکدا پرۆژەکە، بە زانیاری و ڕەزامەندی و هاوکاری کۆلێژی زانستە سیاسییەکانەوە ئامادە کرابوو. وەلێ لە تایبەتمەندییە زانستییەکاندا بە هەستیارییەوە زۆر پێداگیری لەسەر ئەوە کرابوو "ئەو پیاوە، دوای کۆکردنەوەی زانیاری لەبارەی دۆخی ژێرخانی ئابووری و کۆمەڵایەتی کیلیس و نسێبین و جزیرێ و شەمزینان و ئەلباك و بازید، دواتر لە دوخور بە ڕووسەکانی دەفرۆشێتەوە. بۆیە ڕێگریکردن لە دەستپێکردنی ئەو توێژینەوەیە، ئەرکێکی زانستییە. لە پاڵ ئەمە، ئاگادارکردنەوە و هەواڵ پێدان بە پۆلیس، ئەرکێکی نیشتیمانی سەرشانمانە". دوای ئەو زمان لێدان و تۆمەتبار کردنە، لێژنەی

زانستی کۆلێژی ئەدەبیاتی زانکۆی ئەتاتورك، بە بێ دوودڵی ئەو تۆمەتانەی زیاتر بردە پێشەوە. ئەو ڕووداوانەی لە خوارەوە بۆتان باس دەکەم، پەیوەندییەکی پتەوی بەو زمان لێدانەوە هەیە.

ئەو پێشگیرییەی، بۆ ئەنجامدانی ئەو توێژینەوەیە دەکرا لە کۆلێژی ئەدەبیاتی زانکۆی ئەتاتورك، لە ڕق و کێشەیەکی تایبەتی و کەسی زیاتر هیچی دیکە نەبوو. هۆکاری ئەمەش بۆ ئەو لێکۆڵینەوانە دەگەڕاوە تا ئەوسا کردبووم و بڵاوم کردبۆوە، کە ببووە هۆی ئەوەی بەرپرسانی کۆلێژ و هەندێك کەسی دیکەی ناو زانکۆ پێی جاڕس بن. ئەوان لە بری ئەوەی بە شێوەیەکی زانستی بێن و ڕەخنە لەو توێژینەوانە بگرن، کە بڵاو کرابوونەوە، دەستیان دابووە هەوڵی وەدەرنانم لە زانکۆ، کەبە هەموو شێوەیەك دژ بە ماددەی ١٢٠ی یاسای زانکۆی ژمارە ٤٩٣٦، کە لە دەستووری تورکیادا هاتووە. بەڵام ئەوان لەو بارەیەوە دۆسیەیان لە هەمبەر کردبوومەوە لە دادگا. دەیانویست بەوێ شێوەیێ، داخی دڵی خۆیان دابمرکێننەوە. ئیدی بە بێ ئەوەی هیچ ڕوونکردنەوەیەکی لە بارەوە بدەن، پرۆژەکەیان ڕەتکردبۆوە. لێ، سەرباری هەڵوێستی نەرێنی ڕاگری کۆلێژی ئەدەبیات و لیژنە زانستییەکەی، بەڵام سەرۆکی زانکۆکەمان، بە ئەرێنی لە پرۆژەکەی ڕوانی. بۆیە لە نامەیەکدا کە ئاراستەی پارێزگای هەریەکە لە شارەکانی عەنتاب و مێردین و جۆلەمێرگ و وان و ئاگری و قارسی کردبوو، داوای هاوکاری و ئاسانکاری کردبوو بۆمان. لە نووسراوە ئاراستەکراوەکەیدا بۆ پارێزگاری ئەو شارانەی لەسەرەوە ناوم هێنان، پرۆفیسۆر دکتۆر ڕەشید سۆنبەڕوو، سەرۆکی زانکۆی ئەتاتورك لە نێوان سالانی ١٩٦٧-١٩٦٩ بەو شێوەیە داوای کارئاسانی بۆ کردبووین:

"دکتۆر ئیسماعیل بێشکچی، مامۆستای یاردەدەر لە کۆلێژی ئەدەبیاتی زانکۆکەمان، توێژینەوەیەك دەکات لە ژێر ناونیشانی (لێکۆڵینەوەی بەراوردکاری ژێرخانی کۆمەڵناسی ئابووری – سۆسیۆ ئیکۆنۆمی) لە شارۆچکەکانی نزیك سنوور. بەشی مەیدانی لێکۆڵینەوەکەی لە نێوان ١٣-٧-١٩٦٨ تاوەکوو ١٧-٩-١٩٦٨ لە گوندەوار و شارۆچکەکانی کیلیس و نسێبین و گریکێ عەمۆ و شەمزینان و ئەلباك و بازید و دوخورِ دەبێ. لەپاڵ ئەو، دوو قوتابیش هاوکاری ئەنجامدانی توێژینەوەکەی دەکەن. بۆیە تکاتان لێدەکەم هەموو جۆرە هاوکارییەکی ماددی و مەعنەوی بۆ دکتۆر ئیسماعیل بێشکچی فەراهەم بکەن".

ئەو نووسراوەی سەرۆکی زانکۆ، بۆ پارێزگارەکانی ناردبوو، کۆپییەکیشی لای ئێمە بوو. ئێمەش وامان بیرکردەوە، کە لە ڕێگای ئەو نووسراوەوە، کاتێك دەچینە پارێزگای ئەو شارانە، ئەوانیش بە پشتبەستن بە نامەکە ئاسانکاریمان بۆ دەکەن و بەرەو قایمقامی شارەدێیەکان دەماننێرن و لەوێشەوە قائیمقامەکان لەسەر بنەمای نووسراوەکە، ئاگاداری موختاری لادێکان دەکەنەوە تا کار ئاسانی تەواومان بۆ بکەن. وەلێ ئەوەی لە خوارەوە بۆتان باسدەکەم، بە پێچەوانەی بیرکردنەوەکانی ئێمە بوو، هەروەها دژی ئەو پلانەش بوو کە پێشتر دامان نابوو بۆ ڕێڕەوی ئەنجامدانی کارەکە. بەرپرسانی کۆلێژی زانکۆ، لە چەند بەیانێکدا ئێمەیان بە هەڵە لە بەرپرسی کارگێڕی شار و شارۆچکەکانی مەیدانی توێژینەوەکەمان گەیاندبوو، بەو هۆیەشەوە، لە کاتی کارکردندا چەندان ڕووداوی نەخوازراوە و چاوەڕوان نەکراو ڕووبەڕوومان بۆوە. لە خوارەوە بە چەند خاڵێك دەمەوێ باسی بکەم:

١- لە توێژینەوە مەیدانییەکەدا، هەریەکە لە ئەحمەد ئاراس و جاوید گۆك تورك هاوکارییان دەکردم، ئەوان دوو قوتابی بەشی کارگێڕی بوون لە زانکۆکەمان.

٢- لە بەرواری ١٣-٧-١٩٦٨ لە شـــارۆچکەی کیلیســـەوە دەستمان بە ئەنجامدانی توێژینەوەکە کرد. لە عەنتاب، سەرۆکی پارتی کرێکارانی تورکیای ئەو شارە، کاك ڕەشیدی بە ڕەگەز کورد زۆر هاوکاری کردین. ئەو ڕاپرسییەی پێشتر ئامادەمان کردبـــوو، لە لادێکـــانی شـــارۆچکەی کیلـــیس و ناوچەکـــانی دەوروبەری قەرەقۆلی دەرگای سنووری ئۆنجوو پنار بلاومان کردەوە. لە عەنتاب و کیلیس هیچ کێشە و تاسەیەکمان نەهاتە پێش. پارێزگاری ئەوسای عەنتاب، خەیرەدین ئەرسۆز بوو. لە کیلیسیش لە میوانخانەی قایمقامیەتی شارە دێیەکە ماینەوە.

٣- لە دوای کیلیس، بڕیار بوو بچینە قەزای نسێبینی سەر بە شـاری مێـردین. لە عەنتـابەوە بە شـەمەندەفەر بەرەو ئـاقچەکەلە چـووین و لەوێشـــەوە بەرەو ڕوهـــا. هێلـــی شـــەمەندەفەر لەوێ ناوچەیەدا، بە هاو تەریبی سنووری نێوان سووریا و تورکیا درێژ دەبێتەوە. دوای ئەوەی پشوویەکی کورتمان لە ڕوها دا، دوای تێپەڕینی وێران شار، گەیشتینە مێردین.

٤- لەوێ لەگەڵ نیهـات ئۆغوزبـۆڕی پارێزگـاری مێـردین هەڤدوومان بینی. لە دانیشتنەکەدا پارێزگار ئەمانەی بە ئێمە گوت "دانیشتوانی ناوچەکە بە کوردی قسە دەکەن. هەروەها ناوچەکە لە ڕووی جوگرافییەوە لە بارزانی نزیکە، بۆیە دەڤەرێکی گەلەك هەستیارە و توێژینەوەی کۆمەڵایەتی لێرە زۆر مەترسیدارە". بەو

ئاخافتنەی کردی، پارێزگار ویستی ئەوەی پیشان داین، دەتوانێ ڕێ بە جوڵانەوە و کارەکانمان بگرێ. وەك ئەوەی چووبێتە ناو تاقیکردنەوە، یەك بەیەك لەو پرسیارانە ورد بۆوە کەلەسەر ڕاپرسییەکەمان نووسیبوومان. لە دوای ئێمەشەوە، لە ڕێگای تەلەفۆنەوە فەرمانی بە قائیمقامەکان کرد، تا لە ناحیە و لادێکان چاویان لەسەر ئێمە بێ و لە ژێر ڕکێفی ئەوان دەرنەچین. وەلێ دواتر بە ڕوون و ئاشکرایی بۆمان دەرکەوت، پارێزگار تەقەلای ئەوەی داوە ڕێگری لەبەردەم ئەنجامدانی توێژینەوەکەمان بکات. ئەمەش کاتێك دەرکەوت کە لە گوندی بوجاکی سەر بە نسێبین بووین. لە بەڕێوەبەرایەتی موختاری لادێکە لەگەڵ گوند نشینێك قسەمان دەکرد، جگە لەو لادێ نشینانەی لەگەڵیان دەدواین، چەند کەسێکی دیکەی خەڵکی ناوچەکەشی لێ بوو. لەبەر ئەوەی ئەو کەسەی لەگەڵی دەدواین تورکی دەزانی، بۆیە بە تورکی گفتوگۆکەمان کرد. لەوێ سەروبەندێدا، موختاری بوجاك بە کوردی ئەو چەند ڕستەیەی گوت "زۆر ڕوو بەوانە مەدەن. چونکە سیخوڕن. بۆ ئەوەش فەرمانمان لە پارێزگار و قائیمقام بۆ هاتووە. من ئەوانەم لەناو شاریش بینی، هەر لەوێش پشتگوێم خستن، ئێوەش زۆر بەدەمیانەوە مەچن". کاتێك لە پاڵ ئێمە کابرا ئەو قسانەی بۆ گوند نشینەکان کرد، نەیدەزانی ئێمە کوردی دەزانین. هەروەها ئەوانەی قسەمان لەگەڵ دەکردن، لەگەڵ خۆی بردنیە دەرەوە. وەلێ ئێمە دەستەوەستان نەماینەوە و دەستمان بە دواندنی ئەو چەند گوندنشینە کرد کەلەوێ مابوونەوە. بەڵام ئەوەی دواتر قسەمان لەگەڵ کرد، تورکییەکی باشی نەدەزانی. بۆیە لەگەڵ ئەو بە کوردی دەستمان بە گفتوگۆکرد. ئەحمەد ئاراس

کـــوردییەکی زۆر باشـــی دەزانـــی؛ بـــۆیە لەکـــاتی ئاخـــافتن و چـاوپێکەوتنەکەدا، لەگەڵ ئەو گونـد نشـینە زۆر خۆشـیمان لەیەك هات. لەوێ سەر و بەندێدا، موختاری بوجاك هەواڵی بۆ ناردین، "کەی لێرە دەڕۆن و، بەو پێیەی هیچ دۆست و ناسیاوێکمان لێرە نییە، ئایا شەو لە کوێ دەمێننەوە؟" لە وەڵامدا ئەو برادەرەی کە بە کوردی گفتوگۆمان لەگەڵ دەکرد, هاتە دەنگ و گوتی "من ئەو برادەرانە دەبەمەوە لای خۆمان و دەبنە میوانی من، بەیانیش هەر خۆم ڕێڤانیان دەکەم".

ئێـــوارە لەو مـــاڵەی میـــوان بـــووین، گونـــد نشـــینەکان ئەو بۆچوونانەی خوارەوەیان پێگوتین:

"کاتێك موختار بە ئێمەی گوت ئێوە سیخوڕن، ئەوەی ڕاستی بێ هیچ خۆشیمان لێ نەهاتن. وەلێ•دواتر بینیمان ئێوە دەستتان کرد بە ئاخافتنی کوردی. بۆیە هەستمان بەوە کرد ئێوە زۆر لە ئـێمە نـزیکن. هەروەهـا دەربـارەی سـیخوڕبوونی ئێـوە موختـار دەیگـوت، لە پارێزگـار و قائیمقامیەتەوە هەواڵمـان بـۆ هـاتووە لەو بـارەیەوە. وەلـێ ئـێمە لەناوخۆمـان بیرمـان کـردەوە، ئەگەر ئەوانە سیخوڕ بن، چۆن تا ئێرە هاتوونە؟ لە کاتێکدا لە ئاستێکی بالای کارگێڕییەوە هەواڵیان لەو بارەیەوە هەیە. بەڵام دەبێ ئەوەش بڵێین، ئەو وەڵامـانەی لە ژووری موختـارەوە بە ئێوەمـان گـوت، سـەر لەبەری هەڵە و پـێچەوانەیە. چـونکە هەم لە ئێـوە دەسـەڵمینەوە، هەمیش لە موختار. بۆ نموونە کاتێك ئێوە لێتان پرسین ئایا لە موختار و ژەندرمە دەترسن، یان لێیان دەسڵەمنەوە؟ ئێمە بە نەخێر وەڵاممان دانەوە. چوونکە ڕاستییەکەی ئێمە لە ژەندرمە و موختار

ڕازی نین. ئەوەی ڕاستیش بێت لەبەر ئەوەی موختار خۆشی لە ئێوە نەهات ئێمە ئێوەمان کەوتە بەردڵ. کاتێك موختار بە خراپە دەستی بە درۆ و دەلەسە کرد، ئێمە گوتمان، بە دڵنیاییەوە ئەوانە شتێك دەزانن، بۆیە با میوانداریان بکەین و شەو لای ئێمە بمێننەوە، تا بزانین بە تەواوی بۆچی هاتوونە و چی دەکەن. لەوەش دڵنیا بووین ئێوە لەبەرژەوەندی ئێمە خەبات دەکەن. چونکە ئەگەر لە بەرژەوەندی ئێمە کاریان نەکردبا، بە دڵنیاییەوە پارێزگارو قائیمقام و موختار لە هەمبەر ئێوە نەدەوەستانەوە".

دوای دەرچوونمان لە گوند، کاتێك لە باڵەخانەی پارێزگا، ئەو مامەڵە خراپەی ئەوێمان بۆ پارێزگار باس دەکرد، لە پڕ، لە دەرگاوە پۆلیسێکی دۆسییە لە دەست بە ژووریّ کەوت. بە تیلە چاوێك سەیری کاغەزەکانی دەستی پۆلیسم کرد و زانیم، بەشێکی لەو پرسیارانە پێك هاتووە کە ئێمە لە دانیشتوانی ناوچەکانمان دەکرد. ڕاپرسییەکەی ئێمە نزیکەی ۱۱-۱۲ ڕووپەڵ بوو، بۆ ئەوەی پەرت و بڵاو نەبێت، لە لاپەڕەی پێشەوە و دواوەی، بە شێوەی نووشتانەوەی سێگۆشەیی، لای ڕاستی سەرەوە، بە کاغەزی ڕەنگا و ڕەنگ پەڕەکانمان نوشاتندبۆوە و بە دەمبوسێکیش ڕاگیرمان کردبوو. بۆیە هەرزوو کاغەز و پرسیارەکانی خۆمان ناسیەوە، بەڵام هیچ خۆم شێلوو نەکرد. پارێزگار لەسەر مێزەکەی بەردەمیەوە، بەخێرایی چەند ڕستە و شتێکی لەسەر نووسی و بە پەلە پرۆزە دایەوە دەست پۆلیسەکە. دواتر بۆم ڕوون بۆوە، پۆلیس بە ئۆپەراسیۆنێکی نهێنی دوای دەرچوونی ئێمە لەو میوانخانەی لێی مابووینەوە، لە ڕێگای کەسێکەوە چوونەتە ژوورەکەی ئێمە و ڕاپرسیەکەیان لێ بردبووین.

بە پێی پلانی داندراو، قەرار بوو بەر لە مێردین، توێژینەوەکەمان لە نسێبین، دواتر لە جزیرێ بکەین. هەروەها لەو بڕوایەشدا بووین، پێویست ناکات تەواوی ڕووپەڵە کۆپیکراوەکانی ڕاپرسی لەگەڵ خۆمان بگێڕین، چونکە هەم بارگرانی بوو، هەمیش کارەکەی لێ هێواشتر دەکردینەوە. بۆیە بەشێکیمان لەو هۆتێلە جێهێشتبوو کە لێی دەماینەوە. بۆیەش تەنیا ئەو ژمارەیەمان لە نوسخەکانی ڕاپرسیەکە برد، کە بۆ شارەدێی نسێبین تێری دەکرد. ئەوەی دیکەمان لە میوانخانەکەی مێردین جێهێشتبوو. بەوێ شێوەیێ کاتێك ئێمە لە نسێبین بووین، پۆلیس و میت، چووبوونە میوانخانەکە و کارگێڕی ئەوێیان ناچار کردبوو تا ژوورەکەی ئێمەیان پێ بڵێن، بۆ ئەوەی ڕاپرسیەکەمان لێ ببەن.

ئەو کارە لە کاتێکدا بوو، کە ئێمە بەر لە هەر شتێك پرسیارەکانی ناو ڕاپرسیەکەمان بە پارێزگار پیشان دابوو. بەڵام پارێزگار، بۆ ئەوەی بزانێ ئایا تەواوی ئەو نووسخانەی لەگەڵ خۆمان هێناوە وەکوو ئەوەیە کە ئێمە پێمان پیشان دابوو، بڕیاری کردەوەیەکی ئاوای دەرکردبوو. لە کاتێکدا پرسیارەکانی ناو ڕاپرسییەکە زۆر کراوە و ئاشکرا بوون. بە شێوەیەك هەر کەسێك بیویستبا دەمانتوانی دانەیەکی پێ بدەین. لە ئەنجامیشدا کاتێك پشتمان لە مێردین کرد و ڕۆیشتین، چووینە لای ئەوەی دزیەکەی بۆ بەڕێوەبەرایەتی پۆلیس کردبوو و، وەك هەڵوێستێك دانەیەکمان بۆ بەجێهێشت. ئەویش لە وەڵامدا بە حەسرەتەوە دوای بینینی وێنەیەکی لەبەرگیراوەی ڕاپرسیەکە گوتی "بۆ ئەو ڕاپرسییە نهێنی و تایبەت نەبوو؟ ئێوە چۆن دانەیەك لێرە جێدەهێڵن؟".

لەوێ دەمێـــدا، نســـێبین قەزایەکـــی زۆر بچـــووك بـــوو. لەوێ میوانخانەیەکی بچووك هەبوو. لە گوندەوارەکانی نزیك سنووریش کارمـــان کـــرد و ڕاپرســـییەکانمان پـــڕ کـــردەوە. لە گەڕانەوە، هەمدیسان سەبارەت بە پرۆژەی توێژینەوەکەی ئەوێ، زانیاریمان دایە پارێزگار و پلان و پرۆگرامی داهاتووی خۆمان بۆ باس کرد. پێشمان ڕاگەیاند، کە بەرەو ناوچەی شرناخ لە جزیرێ و قیلابان دەچین. وەلێ پارێزگار زۆر نارەحەت و شڵەژانی لە ڕووخساری دەرکەوت، دوای ئەوەی گوێی لە پلانی جوگرافی توێژینەوەکەمان بوو.

"لە ڕێگای شرناخەوە مەچنە شەمزینان. بە ڕێگای چواردەوری دەریاچەی وانەوە بـڕۆنە شـاری وان. دواتـر بـڕۆنە جـۆلەمێرگ. لە نێوان شرناخ و قیلابان ڕێگا نییە. بۆیە ناچاری ئەوە دەبن بە پیادە ڕێ بکەن. جا لەوێش بەردەوام ترسی ئەوە هەیە ئەشقیا و ڕێگر، یەخەتـان بگـرن و تووشـی بەڵایەکتـان بـکەن" پارێزگـار ئـاوای پێگـوتین. کەچی لە نێوان قیلابـان و شـرناخ ڕێگـا هەبوو، وەلـێ ڕێگـایەکی خـراپ. ئەو شـۆفێرەی گرتبوومـان، سـۆزی ئەوەی پێـدابووین ئـێمە بگەیەنێـتە ئەوێ. بەڵام کرێیەکـی زۆری لـێ داوا کردین، کرێیەکی زۆریش خەیاڵی.

ئێمە لەسەر هەڵبژاردنی ڕێگای شرناخ سوور بووین. چونکە لەلایەك کاتمان کەم بوو، لەلایەکی دیکەش پێداگیریمان لەسەر ئەوە دەکرد ناتوانین ٤-٥ ڕۆژ بە سوڕانەوە بە دەوری دەریاچەی وان، کـات بە فیـڕۆ بـدەین. بـۆیە جەختمـان لەوە دەکـردەوە، کە دەتوانین ڕێگا ٥٠ کیلۆمەتریەکەی نێوان شرناخ و قیلابان بە پێ

ببـڕین. جـا سـەبارەت بە مەسـەلەی ڕێگرەکـانیش گوتمـان "چ پـارەیەکی وامـان پـێ نییە، سـا ئەشـقیا ڕێمـان پـێ بگـرن چیمـان لێدەکەن؟".

دوو جـار لەگەڵ پارێزگـاری مێـردین قسـەمان کردبـوو. لە دانیشـتنی یەکەمـدا هەردوو هـاوڕێی قوتـابیم، ئەحـمەد ئـاراس و جاوید گۆك تورکیشم لەگەڵ بوون. ئەحمەد ئاراس کورد بوو و جاویـد گـۆك تـورکیش تـورك. لەوێ دانیشـتنێدا، لەکـاتی گفتوگۆکەماندا، لە ئاریشەکانی تورکیاوە دەستمان پێکرد و دواتر هاتینە سەر کێشەکانی دەڤەری ڕۆژهەڵات و پرسگرێکی قوتابییان. بەڵام لە دانیشـتنی دووەمـدا مـن تەنیـا بـووم. چـونکە ئەوان نەیانویسـتبوو لەگەڵـم بـێن. لە دانیشـتنی دووەمـدا، پارێزگـار زۆر لەسـەر ئەحـمەد ئـاراس وەسـتا، چونکە ئەو لە ڕووی جەستەییەوە هەر زوو کوردبـوونی خـۆی بەیـان دەکـرد. لەلایەکـی دیکەشـەوە کـوردی زانێکـی زۆر چـاك بـوو، بـۆیە لە مـاوەیەکی کورتـدا سەرنجەکان دەکەوتنە سەر ئەو.

لە سـەروبەندی تـوێژینەوە مەیـدانییەکەمان لە مێـردین، ئەحـمەد ئـاراس لەو چایخـانە و قاوەخانـانەی گفتوگـۆی لەگەڵ بەشـێك لە دانیشـــتوانی ئەوێ دەکـــرد، پرســـیاری کـــامەران بەدرخـــان و جگەرخـوێنی لە خەڵکەکە کردبوو. ئەو دەیویسـت سـەبارەت بەو کەسـایەتییانە هەنـدێك زانیـاری و هەواڵ کۆبکـاتەوە؛ وەلـێ ئەو پـرس و وەڵامـانە بە هەر شـێوەیەك بـووبێ، گەیشـتبووە دەسـت ڕێکخسـتنەکانی میـت و بەڕێـوەبەرایەتی پـۆلیس. بـۆیە پارێزگـار بەردەوام لەو بـارەیەوە ئەوەی دووپـات دەکـردەوە کە "ئێـوە لە لادێکـان بە کـوردی قسـەتان کـردووە، بەوەش نەوەسـتاوون و هـاتوون سـوئال و سـۆراخی ناپـاکێکی نیشـتیمانی وەك کـامەران

بەدرخان دەکەن کە دۆسیەکانی تۆمەتبارکردنی، بە گەورەکانیش هەڵناگیردێت". بە تایبەتیش بەو شێوەیە باسی ئەحمەد ئاراسی دەکرد "تۆ کەسێکی لەسەر ئەستۆی دەوڵەت خوێندووتە و نیشتیمانپەروەری، وەلێ ئەو قوتابیانەی لەگەڵتن، بە تایبەتی کوردەکە، هیچ پێناچێت ئاوا بێ".

* * *

کاتێك چووینە جزیرێ، قائیمقامی شارەکە، حەسەن چاکرم لە سەردەمی خوێندنی زانکۆوە دەناسی. ئەو قۆناغێك پێش من بوو. کە یەکدیمان بینی، منی بە بیر هاتەوە، بەڵام هیچ هاوکارییەکی نەکردین.

لە شرناخەوە بەرەو قیلابان ڕێمان کرد. لەوێشەوە هەمدیسان بە پێ چووینە ئەلکێ. ڕێگاکانمان نزیك سنووری نێوان تورکیا و عێراق بوو. بە شێوەیەك دەنگی تەقاندنی تۆپەکانی ئەودیوو سنوور دەگەیشتە گوێچکەکانمان. چونکە جەنگی نێوان کورد، بە سەرکردایەتی بارزانی، لەهەمبەر حکوومەتی عێراق بەردەوام بوو. ڕێگای نێوان قیلابان و ئەلکێ، هەورازێکی سەخت بوو. نەعیم تیرالی قائیمقامی ئەلکێم دەناسی، چونکە ئەویش هاوڕێی خوێندن و هاوپۆلم بوو. بەر لەوەی بشچم، دەمزانی ئەو هاوڕێیەم لەوێ قائیمقامە، بۆیە ویستم سەردانێکی بکەم. لەوێ، دەربارەی عەشیرەتەکان پرسیارێکم لێکرد، بە بیانووی ئەوەی نهێنی دەوڵەتە، وەڵامی نەدامەوە. دواتر لە ماڵەکەی نەعیم تیرالی بووینە میوان. خێزان و منداڵی نەبوو. جا کاتێك ئێمە لای ئەو بووین، پارێزگار تەلەفۆنی بۆ کرد و، دڵنیام سەبارەت بە ئێمە شتی خراپی گوت... هەر لە سەردەمی ئامادەییەوەش، ئەرۆڵ کنکی داواکاری گشتی کۆماری ئەلکێم دەناسی. ئەو پۆلێك پێش من بوو. ئیدی لەوێوە بەڕێکەوتین و چووینە جۆلەمێرگ.

٥- هەمان ڕێگریەکانی پێشوو، لە جۆلەمێرگیش هاتە پێشمان. پارێزگار بۆ ئەوەی پێشگیر بێت لەبەردەم چوونمان بۆ شەمزینان، هەزار و یەك بەهانەی دۆزیەوە. حوسێن ئۆغوتچەنی پارێزگار، لە نێوان سالآنی ١٩٦٥-١٩٦٦ لە یەکێك لە قەزاکانی ئەرزەرووم قائیمقام بوو. ئەویشم لەوێ دەمێوە دەناسی و ئەویش منی بیرهاتەوە.

٦- بەڵام لە شاری وان، نوری باباجانی پارێزگار، ئاماژەی بەوە کرد، تا لە وەزارەتی ناوخۆوە ڕێپێدان نەهێنین، بە هیچ شێوەیەك ڕێگا بە ئەنجامدانی بلآوکردنەوەی ڕاپرسیەکەتان نادەم. لە کاتێکدا بۆ ئەنجامدانی بەشی مەیدانی هیچ توێژینەوەیەکی زانستی، پێویستی بە ڕێپێدانی وەزارەتی ناوەخۆ نەبوو. ئێمەش تەنیا ئەو نووسراوەمان پێبوو، کە سەرۆکی زانکۆی ئەتاتورك بۆ پارێزگارەکانی نوسیبوو سەبارەت بە هاوکاری کردنی ئێمە لە شارەکانیان. پارێزگار بەرامبەر بەو نووسراوەی بەردەستمان گوتی " من سەرۆکی زانکۆ و مانکۆ و پرۆفیسۆر و شتی وا ناناسم. دەبێ ئێوە ڕێپێدانی وەزارەتی ناوخۆتان پێبێت". لەوێ ئەو شتەی ببووە هۆی ئەوەی نیشانەی پرسیار لەسەری پارێزگار دروست بکات ئەوە بوو: لە کاتی توێژینەوەکەی ئێمە، بەشی توێژینەوەی پەیمانگای ناسنامەی زانکۆی هاجەتەپە، لەسەر ئاستی تورکیا سەرقاڵی گشت پرسیەك بوو. وا ڕێك دەکەوت لە هەندێك شوێن لەگەڵ ئەوانەی گشت پرسیەکەیان دەکرد، تووشی یەك دەبووین و بەیەکەوە کارمان دەکرد. ئەوان بۆ کارەکەیان بەڵگەیەکی وەزارەتی ناوخۆیان پێ بوو، کە واژووی وەزیری ناوخۆی بەسەرەوە بوو. بەڵام سەیر ئەوەبوو، لە نووسراوەکە هیچ هێمایەکی

ڕێگــا پێــدان نەنووســرابوو. تەنیــا ئەوە نەبــێ داوای ئەوەی لە پارێزگاکان دەکرد، تا کار ئاسانیان بۆ بکەن. بۆیە بە پشت بەستن بەو بیرکـردنەوەیە، پارێزگـار دەیگـوت دەبـێ بـۆ کارەکەتـان ڕێگـا پێدانی وەزارەتی ناوخۆ لەگەڵ خۆتان بهێنن.

٧- ســـەبارەت بە وەڵام و ڕێگریەکـــانی پارێزگـــار و ئەو بەربەســتانەی تــا ئەوســا هــاتبووە پێشــمان، هەســتام بە نووســینی مەکتووبێك بۆ سەرۆکی زانکۆی ئەتاتورك. لە نامەکە ئاماژەم بەوە کردبوو، سەرجەم پارێزگار و قائیمقام و موختارەکان، ڕێگری لە ئەنجامدانی کارەکەمان دەکەن و هێزەکانی پۆلیس و خەڵکمان لێ هــان دەدەن. بەوەش ناوەســتن و پڕوپاگەنــدەی ناڕەوامــان بــۆ هەڵدەبەستن. هەروەها ئاماژەم بەوە کردبوو، سەرباری ئەوەی ئێوە نووســـراوتان بـــۆ کارئاســـانی شـــۆلەکەی ئـــێمە کـــردووە و، پارێزگارەکـــانیش ئاگـــاداری هاتنمـــانن، بەڵام ئەمە هیچـــی لە پێشـــگیریەکان کەم نەکـــردووەتەوە، بەڵکـــوو بە پـــێچەوانەوە لە هەندێك شوێن بووەتە کێشەش بۆمان.

دەمەوێ لە خـوارەوەش تەواوی ئەو نامەیەتـان بـۆ بنووسـمەوە کە لە ١٣-٨-١٩٦٨ لە پارێزگـــای وانەوە بـــۆ ســـەرۆکی زانکـــۆی ئەتاتورکم نووسی:

"یەکەم: لە بەرواری ٨-٧-١٩٦٨ توێژینەوەکـــانی کیلـــیس و نسێبین و جزیرێمان تەواو کرد. دووەم: پارێزگـاری جۆلەمێرگ و وان، ئاماژەیـان بەوە کـرد، ئەنجامـدانی تـوێژینەوەی کـۆمەڵایەتی لەوێ مەترسیدارە و ڕێگا بە کارکردنتان نادەین. سێیەم: پارێزگاری وان پێـی گـوتین: بـۆ ئەنجامـدانی تـوێژینەوەیەك لە دەڤەرەکەدا،

نووسـراوێکی سـەرۆکی زانکـۆ بەس نیـیە. چـوارەم: لەوە گەڕێـن پارێزگارەکـان هـیچ هاوکارییـان نەکـردین، بەڵکـو بە پـێچەوانەوە تەگەرەی زۆریان خستە سەر ڕێی کارەکەمان. پێنجەم: لە مێردین، پارێزگـار و قائیمقـام و بەڕێـوەبەری ناحیەکـان، ئێمەیـان وەکـوو سیخوڕ بە خەڵکەکە ناساندبوو. وەلێ ئەو بۆشاییەی لە ئەزەلەوە لە نێوان خەڵك و حکوومەت هەبووە، جارێکی دیکەش لەوێ خۆی دووپات کردەوە. دانیشتوانی ئەوێ ئێمەیان بە تەنیا جێنەهێشت و لەماڵەکـانی خۆیـان میوانـداریان کـردین. شەشـەم: هەڵوێسـتی ئەو پارێزگـارانە، لە قەزا و ناحیەکانیشیان دووبـارە بـۆوە. حەفتەم: لەبەر ئەوەی ناوچەکە بە کوردی دەپەیڤن و لە بارزانی نزیکن، بۆیە بە تـۆمەتی هەسـتیاری دۆخـی ناوچەکـە، ڕێگریمـان لێکـرا. هەشـتەم: بەڵام چەنـــد خاڵێـــك هەیە کە ترســـی لە دڵـــی پارێزگارەکـــان چێکـردووە و بووەتە ڕێگرێکـی سەختی توێژینەوەکە. ١- بە هـۆی کـاری قاچـاغچیەتییەوە هەنـدێك کەس و لایەن هەن، بە ملیۆنـان لیــــرە قـــازانج دەکەن. ٢- فەرمـــانبەرانی حکـــوومەت لەگەڵ قاچاغچیەکـان بەیەکەوە کـار دەکەن. جـا یـان پـۆلیس و ژەنـدرمە هاوبەشـی کارەکەن، یانیش دادوەر و داواکـارە گشتیەکان. چونکە ڕێ بـۆ ئەو کـارە خـۆش دەکـرێ و ئەوەش بە ئاشـکرا دیـارە. ٣- ڕۆڵ و بـوونی عەشـیرەتگەرایی بە درێژایـی سـنوور زۆر بە هێـزە، ئەوەش لەلایەن خێـزان و خـزم و دۆسـتانەوە پشـتگیری دەکـرێ. بـۆیە وەك چـۆن بیـرۆکەی پـارتی سیاسـی گرنـگ نیـیە لایـان، بە هەمـان شـێوە کـارگێڕانی دەوڵەت، لەوانە پارێزگـار و قائیمقـام و دادوەر و داواکـاری گشـتیش، زۆر لاوازن و بەرامـبەر بە هێـز و توانـای عەشـیرەت دەستەوەسـتان مـاونەتەوە. ٤- ڕێگـایەك نیـیە بە

ڕێگا بچێ و قیرتاو کرابێ. ٥- هیچ وەبەرهێنانێك لە ناوچەکە نییە. ٦- ژێرخانی سیستەمی فیودالیزم، بە هەموو توانای خۆی لەوێ بوونی هەیە. ڕێژەی ئەو کەسانەی هیچ پارچە زەویەکیان نییە، بەرامبەر ئەوانەی ١٢ تا ١٨ هەزار دۆنم زەوییان هەیە، زیاتر ٦٥% دانیشتوانەکە پێك دەهێنێت. ٧- زۆربوونی ژمارەی دانیشتوانی ئەوان واران بە شێوەیەکی خێرا و، زیاد بوونی ڕۆڵی تراکتۆر لە کشتوکاڵ کردن، بە دڵنیاییەوە ئەو پێکهاتە کۆمەڵایەتییە دەگۆڕێت. ٨- تاکە لایەنێکی فەرمی کە پەیوەندی لەگەڵ خەڵك هەبێت، ژەندرمە و ئەو فەرمانبەرانەن کە باج و سەرانە کۆ دەکەنەوە. دروست بوونی ڕێگر و ئەشقیا، ئەنجامی شێوازی کارگێڕی و ڕێکخستنی ناوچەکەن. واتا ئەوان دژی خەڵك نین، بەڵکوو دژی ئاغاکان دەنگیان بەرز کردووەتەوە، کە لەگەڵ دەوڵەت کاردەکات. ٩- بە درێژایی سنوور، پەیوەندییە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان، هی ئەو دیون. نۆیەم: بە وردبوونەوە لەو خاڵانەی لە سەرەوە باسم کرد، لەوە تێدەگەین بۆچی دەڵێن ناوچەکە دەڤەرێکی هەستیارە بۆ توێژینەوەی کۆمەڵایەتی. دەیەم: ئاگاداری هەموو هەنگاوێکی خۆمم کە چۆنم هاوێشتووە و هەموو قسەیەکیشم بە حیساب و کیتاب کردووە. قوتابیە هاوکارەکانیشم بە هەمان شێوە. وەلێ وەك ئەو ڕاستیانەی لەسەرەوە نووسیومن، کەسێکی ئەکادیمی لەو بارەیەوە چ قەباحەتێکی دەبی هەبێ؟ یازدەهەم: بەیانی بەرەو بەیازد بەڕێدەکەوین، لەوێشەوە دەچمە دوخوڕ. لەوێ ناچمە لای پارێزگاکان تا داوای هاوکارییان لێبکەم، بەڵکوو پێیان دەڵێم لە ناوچەکانیان دەست بە ئەنجامدانی توێژینەوە دەکەم. جا ئەگەر ڕێگام پێبدەن یان نا، من بە دڵنیاییەوە

تـــــــــویژینەوەکەم تەواو دەکەم. دوازدەهەم: لە گەڕانەوەم بە توێژینەوەیەکی فراوانەوە هەموو شتێك باس دەکەم. سێزدەهەم: تا ئێستاش ئەو ناوچانەم تەواو کردووە: ئەرزرووم، مەلادی، عەنتاب، کیلیس، قیلابان، ئەلکێ، جۆلەمێرگ، گەڤەڕ، ئەلباك، وان. لەوان ڕێگایاندا، بە ئامرازی جیا جیا ڕێمان تەی کردووە، هەندێك جار بە مانتۆرسکیل، یاخود بە پیادە".

لەگەڵ ڕێزم...

٨- دوای نووسینی ئەو نامەیە، بەرەو ئاگری کەوتینە ڕێ. وەلێ لەوێ چاودێری و بەربەستەکانی هێزەکانی ئاسایش زۆر خەستتر بوو. نامیق سەزگینی پارێزگار، هەم دەیویست بەرامبەر ئێمە خۆی بە کەسێکی چاك پیشان بدات، هەمیش لە پشت ئێمە هەموو هێزەکانی پۆلیسی دەخستەکار، بۆ ئەوەی چاویان لەسەر ئێمە بێت. پۆلیس بە بێ وەستان لە هۆتێل و ڕێستورانت و چایخانە و ڕێگا و بانەکانیش بەدواوەمان بوون. بەڵام لەبەر ئەوەی کەسی زۆر چالاك و زیرەك و پڕ زانیاری نەبوون، هەر زوو کەشف دەبوون و دەمانزانی پۆلیسن و بەدوای ئێمەوەن. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر وازیان لێنەدەهێناین.

٩- لە بازید، بە تەواوی وردەکارییەوە دۆخەکەم لە قائیمقام گەیاند. ئەوەم بۆ ڕوون کردەوە، کە پرۆژەکەمان کارێکی تەواو زانستییە و هیچ نیەت خراپیەکی بۆ هیچ لایەنێك تێدا نییە. بۆیە لە ماوەی ڕابردوو لە کاتی کارکردن زۆر چاودێریەکی ناشرینیان کردووین، چونکە جگە لە مافی ئازادی کاری ئەکادیمیمان، ئازادی تاکە کەسیشیان پێشێل کردووین. زۆری و کەمی لێ

نەکەم، چیمان بەسەر هاتبوو هەموویم بۆ باس کرد. پاشان لەگەڵ قائیمقام ئەو گوندانەشمان لەسەر نەخشە هەڵبژارد، کە بە نیاز بووین ڕاپرسیەکەی لێ بڵاو بکەینەوە. بەڵام سەرباری ئەوە، قائیمقام درێخی نەکرد لە ناردنی سیخوڕ بە دوامانەوە. بە شێوەیەك، لە هەر لادێیەك کە بۆی چووین، هەرکەسێك کە قسەمان لەگەڵی کرد، لە دوای ئێمە لێکۆڵینەوەی لەگەڵ کرا. تا بزانن چیمان لێپرسیوون و چیان وەڵام داینەوە. ئەو زانیارییەشمان دوو مانگ دوای ئەنجامدانی توێژینەوەکە، لە گوند نشینەکانەوە زانی. لە ڕێگای ئەو قوتابیانەی خەڵکی گوندەوارەکانی ناوچەکە بوون. ئەوان دوای ئێمە چی ڕوویدابوو، هەموویان بە وردی دەگەیاندە ئێمە.

١٠- یەکێك لە ڕێگرییە سەیرەکان لە قارس ڕوویدا. ئەو وردەکارییانەی بە قائیمقامی بازیدم گوت، لە قارس هەمان شتم بە پارێزگاری ئەوێش گوت. ئەوەم بۆ باسکرد کە چاودێری کراین، لە کاتێکدا نازانین بۆ ئەو کارەیان کرد؟ لە کاتێکدا مافی ئەوەیان نییە ڕێگری لە ئەنجامدانی توێژینەوەکەمان بکەن. لە وەڵامدا پارێزگار گوتی "لەو شوێنانەی بۆی چوون بە کوردی قسەتان کردووە، بۆ ئەمەش بەڵگەی سەلمێندراو لەبەر دەستە".

یوسف زیا ئەر ئۆغڵووی پارێزگاری قارس، ساڵی ١٩٥٥ قائیمقامی ناوچەی ئیسکلیپ بوو. لە قۆناغی ناوەندی بووم و ئەویش وانەی زمانی فەرەنسی دەگوتەوە. لەوێ دەمێوە ئەوم دەناسی. من لە ساڵی ١٩٥٤ دەرچووبوم و خوێندنی قۆناغەکەم تەواو کردبوو. قوتابیانی دوای ئێمە، یوسف زیا ئەرئۆغڵوو باشتر

دەناسن. سەردەمی مامۆستایەتی ئەوێ دەمێشم بە بیر پارێزگار هێنایەوە. بەڵام خۆی لێ نەبان کرد و ئەدگاری ڕەقی و زبری دەموچاوی شل نەکردەوە.

لە وەڵامی ئەوەی بۆچی بە کوردی قسە دەکەین؟ ئەوەم بۆ ڕوون کردەوە کە، ناچارین لەوان ناوچان بە کوردی بئاخڤین، بۆئەوەش هەر دەبێ چاوپێکەوتن و دیدارەکان بە کوردی بێت، چونکە خەڵکەکە تورکی نازانن و گوندەوارەکانی سەر سنوور زۆربەی زۆریان تەنیا دەتوانن بە کوردی قسە بکەین. لە وەڵامی ئەمەشدا پارێزگار گوتی "مادەم وایە بڕۆنە ئەو لادێیانەی تورکی دەزانن. لەگەڵ ئەوانە بدوێن کە تورکی دەدوێن. سا ئەگەر گوندەوارییەکانی سەر سنوور بە کوردی دەپەیڤن، بڕۆنە لادێکانی ناوەڕاستی ئەنادۆڵ، یان ڕۆژئاوای ئەنادۆڵ، بۆ ئەوەی توێژینەوەکەتان بکەن". جا لە هەمووی خۆشتر، پارێزگار لە هاوکاری ئەو قوتابیيانە تێنەدەگەیشت، کە لەگەڵ من ڕاپرسیەکانیان بڵاو دەکردەوە و ئالیکاری منیان دەکرد. بۆیە لەو بارەیەوە هاتە قسە و گوتی "باشە ئەوە لە تۆ گەیشتین کە توێژینەوە دەکەی، ئەی ئەو دوو کەسەی لەگەڵتن، چین؟ ئەوانیش وەك تۆ توێژینەوە دەکەن؟ هەر یەکە و با لێکۆڵینەوەی خۆی بۆ خۆی بکات". دواتر بەو شێوەیە درێژەی دایێ "ئایا پەیوەندی نێوان ئاغاکان و سۆسیالیزم چییە؟". لە کاتێکدا هیچ دۆخێك لە گۆڕێ نەبوو بۆ پرسینی ئەو سوئالە.

کاتێك لە بازیدەوە هاتینە قارس، لە ئیدر، خالید گونەشمان بینی. ئەوسا خالید، قوتابی کۆلێژی کشتوکاڵ بوو. لەگەڵ ئەو، تا

قارس بەیەکەوە چووین. لەناو شاریش هەندێك بەیەکەوە سوڕاینەوە. ئەوەش ببووە هۆی ئەوەی سەرنجی هەواڵگری بۆ لای خۆی ڕاکێشێت. دوای ئێمە لێیان پرسی بوو "ئەوان سێ کەس بوون، بۆچی بەگەڵیان کەوتی؟" ئەویش لە وەڵامدا گوتبوی "لە ئیدر ئەرکیان پێ سپاردم تا چاودێریان بکەم".

لەوێش، سەرباری ئەوەی هەموو شتێکما بۆ پارێزگار باسکرد، بەڵاو ئەویش درێخی نەکرد، لە ناردنی سیخوڕ بە دوامانەوە و ئەوەندەی لە دەستیان هات، ڕێگرییان لێکردین. بۆ نموونە بۆ چوونە ناوچەی دوخوڕ، پێویست بوو لە ئەردەخانەوە تێپەڕین. لەبەر ئەوەی هیچ ترومبێلێك نەبوو ڕاستەوخۆ لە قارسەوە بچێتە دوخوڕ، بۆیە بە ناچاری دەبوو بچینە ئەردەخان. پارێزگار تەلەفۆنی بۆ تەواوی ئەو قائیمقامانەی سنووری پارێزگاکەی خۆی کردبوو، هەر لەناو ترومبێل، لە شوێنی پۆلیس قائیمقام و فەرماندەی ژەندرمە پێشوازیان لێکردین. قائیمقام ئەوەی لە توانایدا بوو، خەڵکی دژی ئێمە هاندا و بە ئاشکرا دەیگوت "من سەر بە پارتی عەدالەتم[1]، جا بڕۆنە لای پارێزگار سکاڵام لێبکەن". چونکە وای دەزانی بە لۆمە لێکردنی، پایەی لای پارێزگار بەرزتر دەبێتەوە. چونکە پارێزگاریش ئەندامێکی تۆخی پارتی عەدالەت بوو و ئەمەشی بە شانازییەوە دەگوت. لە ئەنجامدا توێژینەوەی سۆسیۆ ئیکۆنۆمی ناوچەکانی سەر سنوور لەگەڵ هەموو ئەو ڕێگریانەی هاتە بەردەمی، بەوەی چییان لە دەست هات کردیان و درێخیان

---

[1] ئەو پارتە ساڵی ١٩٦١ لەلایەن راغب گوموش پالا بە بیروباوەڕی پارێزگاری لیبڕاڵی دامەزرا و، ساڵی ١٩٨١ داخرا. (وەرگێڕ).

لە ڕێگریکردنمان نەکرد، لە کاتێکدا بۆ دەستەیەکی دیکە، کە توێژینەوەی کۆمەڵایەتیان لە هەمان ناوچە دەکرد، زۆر کار ئاسانیان بۆ کرا. بە شێوەیەك ترومبێلیان بۆ دابین کردن و میوانخانە و شوێنی مانەوەشیان پێدان. چونکە ئەوان ڕێگا پێدانێکی ڕێکخستنەکانی پلاندانانی دەوڵەتیان پێ بوو، بە واژووی سەرۆك وەزیران سولێمان دەمیرەڵ[1].

لەبەر ئەو کردەوە نایاساییانەی پارێزگار و قائیمقام، کە دژ بە ماف و دەستوور بوو، چوونە دوخوڕمان هەڵوەشاندەوە و گەڕاینەوە. لە کاتێکدا، وەك لەسەرەوە باسم کرد، ئەوان تۆمەتباریان کردبووین بەوەی، ئەو زانیاری و بەڵگانەی لە کیلیس و نسێبین و جزیرێ و شەمزینان و ئەلباك و بازید کۆی دەکەینەوە، لە دوخوڕ بە ڕووسەکانی دەفرۆشین. هەرچی بوایە، نەدەبوو ئاوا پێش بە ئێمە بگرن، چونکە ئەمە ئەرك و کارێکی نیشتیمانی بوو دەمانکرد. هەر لەبەر ئەوە، پۆلیس ڕێگری زۆری لێکردین لە چوونە دوخوڕمان. لەمەشەوە ئەوەمان بۆ دەرکەوت ئەو زمان لێدانەی بەشی لێژنەی زانستی و کۆلێژی ئەدەبیاتی زانکۆی ئەتاتورك لای پارێزگار و ژەندرمە و بەڕێوەبەرایەتیەکانی پۆلیس، باندۆرێکی زۆری هەبوو و تەنگەبەری زۆری لە مەیدانی کار بۆ چێکردین. لە کاتێکدا ئازادی ڕا دەربڕین و زانستی بەو

[1] سولێمان دەمیرڵ (١٩٢٤-٢٠١٥) سیاسەتمەداری تورك، بە نۆیەمین سەرۆك کۆماری تورکیا دادەندرێت. دەمیرەڵ لە نێوان ساڵانی (١٩٩٣-٢٠٠٠) وەکو سەرۆك کۆماری ئەو وڵاتە کاری کردووە. بەر لەو پۆستەش ٥ جار لە پێنج خول و سەردەمی جیاواز سەرۆك وەزیرانی تورکیا بووە. جگە لەوەی سەرۆکایەتی هەردوو پارتی عەدالەت و دۆغروو یۆلی کردووە. (وەرگێڕ).

شـێوەیە، لە ژێـر چـاودێری و سـیخوڕی فەرمـی بـووبێ، دەبـێ داهێنانی زانستی چۆن کرابێ؟

کاتێك ویستمان بچینە دوخوڕ، شۆفێری ترومبێلێك پێی گوتین کە دەتـوانێ بمانبـا، بەڵام داوای کرێیەکـی ئەوەنـدە زۆری کـرد، پێدانی لە توانای ئێمە نەبوو. ڕەنگە بڵێم ٢٥ قات لە کرێی ئاسایی زیاتر بوو.

جاویـد گۆکتـورکی قوتـابی هاوڕێمـان، لە نـاوچەی دامـلا لە قەرەقـۆڵی سـەر سـنوور، بـرا گەورەیەکـی لەوێ بـوو بە پـلەی جێگـری ئەفسـەر، ئەو لە ئـێمە دابـڕا و چـووە بینینـی ئەو. لەگەڵ خۆی چەنـد وێنەیەکی لە ڕاپرسیەکەش بـرد، بەڵام پاڵەپەستۆکانی سەرمان ئەوەندە زۆر بوو، لە کۆتایدا داواکاری گشتیش هاتە ناو پرسـەکە. بـۆیە دەربـارەی ئەو هەڤاڵەمـان دۆسـیەیەکی دادگـایی کردنـی کـردەوە بە نـاوی (سـازکردنی پڕوپاگەنـدە، بـۆ ڕووخـانی ڕژێمـــی دەوڵەت). بەمەوە دەیویســـت لە زانکـــۆ دەری بکـــات. داواکـــاری گشـــتی، تـــا ئەوســـا بانگەشـــەی ئەوەی دەکـــرد، ئەو ڕاپرسیانەی تا ئەوکات کۆکراونەتەوە، تاوانن. بەڵام ئەو برادەرەمان لە بەرگری کردنەکەدا ئاماژەی بەوە دابوو، ئەو ڕاپرسیە پڕکراوانە، چەند داتایەکن بۆ ژێرخانی توێژینەوەیەکی زانستی و ئەکادیمیی. بەو شێوەیە دۆسیەکە بڕیاری وەستانی بۆ دەرچوو.

لە ئەردەخانەوە لەگەڵ ئەحـمەد ئاراس بەیەکەوە گەڕاینـەوە. لە ڕێگـا، ڕادیـۆی نـاو ئۆتۆبووسـەکە هەواڵـی ئەوەی بـڵاو کـردەوە، سوپای یەکێتی سۆڤیەت، دەستی بەسەر چیکۆسلۆڤاکیا گرتووە و دوبچەکی سـەرۆك وەزیرانیشی لەکـار لاداوە. بیسـت یان بیسـت و یەکەمین ڕۆژی تەباخی ساڵی ١٩٦٨ بوو...

## یەکەمین ئاگادارکردنەوەی مەترسیدار ئەو ڕێگرە بنچینەییانەی، لەبەردەم گەشەکردنی توێژینەوەی کۆمەڵایەتین، لە تورکیا

لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٦٩، هەواڵێکم لە زانکۆی هاجەتەپەوە پێگەیشت. لە نوچەکەدا هاتبوو، پەیمانگای توێژینەوەی ناسنامەی زانکۆی هاجەتەپە و ڕێکخراوی زانستە مرۆڤایەتیەکانی تورکی، بە ناونیشانی (پێشهاتەکانی بەردەم زانستە مرۆڤایەتییەکان لە تورکیا) دەیانەوێت سمینارێك ڕێك بخەن. لە پاڵ ئەوەی داوای بەشداریکردنیان لێکردبووم؛ هاوکات، داوای ئامادەکردنی بۆچوونی منیان دەکرد سەبارەت بە (چارەسەری کێشەکانی توێژینەوەی کۆمەڵایەتی لە تورکیا و ئەو مژار و کێشانەی بۆ توێژینەوە دێنە پێش). سیمینارەکە لە ٢٣-٢٥ مانگی دووی ساڵی ١٩٧٠ لە زانکۆی هاجەتەپە بەڕێوە دەچوو. بۆ سمینارەکە بۆچوون و هزری خۆم لە ژێر ناونیشانی (کێشە سەرەتاییەکانی توێژینەوەی کۆمەڵایەتی لە تورکیا) نووسی و، بەر لە ماوەی دیاری کراو، بۆم ناردن. ڕۆژێك بەر لە سمینارەکە چوومە ئەنقەرە. بۆ ئەوەی بزانم ئاکامی بۆچوون و پێشبینیەکانی ناو ڕاپۆرتەکەم چی لێ بەسەردێ. سەرەتا چوومە زانکۆی هاجەتەپە. لە بەشی کۆمەڵناسی لەگەڵ قوتابییەك تووشی یەك بووین و پێی گوتم "سەرجەم وتار و ڕاپۆرتەکانی لە سمینارەکە پێشکەش دەکرێ، کۆپی و بڵاو کراوەتەوە" جا قوتابییەکە بەو شێوەیە درێژەی دایێ "ڕاپۆرتەکەی ئێوەش ژمارەیەکی زۆری وێنە لەبەر گیراوە، وەلێ بڵاو نەکرایەوە". هۆکاری ئەو کارەشیان بۆ ئەوە گەڕاندبۆوە، کە نووسینەکەمیان

بە مەترسیدار زانیوە. قوتابییەکە بەردەوام بوو لە قسەکردن "زۆر هەوڵمدا تا دانەیەك لە ڕاپۆرتەکەی ئێوە دەست بخەم، بەڵام سەرکەوتوو نەبووم". بەڵام بە پێی گوتەکانی ئەو خوێندکارە بێ، یەکێك لە برادەرەکانی توانیویەتی دانەیەك لە ڕاپۆرتەکەی من بفرێنێت.

ڕۆژی دواتر چوومە ئەو هۆڵەی سیمینارەکەی لێ بەڕێوە دەچوو. کاتێك لەبەردەم دەرگای هۆڵەکە هاتوچۆم دەکرد، پرۆفیسۆر دکتۆر موبەجەل کرای، ئەندامی لیژنەی ڕێکخستنی سمینارەکە منی بینی و لێم نزیك بۆوە و بە ئەسپایی قۆڵی گرتم و منی بردە پەنایەك؛ مامۆستا موبەجەل ئاوا سەری قسانی کردەوە "ڕاپۆرتەکەی تۆمان خوێندەوە. کۆمیتەی ڕێکخستنی سمینارەکەش لێی ورد بوونەوە و زۆر بە مەترسییان زانی. وەکوو خۆم، منیش بە مەترسی دەبینم، چونکە ئەگەری ئەوە هەیە، پۆلیس هێرش بکاتە سەر سمینارەکە، یان ڕێگری لە ئەنجامدانی بکرێت. یانی ڕەنگە شتێك ڕوو بدات کە میزاجی هەموو لایەك بترشێنێ". مامۆستا موبەجەل ئەو ڕستانەی بە دەنگێکی نزم و کەلەجانێکی زۆرەوە پێ گوتم. یەکەم جارم بوو بە شێوەیەکی ئاوا جددی بەشداری کۆبوونەوەیەکی وەها بکەم. ڕاپۆرتێکم پێشکەش کردبوو، ناوەڕۆکەکەشی لەلایەن ئەو کۆمەڵناسانەوە گوێی لێ دەگیردرا، کە بەشداری سمینارەکەیان دەکرد. ئەوانیش لەهەمبەر هزر و بۆچوونی من، دوونیا بینی خۆیان لەسەر مژارەکان دەردەبڕی؛ بۆیە زۆر بە کەلەجان بووم. کاتێکیش مامۆستا موبەجەل ئەو قسانەی بۆ کردم، تووشی سەرسوڕمان بووم. ئاخر ئەوە کەی کارێکی ڕەوا بوو بەرامبەرم کرا؟

ئەو پرۆفیسۆرە بەڕێزە، زۆر لێکۆڵینەوەی پۆلیسی بینی بوو و لەگەڵ زۆر هێرشی ئاسایش ڕووبەروو ببووەوە. جا ئەگەر پرۆفیسۆرێکی وەها، لە بیروبۆچوونی ئێمە نەگا، ئێمە چۆن دەتوانین، کێشەکانمان بهێنینە زمان و باسیان بکەین.

ئەو بەیانییەی سمینارەکە بەڕێوەدەچوو، قەرەباڵغییەکی زۆر لەبەردەم هۆڵی پەیمانگای توێژینەوەی ناسنامەی زانکۆی حاجی تەپە دروست بوو. زۆربەی ئەوانەم دەناسی کە بەشداری سمینارەکەیان دەکرد. ئەوسا لە ئەرزرووم، لە زانکۆی ئەتاتورك کارم دەکرد و تەنیا بۆ سمینارەکە چووبوومە ئەنقەرە. پرۆفیسۆر دکتۆر موبەجەل، لە گۆشەیەکی دوور لە قەرەباڵغیەکە بەردەوام بوو لە قسەکردن "... زۆر گەنجیت، هێشتا لەیەکەم پایەی پیشەکەتی، بۆیە لە وەها دەستپێکێکدا، ڕووبەڕووبوونەوەت لەگەڵ بوویەر و ڕووداوی لەو شێوەیە، کارێکی ڕاست نییە. وەك ڕاپۆرت و پێشنیازەکانی دیکە، ئەوەی تۆشمان چەندان دانە لێ کۆپی کرد، وەلێ لەسەر ئاگادارکردنەوەی هاوڕێیەکمان، لێژنەی بەڕێوەبردنی سمینارەکە، هەمدیسان بە نووسینەکەی تۆدا چوونەوە. لە پێداچوونەوەکەدا، بڕیاری بڵاونەکرانەوەی درا. بە بۆچوونی منیش دابەشکردنی کارێکی ڕاست نییە، چونکە ئێمە بۆ چاکەی تۆ ئەو کارەمان کرد. بەو پێیەی بە هۆی ئەو ڕاپۆرتەوە پێشهاتی ئۆپەراسیۆنی پۆلیس و دەستگیرکردنی تۆ کارێکی باش نەدەبوو. بە بۆچوونی من قسە لەسەر بابەتێکی دیکە بکە و جارێکی دیکە بیر لە نووسینەوەی ڕاپۆرتەکەت بکەوە. چونکە ئەگەر مرۆڤ لە تەمەنی گەنجی تووشی کارێکی وا نەخوازراو بێت، جارێکی دیکە ناتوانێ بە ئاسانی بکەوێتەوە سەر پێیەکانی خۆی. خۆت

تووشــی هەڵە مەکە و بــڕوانە پێشــەڕۆژی پیشــەی ئەکادیمیــت... چــونکە لە داهــاتوو دەتــوانی بە ئاســانتر بــاس لەو جــۆرە مــژارانە بکەیت... ".

بەرامــــــبەر بەو مەترســــــیانەی ئۆپەراســــــیۆنی پــــــۆلیس و دەســتگیرکردنەی، مامۆســتا مــوبەجەل باســی کــرد؛ ویســتم باســی ئازادی زانکۆی بۆ بکەم و ڕووداوی لە بەین بردنی کۆلێژی زمان و بەشــەکانی مێــژوو و جوگرافیــای ســاڵی ١٩٤٨ بە بیــربهێنمەوە. بــۆ ئەمەش گــوتم "زانکۆکــان وەك دامەزراوەیەك ســەربەخۆ بوونــە". بەڵام مامۆستا باسی دۆخی واقیعی تورکیای بۆ دەکردم و گوتی "بەرامبەر بە دۆخی ڕاستەقینەی تورکیا، دامەزراوەی وەکوو زانکۆ زۆر جێگــای بــاوەڕ و متمــانە نــین". هەروەهــا بەر لەوەی بــڕوا ئەوەشی پێگوتم "ئاگادار بە هەموو چاوەکان لەسەر تۆن". ئیدی بەو ڕســتەیە کۆتــایی بە گفتوگــۆکەی نێوانمــان هێنــا. منــیش زۆر پێداگریم لەسەر نیقاشەکەی نێوانمان نەکرد.

پێشکەشکردنی ڕاپۆرتەکەی من، لە سێیەم ڕۆژی سمینارەکەدا بوو. بۆیەی داوایان لێکردم تا ئەو ڕۆژە جارێکی دیکە بیرێك لە پرسەکە بکەمەوە. لەوێ سەرو بەندێشدا، بە هۆی ئەوە بابەتانەی لە وانەکــان باســم دەکــرد و ئەو پرســیارانەی لە تاقیکردنەوەکــان دەمهێنــایەوە، لە زانکــۆی ئەتــاتورك؛ داوایەکــی کــارگێڕیم لەســەر کرابــۆوە. بە هــۆی ئەو دۆســیەوەش، پاڵەپەســتۆیەکی زۆرم لەســەر بوو. پرۆفیسۆر و لێژنەی بەڕێوەبردنی سمینارەکەش، ئاگاداری ئەو دۆخەم بوون.

دەبێ ئاماژە بەوە بکەم، بە هۆی ئەو ئاخافتنانەوە، تووشی بێ

ئومێدی ببووم، چونکە ئازادی زانستی و بیرورا، لە واقیعی تورکیادا زۆر گرنگ و پڕ بایەخ نەبوو. بۆیە لەو بارەیەوە هەست و بیر و هۆشم تێکەڵ و پێکەڵ ببوو. لە کاتێکدا داوای ئەوەیان لێدەکردم، بە هیچ شێوەیەك باسی ڕاپۆرتەکە و چۆنیەتی ئامادەکردنی و بڵاونەکردنەوەی نەکەم. بە کورتی ڕووبەڕووی بارێکی ناهەموار ببوومەوە. بۆیە دەبوو خۆم بڕیار لەو دۆخە بدەم کە تێی کەوتبووم. لەو بارەیەوە پرسەکەم لەگەڵ چەند دۆستێك گەنگەشە کرد، ئەوانیش لەو بارەیەوە ڕەخنەیان لە لێژنەی ئامادەکاری و بەڕێوەبەرانی سمینارەکە گرت. لە کاتێکدا چەندان پرۆفیسۆر و دکتۆری ناودار، لە سمینارەکە دەدوان هەبوو. جگە لەمانە، ڕێژەی ئامادەبوونیش زۆر و قەرەباڵغ بوو.

ڕۆژی سێیەم نۆرە هاتە سەر پێشکەشکردنی ڕاپۆرتەکەی من. لەوێ هیچ باسی ئامادەکاری و ڕێگریکردن لە بڵاوکردنەوەی ڕاپۆرتەکەم نەکرد. بەڵکوو کورتکراوەیەکم لەسەر ڕاپۆرتەکەم پێشکەش کرد. ئەو ڕاپۆرتەی کە پێش، بە بڵاوکردنەوەی گیرا، نزیکەی ٦٤ لاپەڕە بوو. وەلێ تەنیا هەشت نۆ خولەك قسەم کرد. سەرەڕای ئەمە، پرۆفیسۆر دکتۆر کەمال کارپات ڕەخنەی لە قسەکانم گرت. شێوازی ڕەخنەگرتنەکەشی بە دەنگ بەرزکردنەوە و هاش و هوش بوو. لە کاتێکدا هێشتا لەسەر کورسیەکەی خۆم لەبارەی پرسەکە دەپەیڤیم. ئەو نزیکەی چوار مەتر لە شوێنی دانیشتنی منەوە ڕۆنیشتبوو. ئەو دەنگەی لەناو غەڵبەغەڵبەکە دەهاتە بەر گوێی من ئەوە بوو "کورد هەیە و دەوڵەت نییە، کورد هەیە و دەوڵەت نییە ... ". واتە مەبەستی ئەوەبوو بڵێ "تۆ باسی کورد بکە، بەڵام دەوڵەت دەرهەقت دێت... ". جا بە ناوهێنانی دەوڵەت،

دەیویست هێز و قودرەتی حکومەتمان بیر بهێنێتەوە. پرۆفیسۆرەکانی دیکە، ئەگەر بەقەد ئەویش نەبێ، وەلێ ئەوانیش بە فسکەفسك، ڕەخنەیان لێگرتم.

پرۆفیسۆرەکان ڕستەی (کێشەی ڕۆژهەڵات)یان وەکوو بانگەوازێك بۆ کوردەکان لێك دەدایەوە، ئەمەش بێ ویستی خۆیان بوو. ئەوانەی ڕەخنەیان لێدەگرتم، مامۆستایانی بەشەکانی، زانستە سیاسییەکان و کۆمەڵناسی و مێژوو و مرۆڤناسی و ئابووری و زانستە مرۆڤایەتییەکان بوون.

ئێوارەی ڕۆژی سێیەمی سمینارەکە، کە کۆتا ڕۆژی سمینارەکەش بوو. داوەتی کۆبوونەوەیەك بووم، کە لە ماڵی ئۆیا بایدر ساز دەکرا. لەگەڵ من چەند کەسایەتییەکی ئەکادیمی وەك، شەریف مێردینی و مەتە تونچایی و ئیلتەر توران و ئۆیا بایدار بەشدار بوون. لەوێ شەریف مێردینی باسی توێژینەوەیەکی کرد لە ئیزمیر، کە لەلایەن کۆمەڵێك کەسانی پسپۆری زانستی کۆمەلایەتی ئەنجام دەدرێ. هەروەها باسی لەوەش کرد، کە لێکۆڵینەوەکە لەلایەن ڕێکخراوی زانستە مرۆڤایەتیەکانی تورکەوە هاوکاری و پشتگیری دەکرێ. هەروەها باسی ئەوەی کرد، ئەگەر پرۆژەیەکی لەو شێوەیەش لە دیاربەکر بکرێ کارێکی خراپ نییە. لەو بارەیەوەش داوای لە من کرد، تا ڕاپۆرتێکی سەرەتایی بۆ ئامادە بکەم.

ماوەیەك دواتر ڕاپۆرتەکەم ئامادەکرد و دامە شەریف مێردینی، وەلێ هیچ پێشکەوتنێك لەبارەی پرسەکەوە ڕووی نەدا. چونکە مژارەکە ئەوێ ئێوارێ لە ماڵی ئۆیا بایدار دەستی پێکرد و هەمان

شەویش هەر لەوێ کۆتایی پێهاتبوو. ساڵێك دوای سمینارەکە، کاتێك ڕژێمی ١٢ی ئازار هاتە پێش، دەستگیرکرام و دواتر خرامە زیندان.

## مەهمەت عەلی ئایبار، سانسۆرێکی ڕووکەش

حەسەن حوسێن کۆرکمازگیلی شاعیر (١٩٢٧-١٩٨٤)، لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٦٠، دەستی بە سەرپەرشتی کردنی گۆڤاری (فۆرم) کرد. ئەو کەسێکی نزیك لە پارتی کرێکارانی تورکیا[١] بوو. لەوێ دەمێدا گۆڤارەکە چەندان نووسینی منیشیان بڵاو کردەوە. حەسەن حوسێن ساڵی ١٩٦٩ لە نامەیەکیدا کە بۆ منی ناردبوو، ئاماژەی بەوە کردبوو، جارێکی دیکە لەگەڵ چەند ڕووناکبیرێکی وەك مەهمەت عەلی ئایبار[٢] و یاشار کەمال[٣] و

[١] پارتی کرێکارانی تورکیا لە ساڵی ١٩٦١ لە تورکیا دامەزرا. بەیەکەم پارتی سۆسیالیت دادەنرێ لە تورکیا، کە توانیویەتی پەرلەمانتار بنێرتە پەرلەمان. پارتەکە دوای کودەتای دوازدەی ئەیلولی ساڵی ١٩٨٠ داخرا. مووسا عەنتەر یەکێك بووە لە ئەندامانی ئەو پارتە (وەرگێڕ).

[٢] مەهمەت عەلی ئایبار (١٩٠٨-١٩٩٥) سیاسەتمەدار و مافپەروەر و نووسەر. لە نێوان ساڵانی (١٩٦٢-١٩٦٩) سکرتێری گشتی پارتی کرێکارانی تورکیا بووە و لە نێوان ساڵانی (١٩٧٥-١٩٨٠) سەرۆکی پارتی سۆسیالیتی شۆڕشگێڕی بووە. جگە لەوەی لە دوو خولی جیادا ئەندامی پەرلەمانی تورکیا بووە. (وەرگێڕ).

[٣] یاشار کەمال یاخود کەمال سادق گۆکچەلی (١٩٢٣-٢٠١٥) نووسەری ناوداری کوردی تورك نووس. چیرۆك خوان و ڕۆمان نووسێکی ناوداری جیهانییە و بەشێکی زۆری پەرتووکەکانی وەرگێڕدراونەتە سەر زۆربەی زمانە زیندووەکانی جیهان. (وەرگێڕ).

عابدین دینۆ و باڵابان، دووبارە دەست بە ژیاندنەوەی گۆڤارەکە دەکەن. بۆیە داوای وتارێکی لە من دەکرد.

لەو ماوەیەی بۆ من دیاری کرابوو، نووسینێکم بە ناونیشانی (کێشەکانی ڕۆژهەڵات) نووسی و بۆم ناردن. ماوەیەك دواتر، لەو کتێبخانانەی ئەرزڕووم، کە ڕۆژنامەشیان دەفرۆشت، دانەیەکم لە گۆڤارەکە کڕی. لەوێ سەردەمێدا، لە پاڵ گۆڤاری فۆرم، چەندان ڕۆژنامە و گۆڤاری وەك سۆسیال عەدالەت و دەڤریم و کڤلّجمیش لە ئەرزەڕووم دەفرۆشران.

لە گۆڤارەکەدا وتارەکەی خۆم نەبینی، بۆیە بە تەلەفۆن پەیوەندیم بە کاك حەسەن کرد و ئەوەم پێڕاگەیاند کە، وتارەکەم لە گۆڤارەکەدا بڵاو نەکراوەتەوە. ئەوسا ئەنجامدانی تەلەفۆن لە نێوان دوو شار زۆر دژوار بوو. دەبوو تەلەفۆن بۆ بەداله بکەیت و پاشان ئەوان بەو ژمارەیان دەبەستیەوە کە داوات کردبوو. بۆ ئەوەش کاتێکی زۆری پێویست بوو. وەلێ سەرکەوتوو ببوم لە پەیوەندی گرتن لەگەڵ کاك حەسەن. کاك حەسەن لەوسەری تەلەفۆنەکەوە سەبارەت بە پرسیارەکەی من گوتی "بێشکچی، وتارەکەی تۆ لە فلانە لاپەڕەیە". کاتێك سەیری لاپەڕەکەم کرد، بینیم گۆڕانکاری زۆری بەسەر هێندراوە. بە شێوەیەك ناونیشانی وتارەکەشیان بۆ (کێشەی ڕۆژهەڵات لە پەنجەرەی پۆلەوە) گۆڕی بوو. لە پاڵ ئەمە چەند مانشێتێکی لاوەکی دیکەشیان زیاد کردبوو. ناوەڕۆکی وتارەکەش گۆڕانی بەسەردا هێندرابوو. لە سەرەوەی نووسینەکە، لەسەر ڕەنگێکی تۆخ، بە پیتی ئەستوور ئیسماعیل بێشکچی نووسرابوو، وەلێ زۆر بە سەرنجەوە لێی ورد نەبووبایەوە، ناوەکەت نەدەبینیەوە...

دواتـر بە نـامەیەك دۆخەکەم بە حەسـەن حوسێن کۆرکمازگیـل گـوت و بـۆم نووسـی "ئەوە ڕاسـت نیـیە کە ئەوەنـدە دەسـتکاری نووسـینەکەم کـراوە". کـاك حەسـەن لە مـاوەیەکی کورتـدا، بەو شێوەیە وەڵامی نامەکەی دامەوە "بێشکچی، کاك مەهمەت عەلی، زۆر مژوولـی نووسـینەکانی دیـکەی نـاو گۆڤـارەکە نەبـوو. وەلـێ وتارەکەی تۆی وشە وشە خوێندەوە و لێی ورد بۆوە. بۆیە زۆری لێ گۆڕی و منیش خۆم تێی هەڵنەقورتاند". مەهمەت عەلی ئایبار (١٩٠٨-١٩٩٥) سـاڵی ١٩٦١ بەردەوام نووسـخەیەك لە دەسـتووری تورکیـای لە بـاخەڵی لەگەڵ خـۆی دەگێـڕا. بـۆ ئەمەش دەیویسـت تەواوی بۆچون و ڕووداوەکان هاوتەریبی دەستوور بن. ڕووکەنی سۆسـیالیزم و بۆچـوون و ڕێگـاکەی، سـەرچاوەکەی لە کـاك مەهمەت عەلییەوە سەرچاوەی گرتبوو. ئەو هەژموونێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی بـوو کە لەدوای هێرشـی سـەربازی یەکێتـی سـۆڤیەت بۆسـەر چیکۆسلۆڤاکیا لە ٢٢ تەباخی ١٩٦٨ ڕوویدا و بووە هۆی لەکار لادانی دوبچەکی سەرۆك وەزیران.

## پانێلی ڤارس

ساڵی ١٩٦٨، لە پاڵ دەوامی زانکۆم، وتارم بۆ گۆڤاری فۆرم و ڕۆژنـامەی ئەکشـام دەنووسـی. لەوێ دەمێـدا ڕۆژنـامەی ئەکشـام ئاراسـتەیەکی ئۆپۆزسـیۆنی هەبـوو. چەتـین ئاڵتـان و ئیلهـامی سۆیساڵیش لە ڕۆژنامەی ئەکشام دەیان نووسی. مانگی یەك، یان دووی وەرزی زسـتان بـوو. قوتـابییەکی هاوڕێمـان بە نـاوی جاسـم

لێی پرسیم "کاك ئیسماعیل، ڕێکخراوی خوێندکارانی دەرچووی قارس، لە شارەکەیان پانێلێك ڕێکدەخەن. ئایا ویستی بەشداری کردنـــت هەیە؟". پـــانێلەکە بە هاوبەشـــی لەگەڵ ســـەندیکای مامۆستایانی تورکیا ساز دەکرا. هەروەها قوتابیەکە بەو شێوەیە درێژەی پێدا "لەهەموو کوچەیەکی شاری قارس، ئاگاداری و لافیتە هەڵدەواسین و هەوڵی ئەوە دەدەین خەڵکێکی ئێجگار زۆر بەشداری پانێلەکە بکات. وەلێ پێویستە پرۆفیسۆری جوگرافیاش ئامادە بێت؛ ئایا دەتوانی لەو بارەیەوە قسەی لەگەڵ بکەی؟ بلێتی چوون و هاتن و شوێنی مانەوەی میوانخانە و هەموو شتێکیشی بۆ ڕێکدەخەین". منیش لە وەڵامدا ئەوەم پێ گوت "خۆم دێم و لەگەڵ ئەو پرۆفیسۆرەی باسیشی دەکەی، هەوڵی خۆم دەدەم بۆ هاتنی". بە بێ درەنگ کەوتن، چووم لەگەڵ مامۆستاکە قسەم کرد و هەواڵی ئەوەشم پێدا کە سەرۆکی سەندیکای مامۆستایانی تورکیای شاری ئەرزڕوومیش بەشداری پانێلەکە دەکات. دوای ئەوە، مامۆستاکە ڕازی بوو بۆ بەشداری کردن.

ڕۆژی هەینی یەکێك لە مانگەکانی ناوەڕاستی وەرزی زستان بوو؛ لەبەر بەفر و تەم و مژی وەرزەکە، چاو چاوی نەدەبینی. کەشێکی ساردی کەلە تەزێن بوو هەواکەی. شەمەندەفەر دەمژمێر ١٨.٠٠-١٨.٣٠ هات، دوای ئەوەی کاتێکی زۆر لە وادەی دیاری کراوی خۆی درەنگ کەوت. ڕێگای نێوان قارس و ئەرزڕووم لە کاتی ئاساییدا بە شەمەندەفەر ٤ دەمژمێر بوو، وەلێ ئێمە بە شەش دەمژمێـر گەیشـتین. کـاتێ گەیشـتینە خـاڵی وەسـتانی شـوێنی مەبەست، دەمژمێر ٢٤.٠٠ شەو بوو.

بڕیار بوو لە خاڵی وەستانی شەمەندەفەر لە قارس، جەسیم پێشوازیمان لێبکات، وەلێ کاتێك لەگەڵ مامۆستاکەی تەکم و سەرۆکی سەندیکای مامۆستایانی تورکیای شاری ئەرزڕووم دابەزین، جەسیم دیار نەبوو. لەگەڵ ساردی هەواکە، تەم و مژێکی زۆریش حوکمی خۆی دەکرد. واتە جگە لە جەسیم هەموو شتێك هەبوو. ئێمە وامان لێکدایەوە، لەبەر ئەوەی درەنگ گەیشتووین، جەسیم لەبەر ساردی کەشەکە چاوەڕێی نەکردووین. مامۆستاکەی من هێنابووم، دەستی بە پرتە پرت کرد "بێشکچی لە نێوچاوانی تۆ ئەو شتانەمان بەسەر هاتووە، نازانم بۆ گوێم بۆ گرتی و بەگەڵت کەوتم. ئەی بڕیار نەبوو لە پێشوازیماندا بن؟".

پێشتر چووبوومە قارس، بەڵام تەنیا بە پاس چووبووم، نەك شەمەندەفەر. خاڵی وەستانی شەمەندەفەر دەکەوتە دەرەوەی ڕۆژهەڵاتی شارەکە. جا لەبەر زۆری تەمەکە، گڵۆپی ناو شاریش نەدەبیندرا. بۆ ئەوەی ڕێگای چوونە ناو شاریش بپرسین، عەبدێکی خوامان لەوێ نەدەبینی. بە خەملاندنی خۆمان، بەسەر سکە ئاسنینەکانی شەمەندەفەر دەستمان بە ڕێکردن کرد. دوای ماوەیەکی زۆر بە پێ ڕۆیشتن، گەیشتینە کۆشکێکی بچووك. لەوێ چاودێرێکمان بینی لە ژوورەوە بوو دانیشتبوو. سەبارەت بە ئاراستەی ئەو شوێنەی بۆی دەچووین، کابرا پێی گوتین "بە پێچەوانەوە هاتوون. بۆ ئەمەش دەبێ بگەڕێنەوە خاڵی وەستانی شەمەندەفەر و لەوێ ڕێگاکە لە کەسێك بپرسن". هەموو ئەمانە لەلایەك، بەڵام نزیکەی یەك مەتر بەفر کەوتبوو، بۆیە پێڵاو و گۆرەویەکانمان لەگەڵ ئاو ببووە جل. پەنجەی قاچیشمان تۆزێکی مابوو لە سەرمان ببەستێت. مامۆستاکەی تەکیشم بەردەوام بوو

لەسەر منجە منجەکەی "ئەوەی بەسەرمان دێت، بە هۆی تۆوەیە بێشکچی".

دوای چەند دەمژمێرێك ڕێکردن، لە کۆتایدا توانیمان ڕێگایەك بدۆزینەوە، وەلێ هێشتا هیچ ڕووناهییەك لە دەورروبەرەکە نەبوو. تا گەیشتینە باڵەخانەیەك و گوتم "دەزانم ئێرە کوێیە، بۆیە ئێستا دەتانبەمە میوانخانەکە". لەبەر خۆمەوە بیرم لەوە کردەوە، ڕەنگە بە هۆی درەنگ کەوتنی شەمەندەفەر، ئەو برادەرەی چاوەڕێی ئێمەی دەکرد لەبەر سەرما چووبێتە میوانخانە و لەوێ چاوەڕێمان بکات. لەگەڵ ڕێکردن سەیری دار و دیواری ئەوێم دەکرد، بەڵام هیچ شتێکی هەڵواسراوم نەبینی سەبارەت بە پانێلەکەی بۆی دەچووین. کاتێك گەیشتینە میوانخانەی باڵ پالاس، لە ژوورەوە هیچ گڵۆپێکی داگیرساو نەبوو. بەڵام پیاوێکمان بینی، لەسەر کورسی، لە تەك ئەو سۆبایەی داگیرسابوو، بە دانیشتنەوە خەوتبوو. جەسیم لە میوانخانەکەش نەبوو، وەك چۆن هیچ بانگەشەیەکی هەڵواسراوی پانێلەکەش لە هیچ کوێیەك نەدەکەوتە بەرچاو.

کاتێك گەیشتینە هۆتێلەکە، بەوە دڵی خۆمان خۆشکرد، هیچ نەبێ شەوەکە بە خەوتن لێرە تەواو دەکەین و تۆزێك خۆمان گەرم دەکەینەوە و، بەیانی بە تێرخەوی دەچین بۆ بەشداری کردن لە پانێلەکە؛ بەڵام لەوێش تووشی بێ ئومێدی بووین. چونکە کاتێك کابرای چاودێرمان لەخەو هەڵستاند و پێمان گوت "بەیانی لێرە پانێلێك بەڕێوە دەچێ و بۆ ئەمەش دەبوو بێنە پێشوازی ئێمە" بەڵام .کارمەندەکە ئاگاداری هیچ یەکێك لەو شتانە

نەبوو. بۆیە چاوەکانی هەڵگڵۆفی و ڕووی لە ئێمە کرد "بڕا ئێوە باسی چی دەکەن؟ پانێلی چی و حاڵی چی؟". لە میوانخانە ٥ نهۆمییەکە، هیچ یەکێك لە ژوورەکان سۆبەی لێ دانەگیرسابوو. سەرباری ئەو پێشهاتانە، مامۆستاکەی تەکیشم دەیگوت "من لەگەڵ دوو کەسی دیکە لەیەك ژوور نامێنمەوە. بۆیە ژوورێکی بە تەنیام دەوێ". بەهەر شێوەیەك بێ ژوورێکمان بۆ ئەو دابینکرد. پێڵاو و گۆرەویی و پاچەی پانتۆڵەکانمان تەڕ ببوو. نەدەبوو بەو جلانەی بەریشمانەوە بنووین، چونکە ڕۆژی دواتر بەهەمان جل و بەرگ بەشداری پانێلمان دەکرد، بۆیە بە ناچاری هەموو جلەکانمان داکەند و بە ڕووتی چووینە ناو بالینگان.

ڕۆژی دواتر چاومان بەدوای جەسیم گێڕا، بەڵام لە هیچ شوێنێك نەبوو. لەبەر ئەوەی پێشتر چووبوومە قارس، کاك حەیاتیی سەرۆکی پارتی کرێکارانی تورکیای شارەکەم دەناسی. بە ناچاری چووینە لای ئەو. لە ڕێگا هەر چاوم لەسەر دار و دیواری ڕێگا و بانەکان بوو، تا بزانم هیچ پانکارتێکی سمینارەکە هەڵواسراوە؟ چونکە جەسیم پێی گوتبووم "هەموو شوێنێك بە ئاگادارکردنەوە و لافیتە پڕ دەکەینەوە".

کاتێك کاك حەیاتیمان بینی و بەسەرهاتەکەی خۆمانمان بۆ باسکرد، ئێمەی بردە باڵەخانەی سەندیکای مامۆستایانی تورکیای شارەکە، بەڵام چاوم لەسەر دیوارەکان هەڵنەدەگرت. کە گەیشتینە شوێنەکە، چاوم بە برادەرێك کەوت کە دەرچووی کۆلێژی ئادابی زانکۆی ئەتاتورك بوو لە ئەرزڕووم و ئەوساش مامۆستای ئامادەیی بوو. لە وەڵامی باسکردنی ئەوەی بەسەرماندا هاتبوو

گوتی "واز لەو کلاوچییەی بێنن...! " جا بە خراپە باسی جەسیمی کرد. دواتر تێگەیشتین کە هیچ کەسێك ئاگاداری پانێلێکی لەو شێوەیە نەبوو، چونکە هیچ چالاکیەکی وەها لە گۆڕێ نەبوو. جەسیمە فەندی بەناوی سازکردنی پانێل و بەکارهێنانی ناوی ئێمە پارەی لە هەندێك کەس وەرگرتبوو و خۆی بزر کردبوو. تەنیا ئەوە نەبێ بلیتی شەمەندەفەری نێوان قارس و ئەرزڕوومی بۆ بڕی بووین.

دوای ئەمە دووبارە گەڕاینەوە ئەرزڕووم و بە برادەرانم گوت "جەسیم لە هەرکوێ بێ، بۆم بدۆزنەوە هەندێك شتی پێدەڵێم". بەڵام ئەو لە هیچ شوێنێك خۆی دەرنەدەخست. دەمویست بیگرم، بەڵام بەردەوام خۆی لێ دەشاردمەوە و نەدەکەوتە دەستم. دوای ماوەیەك لەناو شار کەپوومان بەر یەك کەوت و گرتم. هەزار و یەك بێنە و بەردە و درۆ و دەلەسەی کرد، بۆ ئەوەی بەرگری لە خۆی بکات، بەڵام ڕەزیل و سەفیلم کرد. جا جگە لەمە، خۆ هیچی دیکەم لەگەڵ پێنەدەکرا...

## کۆڕبەند لە قامووشان

دووبارە مانگەکانی زستانی ساڵی ١٩٦٩ بوو. لەوێ سەردەمێدا، قارس شارێکی زۆر بە جوڵە بوو. لە قامووشان برادەرێك هاتە لام. ئەو خوێندکاری زانکۆی ئەتاتورك بوو. قوتابییەکە باسی ئەوەی کرد لە ناوچەی قامووشان، لە ژێر ناونیشانی (کێشەکانی بەرەوپێشچوونی ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ) کۆنفڕاسێك ڕێك دەخرێ.

داوای لێکـردم تـا بەشـداری بـکەم. کاتێـك باسـی ئەوەی کـرد، تێچـووی ڕێگـا و شـوێنی مانەوەمـان بـۆدابین دەکـات؛ ئەو بەسەرهاتەم بۆ گێڕاوە کە لە چوونە قارس بۆ بەشداری کردن لە پانێلەکە بەسەرمان هاتبوو. بەڵام ئەو بە دڵنیایەوە بوونی شتێکی وەهای ڕەتکردەوە.

دوای هەفتەیەك، لەگەڵ هاوڕێیەکی شاری ئاگرییم، بە ڕۆژی ڕوونـاك کەوتینە ڕێ؛ بەڵام ئەوێ جارێ بە ئۆتۆبووس چووین. عەلەساس بەرامبەر هەر پێشهاتێك ڕێکاری پێویست دەگرینەبەر. ئەو خوێندکارەی ئێمەی داوەت کردبوو، هاوکات کە ئەندامێکی کۆمەڵەی قوتابیانی دەرچووی خوێندنی باڵا بوو، بڕیار بوو لە تێرمیناڵ پێشوازیمان لێبکات و بمانباتە میوانخانە. کاتێك گەیشتینە قامووشـان و لە ئۆتۆبووس دابەزین، ئەو برادەرەی دەبوو لەوێ بێت، لە ڕاست و چەپی هیچ شوێنێك دیار نەبوو. زۆر بەدوایدا گەڕاین و لێمان پرسی، وەلێ نەماندۆزییەوە. لە شانسی خۆم، حوسێن ئەمیلی سەرۆکی پارتی کرێکارانی تورکیای شارەکەم دەناسی. لەوێ دەمێ دەتتوانی بە پرسیارکردن لە باڵەخانەی پارتی کرێکارانی تورکیا شوێنەکەیان بدۆزیەوە؛ بۆیە لە چایخانە و ڕاست و چەپمان پرسی و توانیمان شوێنەکە بدۆزینەوە و بچینە لای حوسێن ئەمیرلی. هۆکاری هاتنەکەمان بۆ باسکرد، لەوێش هیچ کەسێك ئاگاداری وەها کۆڕبەندێك نەبوو. چونکە وەك ئەوەی قارس، هیچ کۆڕبەندێك لە گۆڕێ نەبوو...

حوسێن ئەمیرلی ڕووی تێکردین و گوتی "مادەم تا ئێرە هاتوونە، چی دەڵێن ئەگەر ئێمە کۆنفڕاسێك ڕێك بخەین؟".

لەسەر داواکاریەکەی کاك حوسێن ڕێك کەوتین و ئێوارەی هەمان ڕۆژ، لە هۆڵێکی بچووکی قوتابخانەی ئامادەیی قامووشان، زیاتر لە ٣٠٠ کەس هاتبوون بۆ گوێگرتن لە کۆڕبەندەکە. لە نێوان ئامادەبوواندا، هەریەکە لە قائیمقام و بەڕێوەبەری پۆلیس و فەرماندەی ژەندرمەش دەبیندران. دوای ئاخافتنێکی کن، حوسێن ئەمیرلی ڕووی لە من کرد و بە گوتنی "ئێستاش ئیسماعیل بێشکچی قسەتان بۆ دەکات". نۆبەتی ئاخافتنەکەی بە مندا. هێشتا نەمگوتبوو "ڕۆژهەلاتی ئەنادۆڵ... " لە پڕ نزیکەی ١٥٠-١٦٠ کەس لە ئامادەبووان، لە ڕیزی پێشەوە و ناوەڕاست و دواوە، خرۆشان و هەستانە سەر پێ و بە تەپ و هۆڕی دەنگی قاچیان هۆڵەکەیان جێهێشت، بەلام قائیمقام و بەرپرسەکانی دیکە بەردەوام بوون لە گوێگرتن. ڕەنگە مەراقی ئەوەیان کردبێ "با بمێنینەوە تا بزانین، بێشکچی چی دەڵێت؟ ئایا باسی شتێکی خراپ دەکا یان نا؟" ئەوانەی دەڕۆیشتن، بە پرۆتێستۆکردنی من، لە هۆڵەکە دەچوونە دەرەوە. وەلێ من نزیکەی دەمژمێرێك و پازدە خولەك ئاخفیم. دواتریش نزیکەی ٤٠ خولەك پرسیار و وەلاممان لەسەر قسەکانی پێشووم کرد. پێم وابێ کۆنفراسێکی زۆر جوانتر و بە سوود تری لێ دەرچوو...

## سەری بێشکچی دەمانچەیە...

لە نێوان سالانی ١٩٦٨-١٩٧٠ لە زانکۆی ئەتاتورك لە ئەرزڕووم، دەستەیەکی هەڤالانمان هەبوو. دکتۆر ئینایەت بەرگمان، مامۆستای فیزیای خاك بوو لە کۆلێژی کشتوکاڵ. ئەحمەد ئاراسیش قوتابی بەشی کارگێڕی بوو. قوددوسی

ئۆزتاشیش ئەندازیاری کارگەی شەکر بوو. ئەحمەد ئەلبەك قوتابی کۆلێژی کشتوکاڵ بوو. ناجی گورشین مامۆستای یاریدەدەر بوو لە کۆلێژی ئاداب. کیرکۆریش مامۆستای یاریدەدەر بوو لە کۆلێژی پزیشکی. ناوەناوەش، هەندێك برادەری دیکەش دەهاتنە ناو دەستەکە.

هەموو ئەو هەڤاڵانەی باسم کرد نا، بەڵام سێ چوارێکمان زوو زوو دەهاتینە با هەڤدوو. زۆربەی کاتیش لەگەڵ مامۆستا ئینایەت بەرگمان بەیەکەوە بووین. ئەو ترومبێلیشی هەبوو، بۆیە هەندێکجار بە ترومبێلەکەی ئەو دەچووینە دەرەوەی ئەرزڕووم بۆ گەشت و سەیران.

لەوێ سەردەمێدا لە ئەرزڕووم و بەتایبەتیش لە زانکۆ، کۆمەڵگایەکی زۆر چالاك و دینامیکی هەبوو. زانکۆ زوو زوو کۆڕبەند و سمینار و گەشتی زانستی ڕێکدەخست. لە نێوان چەپ و ڕاستەکانیش دەمە دەم و نیقاش بەردەوام بوو. زۆر جار بۆ دیدار لەگەڵ مامۆستا ئینایەت لە تاقیگەی کۆلێژی کشتوکاڵ، یان لە ژوورەکەی من لە کۆلێژی ئاداب، بەیەکەوە دەمەتەقێی خۆش و درێژمان دەکرد. لە پاڵ ئێمە بەردەوام چەند هەڤاڵێکی دیکەش بەشداری گفتوگۆکانیان دەکردین. لەناو شاریش بەردەوام لەیەك قاوەخانە گرد دەبووینەوە.

ڕۆژێك لەناو گفتوگۆبووین، ئەحمەد ئاراس بە کەلەجانەوە هاتە لامان و بە دڵە خورپەوە گوتی "کێشە و ناکۆکیەکانی نێوان چەپەکان و ڕاستەکان لە ئەرزڕووم زۆر قوڵ بووەتەوە، چەپەکان لە هەڵکشانن و ڕاستەکانیش لەهەمبەر ئەمە دەستیان بە کاری

ڕێکخراوەیی کردووە. ئیدی پێویستمان بە هەڵگرتنی چەکە...".
ئەحمەد ئاراس دوای ئەو قسانەی، دەمانچەیەکی لەژێر کراسەکەی، لە بەر پشتی دەرهێنا و گوتی "من چەکی خۆم هەڵگرتووە". لە وەڵامدا مامۆستا ئینایەت بە هێمنی گوتی "بێشکچی پێویستی بە دەمانچە هەڵگرتن نییە، چوونکی سەری وەك دەمانچەیە".

لەگەڵ هاتنی ڕژێمی دوازدەی ئازار، تاقمەکەمان لەبەر یەك هەڵوەشاوە و پەرت و بڵاو بووین و کۆتاییان بە ژیانی ئەکادیمم هێنا لە زانکۆی ئەتاتورك. لەو بەرگریکردنانەی لە دادگای دۆخی لەناکاوی سەربازی دیاربەکریش کرا، بەشێك لە برادەران، بەهەر شێوەیەك بووبێ، بڕیاری دووکەوتنەوەیان لە بێشکچی بۆ دەرکرا.

## سەردانی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی کولتووری ڕۆژهەڵات *(DDKO)*

لە پایزی ساڵی ١٩٦٩، کاتێك لە ئەرزڕوومەوە چوومە ئەنقەرە، یەکێك لەو کۆمەڵە و ڕێکخراوانەی سەردانم کردن، کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی کولتووری ڕۆژهەڵات (DDKO)[1] بوو. لە ڕێگای

[1] کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی کولتووری ڕۆژهەڵات، لە ساڵی ١٩٦٩ لەناو قوتابیانی کورد لە باکووری کوردستان و تورکیا لە ئیستانبوڵ دامەزرێندرا، چونکە تا ئەوسا کورد لەناو پارتە کۆمۆنیستییە تورکییەکان کار و چالاکیی سیاسییان دەکرد، بەڵام دوای دامەزراندنی کۆمەڵەکە ئیدی کورد لە ناو کۆمەڵەیەکی تایبەت بە خۆی سیاسەتی دەکرد. کۆمەڵەکە دوای کودەتای سەربازیی ١٩٧١ چالاکییەکانی قەدەغە کرا. (وەرگێڕ).

میـــدیاوە ئاگـــاداری دامەزرانـــدنی ئەو کـــۆمەڵەیە ببـــووم. ناونیشانەکەشیان کەوتبووە نهۆمی یەکەمی باڵەخانەیەك، لەسەر ڕێگای نێوان ناوچەی کزلایی و جەبەجی، لە شەقامی زیا گۆك ئالپ.

لەوێ، لەگەڵ کۆمەڵەیەکی تازە و هەڤاڵی نوێ یەکدیمان ناس دەکرد، بۆیەش کەلەجانم پێوە دیار بوو. دەستم بە زەنگی دەرگاکەوە ناو، لە چەند چرکەیەکدا قاپیەکەیان کردەوە. کە ئومێد فوراتم بینی دەرگاکەی کردەوە، زۆر دڵخۆش بووم. هەستێکی دڵخۆشکەر لەناخم چەکەرەی کرد، کە هاتوومەتە شوێنێکی ڕاست. ئەوێ ڕۆژێ، لەوێ، لەگەڵ زۆر کەسی چاك یەکدیمان ناسی. کاك جانیبیشم لەوێ بینی. چونکە جانیب یڵدرمم[1] لە میتینگەکان ساڵی ١٩٦٧ەوە دەناسی.

لە ئێوارەی ئەوێ ڕۆژێ، لەگەڵ هەریەکە لە ئیحسان ئاکسۆیی و سولێمان دەمیرکاپی بەیەکەوە چووینە دەرەوە. بە مەش کردن، تاوەکوو لای باڵەخانەی کۆلێژ چووین. لەبەردەم دەرگای کۆلێژی زانستە سیاسییەکانەوە، تا پەیمانگای هونەرە جوانەکانیش هەر بە پێ ڕێمان کرد. لەوێ، بەشە ناوخۆییەکی قوتابییانی دیاربەکر هەبوو. ئیحسان و سولێمان لەوێ دەمانەوە.

---

[1] جانیب یڵدرم (١٩٢٥-٢٠١٥) سیاسەتمەدار و پارێزەری کورد، یەکێکە لەو کەسایەتیانەی باکووری کوردستان کە گەواهیدەری زۆر ڕووداوی مێژوویی و دیاری ناو خەباتی بزوتنەوەی کوردییە لە باکووری کوردستان و تورکیا. (وەرگێڕ).

## کۆڕبەندی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی کولتووری ڕۆژهەڵات (DDKO) لە ئەنقەرە

لە یەکەمین هەفتەی مانگی سێی ساڵی ۱۹۷۰، بە سەردانێك چووومە ئەنقەرە. لەوێ، سەرێکم لە بارەگای کۆمەڵەی شۆڕشگێڕانی کولتووری ڕۆژهەڵات دا. برادەرانی ئەوێ، دەیانویست بەر لەوەی لە ئەنقەرە بڕۆم، لە بارەگای کۆمەڵەکەیان کۆڕبەندێك پێشکەش بکەم. وا ڕێککەوتبوو، چەند ڕۆژێك بەر لەو سەردانە پەرتووکەکەم بەناوی (ڕێکخستنی سۆسیۆ ئیکۆنۆمی و ژێرخانی نەتەوەیی ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ) تازە بڵاو ببۆوە. کۆڕبەندەکەش هەر سەبارەت بە کیتابەکە دەبوو. بۆیە منیش داواکەیانم ڕەتنەکردەوە و دەستم بە خۆئامادەکردن کرد.

لەو ڕۆژانەی لە ئەنقەرە بووم، لە بەرواری یازدەمین ڕۆژی مانگی سێی ساڵی ۱۹۷۰، ڕێککەوتنی یازدەی ئازار لە نێوان، مەلا مستەفا بارزانی و سەددام حوسێن لەسەر پێدانی مافی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان واژووی لەسەر کرابوو. ڕێککەوتنەکە لەناو گەلی کورد، ببووە مایەی دڵخۆشیی و شادی و، خرۆشانێکی تازەی دروست کردبوو. بەوێ شێوەیێ، کۆڕبەندەکە ڕۆژێك دوای ئەو ڕێککەوتنە، واتە لە ۱۲ ئازار ساز کرا. بڕیاریشم دابوو، تا باس لە ڕێککەوتنامەکەش بکەم.

بارەگای کۆمەڵەکە لە شەقامی گۆك ئاڵپ، لە شوێنێکی بچووك بوو. وەلێ خەڵکێکی زۆر هاتبوون و قەرەباڵغیەکی زۆر دروست ببوو. بۆئەوەی ئامادەبووان گوێبیستی تەواوی قسەکانم بن، دەرگای نێوان ژوورەکانیان خستبووە سەر پشت. لە ساتەوەختی قسەکانم، ناوی شارە کوردییەکانی وەك دیاربەکر و وان و ئاگری

و موش و قارس و بەدلیسم دەهێنا؛ کاتێك ناوی ڕوهام هێنا، گوێم لە ڕستەیەك بوو، یەکێك دەیگوت "کاکۆ سیوێرەگ، کاکۆ سیوێرەگ[1]". لەگەڵ من ئامادەبوانیش گوێبیستی بوون و لەگەڵ ئەوە کەنینەوە. لەبەر ئەوەی شوێنەکە تژی گوێگر بوو، بۆیە نەمزانی دەنگەکە لەکوێوە هاتە بەر گوێچکەم. پێم وابێ ئەویش لەبەر قەرەباڵغی گوێبیستی ناوی ڕوها نەبوو. بۆیە هەمدیسان دەستم بە گوتنەوەی ناوی شارە کوردییەکان کردەوە. دووبارە کە گوتم ڕوها، دیسان گوتیەوە "کاکۆ سیوێڕەگ، کاکۆ سیوێڕەگ"، بەڵام ئەوجارە بە دەنگێکی بەرزتر، بەڵام بە تۆنێکی ڕەحەت و نەرم و پڕ ئاواز... ئەو برادەرەی لە تەك من وەستابوو، ڕووی لە من کرد و گوتی "کاك ئیسماعیل، دەبێ سیوێڕەگیش جیا لە ڕوها ناوی بهێندرێ، وا پێدەچێ ئەو هەڤاڵە مەبەستی ئەوە بێت".

ئەو کۆڕبەندەی لە دوازدەی ئازار، لە بارەگای کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی کولتووری ڕۆژهەڵات، پێشکەشم کرد، دواتر لە سەردەمی ڕژێمی دوازدەی ئازاری تورکیا، بووە هۆکاری ئەوەی داوام لەسەر بکەنەوە. کۆڕبەندەکەش دژی من و کۆمەڵەکە، ببووە بەڵگەیەکی تۆمارکراو لەسەرمان، جگە لە دانە پاڵی چەندان تۆمەتی دیکەش.

وتاری کۆڕبەندەکە، لەلایەن ئەندامانی میتەوە، لهسەر کاسێتێك تۆمار کرابوو و خرابووە ناو ئەو دۆسیەیەی لەسەرم کرابۆوە. بە ئەگەرێکی زۆر، میت، ئەو کارەی لە ڕێگای کەسێکەوە کردبوو کە بە شداری کۆڕبەندەکەی کردبووین. هەروەها نیوەڕۆکی ناو وتارەکەشیان لە ڕێگای گوێگرتن لە کاسێتەکە نووسیبۆوە. لە

[1] یەکێکە لە قەزاکانی شاری ڕوها لە باکووری کوردستان. (وەرگێڕ).

کاتی لێکۆڵینەوەی دادگا، دانم بەوەدا نا، کە ئەو وتارە هی منە و لە بارەگـای ئەنـقەرەی کـۆمەڵەی شۆڕشـگێڕی کولتـووری ڕۆژهەڵات پێشکەشم کردووە. کەچی سەرباری ئەوە، کەسێکیان دامەزراند تا جارێکی دیکە دەنگی ناو کاسێتەکە تەفریغ بکاتەوە و بە کۆمپیوتەر بنووسرێتەوە. بە بڕیاری دادگا هەریەکە لە ڕدڤان چۆنگور و جان گورزاپ و دوو کەسی دیکەش لە کەناڵی تە ڕە تە TRT بەشـداری دانیشـتنەکانی دادگـایی کردنەکەیـان کـردم، وەکـوو لایەنـی شـارەزا لە پرسـی تۆمـارکردنی دەنـگ. پـێم وابـێ لەوێش هەر ئەو دەستەیە دەنگیان تۆمار کردم. بە پشت بەستن بە دەنـگە نـوێیەکە، جـارێکی دیـکە دەنگـی تۆمـارکراوی نـاو کۆڕبەندەکەیان نووسیەوە. لە کاتێکدا، خۆم گوتبووم ئەوە دەنگی منە، بۆیە پێویستی بەوە نەبوو کەسانێکی شارەزا لە بوارەکە بێنن و ئەوەندە خۆیان بە تۆمارکردنی دەنگەوە مژوول بکەن.

دوای لێخۆشـبوونە گشتییەکەی ساڵی ١٩٧٤، ڕۆژێ کاتێك لە نـاوچەی کزلای پیاسـەم دەکرد، کەڵکەڵەی ئەوە کەوتە سـەرم بۆ ئەوەی بزانم بارەگای ئەنقەرەی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی کولتووری ڕۆژهەڵات چـــی لێهـــاتووە. لەگەڵ بـــرادەران بەرەو ئەوێ هەنگاوەکانمـان خێراکـرد. کە گەیشـتین، بینـیم ئەو باڵەخـانەیەی بارەگـای کـۆمەڵەی لێبـوو، ڕووخێنـدرابوو و لە شـوێنی ئەویـش باڵەخانەیەکی گەورەی چەند نهۆمی لێ چێ کرابوو. لە ڕێڕەوی چـوونە ژوورەوەش، لە شـوێنی بارەگـای کـۆمەڵەکە، قاوەخـانەیەك دروسـت کرابـوو و ناویـان لێنـابوو (دیـنلەمە کراتهانەسـی [1]). ناوەکەی بۆ من جێگای تێڕامان بوو.

---

[1] قاوەخانەی گوێگر. (وەرگێڕ).

لە چەپەوە: نەسلیهان گەنجە، جەمال ئۆزگوڤەن، عەزیز ئۆزگوڤەن،
نەناسراو، ئیسماعیل بێشکچی. ئەرزڕووم، ١٩٦٩

لە راستەوە ئیسماعیل بێشکچی دەستی بە زنجیر بەستراوەتەوە و پۆلیسێك قۆڵی گرتووە، لە دواوەش لەوەند کاناتی پارێزەری. مانگی دووی ساڵی ١٩٩٤.

# بەشی سێیەم
# قوربانیی پێداگریی،
# لە زانست بێکاری - دادگاییکردن - زیندان

## کورد و شۆڕشی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی بەنگلادیش

لە بیستەمین ڕۆژی، مانگی حەفتی ساڵی ١٩٧٠، لە زانکۆی ئەتاتورك کۆتایی بە کاری ئەکادیمیم هێنرا. منیش ڕاستەوخۆ هانام بردە بەر دادگای باڵای کارگێڕی. ئەوانیش لە ماوەیەکی کورتدا، داوای ڕاگرتنی بڕیاری دەرکردنەکەمیان دا. وەلێ زانکۆ، تا بەرواری مانگی دوازدەی ساڵی ١٩٧٠ فەرمانەکەی جێبەجێ نەکرد. لەوێ ڕێککەوتێوە، ئیدی بۆ کۆلێژی زانستە سیاسییەکانی زانکۆی ئەنقەرە گوازرامەوە. کاتێك کاروباری گواستنەوەم بۆ زانکۆ تازەکە دەستی پێکرد، بۆ ئەوەی ئیشەکەم تەگەرەی بکەوێتە پێش، زانکۆ کۆنەکەم دەستی بە جێبەجێکردنی بڕیاری دادگای باڵای کارگێڕی کرد. وەلێ من ئیدی لە زانکۆی ئەنقەرە دەستم بە دەوامی خۆم کرد و فەرمانی کارگێڕی کارکردنم بۆ دەرچوو.

لە سەردەمی ڕژێمی دوازدەی ئازار، لە کۆلێژی زانستە سیاسییەکانی زانکۆی ئەنقەرە، زوو زوو کۆبوونەوە و کۆڕبەند ساز دەکرا. ئەو جڤینانە مەبەستیان بوو، تا ئەوە بزانن، بەرامبەر بە ڕژێمی تازە پێویستە چ ڕێکارێك بگردرێتەبەر؟ کۆڕ و

کۆبوونەوەکان زۆر قەرەباڵغ دەبوو؛ بەشێکی زۆری مامۆستاکان بەشدارییان دەکرد و، هەموو کەسێك بیروبۆچوونی خۆی بەیان دەکرد و گەنگەشە دەکرا. لە مانگەکانی پێنج و شەشی ساڵی ۱۹۷۱، ئەو جۆرە کۆڕ و کۆبوونەوانە زۆر زیادی کرد.

لەوێ دەمێدا، شۆڕشی ڕزگاریی خوازی نەتەوەیی بەنگلادیش، دژ بە پاکستان گەیشتبووە لووتکە. لە ڕۆژهەڵاتی پاکستان، بەنگلادیش دەیویست لەو وڵاتە جیا ببێتەوە. یەحیا خانی[1] سەرکردەی پاکستان، بۆ ڕێگریکردن لە شۆڕش و سەرهەڵدانی بەنگلادشییەکان، ڕووبەڕووبوونەوەکانی گەیاندبووە ئاستی تیرۆر.

لەناو ئەو کۆڕ و کۆبوونەوە و کۆڕبەندانەی لە زانکۆ دەکرا، منیش لەناو یەکێك لە کۆڕبەندەکان، وتارێکم دا. لەوێ دەمێدا کورد و کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی کولتووری ڕۆژهەڵات، بەردەوام و بێ پسانەوە داوای مافە دیموکراتییەکانیان دەکرد. منیش لە وتارە کورتەکەمدا، بەشێك لەو داواکاریانەم هێنا زمان و گوتم "پێویستە دان بە مافە دیموکراتییەکانی کورددا بندرێت. بۆیە ئەگەر حکوومەتی تورکیا، گوێ بە داواکاریەکانی کورد نەدا، ئیدی کورد باس لە مافە سیاسییەکانیشیان دەکەن". پاشان باسی شۆڕشی بەنگلادشییەکانم کرد دژ بە پاکستان.

ڕاگری کولێژ، پرۆفیسۆر دکتۆر مومتاز سۆیسال بوو. ڕۆژی دواتر، لەگەڵ بەشێك لە مامۆستای بەشەکان، لەبەردەم ژووری

---

[1] ئاغا محەمەد یەحیا خان (۱۹۱۷-۱۹۸۰) سیاسەتمەدار و فەرماندەی سەربازی، لە نێوان ساڵانی (۱۹۶۹-۱۹۷۱) سەرۆککۆماری پاکستان بوو.(وەرگێڕ).

ڕاگری کۆلێژ، لە نێوان خۆمان، بەسەر پێوە خەریکی قسە و دەمەتەقێ بووین. لەوان ڕۆژاندا، لە کۆلێژ، زۆر بە چڕی پشکنینی پۆلیس هەبوو. بە شێوەیەك، ڕەفی پەرتووکخانەشیان دەپشکنی. لەدەمەو وەختی گفتوگۆی ئێمە، مامۆستا مومتاز هات و، کاتێ چووە ژوورەوە، منی بینی و پێی گوتم "ئیسماعیل لەگەڵ من وەرە، با بچینە ژوورەوە". لە ئۆدەکەی خۆی درێژەی بە قسەکانیدا "دوێنێ کاتێك تۆ دەئاخفی، کێ لە ژوورەوە بوو؟". منیش وەڵامم داوە "زۆر قەرەباڵغ بوو، هەموو کەسێکی لێبوو".

مامۆستا لەسەر پرسیارەکەی خۆی پێداگیری نەکرد، بەڵام ئەمانەی بۆ قسەکەی زیاد کرد "دوێنێ ئێوارە، لە سەرۆکایەتی وەزیرانی تورکیاوە تەلەفۆنیان بۆ کردم و لەسەر ئەوە ڕەخنەیان لێگرتم، چۆن دەبێ لە کۆلێژی زانستە سیاسییەکان، ڕێگا بە وەها ئاخافتن و کۆڕبەندێك بدرێت؟ هەروەها بۆچی ڕێگا خۆش دەکەن تا ئەو جۆرە وتارانە بڵاو ببنەوە؟". ئەو کەسەی تەلەفۆنیشی بۆ کردم، سەعدی کۆچاشی ڕاوێژکاری کاروباری سیاسیی سەرۆك وەزیران بوو.

لە سێزدەمین ڕۆژی مانگی حەفتی ساڵی ١٩٧١، مامۆستا مومتاز لەناو کۆلێژ دەستگیرکرا و خرایە زیندان. منیش شەش ڕۆژ دواتر، لەناو باڵەخانەی زانکۆ، بەهەمان شێوە دەستگیرکرام و بردرامە دیاربەکر. وەلێ لەکاتی دادگایی کردنم، بە هیچ شێوەیەك ئەو پرسەیان لەگەڵم نەکردەوە. چونکە لە هەموو ئەو تۆمەتانەی بۆم هەڵبەسترابوون، لە زۆر کات و شوێنی جیاواز، ئەو پرسە نەکرابۆوە.

مامۆستا مومتاز بە هۆی پەرتووکەکەی بەناوی (پێشەکییەك بۆ دەستوور) دادگایی دەکرا. وەلێ لەو باوەڕەدام لە دادگایی کردنی مامۆستاشدا ئەو بابەتەی من باس نەکرابێ. بە بۆچوونی خۆشم، هۆکاری ئەو باس نەکردنە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، ئەو کەسەی زمانی لێدابووم لەسەر وتارەکەی ئەوێ ڕۆژێم، داوای ئاشکرا نەکردنی ناوەکەی خۆی کردبوو لەو بارەیەوە.

## یەکدیناسین لەگەڵ چەندان لایەنی دیکەی زانستی - فەرماندەیی دۆخی ئاوەرتە و زیندانی سەربازی سەیران تەپە لە ساڵی ١٩٧١

لە ناوەڕاستی مانگی پێنج، لەلایەن ڕژێمی دوازدەی ئازارەوە، دوای ئەوەی دەستگیرکرام و بردرامە دیاربەکر؛ شەوێك لە بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی دیاربەکر دەستبەسەر مامەوە. دواتر ڕادەستی بەندیخانەی سەربازەی فەرمانەدەیی دۆخی لەناکاو کرام. لە قاوشەکەی من، دکتۆر تارق زیا ئەکینجی[١] و یوسف ئەکینجی و دکتۆر ناجی کوتلایی[٢] و مووسا عەنتەر[٣] و جانیب یڵدرم و

---

[١] تارق زیا ئەکینجی لە دایك بووی ساڵی ١٩٢٥. سیاسەتمەدار و دکتۆر و نووسەرێکی کوردە و لە نێوان ساڵانی (١٩٦٥-١٩٦٩) پەرلەمانتاری پارتی کرێکارانی تورکیا بووە. (وەرگێڕ).

[٢] ناجی کوتلای، نووسەر و دکتۆر و ڕۆژنامەڤانێکی کوردە. ئەو لە ساڵی ١٩٣١ لە شاری ئاگری باکووری کوردستان لە دایك بووە. یەکێکە لە گیراوانی دەستەی چلونۆکان و لە زیندان هەڤاڵی مووسا عەنتەر بووە. (وەرگێڕ).

[٣] مووسا عەنتەر یان ئاپێ مووسا (١٩٢٠-١٩٩٢) نووسەر و ڕۆژنامەڤانێکی کوردی شاری مێردینی باکووری کوردستانە. بەهۆی نووسین و پەرتووك و =

مەهدی زانا[١] و نیازی تاتڵجی و محەمەد ئەمین بۆزئارسلان[٢] و بەهادین ئەریلماز و عەبدولڕەحمان ئوچەمان و ئەدیپ قەرەهان و چەندانی دۆستی دیکەی لێ بوو. بینینی ئەو دۆستانە، دڵخۆشی کردم و هەموو دوودڵی و ناڕەحەتیەکانم ڕەویەوە. ئەو برادەرانەم لە پارتی کرێکارانی تورکیا و میتینگەکانی ڕۆژهەڵاتی تورکیا ناسی بوو.

لەوێ باسی ئەوەیان بۆ کردم، چەند ڕۆژێك پێشتریش، هەریەکە لە یومنوو بوداك و عەلی بەی کۆیلوو و ئیبراهیم گوچلوو و مومتاز کۆتان و ئیحسان ئاکسۆیی و عیسا گەچیت و

---

هەڵوێست و ڕەخنەکانی لە دەوڵەتی تورکیا، بەرامبەر بە بەرگری کردن لە گەلی کورد و زمانەکەی،ساڵەهای ساڵ کەوتۆتە زیندان. خاوەن چەندان پەرتووکی گرنگە بە زمانی کوردی شێوەزاری کرمانجی و زمانی تورکی. پەرتووکی (بیرەوەریەکانم) وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی کوردی شێوەزاری سۆرانی. ساڵی ١٩٩٢ دەستێکی ڕەشی نادیار، کە تا ئێستا دادگاکانی تورکیا ساغیان نەکردۆتەوە بە فەرمی کێ بووە، لە کوچەیەکی تاریکی دیاربەکر، لە پشتڕا مووسا عەنتەر شەهید دەکا. (وەرگێڕ).

[١] مەهدی زانا، سیاسەتمەدارێکی کوردە و لە ساڵی ١٩٤٠ لە دایك بووە. زانا هاوسەری سیاسەتمەداری ناوداری کورد، لەیلا زانایە. لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٧٨ی شارەوانی تورکیا، وەکو بەربژێرێکی سەربەخۆ خۆی بۆ سەرۆکی شارەوانی دیاربەکرد هەڵبژارد و توانی هەڵبژاردنەکە بباتەوە و ببێتە سەرۆکی شارەوانی گەورەی دیاربەکر. زانا بەهۆی ژیانی سیاسیەوە ١٦ ساڵ لە زیندان بووە و ئێستا لە ئەوڕوپا ژیان بەسەر دەبات. (وەرگێڕ).

[٢] محەمەد ئەمین بۆزئارسلان، سیاسەتمەدار و نووسەری ناوداری کورد، لە ساڵی ١٩٣٥ لە دیاربەکری باکووری کوردستان هاتۆتە دونیا. محەمەد ئەمین باوکی نووسەری ناودار حەمید بۆزئارسلانە. خاوەنی یەکەم پەرتووکی چاپکراوی کوردییە بە پیتی لاتینی کوردی لە تورکیا. بەناوی ( ئەلف و بێی کوردی). (وەرگێڕ).

تەحسین ئەکینجی و سولێمان کوتایی و ئیبراهیم کوتلایی و زولکوفر بیلگین و چەندانی دیکە لە قاوشی دەستبەسەرییەوە بۆ ئێرەیان هێناون.

یومنوو بوداك، جل و بەرگێکی سەربازی لەبەر بوو. ئەو دەستە جلەی لە قوتابخانەی جێگری ئەفسەرییەوە لەگەڵ خۆی هێنابوو. هەردووکمان سەرەتا لە دادگای ناو شورای دیاربەکر، دواتریش دۆسیەکانمان بۆ دادگای سەربازی فەرماندەیی لەناکاو گوازرایەوە. فەرمانی دەستگیرکردنی غیابی، بۆ دەستگیرکردنی ڕووبەڕوو و خستنە زیندان گۆڕدرا...

کاتێك لە دادگای سەربازی دۆخی لەناکاو دەرچووین، لەگەڵ کۆر گەنەراڵ سوعات ئاك تولگای تووشی یەك بووین. ئەویش لە باڵەخانەکە دەردەچوو. کاتێك ئێمەی بینی، لێی پرسین ئێوە کێن و لە کوێوە بۆ ئێرە هێندراون؟ منیش ئەوەم بۆ باسکرد کە، مامۆستای یاریدەدەرم لە کۆلێژی زانستە سیاسییەکانی زانکۆی ئەنقەرە و لەوێ دەستگیر کراوم و هێندراومەتە ئێرە. یومنووش بە هەمان شێوە وەڵامی داوە کە خەڵکی دیاربەکرە و لە بنەماڵەی هازر ئۆغلووە و لە قوتابخانەی جێگری ئەفسەری دەستگیرکراوە و هێندراوەتە ئەوێ. فەرماندەکە ڕووی لە من کرد و پرسی "مامۆستا بۆچوونت چییە لەسەر ئەنارشیستی؟" "وەڵامی ئەو پرسیارە لەسەر پێیان نادرێتەوە و لە دادگا ئەو وەڵامە دەدەمەوە". ئاوا وەڵامی پرسیارەکەی ئەوم داوە. ئەو فەرماندەی حەفتەمی هێزی پیادە بوو. لەهەمان کات فەرماندەی دۆخی ئاوەرتەی دیاربەکر و سیرتیش بوو.

بەنـدیخانەی دۆخـی لەناکـاو لە نـاوچەی سـەیران تەپە بـوو. قاوشـــی ئەوانەی دەستبەســـەر بـــوون، لەگەڵ ئەوانەی زینـــدانی کرابـوون، لەیەك جیـاواز بـوو. لە نێوانیشـیان مەیـدانێکی گەورە هەبوو. لە ڕۆژانـی سـەردانی کـردن، هەموو کەسێك بۆی هەبوو لەگەڵ ســەردانیکەرانیان یەکــدی ببیـــنن. لە نازنـــاوی میـــوان و زینـدانیەکانیان نەدەپێچـاوە. ڕۆژانەش دەبـوو هەمـوو بەیانیـان لەو مەیدانە و لە دەوروبەری زیندانەکە وەرزش بکرێ.

هەر لەیەکەم ڕۆژەوە، بەشــداری ئەو دەســـتەیەم کــرد کە لە سـەرەوە ناویـانم هێنـا. دواتـریش بەشـداری کـۆمەڵەی قوتابییەکـانم کـرد. لە کۆتاییەکـانی ساڵی ١٩٧١، بەنـدیخانەی دۆخـی لەناکـاوی نـاوچەی سـەیران تەپە، بـۆ شـوێنێکی نزیـك لە ڕووبـاری دیجـلە گوازرایەوە.

## دادگاییە بێ بینەرەکان

دوای دەسـتگیرکردنم، لە دادگـای سـەربازی دۆخـی لەناکـاوی دیاربەکر و سیرت دادگـایی دەکـرام. مژاری دادگـایی کـردنەکەم، بریتـی بـوو لە نـاوەڕۆکی ئەو بابەتـانەی لە وانەکـانی کـۆلێژ بە قوتابیـــانم دابـــووەوە، لەگەڵ ئەو پرســـیارانەی لە تاقیکردنەوەکـــان هێنـابوومەوە، لە وانەی کۆمەڵناسـی زانکـۆی ئەتـاتورك، لە نیـوان ساڵانی ١٩٦٧-١٩٦٨، هەروەهـا لەگەڵ ئەو وتـارانەی لە ڕۆژنـامە و گۆڤارەکـان بـڵاوم کردبۆوە، لە پـاڵ ئەو لێـدوان و ئاخافتنـانەی لە کۆڕ و کۆبوونەوە و کۆڕبەندەکان دەمدا.

دانیشتنەکانی دادگا بە بێ ئامادەبوونی هیچ گوێگرێك بەڕێوە دەچوو. لە کاتێکدا، لە دادگایە سەربازییەکانی دۆخی ئاوەرتەی ئیستانبووڵ و ئیزمیر و ئەنقەرە و ئێسکی شەهیر، کە لەوێش دۆخی لەناکاو هەبوو، باس لەوە دەکرا، گوێگر بەشداری دانیشتنەکانی دادگا دەکات. لەو ڕێگایەشەوە چۆنییەتی بەرێوەچوونی دادگاکان دەگەیشتە میدیاکان. بەڵام لە دانیشتنی دادگاکانی دیاربەکر، هیچ کەسێك بۆی نەبوو ئامادە بێت، بەلای کەمەوە هیچ کەسێك لە دانیشتنەکانی مندا ئامادە نەبوو.

لەناو یەکێك لەو ڕۆژانەی دانیشتنی دادگام بەڕێوە دەچوو، هەستم بەوە کرد، کچێکی گەنجی قوتابی ئامادەیی، لە ڕیزەکانی دواوەی هۆڵی دادگاکە دانیشتووە و گوێ لە دادگایی کردنەکە دەگرێ. لەوێ بۆ پاراستنی ئاسایشی دادگاکە، کەسێك دیاری کرابوو. ئەویش بە ناچاری گوێگری دادگایی کردنەکە بوو. چەند جارێکیش چەندان قسەی باشی لەبەرژەوەندی من کرد، بۆ بەرگری کردن لە دۆسییەکەم. لەو کابرایەوە دواتر زانیم، کچە گەنجەکە، کیژی ئەو داواکارە گشتییە بوو کە سەرپەرشتی دۆسیەکەی منی دەکرد. دوای دانیشتنی دادگا، لەگەڵ باوکی ببووە دەمەقاڵێیان و پێی گوتبوو "ئەو شتانەی بێشکچی باسی دەکات، ڕاست و حەقە. چونکە ئێوە بە نکۆڵی کردن لە بوونی کورد و زمانەکەی، ناحەقی دەکەن. منیش لە قوتابخانە برادەری کوردم هەیە، کاتێك دەپەیڤن هیچ شتێکیان لێ تێناگەم، بۆیە بە دڵنیایەوە زمانێك هەیە بە ناوی زمانی کوردی... ". لە دوای بوویەرەکە، ئیدی ڕێگا بە هیچ کەسێکی دیکە نەدرا، تا بەشداری دانیشتنەکانی دادگا بکات. تەنیا چەند پارێزەرێك نەبێ.

لەوێ دەمێدا، لەگەڵ مەهدی زانا، لەیەك قاوش دەماینەوە. ئەو لەسەر دۆسیەی کۆمەڵەی شۆڕشگێری کولتووری ڕۆژهەڵات دادگایی دەکرا. ڕۆژێك لەگەڵ کاك مەهدی باسی ئەوەم کرد، هیچ کەسێك نایەت بەشداری دانیشتنەکانی دادگایی کردنەکەم بکات؛ بەڵام ئەوەم بە توندی پێ گوت. لە وەڵامدا گوتی "بە شاگردەکەم دەڵێم، ئەوجارە لەگەڵ برادەرەکانی بێن و بەشداری دانیشتنەکانی دادگایی کردنەکەت بکەن". چەند ڕۆژێك دواتر لە کاتی سەردانیکردندا، مەهدی زانا بە شاگردەکەی خۆی گوتبوو" بەشداری دانیشتنەکانی دادگایی کردنی کاك ئیسماعیل بکەن" بۆ ئەمەش بەرواری نزیکترین دانیشتنی دادگایی کردنمی پێ گوتبوون. مستەفا ئاری شاگردی مەهدی زانا و وەستا نیازی، ئەوسا تەمەنی ١٥ساڵ بوو.

مستەفا ئاری بۆ بەشداری کردن لە دانیشتنی دادگا هاتبوو، بەڵام سەرەتا دەبوو ئاسایشی بەردەرگا ڕێگای بدەن بێتە ژوورەوە. یەکێك لەسەربازەکانی پرسگە پرسیاری ئەوەی لێکردبوو، بۆچی هاتوویەتە ئێرە؟ ئەویش لە وەڵامدا گوتبووی "بەشداری دانیشتنی دادگایی ئیسماعیل بێشکچی دەکەم". بەڵام سەربازەکە بەو وەڵامە زۆر پەست دەبێ: "ئیسماعیل بێشکچی چی تۆیە؟" ئاوا وەڵامی شاگردەکەی مەهدی زانای دابۆوە. وەلێ مستەفا ئاری بە بێ ئەوەی خۆی سەغڵەت بکات دەڵێ "ئیسماعیل بێشکچی کوڕی خالتکی منە". بەڵام سەربازەکە زیاتر دەهری دەبێ و لێی دەخووڕێتەوە "هەتیوو، تۆ خەڵکی بیسمیلی و بێشکچیش خەڵکی چۆروومە، بەس تێم ناگەیەنی ئیسماعیل چۆن دەبێتە کوڕی پووری تۆ؟" سەربازەکەی بەردەرگا بەو شێوەیە بەردەوام دەبێ

لەسەر ئاخافتنەکەی "لەو ناوە سکتربە و لەبەرچاوم مەمێنە. جارێکی دیکەش نەیەوە بەو ناوەدا، چونکە ئەگەر لێرە بتبینمەوە، پێچکت دەشکێنم و ئەو کەلە سەرەت دەتەقێنم". بەو شێوەیە هەڕشە لە مستەفا ئاری دەکا و ناهێڵێ بێتە ژوورەوە... مستەفا ئاری لە دیداری داهاتووی خۆی، ڕووداوەکە بە مەهدی زانا دەڵێ و ئەویش بۆ منی گێڕاوە.

لەوێ سەردەمێدا، دانیشتنەکانی دادگا بەوێ شێوەیێ، بە بێ ئامادەبوونی هیچ کەسێك بەڕێوەدەچوو. بۆیە هیچ وردەکارییەك نەدەگەیشتە دەستی میدیاکان. تەنیا بەرواری دەستپێکردن و کۆتایی هاتن و ئەنجامەکانی دادگا، لەلایەن فەرماندەیی دۆخی لەناکاو بڵاودەکرایەوە.

ڕۆژ هات و ڕۆی، ساڵی ۲۰۱۸ کاتێك لە پیشانگای پەرتووك لە دیاربەکر، لەگەڵ بەشێك لە خوێنەران خەریکی دەمەتەقێ بووین، باسی ئەو ڕووداوە و ڕژێمی دوازدەی ئازارم بۆ دەکردن. ڕۆژی دواتر، لەو شوێنەی بۆ ئێمە دیاری کرابوو لە پێشانگاکە، پیاوێك هاتە لامان. لەگەڵ خۆشی چەند منداڵێکی هێنابوو، هەندێکیان زۆر بچووکیش بوون. کابرا لێم نزیك بۆوە و هاتە لام و گوتی "کاك ئیسماعیل، من ئەو شاگردەم، کە دوێنێ تۆ باست کرد؛ شاگردی مەهدی زانا و وەستا نیازی. ئەوسا تەمەنم ١٥ ساڵان بوو، ئێستاش ڕێك ٦٠ ساڵم تەواو کردووە. نهاشی لەگەڵدابێ هەر کاری بەرگدووری دەکەم و ئەو منداڵانەی دەشیانبینی، ڕۆڵە و نەوەی منن". مەهدی زاناش لە پەرتووکی (زەلال) باسی هەمان چیرۆك و بەسەرهات دەکات.

## زانست و سیخوڕەکان، سیخوڕە گەواهیدەرەکان (پرۆفیسۆر و پرۆفیسۆری یاریدەدەر و مامۆستا یاریدەدەرە نیشتیمانپەروەرەکان)

وەك لە بەشەکانی سەرەوە ئاماژەم پێکرد، یەکێك لەو تۆمەتانەی لەلایەن داواکاری گشتییەوە خرابووە پاڵم، بابەتەکانی وانە گوتنەوەم بوو. بۆ ئەمەش وەك سەرچاوەیەکی تاوانبارکردنم، دەفتەری ئەو قوتابیانەی لە وانەکانم تێبینیەکانی خۆیان تۆمارکردبوو، لەگەڵ ئەو نووسین و پەرتووکانەی سوودم لێوەردەگرتن بۆ دەرس گوتنەوە، خرابووە ناو دۆسیەکەمەوە. بۆیە لەو بارەیەوە، ساڵی ١٩٦٨ زانکۆی ئەتاتورك، لە شاری ئەرزڕووم، داوایەکی کارگێڕیان لەسەر کردبوومەوە. دوای ئەوەی لێکۆڵینەوەکەش کۆتایی هات و بڕیاری پێ دەرچوو، لە بیستەمین ڕۆژی مانگی حەفتی ساڵی ١٩٧٠، لە زانکۆ، بە فەرمی بڕیاری دەرکردنم دەرچوو. لەوێ سەردەمێ، بۆ ئەوەی دۆسیەی لێکۆڵینەوە کارگێڕیەکەم بکرێتە دۆسیەیی لێکۆڵینەوەی دادگا، دۆسیەکەم بۆ دەزگاکانی ئاسایش و داواکاری گشتی کۆماریش نێردرا. وەلێ داواکاری گشتی، بە هۆی ئەوەی زانکۆ سەربەخۆیە، بە پێویستی نەزانی بوو لە دادگا دۆسیەم لەسەر بکرێتەوە.

لە سەردەمی ڕژێمی دوازدەی ئازار، سەرۆکی زانکۆ و ڕاگری کۆلێژ و چەندانی دیکە، زمانیان لێدابووم. زمان لێدانەکە بۆ تەواوی فەرماندەییەکانی دۆخی لەناکاویش نێردرابوو. لەگەڵ ئەوە، دۆسیەیەکی لێکۆڵینەوەی کارگێڕیشی بۆ زیاد کرابوو. بەوێ شێوەیێ، دادگای سەربازی فەرماندەی دۆخی ئاوەرتەی دیاربەکر،

داوایەكی لەسەر كردبوومەوە و بڕیاری دەستگیركردنی غیابی بۆ دەركردبووم.

لەو ئیفادانەی دامە داواكاری گشتی و، وتەكانی بەرگری كردنم لە دانیشتنی داداگا بریتی بوو لەوەی، ئەو تێبینی و بابەتانەی لە وانەكانم گوتوومەتەوە، بابەتی زانستی و یاساین. وەلێ سەرباری ئەمە، دادگا گوێی لە ٤١ شایەتحاڵ گرت. لەناو ئەواندا، چەند كەسێكیان لەوانە بوون، كە زمانیان لێدابووم؛ ئەوان هەم سیخوڕ، هەمیش گەواهیدەر بوون. زۆربەشیان پرۆفیسۆر و یاریدەدەری پرۆفیسۆر و مامۆستای یاریدەدەر بوون. لەناو شایەتحاڵەكان، قوتابیش هەبوو. لە كاتێكدا لەو دۆسیەیەدا پێویست بەوە نەبوو گوێ لە هیچ كەسێك بیگردرێت، چونكە ئەو بابەتانەی پیشانیاندام كە لەوانەكان دەمگوتەوە، لەگەڵ ئەو پەرتووكانەی وەكوو سەرچاوە بەكارم دەهێنان، لەلایەن منەوە قبووڵكرابوون. بۆیە گوێگرتن لە شایەتحاڵ لە كاتێكدا دەبوو، ئەگەر من نكۆڵیم لە بابەت و وانەكانم كردبا. بەڵام بە تایبەتی سیخوڕە گەواهیدەرەكان، بەو زیهنییەتە باسی بابەتی وانەكان و پرسیاری تاقیكردنەوەكان و دەفتەری تێبینی و پەرتووكەكانیان دەكردم، وەك ناپاك و نیشتیمان فرۆش و سیخوڕی دوژمن هەژماریان دەكردم. لە كاتێكدا خۆیان بە پارێزەری خاك و نیشتیمان و گەل دەناساند. سەرجەم ئەو زمانلێدان و شایەتحاڵانە لە پەرتووكی (دۆسیەی ئیسماعیل بێشكچی لە ڕوانگەی بنەماكانی میتۆدی زانستی و سەربەخۆیی زانكۆ و كۆمەڵگایەكی دیموكرات) بوونیان هەیە. وەك چۆن لە پەرتووكەكانی دیكەش بە وردی باسم كردوون.

ئەو پرۆفیسۆر و مامۆستا هاوکارە زمانلێدەر و شایەتحاڵانەی لەسەرەوە ناوم هێنان، دوای قسەکردنیان لەبەردەم دادوەر، بووە هۆی ئەوەی ڕێگا بکەنەوە بۆ فراوانبوونی دادگایی کردنەکەم. لە ماوەی دوو ڕۆژدا، لە دادگا گوێ لەسەرۆکی زانکۆ و دوو ڕاگر و دوو مامۆستای هاوکار گیرا. لە کاتێکدا لە دادگای سەربازی دۆخی لەناکاو، هیچ گوێگرێك ئامادەی دادگاییکردنەکە نەبوو؛ وەلێ چوار پارێزەری لێبوو؛ لەوانە هەریەك لە شەرەفەدین کایا و یوجەل ئۆنەن و وەیسی زەیدانلی ئۆغلو و فیکری یلدزخان بوون؛ دواتر گولفەر تاشەریش چووە ناو ئەو دەستەە چوار کەسییە.

ئەو کەسانەی زمانیان لێدام و دواتر لە دژم بوونە شایەتحاڵ، تۆمەتی ناپاکی و دوژمنداری گەل و نیشتیمان و، خاك فرۆشیان دامە پاڵ؛ بەرامبەر بەو تۆمەتانە، دادگا پرسیاری ئەوەی لێکردم، لەسەر ئەو تۆمەتانە چی دەڵێی؟ بەرامبەر بەو پرسەی دادگا، وەڵامی من بەو شێوەیە بوو "زانست شتێکی واقعییە و لەگەڵ دۆخە واقعییەکان مامەڵە دەکات. بۆ ئەوەی بوارە واقعییەکان بە ڕێکارە زانستییەکان جێگیر بکات". بە پشت بەستن بەو ڕێکارانە، باسم لەوە کرد، ناکرێ نکۆڵی لە بوونی کورد و زمانەکەی بکرێت. تێگەیشتنی پەیوەست بوون بە نیشتیمان و گەل و دەوڵەت، وەك خۆشەویستی بۆ نیشتیمان، هەستێکی کەسییە و لەناو کایەی زانستیدا شوێنیان نابێتەوە. هەروەها ئەوەم لە دادگا پرسی "دەمەوێ لەو پرۆفیسۆرانە بپرسم، ئایا ئەوانەی زمانیان لێداوم، چ لە زانست تێگەیشتوون؟". وەك چۆن هەمان پرس لەلایەن پارێزەرەکانیشەوە بەرامبەر بە دادوەر هێنرا زمان. جا دادگا

سەرجەم ئەو وشە و ڕستانەی لە زاری پرۆفیسۆرە شایەتحاڵەکانەوە دەردەچوو تۆمار دەکرد، وەلێ هیچ یەکێك لە پرس و داواکاریەکانی من و پارێزەرەکانم، کە لە پرۆفیسۆرەکانمان دەکردن، بە بیانووی ئەوەی پەیوەندی بە ناوەڕۆکی مژاری دادگایی کردنەکەوە نییە، تۆمار نەدەکرد. لەوبارەیەوە داواکاریەکەم پێشکەشی سەرۆکایەتی دادگا کرد، تا ئەو پرسیارانەی ئێمەش تۆمار بکرێت.

سەرۆکی زانکۆ، منی بە بەرپرسیاری ئەو جوڵانەوانە دەزانی کەلە ئەرزڕووم دەستی پێکردبوو. جگە لە تێبینی وانەکان و ناوەڕۆکی دەرسەکان و پەرتووکەکانی خوێندن، منی بە بەشداربووی ناو بویەرەکانیش دەناساند. "دەست بۆ هەر بەردێکی ئەرزڕووم ببەی، بێشکچی لەژێر دەردەچێ" سەرۆکی زانکۆ، لەهەمبەر من ئاوای گوتبوو. بەرامبەر بەو قسەیە، دادگا بە سەرۆکی زانکۆی گوت "بۆ ئەوەی پەیوەندی بێشکچی بە ڕووداوەکانەوە دەستنیشان بکرێ، بەردێك هەڵدەنەوە تا بێشکچی دەرچێت". بەڵام لەبەر ئەوەی سەرۆکی زانکۆ چاوەڕوانی وەها وەڵامێك نەبوو لەلایەن دادگاوە، بۆیە تووشی دۆخێکی نا هەموار ببوو. بەڵام بۆ ئەوەی بەسەر خۆی نەهێنێت، گوتبوی "باسی کورد و زمانی کوردی دەکات، ئیدی کەسێك ئەگەر باسی ئەو شتانە بکات، چاوەڕێی هەموو خەراپەیەکی لێ دەکرێ و دەستی لە هەموو ڕووداوێك دەبێ".

پرۆفیسۆرە زمانلێدەرەکانی دیکەش هەندێك قسەی وەك ئەوانەی سەرەوەیان بۆ دادگا کردبوو. منیش هەموو جارێ ئەوەم

دووبات دەکردەوە کە، زانست شتێکە مامەڵە لەگەڵ واقیع و ڕاستییەکان دەکات، کورد و زمانەکەشی شتێکی حاشا لێنەکراوە و پێویست بە هیچ بەڵگەیەك ناکات، بۆ دانپیانانی. جا تەنیا بۆ ئەوەی وەڵامی داواکارییەکەی من بدەنەوە، یەکێك لە پرۆفیسۆرەکان سەبارەت بەو پرسیارەی من کە گوتبووم "ئایا چی لە زانست تێگەیشتوون؟" لە وەڵامدا گوتبووی "گەر پرسەکە بێتە سەر نیشتیمان و گەل و دەوڵەت، زانست و مانست، پێنج پوڵی قەڵب ناکەن و باسی عەدالەت و مەدالەت ناکرێ... ".

ئەو وەڵامە، ئەوەی بە ئاشکرا بەیان دەکرد کە، بۆچوونی گشتی بەرامبەر زانست پێویستی بە لێپرسینەوە هەیە. بۆ ئەوەی بتوانین بەشێوەیەکی تەندروست، حەقیقەت شرۆڤە بکەین و بە لاڕێیدا نەبەین، هەروەها دەبێ بزانین ئەو ڕێگرە بنچینەییانە چین کە دێنە بەردەممان؟ چوونکە مانا و دەلالەتی بۆچوونی فەرمی بەو شێوەیە هاتە مەیدان. جا لە نێوان قەدەغەیی بیرکردنەوە و ئایدۆلۆژیای ڕەسمی پەیوەندییەکی زۆر گرنگ هەیە، لەبەر ئەوەی بۆچوونی فەرمی بڕیار لەسەر ئەوە دەدات کامە جۆری بیرکردنەوە دەبێ قەدەغە بکرێ. بۆیە لەوێ دەمێ بەدواوە، وردبینی کردن و پەنجە خستنە سەر تێگەیشتن لە ئایدۆلۆژیای فەرمی[1] بووە پرسێکی گرنگ بەلای منەوە.

---

[1] بەهۆی ئەوەی لەم پەرتووکەدا لە زۆر شوێنی دیکە باس لە ئایدۆلۆژیا، یان بۆچوونی فەرمی دەکرێت، بۆیە بە گرنگی دەزانین بەکورتی پێناسەیەکی بکەین، تا ئەم چەمکە بەلای خوێنەرانەوە، ڕوونتربێ. (ئایدۆلۆژیای فەرمی بەو ئایدۆلۆژیایە دەگوترێ، کە دەوڵەتێك، یاخود دامەزراوەیەك، لەژێرخانەکەیدا ئایدۆلۆژیایەك بەرهەمدەهێنێت و لە ڕێگای ڕێکار و سزاکانەوە، خەڵك و
=

ئەو ڕووداو و بەسەرهاتانەی لە یەکەمین دادگاییکردنی مندا ڕوویان دا، بووە هۆی ئەوەی گۆڕانکاریی گەورە لە ژیانی مندا چێکات. بۆیە زۆر گرنگە سەرنجی ئەو جیاوازییانە بدەن کە لە نووسین و پەرتووکەکانی بەر لە ساڵی ۱۹۷۱ و دوای ئەو بەرواره و، بە دیاری کراویش بڵاوکراوەکانی ناوەڕاستی حەفتاکان هەن، چوونکە لەو بارەوە جیاوازیەکی زۆر هەست پێ دەکرێت.

* * *

لێرە بە پێویستی دەزانم ڕووداوێك بنووسمەوە:

لە بیستەمین ڕۆژی مانگی سێی ساڵی ۱۹۷۰، بۆ پرۆتیستۆی سەرۆکی زانکۆ، کورسی فەرمی سەرۆکی زانکۆ لەلایەن قوتابییە ناڕازییەکانەوە سووتێندرا. بۆ گەیاندنی هەمان مەبەستیش، قوتابیەك ئاگری لە گیانی خۆی بەردا بوو. ئەو قوتابییەی هەوڵی خۆ سووتاندنی دابوو، لە کاتی ڕووداوەکە بە ترومبێلی مامۆستا ئینایەت بەرکمان، گەیاندرابووە نەخۆشخانە. جا لەبەر ئەو هۆکارە، دۆسییەیەك لەسەر مامۆستا ئینایەت و ئەو قوتابییانە کرایەوە، کە خوێندکارەکەیان گەیاندبووە بیمارستان. من دواتر زانیم مامۆستا ئینایەت شەوێك دەستبەسەرکرابوو و ئەو بوویەرانە ڕوویان دابوو.

---

کۆمەڵگاکەی ناچار دەکات تا، وەك تاقە ئایدۆلۆژیایەك قبوڵی بکات و لە هیچ کات و شوێن و بار و حاڵێکدا، لەبەرچاوی بێت و لێی دەرنەچێت). (وەرگێڕ).

## گەر بەرگری سیاسییانە نەکەن... یاخود "سیاسی"؟

لە نۆزدەی حوزەیرانی ساڵی ١٩٧١، لە کۆلێژی زانستە سیاسییەکان دەستگیرکرام و بردرامە دیاربەکر. بڕیاری بەندکردنە غیابیەکەشم، بۆ حوکمی دادگا گۆڕا و ڕۆژی دواتر ڕاستەوخۆ بەندکرام. لەناوەڕاستی مانگی حەفت، دکتۆر ئەرگین ئاتاسو سەردانی کردم. من و ئەرگین ئاتاسوو، لە نێوان ساڵانی ١٩٦٩-١٩٧٠-١٩٧١ لە سەندیکای مامۆستا هاوکارەکانی زانکۆ، بەیەکەوە کارمان کردبوو. ئەوم لە نزیکەوە دەناسی و بە هەڤاڵێکی چاکی خۆمم دادەنا. ئەویش لە کۆلێژی پزیشکی خەریکی خوێندن بوو.

لە سەردانەکەیدا ئەرگین پێی گوتم "ئیسماعیل، ئەگەر بەرگرییەکی سیاسییانە نەکەی، ئەو شوێنەی کاری لێ دەکەی، پارێزەرێکی زۆر کارامەت بۆ دابین دەکات...". بەڵام من پێشنیازەکەی ئەوم بە هەند وەرنەگرت. بۆیە ئەوەم بە خۆشی گوت، وەلێ نەمپرسی "ئایا مەبەستت لەو پێشنیازە کۆلێژی زانستە سیاسییەکانە؟ یاخود مەبەستت سەندیکایە، کە ئەو پارێزەرەم بۆ دابین دەکات؟".

چەند ڕۆژێك دوای ئەوەی بردرامە دیاربەکر، داواکارە گشتییە سەربازییەکە، منی بانگهێشتی ئیفادە دان کرد. داواکارە گشتییەکە چەند نموونەیەکی لە تێبینی وانەکان و وێنەی چەند ڕۆژنامەیەك، کە وتارم تێیدا بڵاو کردبۆوە، پیشان دام و گوتی "ئایا ئەوانە هی تۆنە؟ تۆ ئەمانەت نووسیووە؟" منیش لە وەڵامدا "بەڵی هی منن و من نووسیومن ".

ماوەیەکی کەم دوای وەرگرتنی ئیفادەکانم، داواکاری گشتی سەربازی، داوانامەیەکی لەبارەمەوە ئامادە کرد. یەکەمین دانیشتنی دادگا لە کۆتایی مانگی حەفت بەڕێوەچوو. لە دادگا هەمان ئەو وەڵامانەم داوە، کە لە ئیفادەی داواکاری گشتیدا دابوومەوە، بەوێ شێوەیێ بەرگریم لە خۆم کرد. دواتر داواکاری گشتی سەربازی دوای ئیفادەکەم گوتی "جەنابی دادوەر، تۆمەتبار تەواوی تاوانەکانی قبوولکردووە، بۆیە داواکارم لەو دانیشتنەدا بڕیاری سزادانی دەربچێت". سەرباری ئەو داواکارییە، بەڵام کەیسەکەم بۆ ماوەی ساڵێك درێژەی کێشا. دوای ساڵێکیش بە کۆی دەنگی ئەندامانی دادگا، بڕیار لەسەر درێژکردنەوەی بەندکردنم درا. تەنیا لەو یەکەم دانیشتنەی دادگا، بە کۆی دەنگ بڕیار لەسەر بەردەوامی بەندکردنەکەم درا. وەلێ دادوەری دانیشتنەکە، وەکوو تێبینی، ئاماژەی بەوە کردبوو پێویستە ئەو کەسە ئازاد بکرێ.

لە ڕاستەوە خەلیل ئاغا، ئیسماعیل بێشکچی. ساڵی ١٩٧٤، زیندانی ئەدەنا.

# بەشی چوارەم
# ساڵانی حەفتاکان و بەندکراوانی کورد لە دیاربەکر

نیشتیمان – زانکۆ لە ڕێگای گەل – ڕۆژنامە - دادگا

## خەلیل ئاغا، ژیانێك فیدای بەرگریکردن

لە بەرواری بیست و یەکەمین ڕۆژی مانگی شەشی ساڵی ۱۹۷۱، خەلیل ئاغایان هێنایە زیندانی سەربازی دۆخی لە ناکاوی دیاربەکر. لە قاوشەکە چەندان برادەری گیراوی، دۆسیەکانی، کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی کولتووری ڕۆژهەڵات (DDKO)، پارتی کرێکارانی تورکیا، پارتی دیموکراتی کوردستانی تورکیا، گەنجانی ئەرزڕووم و قارس و دیاربەکز، لەگەڵ چەند بەندکراوێکی دیکەشی لێبوو. لەناو گیراوەکاندا، کەسێکی بەتەمەن سەرنجی منی بۆ لای خۆ ڕادەکێشا. هەڤاڵانی ئەوێ باسیان لەوە کرد، ئەو کەسە لە سیرتەوە هێندراوە و تەمەنیشی لەسەرویی حەفتا ساڵییە. خەلیل ئاغا و برازاکانی، بەردەوام بە کوردی لەگەڵ بەندکراوان دەپەیڤین. یەکێك لە برازاکانی ناوی نادر بوو. خەلیل ئاغا خەڵکی شارەدێی دیهیی سەر بە شاری سیرت بوو.

بە تێپەڕینی کات، زانیارییەکان دەربارەی خەلیل ئاغا زیاتر بوو. خەلیل چیفچی و شەڕەفەدین کایا و ڕوشەن ئارسلان پارێزەری خەلیل ئاغا بوون. ئەوان زوو زوو، دەربارەی ناوەڕۆکی کەیسەکەی زانیارییان بە خەلیل ئاغا دەدا. ئەو بە تۆمەتی جوداخوازیی و دابەشکردنی نیشتیمان و گەل و چەتایەتی دادگایی دەکرا. بە یاسای کۆنی ماددەی ١٦٩، دارودەستەی چەتەش دادگایی دەکران.

فیکرەت ئۆتیام: ڕۆژنامەنووسێکی نیشتیمان پەروەر!

ڕۆژنامەڤان فیکرەت ئۆتیام، لە نێوان ساڵانی ١٩٦٨-١٩٧٠ لە دەوروبەری سیرت چەند دیمانەیەکی ساز کردبوو. بەشێك لەو زانیارییانەی دەستی کەوتبوو، بڵاوی کردبۆوە. بەشێکی دیکەشی بۆ بەرپرسانی وەزارەتی ناوەخۆ ناردبوو. دەربارەی خەلیل ئاغا نووسی بوو "خەلیل ئاغا، لە گوندەوارەکانی دەوروبەری سیرت، خەڵك دەکاتە ئەندامی پارتی دیموکراتی کوردستانی تورکیا و، لیرەیەکیش لە هەر ئەندامێك وەردەگرێت. ئەو پارەیەی کۆشی دەکاتەوە، دەینێرێتە باکووری عێراق، بۆ دەستی مەلا مستەفا بارزانی، کە لەگەڵ دەوڵەتی عێراق لە شەڕدایە... " فیکرەت ئۆتیام (١٩٢٦-٢٠١٥) لەوبارەیەوە زۆری نووسیووە. دەربارەی هەمان پرس، لەگەڵ فاروق سوکانی وەزیری ناوخۆی ئەوسای تورکیاش هەڤدوویان بینی بوو.

لە لێپێچینەوەدا، دژی خەلیل ئاغا، دەوڵەت کاری لەسەر ئەو نووسینانە کردبوو. بۆیە هەر زوو دوای دەستبەسەرکردنی، بەندکرا. داوانامەکەشی بە پشت بەستن بەو نووسراوانە ئامادە

کرابــوو. لەکــاتی بەڕێوەچــوونی دانیشــتنەکانی دادگــا، دادوەر بانگهێشتی ڕۆژنـامەنووس فیکـرەت ئۆتیـامی کردبـوو و گـوێی لە قسەی ئەویش گرتبوو. لەوێ دانیشتنێدا، هەریەکە لە شەڕەفەدین کایـا و ڕوشـەن ئارسـلانی پـارێزەرانی خەلیـل ئاغـاش ئامـادەی دانیشــتنەکە بــوون. دوای دانیشــتنەکە زۆر بــاس لە ئیفادەکــانی فیکرەت ئۆتیام و وەڵامەکانی خەلیل ئاغا دەکرا لەسەر مژارەکە. بۆ نموونە فیکرەت ئۆیتام باسی لەوە دەکرد کە خەلیل ئاغا خەڵکی لادێکــانی نزیــك ســیرتی کــردووەتە ئەنــدامی پــارتی و یەکە و لیرەشی لێ وەرگرتوون. دواتـریش پارەکـانی بۆ بـارزانی نـاردووە. بەرامبەر بەو قسانە، خەلیل ئاغا ئاماژەی بەوە کردبوو، ئەو پارانەی بـۆ ماڵبــاتە نەدارەکــانی نــاوچەکە کـۆکردووەتەوە. هەروەهـا دژی تۆمەتی ئێشکیها بوونەکەی خەلیل ئاغا گوتبوی "دەوڵەت لە ئێمە خـۆش ببـوو. بـۆیە ئـێمە ئێشـکیها نـین. هەروەهـا دەوڵەت هەرچـی زەوی و زاری خۆمان هەبوو، هەمووی لێ زەوت کردووین، بۆیە خاوەنی هیچ زەویەکی خۆمان نین".

## یادەوەرییەکانی زیندانم لەگەڵ خەلیل ئاغا

لە پەرتــووکی (ســەرهەڵدانەکانی نــاو کۆمــاری تورکیــا ١٩٢٤-١٩٣٨) کە لەلایەن سـەرۆکایەتی سـوپای تورکیـاوە ئامـادە کرابـوو، زۆر زانیـاری ورد دەربـارەی یەعقـوب ئاغـای بـاوکی خەلیـل ئاغـا دەسـتدەکەوێت. پەرتـووکەکە بـاس لە هێرشـی سـەر قەرەقۆلەکـان و چـوونە سـووریا و عێـراق و دواتـریش دەسـتگیرکردن و دۆسـیەی

دادگایی کردن و زیندانیی کردنەکەی کردووە. لەوێ دەمێدا، لە پاڵ باوکی، خەلیل ئاغاش بەشداری چالاکییەکانی کردبوو. بە هۆی بوونی بزاڤەکەشیانەوە، ماڵبات و کەسو کاری ئاغا، زۆر ستەم و زوڵمیان دەرحەق کرابوو. خەلیل ئاغاش ساڵانێکی دوور و درێژ، بەو هۆیەوە کەوتبووە زیندان. خەلیل ئاغا کە زۆر شارەزای ناوچەکانی کوردستانی سووریا و عێراق بوو، دوای لێخۆشبوونی ساڵی ١٩٢٨، خۆیی و هەڤاڵانی لە زیندان ئازاد کرابوونن.

خێزانەکەیان بە هۆی سەرهەڵدانەکانەوە، تەواوی سەروەت و سامانیان لەدەستدابوو. ئیدی ئەوان لە دەوروبەری ناوچەی دیهی، خاوەنداریيەتیی هیچ شتێکیان لا نەمابوو. وەلێ لەگەڵ ئەوەش، خەلیل ئاغا لە ناوچەکە، خاوەن سەرمایەیەکی گەورەی مەعنەوی بوو. ئەو کەسێکی خۆشەویست بوو، بۆیە لە هەموو شوێنێك قسەی دەڕۆیشت و هەموو خەڵك گوێیان بۆ دەگرت. دۆسیەی پرسی دروستکردنی دەستەیەکی چەتەیی خەلیل ئاغا، لە ساڵی ١٩٧٢ بە حوکمێکی ١٥ ساڵی کۆتایی پێهات، لەگەڵ ٣ ساڵ ڕاگواستنی بۆ ناوچەکانی ڕۆژئاوای تورکیا. سەرەتای ساڵی ١٩٧٣ دۆسیەکەی لەلایەن دادگای باڵای سەربازیەوە قبوولکرا. بەڵام لەپاڵ ئەمانە، خەلیل ئاغا لەسەر دۆسیەی پارتی دیموکراتی کوردستانی تورکیاش دادگایی دەکرا. بۆیە دانیشتنەکانی دادگا و دۆسیەکەی بەردەوام بوو.

شەوی دوو لەسەر سێی مانگی سێی ساڵی ١٩٧٣، لە زیندانی دۆخی ئاوەرتە، ئۆپەراسیۆنێکی زۆر چڕ و توند دەستی پێکرد.

چەند ڕۆژێك بەر لەو بەروارەی سەرەوە، چەندان خوێندکاری قۆناغەکانی ناوەندی و ئامادەیی، ناوچەکانی سیوێرەگ و تاتوان و دێرسیمیان دەستگیرکردبوو و هێنابوویانە ئەوێ. دوای ئەوەی ئەو گەنجانە ئەشکەنجەیەکی زۆریان بەرامبەر کرابوو، پاشان خرابوونە بەر لێپێچینەوە، جا هێنابوویانە زیندانی دۆخی لەناکاو. وەلێ دوای هێنانیان، بەرپرسانی گرتووخانە هاتن و چەند گەنجێکیان برد؛ بە مەبەستی ئەوەی جارێکی دیکە بیانبەنەوە بۆ لێپێچینەوە. دوای لێکۆڵینەوەیەکی پڕ ئەشکەنجە، جارێکی دیکە هێنانیانەوە لای ئێمە. چەند ڕۆژێك دواتر، هەمدیسان ویستیان یەکێك لەو گەنجانە ببەنەوە بۆ ژووری لێپێچینەوە. وەلێ هەڤالانی قاوشەکە بە تۆمەتی ئەوەی ئەو گەنجە دەبەنەوە بۆ ئەشکەنجەدان، نەك لێپێچینەوە، لاوەکەیان ڕادەستی بەرپرسانی بەندیخانە نەکرد. ئەمە وایکرد، ناخۆشیی و ڕووبەروو بوونەوە لە نێوان زیندانییەکان و کارگێڕی بەندیخانەکە دروست بێت. ئۆپەراسیۆنی شەوی دوو لەسەر سێ، کە درەنگانێکی شەو ڕوویدا، هۆکاری ئەو پێکهەڵپڕژینەی نێوانمان بوو. ئەوێ شەوێ، لەپڕ سەربازەکانی زیندانەکە، لە پەنجەرەکانەوە گازی فرمێسك ڕێژیان خستە ناو ئەو قاوشەی لێی دەماینەوە، تا بمانهێننە دەرەوە. لە ماوەی چەند چرکەیەکدا کەس نەبووە برای کەس، فرمێسك لە چاومان و ئاو لە لووتمان دەهاتە خوارەوە؛ ئەوەی ڕێگای دەرچوونیشی دەگرتە بەر، لەبەر دەرگا، لەلایەن سەربازەکانەوە تێروپڕ دەکوتراوە. لە کۆتایی ئۆپەراسیۆنەکە ٤٠ کەسی داواکراوی بەندیخانە، خرانە زیندانی تاکەکەسییەوە. منیش یەکێك بووم لەو چل کەسە. حوجرە تاکە کەسییەکان لە نزیك باڵەخانەی زیندانەکە بوو. زوڵم و ستەمی کارگێڕی

بەندیخانەکە، لەوێش لەسەرمان بەردەوام بوو. تەواوی بەسەرهات و ڕووداوەکانی ئەوێ ڕۆژێتان لە کۆتایی ئەو بەشە بە وردی بۆ باس دەکەم.

ئێوارەی هەشتەمین ڕۆژی مانگی سێ، ئەفسەرێکی پلەیەك، هاتە ئەو حوجرەیەی من لێی دەمامەوە و، ئەوەی پێ ڕاگەیاندم، کە دادگای بالآی سەربازی، بڕیاری لەسەر ئەو حوکمە داوە کەبەسەرتدا سەپێندراوە. بۆیە دەبێ خۆت ئامادە بکەیت و، بەیانی زوو، لە بەندیخانەی دۆخی لەناکاوەوە، دەگوازرێیەوە بۆ زیندانی دیاربەکر.

ڕۆژی دواتر، بۆ ئەوەی کەلوپەلەکانم کۆبکەمەوە، منیان بردە قاوشی بەندیخانەکە. وەلێ، بەرەبەیانی ڕۆژی سێی مانگی سێ، بە هۆی ئۆپەراسیۆنەکەوە هەموو شتێکیان وێران کردبوو. هەرچی پەرتووك و نووسین و ڕۆژنامە و پەڕاوم هەبوو، هیچی بەسەر هیچەوە نەمابوو. ئەوەی ماشبوو، دەستی بەسەردا گیرابوو. ئامێری نووسینیشیان قەدەغە کردبوو، قاپوقاچاغەکانیشم بە کەڵکی ئەوە نەمابوو بەکاری بهێنمەوە. جیا لەمانە، هێنانی پەرتووك و ڕۆژنامە و گۆڤاریان بۆ ناو قاوشەکە قەدەغەکردبوو.

لە شوێنەکەی خۆم بە دوای بەڵگەکانی دادگایی کردنەکەمدا گەڕام، وەلێ هیچ فایلێکم نەدۆزیەوە. بۆیە ڕووم لەو سەربازەکرد کە لەگەڵم هاتبوو و پێم گوت " تا بەڵگەکانی دادگا وەرنەگرمەوە، ناچمە هیچ کوێیەك". دوای ئەوە، سەربازەکە منی بردە ئەو کۆگایەی دوای ئۆپەراسیۆنەکە، کەلوپەلەکانی لێ داندرابوو و لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی زیندانەوە دەستی بەسەردا

گیرابوو. هەرچی کەلوپەلی بەندکراوان بوو، بە تێکەڵ و پێکەڵی و لەسەر یەك، لەوێ فڕێدرابوو. لەوێ ئاو دزەی کردبووە ژوورەوە و گۆمێکی بچووکی دروست کردبوو. ئەمەش وای کردبوو، هەرچی هەیە، وێران بێ و، بەشێکیشیان لەناو ئاو خووسابۆوە و بە کەڵکی هیچ نەمابوو. هەرچۆنێك بێ، توانیم بەشێك لە بەڵگەکانی دادگا بدۆزمەوە و لەگەڵ خۆمی ببەم. بەڵام هێشتا بەشێکی گرنگی نامەکانم نەبینیبۆوە، چونکە بەشێکیان نامەی تەمیزی بڕیاری دادگایی کردنەکەم بوو، کە بۆ دادگای باڵای سەربازیم ناردبوو. منیش داوای پێداچوونەوەم لە بڕیاری دادگای باڵای سەربازی کردبوو. بۆیە جەختم لەوە کردەوە، دەبێ ئەو دۆسیەیە بدۆزمەوە. دوای گەڕانێکی زۆر، توانیم ئەویش دەستەبەر بکەم. بەڵام بەرگی فایلەکە دڕابوو، لاپەڕەکانیش قەپ و قۆچ و ئاڵۆزکاو بوون. لەناو چەندان دۆسیە و پەرتووك و نووسراوی دیکە بە هەزار حاڵ تا کەوتە دەستم.

دوای هەڵگرتنی بەشێك لەو کەلوپەلانە، لەوێ دەرکەتم و چوومە بەردەرگا، تا سواری ئەو ترومبێلە بم کە چاوەڕوانی منی دەکرد. کە سەرکەوتم، بینیم خەلیل ئاغاش لەناو ترومبێلەکەیە، هەر خۆم و خۆی بووین. چونکە هەردووکمان لە یەك کاتدا بڕیاری دادگامان بۆ دەرچوو بوو. کاتێك گەیشتینە بەندیخانەی دیاربەکر، لەناو شوڕای شارەکە، دەوروبەری نیوەڕۆ بوو.

دوای ئەوەی لەژێر دەرگا، کاروبارە فەرمییەکانیان بۆ کردین، دواتر ناویان تۆمار کردین و ئێمەیان بردە یەکێك لە قاوشەکانی ئەوێ. خەلیل ئاغا چەند ناسیارێکی ناوچەی دیهیی شاری سیرتی

هەبـوو. بـۆیە ئەوان هەر زوو بەدەمـیەوە هـاتن و ئەویـان بـردە قاوشـەکەی خۆیـان. منیشـیان بـردە قاوشـی ئەفەنـدییەکان، ئەوەی هەموویان فەرمانبەری حکوومەت بوون. هەر حەفت قاوشەکەی بەندیخانەکە لە زەمین بوون. وەلێ تەنیا قاوشی ئەفەندییەکان چەند پلیکانەیەك لەسەرەوەتر بوو.

لە نێوان ئەوانەی هـاتنە پێشـوازیمان، مامۆسـتا تورانیشـم بینـی. چونکە ئەویش لە قاوشی فەرمانبەران دەماوە. وەلێ چەند ڕۆژێك دواتر، ئەویان بۆ بەندیخانەیەکی قەزایەکی دیکە گواستەوە. کاك تـوران مامۆسـتای وانەی بیرکـاری بـوو لە قوتابخـانەیەکی ئامـادەیی دەوروبەری دیاربەکر.

لەنـاو قاوشـی ئەفەنـدییەکان، کەسێکی لـێ بـوو، بـووە جێگـای سەرنجی من. با ئەوەتان بەو شێوەیە بۆ باس بکەم: سالّی ١٩٧٠، دەستەیێکی شۆڕشگێڕی گەنج چووبوونە فەلّەستین. لەوێ ماوەیەك لە کامپی فەلّەستینییەکان مابوونەوە و دواتر گەڕابوونەوە تورکیا. لە هاتنەوەیانــدا، لە نــاوچەی کانیــا غەزالان، لە پارێزگــای ڕوهــا هاتبوونەوە ناو تورکیا، لەوێشەوە تا دیاربەکر چووبوون، لەوێشەوە بڕیــار بــوو بچــنە ئەنــقەرە و ئیســتانبوولّ، لــێ، لە دیــاربەکر دەسـتگیرکرابوون و خرابـوونە زینـدانی ئەوێ. ئەوان نـزیکەی ١٠ کەسێك دەبـوون، دوان لەوان بە ناوەکـانی قـادر مانگـا و تـونجەر سـومەر، قوتـابی زانکـۆی ئەتـاتورك بـوون. بەهـاری سـالّی ١٩٧٠ لەگەلّ خالیـد گـونەش و جانیـب یلّـدرم لە زینـدانی دیـاربەکر سـەردانی ئەو برادەرانەمـان کـرد، چونکە ئەوانمـان بـاش دەناسـی. ئەوان لە ژوورێکـی سـەر ڕاڕەوی هـاتنە ژوورەوەی بەنـدیخانەکە

دەمانەوە. لەناویاندا حوسێن ئینان و موستەفا یالْچنەریش هەبوو. جگە لەوان، منداڵێکی زۆر بچووکیشیان لەگەڵ بوو، بەناوی عەلی تەنك. دیواری ژوورەکەیان زۆر ئەستوور بوو، بۆیە حوسێن ئینان لە پەنجەرەی ژوورەکە دادەنیشت و سەیری ئەوانەی دەکرد، کە دەهاتنە زیندان و لێی دەردەچوون.

ئەو زیندانەی ئێمە لێی بووین، لە سەردەمی ساڵانی ڕێکخستنی عوسمانییەکان کاروان سەرای بوو. ساڵی ۱۹۲۵ شێخ سەعید[1] و هاوەڵانیشی هەر لەوێ بەندکرابوون.

دەرگای قاوشەکانی زیندانی دیاربەکر، بە درێژایی ڕۆژ لەسەر پشت کراوە بوون. هەموو زیندانێك دەیتوانی سەردانی ئەوانی دیکە بکات لە قاوشەکانی ناو بەندیخانەکە. واتە هەموویان دەیانتوانی لەیەك کاتدا بێنە با هەڤ لە شوێنی هەواگۆڕکێی ناو زیندان. بۆیە شوێنەکە بە ڕۆژ بە بەردەوامی کراوە بوو. جا ئەو ڕۆژەی سەردانی ئەو برادەرانەمان کرد، گاردیانێك بەردەوام سەری لە ژووری ئەو شۆڕشگێڕانە دەدا. کە هۆکارەکەیم لێ پرسین، گوتیان "ئەوە کاروبار و پێویستییەکانمان بۆ جێبەجێ دەکات".

ئەو کەسەی لە قاوشی ئەفەندییەکان تووشی بووم، ئەو کەسە

---

[1] شێخ سەعیدی پیران (۱۸٦٥-۱۹۲٥) شۆڕشگێڕێکی کورد بووە. ئەو یەکێکە لە شێخەکانی تەریقەتی نەقشبەندی. ساڵی ۱۹۲٥ شۆڕشی دژی حکومەتی ئەوسای تورکیا هەڵگیرساند و توانیان گەمارۆی شاری دیاربەکر بدەن، بەڵام دواتر، بەهۆی ناپاکی چەند سەرۆك هۆزێك، هێزەکەیان تێکدەشکێت و خۆی دەستگیردەکرێ و، لە سێدارە دەدرێت. (وەرگێڕ).

بوو کە ساڵی ١٩٧٠ جرت و فرت دەهاتە ئەو ژوورەی باسم کرد. ئەو هەڤاڵانەی لەسەرەوە باسم کردن، یەکێك لەوان باوکی لە بانق کاری دەکرد. ئەو گاردیانەی کردبووە پاسەوان لە بانقەکەی، بۆیە کابرا وازی لە گاردیانی هێنابوو و چووبووە ئەو بانقە، وەلێ بە هۆی ئەوەی ناوی تێکەڵی تاوانێك بووبوو، دەستگیرکرابوو. دوای یەکدی بینینمان، ئەویش منی بیر کەوتەوە، سا بە درێژی باسی ئەوەی کرد، ساڵی ١٩٧٠ بۆچی ئاوا دەچووە ئەو ژوورە. توومەزە کارگێڕی بەندیخانە پێیان گوتبوو زوو زوو بڕۆ لایان و بزانە باسی چی دەکەن...

لەو شوێنەی زیندانەکان دەیانتوانی یەکدی لێ ببینین، منیش لەگەڵ خەلیل ئاغا زوو زوو هەڤدوومان دەبینی و بەیەکەوە پیاسەمان دەکرد. لەگەڵ ئێمە چەند هاوشاریەکی خەلیل ئاغاش بەشدار دەبوون. هەرچی دەستگیرکراو و بەندکراو و زیندانی بەندیخانەکە هەبوو، هەموویان زۆر ڕێزی خەلیل ئاغایان دەگرت. هەموو کەسێك ئەویان داوەتی نان خواردن و چا و قاوە خواردنەوە دەکرد. وەك تاوانبارێکی سیاسیی زۆر ڕێزیان لێی دەگرت.

لەوێ چەند گەنجێکی کوردیشی لێ بوو، کە بە تۆمەتی دزی و بریندار کردن و تاوان و فرۆشتنی ماددەی بێ هۆشکەر و چەند تاوانێکی کۆمەڵایەتی دەستگیرکرابوون. ئەو ڕێز و خۆشەویستیەی زیندانییەکان بەرامبەر بە خەلیل ئاغایان دەنواند، ئەو گەنجانەی تووشی سەر سوڕمان کردبوو. "ئەو کابرایە تورکیش نازانێ، کەسێکی ئاوا چۆن دەبێتە تاوانباری سیاسی؟ ئاخۆ دەبێ ئەو هەموو ڕێز و حورمەتە بۆ کەسێك کە تورکیش

نازانێ لە پای چی بێت؟". گەنجە کوردەکان، سەبارەت بە خەلیل ئاغا لە نێوان خۆیاندا ئاوایان دەگوت.

خەلیــل ئاغــا بە کــوردی دەپەیڤــی، وەلــێ ئەو گەنجــانە کوردییەکەیـان بـاش نەبـوو، یـان هەر نەیانـدەزانی. بـۆیە وەڵامـی پرسیارە کوردییەکانی خەلیل ئاغایان نەدەداوە. وەلێ لەبەر ئەوەی ئاغا بە کوردی دەئاخڤی، ئەو گەنجانە ئەویان بە بچووکی دەبینی. لەکـاتی پیاسـەکردندا، لەگەڵ خەلیـل ئاغـا، نـاوە نـاوە لەگەڵ ئەو گەنجانەش قسەمان دەکرد، ئەوانیش سەریان لە قسە و وەڵامەکانی خەلیل ئاغا سوڕ دەما.

## بەهجەت جان تورك

لە ناوەڕاستی مانگی پێنجی ساڵی ١٩٧٣، ژمارەیەکی زۆر لە جانتورکەکان خرانە کونجی زیندانەوە. ئەوان نزیکەی ١٥ کەسێك دەبوون. بەهجەت جان تورکیش لەناو ئەو دەستەیەدا بوو. ئەو لەویٔ سەردەمێدا سەرۆکی یەکێتی لاوانی پارتی گەلی کۆماری[1] شاری دیاربەکر بوو. ئەو ڕۆژانەی لەگەڵ خەلیل ئاغا پیاسەمان دەکرد، هەڤاڵێك ئێمەی بە بەهجەت جان تورك ناساند. ئەو زۆر ڕێزی لە خەلیل ئاغا دەگرت. زۆر زانیاری لەسەر یەعقوب ئاغای باوکی خەلیل ئاغاش هەبوو. بۆیە زوو زوو دەهاتە لای و لە حاڵ و ئەحواڵ و پێویستییەکانی دەپرسی. ئەو گەنجە کوردانەی لەسەرەوە باسم کردن، سەریان لەوەش سوڕمابوو، ئاخۆ کاك بەهجەت بۆچی ڕێز لە پیاوێکی ئاوا دەنیٔ کە تورکیش نازانیٔ؟ ئیدی لە وەها بار و دۆخێکدا لەگەڵ بەهجەت جان تورك یەکدیمان ناسی. بە هۆی ئەو ڕێز و حورمەتەی بۆ خەلیل ئاغای دەنواند، پێدەچوو کوردێکی نیشتیمان پەروەر بێت. دەمەویٔ ئەوەش بڵێم کە بەهجەت جان تورك لە کۆتاییەکانی ساڵانی ١٩٨٠ و سەرەتاکانی ١٩٩٠، ڕۆڵێکی گرنگی لە بەرەو پێشچوونی ڕۆژنامە کوردییەکان بینی. ئەو هەوڵ و تێکۆشانەی بۆ میدیای کوردی، وایکرد لە ساڵی ١٩٩٤ ببێتە قوربانی تاوانی فایلی بکەر نادیار و بۆ دواجار ماڵئاوایی لە ژیان بکات.

---

[1] CHP پارتی گەلی کۆماری، یەکەمین پارتی کۆماری تورکیایە، ساڵی ١٩٢٣ لەلایەن مستەفا کەمال ئەتاتورکەوە دامەزرێندراوە. (وەرگێڕ).

## لە ڕێگای ئەدەنە

نزیکەی شەش مانگ لە بەندیخانەی دیاربەکر ماینەوە. سەرەتای مانگی نۆ، هاوشان لەگەڵ خەلیل ئاغا، بەیەکەوە گواسترانیەوە بۆ زیندانی ئەدەنە. بەسەر ڕێگای ڕوهاوە ئێمەیان بردە ئەو شوێنەی بۆی دەگوازرانیەوە. لەناو ئەو ترۆمبێلەی ئێمەی پێ دەبردرا، تەنیا من و ئاغای تێدا بوو. لە ڕێگا خەلیل ئاغا زوو زوو دەیگوت "با بوەستین و نان بخۆین، کاکە دە با چا و قاوە بخۆینەوە... " ئەو ئەفسەرەی فەرماندەی ترۆمبێلی گواستنەوەکەمان بوو، هەموو داواکارییەکانی جێبەجێ دەکردین. وەلێ من دەمگوت "کە گەیشتینە بەندیخانە، لەوێ نانێك دەخۆین". لە وەڵامی ئەو قسەیەی مندا، خەلیل ئاغا دەیگوت "مامۆستا خۆ ئێمە ناچینە میوانداری، کێ دەڵێ کە گەیشتینە زیندان هەر خواردنیشمان دەدەنێ". بۆ نان خواردن لە ڕوها دابەزین تا شتێك بخۆین. من و خەلیل ئاغا دەستمان بەیەکەوە کەلەپچە کرابوو. ئیدی تا گەیشتینە ناو ئەو چێشتخانەیەی بۆی دەچووین، ئاوا بە کەلەپچەکراوی بەناو کۆڵانەکاندا تێپەڕین، لە ڕێگاش منداڵی کۆڵانەکان بە چاوێکی ئەبڵەقەوە سەیریان دەکردین و دەیانگوت "یەکێکیان باوك و ئەوەی دیکەیان کوڕ؛ ئاخۆ دەبێ چیان کردبێ ئاوا دەستگیرکراون؟". جا ئەو قسانەیان بە فسکە فسك و پێکەنینەوە، لە نێوان خۆیان دووبارە دەکردەوە. کاتێك خەلیل ئاغاش گوێی لە قسەی منداڵەکان بوو، ڕووی لەوان کرد و گوتی "ئێمە لەسەر مریشك دزین دەستگیرکراوین... ".

لە ڕادیـۆی چێشـتخانەکەوە گوێمـان لەوە بـوو، کودەتـایەکی سـەربازی لە شـیلی ڕووی داوە و سـەلڤادۆر ئالەنـدەی (١٩٠٨-١٩٧٣) سـەرۆکی شـیلی، لەکـاتی ڕووبەڕووبـوونەوەی لەگەڵ کودەتاچییەکـان، گیـانی لەدەسـت داوە. هەروەهـا لە هەواڵەکـانەوە ئامـاژە بەوە کـرا، کە کودەتـا چییەکـان بە سـەرۆکایەتی ئاوگوسـتۆ پینۆچەت (١٩١٥-٢٠٠٦) دەستیان بەو کودەتایە کردووە. بۆیە بەو پێیەبێت، دەبێ گواستنەوەی ئێمە بۆ ئەدەنە لە یازدەی مانگی نۆی ساڵی ١٩٧٣ بووبێتن.

دەمەو ئێـوارە گەیشـتینە بەنـدیخانەی ئەدەنە. سـەرەتا ئێمەیـان لە نهۆمی ژێرزەمین دانا، ئەو شوێنەی ئاوەڕۆ و زێرابی بەندیخانەکەی لێوە تێپەڕ دەبوو. شـوێنێکی وەك حەمام گەرم و تاقەت پڕوکێنەر بـوو. بەیـانی ڕۆژی دواتـر، دوای تۆمـارکردنی ناوەکانمـان، ئێمەیـان بردە بەشی یەکدی بینین. شوێنەکە لە نهۆمی سێیەمی بەندیخانەکە بوو، کە لە کۆمەڵێك حوجرە و زیندانی تاکەکەسی پێك هاتبوو، کە ژمارەیـان نـزیکەی ١٢ حـوجرە دەبـوو. هەر یەکێـك لەوان بـۆ کەسـێك تەرخـان کرابـوو. بەڵام لەوێ، مـن و خەلیـل ئاغایـان بەیەکەوە لەیەك زیندانی تاکەکەسی کرد.

کە چـووینە زینـدان، لە ژووری تۆمـارکردنی ناوەکانمـان و جێبەجێکردنـی کاروبـارە فەرمییەکـان بویەرێـك زۆر سـەرنجمی ڕاکێشا؛ دواتر زانیمەوە ئەوەی ناوەکانمانی تۆمارکرد، کورد بوو و کەسێك بوو ماڵباتەکەیان و باوکی ئەو کەسەش، زوو زوو ناوی لەناو جولانەوە کوردییەکاندەهاتە سەر زمانان. ناوی ماڵباتەکەیانم لەبیر نییە، لەگەڵ ئەوەی لەو باوەڕەدام ناوهێنانیشی زۆر پێویست

نابێ. جا کاتێك ناوی خەلیل ئاغا تۆمار دەکرا؛ پرسیاری ئەوەی لێکرد "بەرواری لە دایك بوونت کەیە؟ چەند منداڵت هەیە؟ خاوەنی چەند خوشك و برایت؟ داهاتت چەندە؟ ..." کەسەکە کوردیشی دەزانی، بەڵام هیچ هاوکارییەکی نەکردین. دواتر زانیم ئەویش بەندکراو بوو، بەڵام لە کارگێڕی زیندانەکە بەرپرسیاری جێبەجێکردنی هەندێك کار و باریان پێدابوو...

لە بەندیخانە خواردنیان بە بەندکراوان دەدا. وەلێ هەڤاڵانی زیندان، دوای ئەوەی چێشتەکانیان وەردەگرت، دووبارە بە ترش و خوێ و بەهارات، کابانیەکیان بۆی دەکردەوە و پاشان دەیانخوارد. من هیچ زانیاری و تاقیکردنەوەیەکی خواردن دروست کردنم نەبوو، بەڵام بە پێی ئەو زانیارییانەی لە برادەرانی ئەوێ بیستم، منیش ڕۆژێك قۆڵم لێی هەڵکرد چوومە ناندین و دەستم بە دروستکردنی خواردن کرد. بەرامبەر بەو هەنگاوەم، خەلیل ئاغا گوتی "کاکە ئاشپەزی ئاوا نابێ، لە هەمووی باشتر ئەوەیە، خۆمان لەگەڵ ئەو خواردنە ڕابهێنین کە پێمان دەدەن".

نزیکەی ١٠ ڕۆژ لە بەشی چاوەڕوانی هێڵدراینەوە. دواتر ئێمەیان خستە قاوشی زیندانیانی سیاسی. لە گرتووخانەی ئەدەنە، خەڵکێکی زۆری زیندانی سیاسی ناوچەی ئەرووحی شاری سیرتی لێ بوو. بۆیە ئەوان خەلیل ئاغایان بردە قاوشی خۆیان. وەلێ ئاماژەیان بەوەکرد، هەموو کات دەتوانن بێنە بەشی سیاسییەکان.

لەو قاوشەی بۆی چووم، هەریەکە لە جان یوجەل[1] و سلێمان ئیجە و عەبدوڵڵا نەفەس و ئەحمەد حەمدی و یاشار ئوچار و چەند کەسێکی دیکەشی لێبوو. لەگەڵ نزیکەی دە کەسێك، کە لە فەڵەستینەوە گەڕابوونەوە و لە ناوچەی سامان داغ دەستگیرکرابوون، چونکە دەیانویست لەوێوە بێنەوە ناو تورکیا. وەلێ ئەوان بە هۆی جیاوازی بۆچوونەوە، بەسەر دوو بەرە دابەش ببوون. ئەوان خەڵکی ناوچەکانی کیلیس و بەلقیس و ئیسلاحییە و ڕەیحانلی و عەنتاپ بوون.

لەوێ خەڵکێکی زۆر دەهاتنە سەردانی خەلیل ئاغا. هەندێك کات منیشی بانگهێشتی لای خۆی دەکرد بۆ دانیشتن لەگەڵ ئەو میوانانە. خەلیل ئاغا خوشکێکی هەبوو لە مێرسین دادەنیشت. ئەو زوو زوو سەردانی دەکرد. هەر کاتێك دەهاتە لای خەلیل ئاغا، زانیاری و هەواڵی ئەوەی پێدەدا "فلان و فلان و فلان چوونە ناو ڕیزەکانی پێشمەرگە، فلان و فلانیش ئامادەکاری دەکەن بۆ ئەوەی بڕۆن، فلانە کەسیش گەڕاوەتەوە".

[1] جان یوجەل (١٩٢٦-١٩٩٩) شاعیر، کوڕی حەسەن عەلی یوجەلی سیاسەتمەداری تورکە. باوکی لە نێوان سالانی (١٩٣٨-١٩٤٦) لە حکومەتەکانی جەلال بەیار و ڕەفیق سایدام و شوکروو سارائۆغلوو، وەزیری پەروەردەی تورکیا بووە. (وەرگێڕ).

## پەیوەندیی نێوان خەلیل ئاغا و جان یوجەل

"دیسان کە دەستی پێ کردەوە ماشا...

بە مەرحەبا خالۆ، ئەلّایەکە لەناوەڕاست دەبڕێ،

دوای بێدەنگییەکی کورت،

لەگەڵ ئەو خەندە ئیختیارەی،

وەك تۆپی جەژن، قاقامان دەتەقێتەوە".

خەلیل ئاغا زوو زوو دەهاتە بەشی گیراوانی سیاسی. لەگەڵ هەر هاتنێکیشی لەگەڵ زۆربەی بەندکراوانی ئەوێ دەمەتەقێ و گفتوگۆی دەکرد. لەوێ برادەرێکی خەڵکی ماراش هەبوو بە ناوی حوسێن. ئەو وەرگێڕی بۆ خەلیل ئاغا دەکرد. جان یوجەل شیعرێکی لەسەر خەلیل ئاغا نووسیبوو. جا سەرەتای هۆنراوەکە بە (ماشەلّا) دەستی پێدەکرد. لەناو پەرتووکە بڵاوکراوەکانی جان یوجەل، ئەو شیعرەش بڵاوکراوەتەوە.

لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٧٣، هەمدیسان شەڕ و پێکدادان لە نێوان کورد و سەدام حوسێن دەستی پێکردبۆوە. سەدام حوسێن بە دنە و هاوکاری و گوشاری تورکیا و ئێران و سووریا، ڕێککەوتنی ١١ی ئازاری جێبەجێ نەکرد. سیاسەت و جوڵەکانی ئەمەریکا و یەکێتی سۆڤیەتیش وەك هاوکاریی و لایەنگری بەغدا دەبیندرا. یەکێك لە ڕۆژەکانی کۆتایی ساڵی ١٩٧٣، لە گەشتی

هەواڵەکانی شەودا، ڕادیۆی ئەنقەرە، هەواڵی ئەوەی بڵاوکردەوە، گوایە هێزەکانی سوپای عێراقی، دەستیان بەسەر زاخۆدا گرتووە و چوونەتە ناو شارەکە. هەمان هەواڵ لەلایەن ڕادیۆی ڕوومیش بڵاوکرایەوە، کە لە قووربرس بەخشی خۆی دەکرد. ئەوسا لەوێ ماکاریۆس (١٩١٣-١٩٧٧) لە دەسەڵات بوو.

ڕۆژی دواتر ئەو هەواڵەیان بە خەلیل ئاغا ڕاگەیاند. بەڵام ئەو لە وەڵامدا، نوچەکەی بە ناڕاست و باوەڕپێنەکراو هەژمار کردبوو. وەلێ برادەرانی ئەوێ ئاماژەیان بەوە کرد، کە ڕادیۆی ڕووم، کە لەژێر دەسەڵاتی ماکاریۆس پەخشی خۆی دەکات، ئەوانیش هەمان هەواڵیان بڵاو کردووەتەوە. لەهەمبەر ئەوە، خەلیل ئاغا گوتی "بنەچەی ئەو هەواڵە حکوومەتی عێراقی خۆیەتی و لە بنچینەوە بە درۆ هەواڵێکیان بڵاوکردووەتەوە. سەددام حوسێنیش هەموو دنیای هەڵخەڵەتاندووە". پاشان بەو شێوەیە بەردەوام بوو لە قسەکردن "هیچ لایەنێك ناتوانێ لە ناوچەی گەلی سپی تێپەڕێت، کە دەکەوێتە نێوان موسڵ و زاخۆ. لەوێ هێزەکانی عیسا سواری لێیە. بۆیە لەوێ باڵندەیەکیش ناتوانێ بەسەر ئەوێدا بفڕێ ئەگەر عیسا سوار[1] ئاگاداری جوڵەکە نەبێت...".

---

[1] عیسا سوار (١٩٢٦-١٩٧٥) پێشمەرگەیەکی کوردی خەڵکی دەڤەری مزووریانی گوندی سێلکێیە. ئەو هەر زوو دەچێتە پاڵ شۆڕشی دووەمی بارزان، لە ساڵی ١٩٤٣ . ١٩٤٥ و بەشداری تەواوی شەڕەکان دەکات. لە مانگی ١١ی ساڵی ١٩٤٥، لەگەڵ مەلا مستەفا بارزانی بەهێزێکی گەورەوە دەچنە مەهاباد و پاش رووخانی کۆماری کوردستان، لەگەڵ بارزانی دەچێتە یەکێتی سۆڤیەتی جاران و دواتر دەگەڕێنەوە عێراق. ساڵی ١٩٥٩ بەهۆی ئەنجامدانی چالاکییەکی شۆڕشگێڕی لە موسڵ، عیسا سوار دەستگیر دەکرێ و رەوانەی شاری سلێمانی دەکرێ و لەوێشەوە دەیگوازنەوە بۆ شاری کەرکوک و بەعقوبە. بەڵام ئەو بە شێوەیەکی زیرەکانە بە هاوکاری رێکخستنەکانی پێشمەرگە، خۆی لە دەستی
=

چەند ڕۆژێك دواتر پارێزەرەکان هاتن. لەوێ پرسیارمان لەسەر ڕاستی و دروستی و سەرچاوەی هەواڵەکە کرد. ئەوانیش بەو شێوەیە ڕووداوەکەیان بۆ باسکردین: یەکینەکانی سوپای عێراق، بەشێوەی ڕێککەوتنی پێشەوختە سەرەتا چوونەتە سووریا، لەوێشەوە هەر بە ڕێککەوتن لە سووریاوە چوونەتە تورکیا. لەوێشەوە چوونەتە سلۆپی و پاشان چوونەتە زاخۆ. هەواڵەکە لە وەها دۆخێکدا، بۆ پرسی کورد و کوردستان زۆر گرنگ بوو. زانینی دۆخی ناوچەکە لە ڕووی سەربازییەوە، بە شێوەیەکی ورد لەلایەن خەلیل ئاغاوە، جێگای سەرنج و گرنگی پێدان بوو. چونکە کاتی خۆی، خەلیل ئاغا لەگەڵ یەعقوب ئاغای باوکی لەوان ناوچان زۆر گەڕابوون و زانیاری زۆری لەسەر هەبوون.

دوای گەیشتنی سوپای عێراق، بۆ شارۆچکەی زاخۆ، هێزەکە نەیتوانی ماوەیەکی درێژ لەوێ بمێنێتەوە، چونکە چەند ڕۆژێك دوای گەیشتنیان، لە شەڕێکی گەورەدا، دوای ئەوەی سوپای عێراقی چەندان قوربانیان دا، بەناچاری ناوچەکەیان چۆڵکرد و چۆن هاتبوون، ئاوا گەڕانەوە.

---

هێزەکانی عێراق رزگار دەکات و دەگەڕێتەوە کوردستان. ساڵی ١٩٦٢ بە فەرمانی بارزانی، عیسا سوار فەرماندەیی سنووری زاخۆی پێ دەسپێردرێ و دەیان داستانی گەورەی وەک (داستانی عێن زالە و گەلی سپی و سەری ئاسهێ و بانیا نێرگزی و دێرەبونی و پیشخابوری و کانی ماسی و خەرابا و ئاڤگەنیێ و چیای مەتین) تۆمار دەکا و سوپای عیراقی بەتەواوی لەو سنوورە تێک دەشکێنن، بۆیەش بەدرێژایی شۆڕشی ئەیلول شەهید عیسا سوار هەر بەفەرماندەیی ئەو سنوورە دەمێنێتەوە، هەتا نسکۆی ساڵی ١٩٧٥. (وەرگێڕ).

## "منداڵان سەرلەنوێ زیاد دەبنەوە"

لە مانگەکانی بەهاری ساڵی ١٩٧٤، هێزەکانی سوپای عێراقی، بە فڕۆکەی (میگ)، کە لەیەکێتی سۆڤیەت کڕی بووی، قەڵادزێی بۆردومان کرد[١]. لەوێ سەردەمێدا، دۆخەکە بۆ کورد، مەسەلەی مان و نەمان بوو. لەوێ دەمێدا، منداڵانی کورد، لەژێر چادر، لە چیا دەیانخوێند و پەروەردە دەکران. بە شێوەیەك گەنگەشەی ئەوە دەکرا، ئاخۆ زانکۆی سلێمانی، ببردرێتە چیا یان نا؟ بە پێی ئەو هەواڵانەی بڵاوکرانەوە و گەیشتنە بەر گوێی ئێمە، لە بۆردوومانەکەدا ٧٢ منداڵی خوێندکار و مامۆستاکانیان گیانیان لەدەست دابوو. لە کەش و هەوایەکی خەمگیندا، هەواڵەکەیان بە خەلیل ئاغا گوت. ئەویش ڕووی لە من کرد و پێی گوتم "مامۆستا خۆت عێذز مەکە، سوپاس بۆ خوا پێشمەرگە هیچی لێ بەسەر نەهاتووە؛ منداڵیش دیسان لە دایك دەبنەوە و ژمارەیان زۆر دەبێتەوە".

لە پایزی ساڵی ٢٠١٨، لە زانکۆی دهۆك، سەردانی سەنتەری

---

[١] لە دەمژمێر نۆ و چل و پێنج خولەکی بەیانی، بەرواری ٢٤-٠٤-١٩٧٤ لەلایەن رژێمی بەعس، بە چەکی قەدەغەکراوی ناپاڵم، شارۆچکەی قەڵادزێی بۆردوومان کرد. لە ئەنجامدا ١٣٤ هاونیشتیمانی شەهید بوون و ١٥٢ی دیکەش بریندار بوون. بە پێی هەندێك سەرچاوەی دیکە بێت، نزیکەی ٣٧٠ هاونیشتیمانی لەو هێرشەدا شەهید بوون. (وەرگێڕ).

بێشـکچیمان کـرد. پرۆفیسـۆر دکتـۆر موسـڵیح دهـۆکی سـەرۆکی زانکۆ، ئێمەی بۆ شیڤی داوەت کرد. ئەوێ ئێوارێ لەسەر مێزی نان خواردنەکە حەفت کەس بووین. چواریان برادەرانی ئێمە و سەرۆکی زانکۆ و ئەکادیمسیەنێکی عەرەب و یەکێکی کورد. لەناو قسە و باسـەکانماندا، پرسـی جەنگـی کۆتاییەکـانی سـاڵی ١٩٧٣ و هـاتنی سـوپای عێـراق بـۆ زاخـۆ و بۆردومـانی قەڵادزێ کـرایەوە. مامۆستا موسڵیحی سەرۆکی زانکۆ، باسی لەوە کرد، لەوێ دەمێدا ئەو لە قەڵادزێ پێشمەرگە بووە. بۆیە زانیاری تەواوی پێداین کە لە بۆردوومـانەکەدا ١٥٠ منـداڵ و خوێنـدکاری کـوردی زانکـۆ، کۆمەڵکوژ کران.

***

لە ناوەڕاستی تەبـاخی سـاڵی ١٩٨٤، خەلیـل ئاغـا لە مـاڵەکەی خۆی، بە هۆی نەخۆشیەوە لەسەر جێگا کەوتبوو. لە دەورووبەری نیوەڕۆ گوێی لە دەنگە دەنگێك دەبێ لە کۆڵانی بەر ماڵەکەیان. بـۆیە برازاکـانی بانـگ کردبـوو و لێـی پرسـی بـوون "ئەو دەنـگە دەنگ و هەرا و هوریایە چییە؟" ئەوانیش لە وەڵامدا پێیان گوتبو "ژمارەیەکی زۆری قوتابی هێرشیان کردۆتە سەر شار و خستۆتیانە ژێـر ڕکێفـی خۆیـان". ئەویـش لە وەڵامـدا گوتبـوی "چارەسـەر بە نیـوەچڵی نـامێنێتەوە". ڕۆژێـك دوای ئەو قسـەیەی کـۆچی دوایـی کرد.

## خورشید ئاغا
## ئەو ژیانەی دروشمەکان بێ بەها دەکەن

چەپەکانی تورکیا، لە کۆتایی سالأنی شەست و سەرەتای حەفتاکان، دروشمێکیان هەبوو بێ پسانەوە دەیانهێنا زمان (تورکی بۆرژوازی و کوردە فەیۆدالەکان، تورکیا بەڕێوەدەبەن) ئەو سلۆگانە بە شێوەی (سەرکار و دەولەتی ئاغا) لە زۆر شوێن و کاتدا بەکار دەهێندرا. لەوێ دەمێدا بەشێکی زۆری کوردە شۆڕشگێڕ و دیموکراتەکانیش هەمان دروشمیان بەکار دەهێنا. وەلێ دۆخ و بەسەرهاتی خورشید ئاغا، هیچ هاوکاریەکی ئەو بۆچوونەی نەدەکرد و دروشمەکەی پوچەڵ دەکردەوە. بە پێچەوانەوە، خاوەنی بیرۆکەی لاوازکردن و ناڕاستی بوونیشی بوو.

لە مانگی شەشی سالی ١٩٧١ ژمارەیەکی زۆری دەستگیراوی شاری سیرتیان هێنایە، بەندیخانەی دۆخی لەناکاوی سەربازی دیاربەکر. باس لەوە دەکرا، ئەوان ئەندامانی پارتی دیموکراتی کوردستانی تورکیا بن. لەناو دەستەکە چەندان کەسی دانیشتووی لادێ و خاوەن کاری ئازاد و کەسی جیاواز هەبوو. لە کاتی لێکۆڵینەوە، ئەشکەنجەیەکی زۆری لادێییەکانیان دابوو. چونکە کە هاتنە لامان، بە ئاسانی نەیاندەتوانی ڕێ بکەن و بپەیڤن. یەکێك لەوانەی ئەشکەنجەدرابوو، خورشید ئاغا بوو، خورشید ئۆنوك.

خورشید ئاغا بە تۆمەتی ئەوەی ئەندامی پارتی دیموکراتی کوردستانە و هاوکاری ماددی و مەعنەوی مەلا مستەفای کردووە،

دادگـایی دەکـرا. واتە بە پێـی ئەو دروشـمە بـێ کە دەیگـوت (سـەرکار و دەوڵەتـی ئاغـا) ئاغـاکە خورشـید ئاغا بـوو. وەلـێ خورشید ئاغا لە لێکۆڵینەوەی ئاسایش لە ژێر ئەشکەنجە هەموو گیـانی شـکێندرابوو. بە دڵنیـایەوە هەمـوو ئەوانەی لە کوردسـتان خاوەنی زەوین، بەو شێوەیە نین. ئەگەر کەمیش بووبێ، دەتوانین بڵێین خەڵکانێك هەبوون وەك خورشید ئاغا بوون.

## پێداگیریی کورد و فیودالیەتی ئاغا

لە قاوشی مانەوەمان، هەستم بە ڕەفتارێکی خورشید ئاغا کرد، کە جێگـای سـتایش بـوو. ئەوەیـش ئەوەبـوو کە هەر قوتـابیەکی کورد لەگەڵ ئەو بە تورکی بدوابا، ئەو قسەی لەگەڵ نەدەکرد. وە یان ئەگەر خوێنـدکارێکی کورد، بە تورکی پرسـیارێکی لێکردبا، ئەو وەڵامــی پرســەکەی نەدەداوە. ئەو تــورکی دەزانــی، وەلــێ بەردەوام بە کوردی دەدوا.

ڕۆژێـك، منـیش بـوومە گەواهیـدەری ئەو هەڵوێسـتەی. دەمەو نیوەڕۆ بوو، هەندێك زیندانییان بە ترومبێلی سەربازی لە دادگاوە هێنـاوە بەنـدیخانە. لەوێ سـەروبەندێدا، بەنـدکراوان لە شـوێنی هەواگـۆڕکێ، دوو دوو و سێ سێ، پیاسـەیان دەکرد. یەکێك لەو هەڤـاڵانەی لە دادگـاوە گەڕابـۆوە، بە تـورکی لە خورشـید ئاغـای پرسـی "ئاغـا خـواردن هـاتووە؟" بەڵام ئەو وەڵامـی نەداوە. کـوڕە دووبارە پرسیارەکەی بە تورکی کردەوە، خورشید ئاغا هەمدیسان بەرسـڤی نەداوە. وەلـێ ئەمجـارە بەنـدکراوەکە "دیـارە تۆ بە پیـاوم

دانانێی، بۆیە وەڵامی پرسیارەکەم نادەیەوە... جا هەروانە ئاغای فیودالّ! " بەو شێوەیە دەستی بە گلەیی و گازاندە کرد، لەهەمبەر ئەوەی بەرسڤی پرسیارەکەی نەدراوەتەوە... بەڵام ئەمجارە خورشید ئاغا هاتە لای ئەو برادەرە و بە کوردی پێی گوت "کورِم، تۆ بۆ بە زمانی خۆت ناپەیڤی؟" ئەویش بەو شێوەیە وەڵامی پرسیارەکەی ئاغای داوە "ئاسیمیلە بوومە و کوردی نازانم... " خورشید ئاغاش لەهەمبەر ئەو وەڵامە گوتی "هەموو ژیانی لینین و ستالین و مێژووی شۆڕشەکانی جیهان دەزانی و، ناوهێنانی مارکست لە زار نابڕێتەوە، بۆیە خۆت فێری زمانی دایکیشت بکە".

## ئەوەندە خۆت بەو پەڕاوانە عێدز مەکە

خورشید ئاغا بە وردی و لە نزیکەوە لەگەڵم هەڵسوکەوتی دەکرد. هەر کاتێك بچووبووما دادگا و لەوێوە بگەڕاباماوە، ورد و درشتی ڕۆژەکەی لێ دەپرسیم. داواکاری گشتی چی گوت؟ دادوەر بڕیاری چی دا؟ تۆ باسی چیت کرد؟ پارێزەرەکانت لەوێ بوون؟ ئیدی هەموو پرسیارێکی ناوەڕۆکی دانیشتنەکەی لێ دەکردم و خۆی بە خەمخۆرم دەزانی و لەسەر ئەو مژارانە بە درێژی دەدواین.

لەوێ دەمێدا، ئەو وەڵامانەی وەکوو بەرگری کردن لە خۆم، بەرامبەر دادگا ئامادەم دەکرد، سەرەتا بە دەست دەمنووسیەوە، دواتر بە ئامێری نووسینەوە چاپم دەکردن. جا نەك تەنیا ئەوەی خۆم، بەڵکوو بەرگرینامەی زۆربەی برادەرانیش بە ئامێری

نووسینەوە، من بۆم ئامادە دەکردن. ئەوەش کارێکی گران و ورد بوو، هاوکات، دەمێکی زۆریشی دەخایاند. ئەو کارەشمان زۆربەی کات لە مێزەکانی چێشتخانە دەکرد. دوای ئەوەی نان دەخورا و مێزەکە پاقژ دەکراوە. ئیدی شەو و ڕۆژ کارەکە درێژەی دەکێشا.

کاتێك ئەو کارەم دەکرد، خورشید ئاغا، بە پیاڵەیەك چاییەوە، یاخود بە بەرداخیك شەربەتەوە، دەهاتە لام و لە دەنگ و باسی دەپرسیم. بەر لە ڕۆیشتنیش دەیگوت "تۆ خۆت بە کارێکی ڤالاوە مژوول دەکەی، چونکەتەنها یەك ڕێگا هەیە بۆ چارەسەری کێشەی ئێمە". جا بە پەنجەی دۆشاو مژەی (شەهادەی) هێمای پەلاپیتکەی چەك تەقاندنی دەکرد و چەند هەنگاوێك دوای دوور کەوتنەوەی ئاوڕێکی لێ دەدامەوە و دەیگوت "زێدە خۆت بەو پەڕاوانە عێذز مەکە"...

خورشید ئاغا ئەوەی زیاتر لە سێ چوار جار کرد. ڕۆژێك کاتێ سەرقاڵی نووسینی بەرگرینامە بووم. خورشید ئاغا دیسان هاتەوە لام. چاێکیشی لە دەست بوو. دوای ئەوەی بەرداخە چایەکەی دەستی لەسەر مێزەکە دانا و لە حاڵ و ئەحواڵی پرسیم، بەر لە ڕۆیشتن گوتی "تۆ خۆت دڵتەنگ دەکەیت و کارێکی بێ هوودەش دەکەی". منیش بەر لەوەی بڕوات، کەمەریم گرت و لەتەك خۆم دامنیشاند و هەوڵمدا بەشێك لە هەستە سۆزداری و بیروبۆچوونەکانی خۆمی پێ بڵێم "خورشید ئاغا، تۆ بەوە تاوانبار دەکرێی، گوایە چوویتە ناوچەکانی دهۆك و زاخۆ لە باشووری کوردستان. دەڵێی برازا و خاڵ و خوارزا و منداڵە مامەکانم لەوێن. باشە بۆچی دەبێ چوونت بۆ ئەوێ تاوان بێ؟ ڕاستە ئێرە وڵاتی تۆیە، بەڵام لەو نێوەندەدا سنوورێك هەیە، وەلێ هەموو

کات بێ ئەوەی کەس بتبینێت تۆ ئەو سنوورە بە تاریکایی شەو تێدەپەڕێنیت و وەك دزێك لێی دەپەڕیەوە. کاتێکیش لە دەمێکی ئاسایدا لە ساتەوەختی تێپەڕینی ئەو سنوورە دەستگیردەکرێی، هەندێك بەرتیل دەدەیتە فەرماندەی قەرەقوڵی ناوچەکە و تێدەپەڕیت. لە وەها دۆخێکی وەك ئێستاش، کاتێك دەستگیر دەکرێی، دەتگرن و دەتهێننە بەندیخانە. ئایا ئەو سنوورە چۆن کێشراوە و بۆچی کێشراوە؟ کەی کێشراوە؟ ئایا بۆچی عەشیرەت و گوندەوارییەکانی ناوچەکە و خزم و دۆستی دەڤەرەکە، بە تێل و ناوچەی مین ڕێژکراو لێك جیاکراینەوە و بە فڕۆکەی سیخوڕی و، سەرباز چاودێری دەکرێن؟ بۆیە پێویستە لەوانە تێبگەین. هەروەها دەبێ بزانین دۆست کێیە و دوژمن کێ؟ جا بۆ زانینی ئەوانە نووسین زۆر گرنگە، بە تایبەتیش زانینی ڕابردوو زۆر بایەخدارە".

بەردەوام بووم لەسەر بەیان کردنی هزر و بۆچوونەکانم بۆ خورشید ئاغا "کورد بە سەرکردایەتی مەلا مستەفا بارزانی،ساڵەهای ساڵە لە جەنگێکی بەردەوامدان لەگەڵ سەددام حوسێن و ڕژێمەکەی. وەلێ هیچ وڵاتێکی جیهان هاوکاری کوردان ناکات. کورد هیچ دۆستێکی نییە، وەلێ دوژمنی گەلێك زۆرە. بۆیە زانینی ئەوانە گرنگ و زەرورەتە. هەر لەبەر ئەوەشە پەڕاو و نووسین گرینگن... ".

سەبارەت بەو پرسە قسەی زۆرم بۆ خورشید ئاغا کرد. هەوڵمدا هەست و سۆز و هزر و بیرمی بۆ ڕوون بکەمەوە. بۆیە دوای ئەو پەیڤانە، خورشید ئاغا زۆر عێدز بوو. بەشێوەیەك خەریك بوو بداتە پرمەی گریان. وەك ئەوەی نەوەی ئەو بم، دەستی بەسەرمدا هێنا و لێم دوور کەوتەوە و جارێکی دیکە

نەیگوتەوە تۆ کارێکی ڤالآ دەکەیت. من لەوێ دەمێدا تەمەنم ٣٢-٣٣ ساڵێك دەبوو. لە کاتێکدا خورشید ئاغا تەمەنی لە دەوروبەری ٦٠ ساڵان بوو.

خورشید ئاغا دەیزانی هاوسەرگیریم کردووە و وەلێ هێشتا منداڵمان نەبووە. بۆیە ناوە ناوە دەیگوت "تۆ پیاوێکی زۆر چاکیت. بۆیە پێویستە ناوت لە ڕێگای منداڵەوە بەردەوامی پێ بدرێ. بۆ ئەمەش دەبێ منداڵت هەبێ. بۆیە دەبێ کچی عەشیرەتێکی کوردت بۆ بهێنین". لە ڕۆژانی سەردانی بەندیخانە، کاتێك بەردەم زیندان تژی منداڵ دەبوو، هاوارم بۆ خورشید ئاغا دەکرد و دەستم بۆ زارۆکەکان درێژ دەکرد و پێم دەگوت "خورشید ئاغا خەم مەخۆ، ئەوانە هەموویان منداڵی ئێمەن... " بەلآم ئەو هەر پێداگری لەسەر ئەوە دەکرد کە دەبێ منیش منداڵم هەبێ و لە ڕێگای ئەوەوە ناوم نەمرێ.

خورشید ئاغا بە هۆی ئەو لێدان و ئەشکەنجانەی پێی کەوتبوو، لە کاتی دەستگیرکردن و زیندانی تاکەکەسی، دۆخی تەندروستی زۆر خراپ بوو. بەردەوام دەرمانی دڵی دەخوارد. لە لێبووردنە گشتیەکەی ساڵی ١٩٧٤ ئەویش ئازاد بوو. بەلآم ماوەیەکی زۆر کورت دوای دەرچوونی، کۆچی دوایی کرد.

دەمەوێ لێرە ئاماژە بەوە بکەم، خەلیل ئاغا و خورشید ئاغا، ڕۆڵێکی زۆر دیار و بەرچاو و گەورەیان هەبووە لە گەشەسەندنی بیر و باوەڕ و ڕامان و هەستەکانم سەبارەت بە کورد و کوردستان.

## حوسێن مووسا ساغنچ
## نموونەی جەسووری کەسێکی مەدەنی

حوسێن مووسا ساغنچ[1]، لە گردبوونەوەکانی ساڵی ١٩٦٧ی ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتەوە دەناسم. لەگەڵ برادەران، لە چەندان کاتی جیاواز، سەردانی شوێنی دارتاشییەکەی و ماڵەکەیمان کردبوو لە تاتوان. شاکر ئەپۆزدەمیریشم لەو سەردانانە ناسی. ئەو لەوێ دەمێدا لە تاتوان خەریکی کاری بەقاڵی بوو.

لەگەڵ کاک حوسێن، لە سەردەمی ڕژێمی دوازدەی ئازار، بەیەکەوە لە زیندانی دۆخی لەناکاوی دیاربەکر بووین. لەوێ دەمێدا زۆر زانیاری گرنگی دەربارەی پارتی دیموکراتی کوردستان و مەلا مستەفا بارزانی بۆ باسکردم. پێدەچوو چەند جارێك سەردانی بارەگای شۆڕشی کردبێت.

لەوێ دەمێدا، ماڵباتەکەی زوو زوو لە زیندان دەهاتنە سەردانی، جمکێکیان هەبوو، زۆر کات ئەوانیان دەهێنا قاوشەکەی ئێمە. زۆر بیرەوەریمان لەگەڵ کاك حوسێن هەیە. لەوانە یادەوەری

---

[1] فەقی حوسێن ساغنچ نووسەر و بیرمەندێکی کوردە (١٩٢٦-٢٠٠٣)لە شارۆچکەی خیزان لە پارێزگای بەدلیس لە باکووری کوردستان لە دایک بوو. ماوەی منداڵی بە کاری بەردتاشی و دارتاشی بردۆتەسەر. لە ساڵی ١٩٣٨ چووە مەدرەسە و لە ئەنجامی وانە خوێندنەکەی بوو بە فەقی. هەر لەوێ خوێندن و نووسین بە پیتی لاتین فێر بوو و هەروەها جگە لە زمانی زگماکیی کوردی، زمانەکانی تورکی، عەرەبی و فارسییش دەزانی. لەو سەردەمە زمانی کوردی لە باکووری کوردستان بە تەواوی قەدەخە بوو و فەقی ساغنیچ دەستی کرد بە لێکۆڵینەوەی زانستی لە سەری زمانی کوردی. (وەرگێڕ).

کارکردنمان لە ناوەندی کولتووری میزۆپۆتامیا[1] و دامەزراندنی ئینیستیتوتی کوردی لە ئیستانبووڵ[2].

حوسێن ساغنچ، پسپۆری زمانی کوردی بوو. چەندان لێکۆڵینەوە و نووسینی هەبوو سەبارەت بە زمانی کوردی، لەوانە (مێژووی ئەدەبیاتی کوردی) یەکێکە لەو بەرهەمانەی سەبارەت بە مژاری کوردایەتی و زمان و وێژەکەی بە کارێکی ناوازە هەژمار دەکرێ. کاک حوسێن کەسێکی جوامێر و بە مەعریفە بوو. سەبارەت بەو بیروباوەڕەی هەشی بوو، کەسێکی زۆر ڕاستگۆ و خۆ نەویست بوو. هیچ کات لە ماڵەکەی، تاتوان و ئەنقەرە و ئیستانبووڵی خوانەکانی بێ میوان نەدەبوو. لە پێڤاژۆی گەشەسەندنی هزریمدا کاک حوسێن ڕۆڵێکی گرنگی هەیە.

کاک حوسێن، کەسێك بوو خاوەن هەستێکی بەرزی نیشتیمانی و ئاکارێکی جوانی شارستانی و بوێری. زۆربەی کاتیش لەسەر

---

[1] ناوەندی فەرهەنگی میزۆپۆتامیا، لە ساڵی ١٩٩١، لەلایەن چەندان ڕووناکبیری کورد، لە ناوچەی بەیئۆغلووی ئیستانبوڵ دامەزرێندرا. ئامانجی کردنەوەی ئەو ناوەندە بریتی بوو لە ناساندنی جیهانی ئەدەب و هونەری کوردی، بە دونیا. ناوەندەکە تاوەکو ساڵی ٢٠١٦ لە چالاکی خۆی بەردەوام بوو، بەڵام لەوێ بەرواری بەدواوە، بە بڕیاری وەزارەتی ناوخۆی تورکیا، بە ماددەی یازدەی دۆخی لەناکاو، ناوەندی کولتووری میزۆپۆتامیا و ٣٧٠ ناوەند و ڕێکخراوی دیکە داخران. (وەرگێڕ).

[2] ئینیستیتوتی کوردی لە ئیستانبوڵ، ساڵی ١٩٩٢ لەلایەن چەندان ڕووناکبیری باکووری کوردستان و تورك دامەزرێنرا، لەناویاندا هەریەکە لە (مووسا عەنتەر و ئیسماعیل بێشکچی و یاشار کایا و فەقێ حوسێن ساغنچ و عەبدولڕەحمان دوڕە و جەمشید بەندەر) ڕۆڵی سەرەکیان لە ئاواکردنییدا هەبوو. ئامانجی دامەزراندنی ئینیستیتوتی کوردی بریتی بوو لە لێکۆڵینەوە و کۆکردنەوە و بڵاوکردنەوەی زانیاری لەسەر مێژووی کورد و کوردستان لەهەموو بوارەکاندا. (وەرگێڕ).

ئەو پرسانە پێداگیر و کۆڵنەدەر بوو. لەوبارەیەوە دەمەوێ، لە خوارەوە دوو بەسەرهاتی کورتی نێوانمان بۆ ئێوە بگێڕمەوە:

لە زیندانی دۆخی لەناکاو، پرۆگرامێکی چڕی پەروەردەیی هەبوو. بۆ نموونە، هەندێکیان بە دەستە پەرتووکێکی دیاری کراویان دەخوێندەوە، هەندێکیش بە تەنیا سەرقاڵی کارێکی دیکە بوون. دواتریش شرۆڤە و گەنگەشەی ئەو کتێبە دەکرا کە خوێندرابۆوە. بە شێوەیەك دوای خوێندنەوەی هەر بەشێك، لە چەند خولەکێکدا گفتوگۆ لەبارەی ناوەڕۆکەکەی دەکرا. هەموو سیستەمی پەروەردەییەکە بە دیسپلینێکی توند تێپەڕ دەبوو. بۆ نموونە لەو دەمەی سەرقاڵی ئەو کارانە بووین، نان نەدەخورا و بنێشت جاوین نەبوو و، جگەرە کێشان قەدەغە بوو. هەروەها لەو شوێنانەی پەروەردەکەی لێ بەڕێوە دەچوو، قسەکردن و دەمەتەقێ قەدەغە بوو. جا شەو و ڕۆژ ڕاهێنانەکە بەردەوام بوو. منیش بەشداری خولەکانی ئێوارانم دەکرد. بۆ هەڤاڵە گەنجەکانیش هەندێك چالاکی جیاواز بەڕێوەدەچوو. ئێوارەیەکی زستانی ساڵی ١٩٧٢، پەرتووکی (شۆڕش و دەوڵەت)ی لینینمان دەخوێندەوە. یەکێك لە برادەران چەند لاپەڕەیەکی لە بەشێکی پەرتووکەکە خوێندەوە. ئەو کەسەی لە دوای ئەو دانیشتبوو و دەستەی خوێندنەوەی ئێمەی بەڕێوەدەبرد، یەکسەر گوتی "یەکێك لە برادەران ئەو بەشە شرۆڤە و گەنگەشە بکات و بۆمانی ڕوون بکاتەوە". دوای ئەو داوایەی مومتاز کۆلاری، کۆڕگێڕ، بێدەنگییەك باڵی بەسەر دەستەکە کێشا. چەند چرکەیەك تێپەڕی و کەس ورتەی لێوە نەهات. لەگەڵ تێپەڕینی دەم، منیش کەوتبوومە ناو هەست و بیرێکی تێکەڵ و ئاڵۆزکاو. خۆم هێنا و برد، تا شتێك

بڵێم، بەڵام زانیم منیش هیچ لەو بەشە حاڵی نەبوومە. لەگەڵ ئەوەی بە زیتەڵەییەوە گوێم بۆ خوێندنەوەی پەرتووکەکە ڕادێرابوو، وەلێ هۆشم لای دانیشتنی دادگای ڕۆژی دواترم بوو. بۆیە ئەمە وایکرد، دڵتەنگ بم بەوەی، نەتوانم لە تەواوی ئەو بەشە بگەم کە چەند چرکەیەك پێشتر خوێندرابۆوە. ئەوەش مێشکمی بەخۆیەوە ئاڵۆزتر کرد. نزیکەی خولەکێك بەسەر پرسیارەکەی کاك مومتاز تێپەڕی و کەس دەنگی نەهات بۆ قسەکردن. بۆیە بەڕێوەبەری دەستەکەمان گوتی "با ئەو برادەرە سەر لە نوێ بیخوێنێتەوە و ئێمەش بە وردی گوێی بۆ ڕادێرین. ئێرە باخچەی زارۆکان نییە و دڵی منداڵان نادەینەوە...". ئەو برادەرەمان دیسان ئەو بەشەی خوێندەوە. دوای خوێندنەوەشی هەمان پرسیاری کردەوە، بۆ ڕاڤەکردنی بەشی خوێندراو لەلایەن یەکێك لەو هەڤاڵانەی گوێگر بوون.

دوای تەواو بوونی خوێندنەوەکە، هەمدیسان کەسێك دەستی هەڵنەبڕی. بێ دەنگی باڵی بەسەر هەمووماندا کێشا. من دەمتوانی هەندێك شت لەسەر ئەو بەشە بڵێم، وەلێ بە تەواوی توانام بەسەریدا نەشکابوو. بۆیە منیش نوقەم لە خۆم بڕی. کات تێدەپەڕی و کەسێك نەبوو وەڵامی بەشی خوێندراو بداتەوە. ئەوێ ئێوارێ، زولکوف شاهین لەتەك من ڕۆنیشتبوو. ئەو زۆر حەزی بەوە دەکرد من بخاتە باروودۆخی ناهەموارەوە. چونکە لە دانیشتنەکانی پێشووتردا، بە نیوە حەنەك و ڕاستییەوە گوتبووی "کاکۆ با کاك ئیسماعیل بۆمان شرۆڤە بکات. مامۆستایەکی یاریدەدەری گەورەیە. زانکۆی خوێندووە و هەر لەوێش مامۆستایە... ". ئەوەشی چەند جارێك دووبارە کردبۆوە. بۆیە

ڕۆژێك، ئەوکاتەی لە شوێنی هەواگۆڕکێ دەمەشیاین، پێم گوتبو "کاتێك پرس دێتە سەر گەنگەشەکردن، دوای خوێندنەوەی هەر بەشێك، مەڵی با کاك ئیسماعیل بۆمان ڕوون بکاتەوە و بەو هەڵسوکەوتانە، منیش تووشی دۆخێکی نا هەموار مەکە". وەلێ ئەو گوێی پێ نەدەدام و کارەکانی خۆی دووبارە دەکردەوە. ئەوێ ئێوارێ، دوودڵ بووم لەوەی زولکوفر دیسان شتێکی ئاوا بڵێتەوە. لە کاتێکدا خۆ بە خۆ، سەرکۆنەی خۆم دەکرد و لەوە دەفکریم ئاخۆ بۆچی نەمتوانیووە ئەو چەند ڕووپەڵە بە ئاسانی تێبگەم؟ سەرتان نەیەشێنم، جاری دووەمیش کەس قسەی نەکرد.

دوای تێپەڕینی خولەکێك، مومتاز دەستی بە پرتە و بۆڵە و ڕەخنەگرتن کرد. لەو سەروبەندێدا، کاك حوسێن دەستی ڕاکرد و گوتی "منی گەنگەشەی دەکەم". بەڵام لەناو ئەو هەموو کەسەی لەوێ بوون، دەست بڵندکردن و دەستپێشخەرییەکەی کاك حوسێن زۆر سەیر بوو. لە کاتێکدا ئەو دارتاش بوو و لە دەرەوەی قوتابخانە خۆی فێری خوێندنەوە و نووسینی تورکی کردبوو. بەڵام کوردییەکی زۆر ڕەوان و جوانی دەزانی، چونکە نووسەرێکی دیاری کورد بوو. ئەو دەستی بە شەن و کەو کردنی ئەو چەند لاپەڕەیە کرد، منیش بە وردی گوێم لێی گرتبوو. هەوڵی ئەوەم دەدا بزانم، کاك حوسێن چۆن توانیویەتی بەسەر ئەو خوێندنەوەیە زاڵ بێ و ئاوا گەنگەشەی بکات. لەکاتێکدا باسی مژارێکی دەکرد، من بە هێسانی لێی تێنەگەیشتبووم. لە کاتی گوێگرتنمدا، کاك حوسێن شتی زۆر جیاواز و سەیری باس دەکرد. بەوەی باسی کۆمەڵگای سەرەتایی و کۆمەڵگای دەست بەسەر و کۆمەڵگای فەیۆداڵ و کۆمەڵگای سەرمایەداری و

سۆسیالیست و ئیمپریالیزم و ئەو کۆمەڵگایانەی بەرەو ڕووی ئەمپریالیزم دەبنەوە. لە پاڵ ئەمانە باسی قۆناغی گواستنەوەی کۆمەڵگای فەیۆداڵی دەکرد بۆ کۆمەڵگای سەرمایەداری. بەڵام ئەو، وشە و چەمك و ڕستەکانی بە کامی دڵی خۆی بەکار دەهێنا، بێ ئەوەی کۆ مانایەکیان هەبێ. بەلاشیەوە گرنگ نەبوو تەواوی بیرۆکەکەی چ واتایەکی گشتی بەدەستەوە دەدا. ئیدی ڕستەی بە دوای ڕستەوە دەنا. جا ئەوانەی ئەو دەیگوت، هیچ پەیوەندییەکیان بە بەشی پەرتووکەکەوە نەبوو کە خوێندرابۆوە. ئیدی بەوێ شێوەیێ نزیکەی دوو خولەك ئاخفی. دوای ئەو دووخەلەکە مومتازی کۆڕگێڕ، خۆی لێ گێف کردەوە و گوتی "ئەوەی ئێمە خوێندمانەوە کەی پەیوەندی بەو قسانەی تۆوە هەبوو؟ تۆ باسی چیت کرد و ئێمە چیمان خوێندەوە؟". لە وەڵامدا کاك حوسێن گوتی "چاوەکەم تۆزێك دەرفەتم پێ بدە، ئەوە هێشتا پێشەکییە. تۆزێکی دیکە دێمە سەر پرسە بنەچەییەکە". بەڵام کاك مومتاز گوتی "واز لە پێشەکی و شتی وەها بێنە و بڕۆ سەر ئەسڵی بابەتەکە".

دوای ئەو لێ خوڕینەوەیە، کاك حوسێن، لەو شوێنەی پچڕابوو، دەستی بە قسەکردن نەکردەوە، بەڵکوو وەك ئەوەی باسی هیچی نەکردبێت، دووبارە لە سەرەتاوە دەستی بە ئاخاوتنەکانی کەمێك لەمەو بەری کردەوە. دیسان باسی هەمان مژار و چەمکەکانی کرد. نزیکەی دوو خولەك بەردەوام بوو لە ئاخافتن. بەڵام مومتاز دیسان قسەکانی پێ بڕی و ڕووی دەمی لە کاك حوسێن کرد "کاکە تۆ باسی چی دەکەی لە ڕای خوا؟ ئەو بەشەی خوێندمانەوە چ پەیوەندییەکی بەو قسانەی تۆوە هەیە؟

ئەوە چ شرۆڤەیەکە تۆ دەیکەی؟" کاك حوسێنیش بە هێمنی وەڵامی داوە "چاوەکەم تۆزێك پشوو درێژ بە و هەندێك دەرفەتم بدەن تا بێمە سەر چەقی باسەکە. ئەوە تەنیا پێشەکییە". بەڵام مومتاز بە هەڵچوون و دەنگێکی گڕەوە، بەو شێوەیە لەسەری ڕۆیشت "پێتڤی بە پێشەکی ناکات، بەڵکو ڕاستەوخۆ بڕۆ سەر شرۆڤەی پرسەکە، ئەگەر لە ماوەی یەك خولەکیش وا نەکەیت، کۆتایی بە گردبوونەوە و کۆڕی ئەمڕۆ ئێوارە دەهێنم". کاك حوسێن هەمدیسان دەستی بە ئاخافتن کردەوە، بەڵام گەنگەشەکەی ئەو وا نەبوو، کە لەو شوێنەی دەپچڕێ، بەردەوامی پێبدا. وەلحاسڵ، جاری سێیەمیش باسی هەمان پرس و بابەت و چەمکەکانی ئاخافتنی یەکەمی کردەوە. بەڵام کاتێك کاك مومتاز گوێی لە هەمان ڕستە و پەرەگراف بۆوە، بە خێرایی قسەکانی پێ پچڕاند. ئیدی بە ڕق و قین و ناحەقیەوە قسەی سارد و سوڕی بەرامبەر کاك حوسێن کرد و داوای کۆتایی هێنانی دانیشتنەکەی کرد. هاوڕێیانیش بڕیارەکەیان بە کارێکی باش زانی بۆ دانیشتنەکانی ئێواران. ئیدی هەر واش کرا. جا بەر لە ڕۆیشتن، مومتازی بەڕێوەبەری دانیشتنەکە بە کاك حوسێنی گوت "تا یەك هەفتە نایەیتە وانەکان و دوورت دەخەمەوە لە دانیشتنی پەرتووك خوێندنەوە".

دوای بڵاوە لێکردنی برادەران، چوومە لای کاك حوسێن و پێم گوت "بۆ ئەو بوێریە شارستانییەی پیشانت دا، دەمەوێ دەستخۆشیت لێبکەم. لەو دەمە ناخۆشەدا، دەستهەڵبڕینەکەت شایەنی تەقدیرە، ئەمە نموونەیەکی زۆر جوان بوو بەلامەوە". لە وەڵامدا کاك حوسێن گوتی "لێیان نەگەڕا قسەکانم تەواو بکەم،

چونکە بەردەوام پەیڤەکانی پێ دەبڕیم و سیل سیلەی ئەفکاری دەپچڕاندم".

بەو شێوەیەی بۆتان باسدەکەم، یادەوەریەکی دیکەشم هەنە: لەگەڵ کاك حوسێنی، لەسەر دوو چارپای نزیك لەیەك، لە ژوورێك دەماینەوە. هەردووکمان لەبەشی سەرەوەی قەروێڵەکان دەخەوتین. ڕۆژێکی پایزی ساڵی ١٩٧٢، لەو شوێنەی لە قاوشەکەمان ڕووناکی تاڤی لێدەدا، لەسەر یاتاغەکانی خۆمان دانیشتبووین و دەمانخوێندەوە. لە بەرامبەر ئێمەش، دەستەیێك لە برادەران ئامادەکارییان بۆ دەستەی ڕاهێنانە پەروەردەییەکان دەکرد. لەناو ئەواندا، سەبری چاپیك و ئیحسان ئاکسۆیی و فەریت ئوزون و فاروق ئاراس و نیازی دۆنمەز و نوسرەت کلێچ ئاسلان و حەسەن ئاجار و مەحمود فڕات و محەمەد توی سز و ئیحسان یاڤوز تورك و جەمشید بیلەك و ئەیوب ئالجا بەی هەبوون. ئەوان لەسەر حەسیرێکی ڕاخراو لە دەوری یەکودوو گرد ببوونەوە. هەندێکیان پشتیان دابووە پاڵ دیواری ژوورەکە. ئەو دەستەی ناوم هێنان، زۆر پەیڕەوی دیسیپلینی ڕاهێنانە پەروەردەیەکەیان نەدەکرد. بۆ نموونە لە کاتی بەڕێوەچوونی ڕاهێنانەکە جگەرەیان دەکێشا، یان نانیان دەخوارد؛ جگە لەوەی لەگەڵ هەڤدوو قسەیان دەکرد. جا بەسەرهاتی خۆیان بۆ یەکدی دەگێڕاوە و دەیاندا قاقای پێکەنین. ئەوێ ڕۆژێ، کە لەوێ ڕۆنیشتبوون، زۆر گوێم لە ڕستەی (شێوازی وەبەرهێنانی ئاسیایی) بوو. هەروەها دەیانگوت ئەو شێوازە لە وەبەرهێنانە گەلێك زەحمەتە. وەلێ ڕاڤەکردنی چەمکی کۆمەڵگای سەرەتایی و کۆمەڵگای کۆیلایەتی و کۆمەڵگا فەیودالی و سەرمایەداری و سۆسیالیست هێ ئاسانترە.

لەبەر ئەوەی ئەوان نزیکەی سێ مەترێک لە ئێمە دوور بوون، بۆیە قسە و باسیان بە هێسانی دەهاتە بەر گوێ.

لە پڕ بینیم کاک حوسێن لە شوێنەکەی خۆی هاتە خوارەوە و، ڕاستەوخۆ بەرەو لای ئەو برادەرانە هەنگاوی هەڵێنا. بە سێ هەنگاو گەیشتە بازنەی کۆبوونەوەکەیان. سەیرم کرد و هەستمکرد شتێکی پێ گوتن. پاشان لەلای ئەوانەوە بەرەو ئەولاتری قاوشەکە ڕۆیشت. هێشتا کاک حوسێن زۆر دوور نەکەوتبۆوە؛ یەکێك لە برادەرانی ناو دەستەکە، بە گرژیەوە بەرەو ئەو چارپایە هات، کە منی لێبوو و بە دەنگێکی نا ئاسایی گوتی "کاك ئیسماعیل، حوسێن پیاوێکی زۆر لە خۆ بایيە". منیش پرسیاری ئەوەم لێکرد هۆکاری دانە پاڵی ئەو تۆمەتە چییە؟ چونکە کاك حوسێن کەسێکی سەنگین و قەدر گرانە. لە وەڵامی مندا برادەرەکە گوتی "وەك خۆتان بینیتان تۆزێك بەر لە ئێستا هاتە لامان و پێی گوتین: کوڕینە، ئێوە وانەی چۆنیەتی وەبەرهێنانی ئاسایی بخوێنن و لە شتێکیش تێنەگەیشتن، وەرنە لام و لە من بپرسن. منیش پێم گوت تۆ کێی و چۆن دەتوانی ئەوەمان فێر بکەیت؟ ئەویش لە وەڵامی مندا هەندیك شتی لەبەر خۆیەوە درکاند و ڕۆیشت". ئەو هاوڕێیە بەردەوام بوو لەسەر گلەیەکانی "کاك ئیسماعیل ئایا ڕەوایە کاك حوسێن شتێکی ئاوا بە ئێمە بڵێ؟ لە کاتێکدا ئێمە خوێندکاری زانکۆین و ئەویش وەك لای هەمووومان ئاشکرایە، لە دارتاشێك زێدەتر نییە، ڕاستە چووتە بەر خوێندن، وەلێ ئەویشی تەواو نەکردووە". دوای تەواو بوونی قسەکانی، منیش وەڵامم داوە "کاك حوسێن ویستویەتی هاوکاری ئێوە بکات، خۆ شتێکی خراپی نەکردووە کە پێی گوتن، ئەگەر لە

شتێك تێنەگەیشتن لە من بپرسن. چونکە دڵنیام لەژێر کاریگەری ئاخافتنەکانی ئێوە ئەو پێشنیازەی بۆ کردوون، چونکە ئێوە دەمێك بوو لە نێوان خۆتان باستان لە قورسی وانەکە دەکرد".

ئەوەی ڕاستی بێت، ئەو چاو نەترسییەی کاك حوسێن منی تووشی زار بەشی کردبوو. دوای ڕۆیشتنی ئەو خوێندکارە دۆستەشمان، بەردەوام بیرم لەو هەڵسوکەوت و بوێرییەی دەکردەوە. لە کاتێکدا کاك حوسێن تازە بە تازە زانیاری لەسەر چەمکەکانی کۆمەڵگای سەرەتایی و بیردۆزەکانی مارکس کۆدەکردەوە. وەلێ زۆر شتی لەبارەی فەیۆدالیزمەوە دەزانی. بەتایبەتیش زۆر شارەزای مەکانەتی شێخ و عەشیرەت و دەرەبەگەکان بوو، چونکە ئاگای لە ورد و درشتی خاوەنداریەتی زەوی ئەوان و پشکی گوندەواریەکان بوو. جگە لەوەی دەیزانی ئەو خاکانەی لەسەرین و ئەو خاکانەی هەیانە هی چ لایەنێکە و بە فەرمیش زەویەکە لەلایەن کێوە کاری لەسەر دەکرێ. بە هۆی شارەزابوونی لە بابەتەکانی بازرگانی و پارە و بانك و قەرز و فائیزیشەوە، سەری لە پرسی سەرمایەداری دەردەچوو. جا سەری لە پرسەکانی کۆمەڵگای سەرەتایی و سۆسیالیزم و کۆیلایەتیش دەردەکرد. وەلێ لەو باوەڕەدام یەکەمجاری بوو، سەروکاری لەگەڵ مژاری وەبەرهێنانی ئاسیایی هەبێ. ئەو کەسێکی زیرەك بوو، بە شێوەیەك دەیتوانی بنەچەی وشەکان بدۆزێتەوە و دوای وردبینی کردنیان، پاشان لەگەڵ شێوازە جیاوازەکانی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکاندا دەیگونجاندن. وەلێ بە ڕوونی دیار بوو، کە هیچ زانیارییەکی بەرچاوی لەسەر بابەتی وەبەرهێنانی ئاسیایی نەبوو. هەر بۆیەش ئەو دەستپێشخەریەی بۆ برادەرە گەنجەکان منی سەرسام کردبوو.

یەك دوو ڕۆژ دواتـــر، کاتێـــك لە شـــوێنی هەواگـــۆڕکێ دەمەشییاین، باسی ئەو ڕەخنە و گلەییانەی گەنجە خوێندکارەکانم بۆکرد "دەمویست هاوکاری ئەو برادەرە لاوانە بکەم" ئاوا وەڵامی قسەکانمی دایەوە. وەلێ من وازم لێی نەهێنا و پێم گوت "کاك حوسێن، ئەگەر هات و ئەو گەنجانە هاتنەوە لات و گوتیان: کاك حوسێن ئێمە سەعیمان لە وانەی وەبەرهێنانی ئاسیایی کرد، وەلێ لێـی حـاڵی نەبـووین و بـاش تێـی نەگەیشـتین. ئەگەر ئەرك نەبـێ دێیت و تێمان بگەیەنی و بۆمان شیبکەیەوە؟ تۆ چی دەڵێی؟". لە وەڵامدا کاك حوسێن گوتی "گەر پرسیارێکی ئاوایان لێکردبام، یان لێم بکەن، منیش لە بەرسڤی ئەواندا چەند ڕستەیەکی ماقولم دەدۆزیەوە بـۆ ئەوەی وەڵامیـان بـدەمەوە. هەروەهـا پـێم دەگـوتن لەوبـارەیەوە دەتـوانن فـلانە کتێـب و فـلانە لێکـۆڵینەوە بخـوێننەوە سوودی دەبێت، ئەگەرنا دەتوانین ئەو پەرتووکانە بهێنن و بەیەکەوە دەیانخوێنینەوە". لە وەڵامی ئەو پرسیارەمدا پێم گوت "تۆ چۆن دەتـوانی باسـی بابەتێـك بکەیـت کە زانیـارییەکی تەواو و زێـدەت لەبـارەیەوە نـیە. بـۆیە ئەو هەڵوێسـتەت بەلای مـنەوە زۆر جێگـای سەرسـوڕمانە. بەڕاسـتی مەراقـی ئەوەم ئایـا چـۆن وەڵامـی وەهـا پرسـیارێك دەدەیـتەوە". جـا کـاك حوسـێن بە پێکەنیـنەوە گـوتی "ئەوسا تۆش هەندێك هاوکاریم دەکەی".

کـاك حوسـێن لە کۆتـایی ژیـانی، هەمـوو هەوڵەکـانی بـۆ لێکـۆڵینەوە و نووسـین لەبـارەی زمـان و ئەدەبیـات و کولتـووری کوردی تەرخان کردبوو. وەلێ بەداخەوە کاتێك سەرقاڵی نووسین بـوو، لە دوازدەی مـانگی سێـی سـاڵی ٢٠٠٣ لە تەمەنـی ٧٧ سـاڵی کۆچی دوایی کرد.

## میوانێك لە ناوچەی ئیسكلیپەوە
## "خۆ ئێمە كورد نین، كوردەكان بە ئێمە چی؟"

لە بەنـدیخانەی دۆخـی لەناكـاوی سـەربازی دیـاربەكر، لە سـەردەمی ڕژێمـی دوازدەی ئـازار، میـوانێكی زۆر نەدەهـاتنە لام. لەمـانی خێـزانم لەبەر ئەوەی كـاری دەكـرد، نەیـدەتوانی بێـتە لام؛ خزم و ناسیاوانی ناوچەی ئیسكلیپیش لەبەر ئەوەی شارەزای ڕێگا و بانەكە نەبوون و دۆخی ماددیـان بـاش نەبوو، نەدەهـاتن. وەلـێ هەندێكجار میوانی چاوەڕواننەكراو سەردانیان دەكردم.

لە بەهـاری سـاڵی ١٩٧٢، حەسـەنی زاوام، لە ئیسـكلیپەوە هـاتە لام. ئەو لەگەڵ ئەحـمەد ئەممـی بـاوكی لە دارتاشـخانە بەیەكەوە كاریان دەكرد. لەوێ دەمێدا ئاسایی بوو ئەگەر پاشناوی میوان و بەنـدكراوان وەك یەك نەبـێ. بە واتـایەكی دیـكە، هەمـوو بەنـدكراوێك دەیتـوانی لەگەڵ میـوانی بەنـدكراوێكی دیـكە دابنیشێت. لە نێوان ئێمە و میوانەكان ڕیزێك سیمی ئەستووری بە ئاسن بەستراو، لێكی جیا دەكردینەوە.

حەسەنی زاوام، ماوەی سەربازی لە نێوان ساڵانی ١٩٥٤-١٩٥٥ لە دیاربەكر بە جێهێنابوو. لەوێ دەمێدا من مەكتووبم بۆ دەنووسی. ئێمە و ماڵی حەسەن، بەر لەوەی لەگەڵ ساتی خوشكە گەورەشم هاوسـەرگیری بـكەن، ناسـیارەتیمان هەبـوو. بـۆیە لە نـزیكەوە ماڵباتەكەیان دەناسین. زاهیدەی دایكم، لەگەڵ كاك ئەتەمی باوكی ئەحمەد ئەممی، بنعامن، واتا ئامۆزای یەكدین.

برادەرانـی بەنـدیخانە، هەركە زانیـان لە ئیسـكلیپەوە میـوانم هاتووە، خڕیان لە دەورم كۆ بوونەوە.

حەسەنی زاوام، بەر لەوەی لە حاڵ و ئەحواڵم بپرسی، باسی زەحمەتی ڕێگا و تێچوونی ماددی گەیشتنەکەی کرد و بەو شێوەیە بەردەوام بوو "لە ئیسکلیپەوە تا چوومە ئەنقەرە، ١٠ لیرەم دایە ئۆتۆپاس. لە ئەنقەرەشەوە بە شەمەندەفەر هاتمە ئێرە، بۆ ئەمەش ناچار بووم ٣٠ لیرەی دیکە بدەم. لە کاتێکدا چوومە هەرزانترین چێشتخانە و لە هەرزانترین میوانخانە مایمەوە...".

پاشان دەستی بە گێڕانەوەی دۆخی خۆیان کرد، دوای ئەوەی من کەوتوومەتە زیندان "لە نێوچاوانی تۆدا، خوشکت ناتوانێ سەری لە ماڵ بباتە دەرەوە، منیش پێم نەخستۆتە ناو بازاڕ، هەموو ئەمانەمان تەنیا لەبەر تۆ بەسەر هاتووە. بە شێوەیەك ناتوانم بچمە چایخانەش.... خەڵك دەپرسێ، خەزوورت تووشی چی بووە ئاوا گیراوە؟ داخۆ دەبێ چ تاوانێکی کردبێ؟ وەلحاسڵی کەلام، چاوڕوومان نەماوە سەیری دەر و دراوسێ بکەین... ".

لەگەڵ ئەوەی باسی ئەوەم بۆ دەکرد، هیچ تاوانێکم نەکردووە و چ کێشەیەکم نییە، وەلێ حەسەنی زاوام بەردەوام بوو لەسەر ڕەخنە و گلەییەکانی و گوتی "من شارەزای تەواوی دیاربەکرم، ماوەی سەربازیم لێرە کردووە، وەلێ کاتێك لە ڕێگای سەرەکییەوە بەلای بنکەی سەربازیدا هاتم، ڕێگایان نەدا بە پێ ڕێگاکە ببڕم. چونکە دەبوو سواری گالیسکە بم. هەرچەندی بۆم شیکردنەوە کە من ئێرە باش دەناسم و ماوەی سەربازیم لێرە تەواو کردووە، هەتا، بە ئاماژە پێکردن گوتم، ئەو دارانەی ئێرە خۆم چاندوومن، وەلێ لە قسەی خۆیان پاشەکشەیان نەکرد و گوتیان بۆ ئەوەی لێرەوە تێپەڕی، دەبێ ئیلا سواری گالیسکە بی، ئەگەرنا ناتوانین ڕێگات بدەین بڕۆی. بۆیە بە ناچاری ١٥ قروشیشم دا بە گالیسکەکە".

ئەو قسانەی حەسەنی زاوام، من و برادەرانیشی زۆر بەخۆیەوە قەڵس کرد. چەند هەڤاڵێکم ویستیان قسەی لەگەڵ بکەن، وەلێ من نەمهێشت و پێم گوتن "کاك حەسەن نەخۆشی دڵی هەیە و پێویست بە دەمە دەم و موناقەشە ناکات... ". لە پاڵ ئەوەش خەریکی ئەوەم، تا بۆی ڕۆشن بکەمەوە، کە هیچ تاوانێکم ئەنجامنەداوە، بۆیە دەبێ ئارام بگرێ، تا تێبگا من بە هۆی نووسینی پەرتووك و وتارەکانمەوە لە بەندیخانەم.

کاك حەسەن دوای ئەوەی کۆری دڵی خۆی هەڵڕشت، پاشان دەستی بردە باخەڵی و گوتی "پارەت هەیە؟ یان پێویستت بە شتێك هەیە؟" وەلێ کاتێك دەستی بردە ناو گیرفانی، ئەتمۆسفێرێکی وای چێکرد، کە شتێکم پێدەدا. منیش لە وەڵامی پرسیاری ئەودا، ئەوەم بۆ باسکرد، کە پێویستم بە هیچ نییە و هیچ کێشەیەك لە ئارادا نییە و دەوڵەتیش لێرە، ڕۆژێ سێ ژەم خواردنمان پێدەدا. ئیدی دەستی لە باخەڵی دەرهێنا، بەڵام بە والآیی و بینم کە هیچی لێ دەرنەهێنا. دوای ئەوەی گوێی لە وەڵامەکانم بوو، بە سەرسامیەوە حەسەنی زاوام لێی پرسیم "باوکت پارەت بۆ نانێرێ، لەمانی خێزانیشت بە هەمان شێوە، بۆیە دەبێ ئەو کەسەی پارەت بۆ دەنێرێ کێ بێت؟ چونکە پێشنوێژ و وتارخوێنی مزگەوتە گەورەکەی ناو بازاڕی ناوچەکەی خۆمان گوتبوی پارەی سەرجەم ئانارشیستەکان لەلایەن مۆسکۆوە دابین دەکرێ. موفتیش قسەکەی هەر لەوێ پشتڕاست کردەوە، بۆیە باوکت لەناو مزگەوت کاتێك گوێی لەو پەیڤانە بوو، دەمودەست بوراوە...". لە هەمبەر ئەوەش ئەوەم بۆ شیکردەوە کە پێویست بە خەم خواردن ناکا و هیچ کەسێك لە مۆسکۆ پارە نانێرێت و کەسیش پارە بە خۆڕایی ناداتە کەس.

کاتێك خەریکی ڕوونکردنەوەی حاڵ و ئەحواڵی خۆم بووم، مەلا شەباب خۆی تێهەڵقورتاند "ئێمە بە شێوەی کۆمەڵ دەژین. تۆ دەزانی ئەوە چییە؟". ئەوەی لە حەسەنی زاوام پرسی. وەلێ ئەو، پرسیارەکەی بە تورکییەکی سەر و سەکوت شکاو پرسی. پاشان بەو شێوەیە بەردەوام بوو لە قسەکردن "من لە زانکۆی ئەزهەرم خوێندووە و باش شارەزای قورئانم. بۆیە دەزانم بێشکچی دەچێتە بەهەشت. چونکە ئەگەر کەسێك هەبێ بچێتە بەهەشت ئەوە بێشکچییە". دوای ئەویش دووبارە باسی ئەوەم کرد، کە من هیچ تاوانێکم نەکردووە و تەنیا لەسەر نوسین و توێژینەوە و پەرتووکەکانم کەوتوومەتە کونجی زیندان. وەلێ کاك حەسەنی زاوام وەك وەڵامێك گوتی "ئێمە خۆ کورد نین و دۆخی کورد بە ئێمە چی؟". پاشان بەو شێوەیە درێژەی داپێ "کورد پیاو نینە و دزن. ڕۆژێك لە کاتی جێبەجێکردنی ماوەی سەربازیم، چووم تا لە چەمێکی نزیکمان تۆزێك مەلە بکەم و هەندێك فێنکم بێتەوە. چەکەکەی شانم لە کەنار ئاوەکە دانا و جلەکانم داکەند و چوومە ناو ئاو. وەلێ کاتێك هاتمە دەرەوە، بینیم چەکەکەم نەماوە. هەربۆیەش فەرماندەکەم لەسەر ئەوە تێروپڕی لێدام، هەروەها پارەی چەکەکەشیان وەك خۆی لێ وەرگرتمەوە".

کاتێك کاك حەسەن وشەی دزی بەکارهێنا، برادەران قبووڵی دۆخەکەیان نەکرد و دەستیان بە قسە و هاوارکردن کرد و پێیان گوت "ئەوە کەی سەردانیکردنە؟ بە بێ ئەوەی لە حاڵ و ئەحواڵی بێشکچی بپرسی، لەوەتەی هاتووی گلەیی و گازاندە دەکەی. جا بۆ زانیاریت ئێمە پێویستیمان بە پارەی تۆ و هیچ هاوکارییەکیش نییە. ئەوەش باش بزانە بێشکچی پیاوێکی چاکە و

کوردیش ستەم لێکراون". جا هەر کەسەو لەپاڵ خۆی قسەیەکی بە حەسەنی زاوام دەگوت. دوای ئەو سەرزەنشت کردنانەی، بینیم حەسەن دەستی بە پێهەڵدان کرد و گوتی "ئیسماعیل کوڕێکی چاکە و زیانی بۆ کەس نییە. مەبەستی من ئەوەیە زیاتر دەرد و میحنەتی نەچێژێ، بۆیە ئاوام گوت".

دوای گەڕانەوەی، تا ماوەیەکی درێژ، حەسەنی زاوام، خوێ و بەهاراتی بە چیرۆکی ئەو سەردانی کردنەیدا دەکرد و لە هەموو شوێنێك باسی دەکرد. وەك ئەوەی هەموو تەمەنی لە سەردانیکردنی مندا بەهەدەر دابێ و زیندان بە زیندان هاتبێتە دیدەنیم. لە کاتێکدا تەنیا دوو کەرەت هاتە لام. یەکێکیان کاتێك لە زیندانی دۆخی لەناکاوی دیاربەکر بووم، جاری کۆتاییش کاتێك لە بەندیخانەی تۆپتاشی بووم لە ئیستانبووڵ.

***

ساڵی ١٩٥٨، کاتێك دەستم بە خوێندن کرد لە کۆلێژی زانستە سیاسییەکانی ئەنقەرە، خزمێکمان بە ناوی مستەفا، کە شەش حەفت ساڵێك تەمەنی لە من بچووکتر بوو، دەستی بە خوێندنی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی ئەنقەرە کردبوو. ئەو خوێندنی تەواو کردبوو و دەستی بەکار کردبوو و چووبووە بورسا بۆ نیشتەجێبوون. بۆیە کاك حەسەن زۆر خولیای ئەوەی هەبوو من و مستەفا بەیەك بەراورد بکا. لەوبارەیەوە پێی دەگوتم "مستەفا خوێندنی تەواو کرد و هاوسەرگیری پێك هێنا و بووە خاوەنی منداڵ. کابرا بووە پیاو بۆخۆی. چونکە کاری هەیە و خانووی هەیە و دوکانی هەیە و ترومبێلی لە ژێرە؛ جا چی نییە، هەموو

شتێکی هەیە". جا بۆ ئەوەی توانج لە من بدا دەیگوت "تۆش خوێندت، بەڵام دارێکت لەسەر بەردێك دانەنا. جا خاوەنی هیچیش نیت، بۆیە ئەوە چ جۆرە خوێندن تەواو کردنێکە!".

ڕۆژێك بۆ چارەکردنی کێشەیەکی خێزانی، چوومە دوکانی دارتاشییەکەی. لەوێ باسی سەردانی مستەفای بۆ کردم، کە لە بورساوە چووبووە ئیسکلیپ:

"مستەفا بە ترومبێلەکەی هاتە بەردەم دوکانەکەم و هەر لەوێش ترومبێلە شینەکەی ڕاگرت. دوای هاتنە خوارەوەی، دوو کورسیم هێنا و بەرامبەر یەك دانیشتین. داوای دوو قاوەم کرد و دوای هاتنی بەیەکەوە خواردمانەوە. جا مستەفا قاچی خستە سەر قاچەکانی و جگەرەیەکی داگیرساند. کە دراوسێکان ئاوا بینیان، دەیانپرسی ئەوە کێیە لەلات؟ منیش بە شانازییەوە دەمگوت ئەوە کوڕی مەتکمە... جا پێیان دەڵێم ئەوە لە بورسا دادەنیشێ و خاوەن کار و دوکان و خانوو و ترومبێلی خۆیەتی...". جا کە باسی ئەوانەی دەکرد، ئەوەی لە بیر نەدەکرد تا ناوە ناوە توانجێکیش لە من بگرێ، بۆیە دەیگوت "بەڵام کەس لە تۆ ناپرسێت". منیش وەك وەڵامێك "پێویست ناکا کەس لە من بپرسێت، چونکە هەرکەسە و لە ژیان و گوزەرانی خۆی بەرپرسە...".

زۆر کوردی شارەکانی کوردستان لە بورسا هەن، بەشێکی زۆریان خاوەن کار و کاسبی خۆیانن لەوێ. کاتێك لە بەندیخانەی بورسا بووم، بەشیك لەو کوردانە بەردەوام سەردانیان دەکردم. یەکێك لەو کوردانەی دەهاتە لام، دوو کەسی ناوچەی

ئیسکلیپی ناسی بوو. بۆیە ڕۆژێك بەر لەوەی بێتە لام، لەگەڵ ئەو دوو هاوشارییەم بووە. کابرای کورد بە برادەرە ئیسکلیپیەکان دەڵێ، بۆ سەردانی ئیسماعیل بێشکچی دەچمە زیندان، تۆش حەز دەکەی هاوڕێیەتیم بکەی؟ کابراش لە وەڵامدا گوتبووی "کاکە دەوڵەت کارێکی چاکی کردووە کە سزای بێشکچی داوە و خستویەتیە زیندان". ئەو کوڕەی ئەوەی گوتبوو یەکێك بوو لە برادەرانی کۆڵان، لە سەردەمی منداڵیم لە ساڵی ١٩٤٠. کابرای دیکەش پێی گوتبوو "ئێستا کارم زۆرە". جا کە ئەو هەڤاڵە کوردە سەردانی کردم، زۆر سەیری بەوە هات کە خەڵکی ناوچەکەی خۆم ئاوا مامەڵەم لەگەڵ دەکەن. لە کاتێکدا ئاوا باسی هەڵسوکەوتەکانی دەوڵەتیان دەکرد. منیش لە وەڵامدا پێم گوت "برا کاتێك دێیە سەردانم، پێویست ناکا خەڵکی دیکە ئەزیەت بدەیت".

ئەو ڕووداوانەی لە سەردەمی دەسەڵاتداریەتیی ڕژێمی دوازدەی ئازار بەسەرمدا هات، لە ڕێگەی مەکتووبەوە بۆ لەمانی خێزانم و ماڵباتەکەم باس دەکرد. لەوان ڕۆژاندا، پۆلیسێکی ئەنقەرە، بۆ سەردانی ماڵباتەکەی دەچێتە ناوچەکەی ئێمە. لەوێش هەر جلی فەرمی پۆلیسی لەبەر بووە، چونکە دەوامی لە قەرەقۆڵ بوو. بۆیە وا دەڵێم چونکە پۆلیسێك بوو لە نزیکەوە ئێمە و هەموو خەڵکی گەڕەکەکەمان دەماننناسی. دایکیشم هەڵستابوو چووبوە سەردانی، بە پشت بەستن بەوەی کابرا پۆلیسی دەوڵەتە و زانیارییەکی لەسەر دۆخی من هەیە. لەوێ لێی پرسی بوو "دۆخی ئیسماعیل چۆنە و چی بەسەر دێ؟" پۆلیسەکەش لە وەڵامدا گوتبووی "ڕەنگە ئیسماعیل لە سێدارە بدەن... ". دوای ئەو

وەڵامە، خێزانەکەمان گەلێك ترسا بوون. بەڵام ئەوانەی ئێمە پێیان گوتبو "ئیسماعیل پەرتووکی نووسیووە. جا لەسەر نووسین خەڵك لە سێدارە دەدرێ؟ شتی وا چۆن دەبێ، کێ باسی شتی وای کردووە... " کابرای پۆلیسیش گوتبووی "جا من ئەم شتانە نازانم، بەڵام بەردەوام لە بنکەی پۆلیس دەڵێن ئیسماعیل پەرتووکی نووسیووە، ئیسماعیل پەرتووکی نووسیوە... ".

ئەو پۆلیسە ناسیارە نەیزانیووە دەمی خۆی بگرێت و بەسەر زمانیدا زاڵ بێت. چونکە لەوێ دەمێدا هیچ ئەگەرێکی لە سێدارەدان بۆ من و هاوڕێیانم لە ئارا نەبوو. وەلێ ئەمڕۆ زۆر جیاوازە، بە شێوەیەك لەسەردەمێکداین کە دۆخەکەی بە درێژایی تەمەنی دەوڵەت ئاوا بێ ماف و بێ یاسا نەبووە. لەبەر ئەوەی دژی بۆچوونی ئازاد، سزاکان بەهەموو شێوەکانی تا دێ قورستر دەبن، ڕەنگە تا سزای لە سێدارەدانیشی تێدا بێت...

## حیکمەت بۆزچاڵی، ڕاستییەکی هەڵچوو

حیکمەت بۆزچاڵی، دووەمین سەرۆکی کۆمەڵی کولتووری شۆڕشگێڕی ڕۆژهەڵاتی، شاخی ئیستانبووڵ بوو. ئەو لە سەدەمی ڕژێمی دوازدەی ئازار، ماوەیەك فیرار بوو. برادەرانمان باسیان لەوە دەکرد، کە بەرەو ناوچەکانی ڕۆژهەڵات ڕۆیشتووە. ماوەیەکی زۆریش لە دەرەوەی وڵات ماوە. بەڵام بە هۆی ناهەمواری ژیانی، بە ناچاری گەڕابۆوە تورکیا و بە نهێنی لە لادێیەکی سیوێرەگ، بە ناوێکی خوازراو شوانکاری کردووە. لە پایزی ساڵی ١٩٧٢،

ڕۆژێك هێنایانه قاوشی دەستبەسەرکراوانی بەندیخانەکەی ئێمە. لەگەڵ ئەو، دوو سێ کەسی دیکەشیان هاورد. ئەو هۆڵەی ئێمە لێی دەمانەوە لە بەندیخانە، لەگەڵ ئەو شوێنەی دەستگیرکراوەکانیان لێ دادەنا، بەیەکەوە نووسابوون. بۆیەش کاتێك دەچووینە شوێنی هەواگۆڕکێ، بە ئاسانی دەمانتوانی برادەرانی دەستبەسەرکراو ببینین.

حیکمەت بۆزچاڵی، بە هۆی کەسێکەوە کە زمانی لێدابوو، دەستگیر دەکرێ. ئەو و برادەرانی، ماوەیەکی زۆر لە هۆڵی دەستبەسەرکردن نەمانەوە، چونکە لە ماوەیەکی کورتدا ئەوانیان بردە قاوشی بەندکراوان. ئەو برادەرانەی لەگەڵ کاك حیکمەت گیرابوون، کەسی شۆڕشگێڕی بەڕێز و دیموکرات خواز بوون.

لەوان ڕۆژاندا، کاك حیکەمت تۆزێك نەساغ بوو، هەروەها چەندان پرسگرێکی دەروونیشی هەبوو. بۆیە زوو زوو، هاواری بەسەر برادەرەکانیدا دەکرد و قسەی سارد و ڕەقی پێ دەگوتن. هەروەها ئەم و ئەوی بە سیخوڕ بوون تۆمەتبار دەکرد. لەناو قاوشەکە بێ وەستان بە نێوان چارپاکان هاموشۆی دەکرد و توانجی لەو و ئەم دەدا؛ جا بە دەنگێکی بەرز ئەو کارەی دەکرد. بەڵام هاوڕێکانی بەرپەچیان نەدەداوە، بەڵکو لە تەقەلای ئەوەدابوون، درێژی بکەن، تا پشوو بدات. لەبەر ئەوەی خۆشەویستیەکی تایبەتم بۆی هەبوو، بۆیە ئەو دۆخە ناهەموار و عەسەبیەی منیشی خستبوە ناو حوزنەوە.

بەیانیان زوو، لەگەڵ دەرگا کردنەوە، دەچوومە بەشی هەواگۆڕکێی بەندیخانەکەمان. پێم وابێ کۆتا ڕۆژەکانی مانگی

دوازدەی ساڵی ١٩٧٢ بوو، یان ڕۆژەکانی سەرەتای مانگی یەکی ساڵی ١٩٧٣؛ ئەوی ڕۆژێش بەیانی زوو چووبووم تا هەوایەکی پاقژی بەیانیان هەڵمژم. هەندێك دواتر، بینیم حیکمەتیش هاتووەتە هەواگۆڕکێ. ماوەیەك بەیەکەوە پیاسەمان کرد. لای قاوشی دەستبەسەرکراوان، نزیك تێلبەندی بەندیخانەکە وەستاین. کەش و هەوا سارد بوو، بەشێوەیەك بەفر و شەختە تێکەڵی یەکدی ببوون. حیکمەتیش باسی ناوچەی سیلڤان و ئەو لادێیەی لێی بوو و ماڵباتەکەی دەکرد، منیش بە هەموو هەستمەوە گوێم بۆ شل کردبوو.

لەوێ سەر و بەندێدا، کەسێکی دیکەش هاتە هەواگۆڕکێ. کاتێك کاك حیکمەت ئەوی بینی، بە دەستی ئاماژەی بۆ کرد، تا بێتە ئەو شوێنەی ئێمەی لێ بوو. کە کابرا گەیشتە لامان، ڕووی تێکرد و پێی گوت "ئەها پێت گوتم بێشکچی سیخوڕی ئەمریکایە. ئەوە خۆیەتی و لەبەردەم خۆشی ئەو شتە بە بێشکچی بڵێ".

کاتێك گوێبیستی ئەوە بووم، هۆپێکم لەخۆم کرد. لەبەر ئەوەی هیچ گوێم لەوە نەببوو، کە شتێکی ئاوام لەبارەیەوە دەڵێن. چونکە برادەرەکەم لە نزیکەوە دەناسی، وەلێ نامەوێ لێرە ناوی بهێنم. کابرا بەرامبەر بەو داوایەی لێی کرا هیچ شتێکی نەگوت، وەلێ ڕەنگی بە ڕووخسارەوە نەما. تۆزێك لێوی جولاند، بەڵام هیچ وشەیەك لە زاری دەرنەچوو. کابرا ناڕەحەت بوو، چونکە کەوتبووە دۆخێکی ناهەموار و نەیدەزانی چی بکات. حیکمەتیش زیاتر پێداگیری لەسەر داواکەی دەکرد و وازی لێ نەدەهێنا و

دەیگوت "ئەوە بێشکچی لەبەردەمتە و ڕووبەڕوو ئەو قسانەی پێ بڵێ... چونکە من ئەوم خۆشدەوێ و کەسێکی بەڕێزە لەلام. بۆیە ئەگەر سیخوری ئەمریکایە، با سزای بدەین، ئەگەر هەویش نییە با ڕێزی زیاتری لێبنێین. چونکە من دەمەوێ ڕێز لەو پیاوە بنێم... ".

بە دوو شێواز لە هەمبەر ئەو پێشهاتە ناڕەحەت بووم؛ یەکیان لەبەر ئەوەبوو، یەکەمجار بوو، سەبارەت بەخۆم ڕووبەڕووی قسەیەکی نەرێنی ببوومەوە، ئەوەی دیکەش سەبارەت بە خراپی ئەو دۆخە بوو کە ئەو برادەرە تێی کەوتبوو. چونکە بێدەنگ بوون و خۆ خواردنەوە و ڕەنگ زەرد بوونی، مرۆڤی ناڕەحەت دەکرد. هەوڵمدا ئەوە بڵێم "بە دڵنیایەوە دەبێ هەڵە تێگەیشتنێك هەبێ" وەلێ حیکمەت قسەی پێ بڕیم و گوتی "من هۆشم لەسەر خۆمە و هیچ بەهەڵە لێك گەیشتنێك نییە. من بە ئاگاییەوە ئەوە دەڵێم، کە تۆزێك پێش ئێستا بیستت". جا ڕووی خۆی لەو برادەرە کرد و بەو شێوەیە بەردەوامی بە ئاخافتنەکەیدا "ئەو ئێوارەیەی منیان هێنایە قاوشی دەستبەسەرەکان، تۆ هاتییە لای ئەو تێلبەندانە و ئاوا پەیڤی. هەتا قاپێك برنجیشت لەدەست بوو. لەسەر برنجەکە چەند پشکە گۆشتێکیش هەبوو. لە دەستەکەی دیکەشت بەرداخێك دۆت پێبوو. تۆ خواردنەکەت بۆ من هێنابوو، منیش پێم گوتبووی برادەرم لێرە هەیە، تۆش وەڵامت دابوومەوە کە چێشت بۆ ئەوانیش دەهێنم. دواتر من پرسیاری قاوشەکان و برادەرانی ئێرەم لێکردی، تۆش گوتت دوو دەستە لێرە بوونیان هەیە: یەکێکیان ئەوەی ئێمەیە کە کۆمەڵەی شۆڕشگێڕەکانن، ئەوەیان دەستە باشەکەن. لەگەڵ کۆمەڵەیەکی دیکە؛ بەڵام ئەوان کەسانی چاك نین. تا گوتت لەناو ئەواندا سیخوڕێکی ئەمریکی

هەیە، لە کورد زیاتر شتێکی دیکە نازانێ. منیش لێم پرسی ئەو کەسە کێیە؟ تۆش ناوی بێشکچیت هێنا".

دوای ئەوەی ئەو بەسەرهاتەی گێڕاوە، پاشان حیکمەت بۆزچاڵی قسەکەی سەرەتای دووبارە کردەوە "ئەوەش بێشکچی، بۆیە ئەوەی کە گوتت سیخوڕە، ڕووبەڕوو بە خۆشی بڵێ. چونکە تۆ بە چ بەڵگەیەك دەتگوت ئەو کابرایە سیخوڕی ئەمریکایە، بۆی ڕوون بکەوە". وەلێ لە پای ئەو هەموو قسەیە، ئەو برادەرە نوتقی لە خۆی بڕیبوو. کاتێك ئێمە سەرقاڵی ئەو دەمەتەقێیە بووین، شوێنەکەمان وردە وردە، تژی بوو لە بەندکراو. جا قەرەباڵغییەك لە دەوری ئێمەش کۆبۆوە. داوام لە حیکمەت کرد تا کێشەکە گەورەتر نەکات، بەڵام ئەو کاردانەوەی پیشان دا و پێداگیری لەوە دەکرد کە هۆشی لەسەر خۆیەتی. بەڵام چاك ئەوەبوو دوای تکاکەی من، زیاتر لەسەری نەڕۆیشت و بەیەکەوە چووینەوە ناو قاوش تا بڕۆین تاشتی بخۆین.

دوای بوویەرەکە، کەڵکەڵەی ئەوەم کەوتەسەر، ئاخۆ ئەو برادەرە بۆچی دەربارەی من ئاوا پەیڤیووە. حەق و حیسابێکی زۆرم لەگەڵ خۆم کرد. لە کۆتایدا گەیشتمە ئەو باوەڕە: یەکێك لە ڕۆژەکانی هاوین، کارگێڕی بەندیخانە من و ئەو برادەرەی بەیەکەوە و تەنها ئەو دووەمانی بردبووە دادگا. ئەوێ دەمێ لەسەر نووسینی وتارێك دۆسیەیەکی دادگایی کردنم لەسەر کرابۆوە. دادگا ئیفادەی لێ وەرگرتم، دواتر منیان لە هۆڵی دادگاوە بردە دەرەوە و لەسەر کورسیەکی بەردەم هۆڵەکە دایان نیشاندم.

لە دوای من، ئەو برادەرەیان بردە هۆڵی دادگا. ئەوێ ڕۆژێ

دەرگای هۆڵەکە بە کراوەیی هێڵدرابۆوە. بۆیە لە ژوورەوە چی گوترا، ئەوانەی بەر دەرگا گوێبیستی بوون. منیش گوێم لە دەنگی ئەو برادەرە بوو، بە دڵنیایەوەش دەنگی دادوەر زیاتر دەهاتە بەر گوێ. لە کاتی دادگایەکەدا گوێم لێبوو ناوی زیا گۆك ئالپ[1] هێنرا. بۆیە ئەمە وایکرد وردتر و بە هەستتر گوێ بۆ قسەکان بگرم. داواکاری گشتی هەندێك نامەی پیشانی ئەو برادەرە دەدا، ئەویش وەڵامی دەداوە "من هیچ کەسێکی ئاوا ناناسم و ئەو نامەیە من نەمنووسیووە و دەست و خەتی منیش نییە". پاشان دەیگوت "ئێمە نەوەی زیا گۆك ئالپین. ڕۆڵەی زیا گۆك ئالپیش شتی وا نانووسێ". ئەوێ ڕۆژێ چەند جارێك گوێم لەو وەڵامانە بووەوە. ئەوەی ڕاستی بێت، زار بەش بووم. لەلایەك باسی مارکسیزم و لەلایەکی دیکەش باسی زیا گۆك ئالپا... وەڵامێکی سەرسوڕهێنەر بوو.

دوای دادگایی کردنەکە، کاتێك سواری ترومبێل کراین، تا گەیشتینەوە بەندیخانە هیچ نەدواین. ئەو وەڵامانەی لە دادگایی کردنەکە بیستم، لای کەسم باس نەکرد. وەلێ کابرا لەو باوەڕەدا بوو، ئەو وەڵامانەی ئەو بە تەواوی بەندیخانەدا بڵاو دەکەمەوە، بۆیە بە مێشکی خۆی هەوڵی بەرگری کردنی داوە، لە ئەگەری ئەوەی شتێکی وا لە بەندیخانە بڵێم، ئەویش وەك بەرسڤێك بڵێ "کاکە ئەوە سیخوڕی ئەمریکایە و باوەڕ بە قسەکانی مەکەن".

---

[1] زیا گۆك ئالپ (١٨٧٦ - ١٩٢٤). کوردە و خەڵکی دیاربەکرە، نووسەر و شاعیر و سیاسەتمەدار بووە، جگە لەمانە ئەندامی پەرلەمانی تورکیاش بووە، بەڵام لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە کە زیا گۆك ئالپ لەگەڵ ئەوەی کورد بووە، بەڵام دواتر دەبێتە دامەزرێنەر و داڕێژەری بنەماکانی فیکری نەژادی (تورکایەتی)، سەبارەت بەو پرسەش چەندان نووسین و پەرتووکی بڵاو کردۆتەوە. (وەرگێڕ).

لە زیندانی دۆخی لەناکاوی دیاربەکر، وەك لەسەرەوەش باسم کرد، لە شەوی دوو لەسەر سێی مانگی سێ، ئۆپەراسیۆنێکی گەورە و فراوان دژی بەندکراوەکانی ناو زیندانەکە جێبەجێکرا. لە کۆتایی ئۆپەراسیۆنەکە، کەمینەیەك، ئەوانەی بە دژی کارگێڕی بەندیخانەکە دەناسران، نزیکەی ٤٠ کەسیان لێ دەستگیرکردین و خستینیانە ناو زیندانی تاکەکەسی. لەناو ئەو ژمارەیەدا، من و حیکمەت بۆزچاڵیش هەبووین.

چەند ڕۆژێك لەوێ، لە زیندانی تاکەکەسی، لەگەڵ حیکمەت بۆزچاڵی، کە ئەویش وەك من بوو، بەیەکەوە شەو و ڕۆژمان تێدەپەراند. یەکێك لە ئێوارەکانی وان ڕۆژانەی لە زیندانی تاکەکەسی بووین، حیکمەت باسی ئەو سەردەمەی بۆکردم کە فیرار بوو. جا باسی چوونی بۆ عێراق و ئەو ڕووداوانەی لەوێ بەسەری هاتبوو، دواتریش چۆن و کەی گەڕاوەتەوە و لە کوێ و بە چ دەردەسەرییەك شوانکاری کردووە.

لەو حوجرە تاریکانەوە، هەندێك تیشکی کزی مۆم دەکەوتنە بەرچاو. منیش بیرم لە ڕۆژی دواتر دەکردەوە، چونکە قەرار بوو بۆ دیاربەکر بگوازرێمەوە. ناوەناوەش چاوم دەخستە سەر یەك، بەشکووم تۆزێك خەو بمباتەوە. وەلێ حیکمەت بە بێ وەستان دەیگوت "کاك ئیسماعیل باش گوێ لە من بگرە. ئەوانەی بۆتی باس دەکەم، شتی زۆر گرنگن. گوێگرە و وتەکانم لە کیس خۆت مەدە، چونکە خوا دەزانێ جارێکی دیکە من چۆن دەدۆزیتەوە. چونکە هیچ کەسێك باسی ئەو شتانەت بۆ ناکا، کە من بۆتی دەگێڕمەوە... " منیش وەڵامم دەداوە "حیکمەت تۆ

بیگێڕەوە و منیش گوێ دەگرم. بۆ ئەوەی چاوم پشوویەك بدا تۆزێـك پێڵووەكـانم دادەخەم". بەڵام ئەو لەسـەری دەڕۆیـی و دەیگوت "نا نا نا چاوت دامەخە، چونکە ئەگەر وا بکەی خەوت لێدەکەوێت. ئەوسا بیستنی بەسەرهاتە گرنگەکانم لە کیس خۆت دەدەی". لە ڕاستیدا ئەو پێویست بوو بڵێ "من جارێکی دیکە تۆ لە کـوێ دەدۆزمەوە" بەڵام حـیکمەت هەردەم خـۆی لە چەقـی باسـەکە دادەنـا. حـیکمەت بەسـەرهاتی گرنگـی دەگێـڕاوە، وەلـێ هەرچەنـدی دەمکـرد، نەمـدەتوانی بیـر و هۆشـم لای پێشـهاتەکانی بەیـانی نەبێـت. پاشـان ناوەنـاوەش لەنـاو گێـڕانەوەی بویەرەکـان دەیگوت "خۆت عێدز مەکە، من بە بابم دەڵێم لە دیاربەکر زوو زوو بێـتە سـەردانت". پاشـان دەگەڕاوە سـەر باسـەکەی خـۆیی و گلەیـی ئەوەی دەکـرد کە دەسـەڵاتدارانی باشـوور، لەگەڵ ئەو بە باشـی مامەڵەیـان نەکـردووە. لەکـاتی باسـکردنی ڕووداوەکـان، نـاوی فەرمانـدە سـەربازییەکانی کـورد، لەوانە عیسـا سـوار و ئەسـعەد خۆشەوی[1] دەهێنا.

ڕۆژی دواتر، واتا نۆهەمین ڕۆژی مانگی سێ، لەگەڵ خەلیل ئاغـا ئێمەیـان بـردە گرتووخـانەی دیـاربەکر. کـاك سـاڵحی بـاوکی

---

[1] ئەسعەد خۆشەوی (١٩١٨- ١٩٧٧) لە گوندی سێلکی لە دایك بووە. ساڵی ١٩٣٤ لەگەڵ ماڵباتەکەی بەرەو باشووری عیراق راگویزراون. دوای پەیوەندی کردن بە هێزەکانی پێشمەرگە، ساڵی ١٩٤٦، لەگەڵ مەلا مستەفا بارزانی دەچێتە مەهاباد لە رۆژهەلاتی کوردستان و دواتر دەچنە یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو. ساڵی ١٩٥٨ دەگەڵ بارزانی دەچێتە چیکۆسلۆڤاکیا و دواتریش دەچنە میسر، بۆ دیداری جەمال عەبدولناسر. ساڵی ١٩٦٢ دەبێتە دەبێتە فەرماندەی هێزی شۆڕش لە دەڤەری بادینان. (وەرگێڕ).

حیکمەت، دوو جار لە زیندان سەردانی کردم. لەوێ کاك ساڵح باسی ئەوەی کرد، کە باوکی بەشداری شۆڕشی شێخ سەعیدی کردووە و دواتر لە سێدارەدراوە.

***

ساڵی ١٩٩٢، لە بارەگای وەشانخانەی (یورت کیتاب) بووم لە ئەنقەرە. لەوێ کچ و کوڕێکی لاو هاتنە ژوورەوە. ئەوان باسیان لەوە کرد، خۆشەویستی هەڤدوونە و دەیانەوێ هاوسەرگیری بکەن. پاشان باسی ئەوەیان کرد دەرچووی زانکۆی پزیشکی دیجلەن و دەیانەوێت لە کوردستان پیشەی پزیشکی بکەن؛ بۆ ئەوەی خزمەتی گەل و نیشتیمانەکەیان بکەن. لەوێ چەند پەرتووکێکیان کڕی و تا ڕۆیشتنیان لەسەر لینگان هەندێك دەمەتەقێمان کرد. کاتێك لە دەرگا چوونە دەرەوە، کوڕە گەنجەکە ئاوڕێکی دایەوە و پێی گوتم "کاك ئیسماعیل من برا بچووکی حیکمەت بۆزچاڵم... لەگەڵ باوکم دووجار هاتبووینە سەردانی جەنابت". کە وای گوت، بانگم کردەوە و هەندێکی دیکەش قسەمان کردەوە. پرسیاری حیکمەتم لێکرد "ئیدی مژوولی کارەکانی بەری نییە و ئێستا کاری پارێزەری دەکات" برا بچووکەکەی، لە پرسیاری کاك حیکمەتدا ئاوا وەڵامی دامەوە.

## ڕووبەڕووبوونەوەیەکی سەیر

ساڵی ١٩٩٢، وەشانخانەی (یورت کیتاب) لە ئیستانبووڵ، بەشداری پێشانگای پەرتووکی تویابی کردبوو. لەوێ سەردەمێدا، پەرتووك چاودێرییەکی توند و زۆری هێزەکانی ئاسایشی لەسەر

بـوو. بەشـێوەیەك زۆر پەرتـووك لە چاپخـانە بەر لەوەی ڕوونـاکی ببیـنن، کـۆ دەکـرانەوە و ڕێگـا بە بڵاوکردنەوەیـان نەدەدرا. ئەوێ ڕۆژێش لە پێشانگاکە، پۆلیس هاتن تا بەشێك لە کیتابەکانی ناو پێشانگاکە کۆبکەنەوە. وەکوو ئامادەکارییەکی پێشوەختە، دەزگای بڵاوکردنەوەی (یورت کیتاب) هەموو پەرتووکەکانی بە زنجیرێك بەیەکەوە بەسـتبۆوە و پاشـان بە کیلۆنێـك هەردوو سـەری زنجیـرەکەی بەیەکەوە مفـتە کردبـوو. ئەوکـات پرۆتێسـتۆی ئەو هەڵوێستەی دەسەڵاتی تورکمان بەو شێوەیە خستبووە بەرچاو.

چەنـد ڕۆژێـك دواتـر، لە پێشـانگاکەوە بە ڕێکەوتـین، تـا بگەڕێینەوە ئەنقەرە. لە ڕێگـا، ئونسالْ ئۆزتورك گوتی "خوشکی سوڕەیا لە بەشی تاقیگەی نەخۆشخانەی فێرکاری کۆجائەلی کار دەکات. با سەرێکی لێبدەین". چووینە نەخۆشخانەکە و لە نهۆمی سـەرەوە چـووینە بەشـی تـاقیگەکە. لەوێ کەسـێکی زۆر سـەرنج ڕاکێشم بینی. ئەو لەگەڵ خوشکەژنی ئونسالْ لە تاقیگەکە کاری دەکرد. دەزانن ئەو کەسەی بینیم کێ بوو؟ ئەو کەسەی گوتبوی "بێشکچی سیخوڕی ئەمریکایە" ئەها ئەو کوڕەی لەناو زیندان ئەو تۆمەتەی بۆ هەڵبەستبووم.

ئەو برادەرە کە چاوی پێمکەوت، ڕاستەپێ لێم نزیك کەوتەوە و لە هەمبێزی خۆی گرتم. پاشان دەستی بەوە کرد تا باسی من بۆ ئونسالْ بکات، باسی زیندان و دادگایی کردن و زۆر شتی دیکەشی کرد... تا ئەوێ ڕۆژێ باسم لەو ڕووداوە نەکردبوو کە

لە ساڵانی ١٩٧٢-١٩٧٣ بەسەرمدا هاتبوو، بەڵام لە ڕێگای گەڕانەوەی ئەنقەرە، بویەرەکەم بە ورد و درشتی بۆ ئونساڵ گێڕاوە.

***

کاتێك لە بیستی تەمووزی ساڵی ١٩٧٠، کۆتایی بە پیشەی مامۆستاییم هێندرا لە زانکۆی ئەتاتورك، نوچەکە لە هیچ میدیایەك بایەخی پێنەدرا و لە هیچ شوێنێك بڵاو نەکراوە. سەندیکای مامۆستایانی یاریدەدەری زانکۆ، لەوێ دەمێدا دامەزراوەیەکی بەهێز و بە کاریگەر بوون. سەندیکا دوای بڕیارەکە لە ئەنقەرە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەڤانی بەستبوو و کارەکەیان شەرمەزار کردبوو. وەلێ هەواڵەکە لە هیچ شوێنێك گرنگی پێنەدرابوو، بۆیە هیچ دەزگایەکی میدیایی بڵاویان نەکردبۆوە.

لەوان ڕۆژانەدا، کاتێك چاومان بە ڕۆژنامە و بڵاوکراوەکان دەخشاند، تا بزانین لە شوێنێك هەواڵی دەرکردنەکەمیان بڵاوکردووەتەوە، لە پڕ چاوم کەوتە سەر هەواڵێکی حیکمەت بۆزچاڵی، کە وەکوو سەرۆکی کۆمەڵەی کولتووری شۆڕشگێڕی ڕۆژهەڵاتی شاخی ئیستانبووڵ دوابوو. ڕوونکردنەوەکە تەنیا لە چاپی ئەدەنەی ڕۆژنامەی جمهوریەت هەبوو. ئەو چاپەی لە ئەدەنە دەردەچوو، زیاتر لە شار و شارۆچکە کوردییەکان بڵاو دەکراوە. چاپی ئیزمیر و ئیستانبووڵی ڕۆژنامەکە ئەو هەواڵەی لێ بڵاو نەکرابۆوە. نوچەکەش لە لاپەڕەی پێنجەم لە چەند ڕستەیەکی کورتدا بڵاوکرابۆوە. لەوێ سەردەمێدا ڕۆژنامەی جمهوریەت لە شەش لاپەڕە پێکهاتبوو. خۆشەویستیم بۆ حیکمەت بۆزچاڵی

لەوێ ڕۆژێوە دەستی پێکرد.

پێم وابێ ئەگەر وردەکارییەکی دیکەی بچووك لەو بارەوە بخەمە بەر دیدەتان، کارێکی چاك دەبێ.

لە کۆتایەکانی ساڵی ١٩٧١، زیندانی دۆخی لەناکاوی دیاربەکر، گواسترابۆوە بنکەیەکی سەربازی، کە لە ناوچەی سەیرانتەپە، تا کەنار ئاوی دیجلە فراوان بوو. ڕۆژێك، شەرەفەدین کایای پارێزەرمان، کۆمەڵێك بەڵگە و پەڕاو و دیکۆمێنتی لەسەر دۆسیەی کۆمەڵەی کولتووری شۆڕشگێڕی ڕۆژهەڵات بۆ هێناین.

هەڤاڵانمان، لە ناوچەی هەواگۆڕکێ، خەریکی دوو گۆڵی بوون. منیش لە چێشتخانە، لەسەر مێزێك دەستم بە سەرووژوور کردنی بەڵگەکانی دۆسیەکە کرد. لە لاپەڕەکانی سەرەتا، چەند نووسینێکم بینی لەسەر زانکۆی ئەرزڕووم. لەوێ باس لەو ئۆپەراسیۆنە دەکرا کە بۆسەر مامۆستایەکی یاریدەدەر کرابوو. لەبەر خۆمەوە گوتم "ئاخۆ دەبێ جگە لە من، مامۆستایەکی دیکەی یاریدەدەریش ئاوای بەسەر هاتبێ؟" بەڵام کاتێك بەردەوام بووم لەسەر هەڵدانەوەی نووسراوەکان، تێگەیشتم کە ئەو مامۆستا یاریدەدەرەی ناوی هاتووە، هەر خۆمم، نەك کەسێکی دیکە.

لەناو یەکێك لە نووسراوەکان، باس لە گفتوگۆیەکی توندی نێوخۆیی کۆمەڵەی کولتووری شۆڕشگێڕی ڕۆژهەڵاتی شاخی ئەنقەرە دەکرا. لەوێ بەشێکیان لەو باوەڕە بوون "نازانین ئەو کەسە کێیە، جا نازانین چ کارێکیشی کردووە. وەك چۆن نازانین چی نووسیووە. جا چ خێر لە تورکێك دەبینین تا بەرگری لێبکەین؟ بۆیە با وازی لێبینین و بگەڕێینەوە سەر ئیش و کاری خۆمان".

بەشێکیشـــیان لەو بـــاوەڕەدابوون "پێشـــکچی پیـــاوێکی چاکـــە و کەســـێکی ناسراویشـــە. چەنـــد مانگێـــك لەمەو بەریـــش، لێـــرە کۆڕبەنـدێکی پێشـکەش کردبـوو... ". مـاوەیەك لە نێـوان خۆیـان سەرقاڵی ئەو دەمەقاڵێیە بووینە، دواتر لەسەر ئەوە ڕێککەوتوون تا بەیاننامەیەك بڵاوبکەنەوە، دژی ئەو بڕیارەی لەهەمبەر من درابوو.

لە چەپەوە، ئەوانەی بە پێوە وەستاون: عەبدوڵا نەفەس، ئیسماعیل بێشکچی، یاشار ئوچار، جان یوجەل.

لە چەپەوە ئەوانەی دانیشتوون: رەجەب موتڵوو، ئیسماعیل ئایدنلی، ئەحمەد حەمیدی دینلەر، چوارەدەمین رۆژی مانگی یازدەی ساڵی ١٩٧٣. زیندانی ئەدەنا.

## بەرخودان، دژی ئەشکەنجە و ئۆپەراسیۆن

لە مانگی یەکی ساڵی ١٩٧٣، نزیکەی بیست گەنجیان لە ناوچەی سیوێرەگەوە هێنا بۆ بەندیخانەی دۆخی لەناکاوی دیاربەکر. ئەوان زۆربەیان خوێندکاری قۆناغی ئامادەیی بوون. قوتابییەکان لەبەر ئەوەی دەستبەسەر بوون، بۆیە هێنابوونیانە لای ئێمە. لەناویاندا محەمەد ئوزونیش[1] یەکێك بوو لە دەستگیرکراوەکان. چەند ڕۆژێك دواتر، بەڕێوەبەرایەتی بەندیخانە، چەند قوتابیەکیان دووبارە لەگەڵ خۆیان برد، تا لێپێچینەوەی

---

[1] محەمەد ئوزون (١٩٥٣-٢٠٠٧) نووسەر و ڕۆماننووسێکی کوردی، هاونیشتیمانی باکووری کوردستانە. ئوزون دامەزرێنەری ڕێکخراوی پێنووسی کوردە لە سوید. جگە لەوەی خاوەنی زیاتر بیست پەرتووکە بە زمانی کوردی و زمانی دیکە نووسیووە. نووسەر یەکەم ڕۆمانی بە نێوی (تۆ) لە ساڵی ١٩٨٥ بڵاو کردەوە. هەروەها ئەو گەلێک لێکۆڵینەوە و هەڵبەستی نووسیوە، کە یەکێک لە هەڵبەستە درێژەکانی بە ناوی "داستانا عەگیدەکی" لە لایەن هونەرمەند جوان حاجۆ کراوەتە گۆرانی. ئەو جگە لە زمانی کوردی، گەلێک بەرهەمی بە زمانی ئینگلیزی، سویدی و تورکیش نووسیوە. ئەمڕۆ هەندێک لە توێژەران، ئەو وەک سەرکێشی ڕۆمانی کوردی مۆدێرن دەپەژرێنن و بەرهەمی ئەو لە ڕیزی ئەو بەرهەمانەن کە زۆر دەخوێندرێنەوە و خوێنەرانێکی زۆر حەزی پێ دەکەن، بە تایبەتی ڕۆمانەکانی "سیا ئەڤینێ" و "ڕۆنی مینا ئەڤینێ، تاری مینا مرنێ" گەلێک بەرچاوترن و ئەم دوو ڕۆمانەی بۆ گەلێک زمانی بیانی وەرگێڕدراون. ئوزون بە هۆی خەبات و نووسین بە زمانی کوردی، چەند جار لە لایەن دەسەڵاتی تورکیا خرایە بەندیخانەوە و هەر بە هۆی ئەم کێشەوە، هاوینی ساڵی ١٩٧٧ باکووری کوردستانی بەجێهێشت و بۆ ساڵانێکی دوور و درێژ لە وڵاتی سوید مایەوە. لە سوید ئەندامی کارای "پێنی سوید" بوو و ساڵی ٢٠٠١، خەڵاتی Torgny Segerstedtی سویدی وەرگرت. (وەرگێڕ).

لەگەڵ بکرێتەوە. دەمەو ئێوارە کەهاتنەوە، ئەو گەنجانە باسیان لەوەکرد، لەکاتی لێکۆڵینەوە، دیسان ئەشکەنجەیەکی زۆر کراون.

ئەو کارەی کارگێڕی بەندیخانە، چەند جارێك دووبارە بۆوە. ڕۆژی دووی مانگی سێ، دیسان چەند سەربازێك هاتن تا یەکێك لەو گەنجانە ببەنە بەر لێکۆڵینەوە. هەڤاڵانیش ئەوەیان بۆ باسکردن، کە لە هەر لێکۆڵینەوەیەك ئەشکەنجەی ئەو خوێندکارانە دەدەن، بۆیە ئەوجارە ڕێگا نادەین هیچ یەکێکیان لەگەڵ خۆتان ببەن.

کارگێڕی بەندیخانەکە سوور بوون لەسەر ئەوەی ئەو برادەرە ببەنە بەر لێکۆڵینەوە. ئێمەش پێداگیریمان لەسەر ڕادەستنەکردنی ئەو هەڤاڵە دەکرد. بە درێژایی ڕۆژ ئەو کێشەیە بەردەوام بوو. بۆچارەکردنی پرسگرێکەکەش، دیداری درێژ درێژ، لەنێوان نوێنەرانی بەندکراوان و کارگێڕی بەندیخانەکە سازکرا. فەرماندەی زیندانەکە هات و گوتی "من زامنی ئەو کەسەم، کە چۆن بە سەلامەتی دەچێتە لێکۆڵینەوە، ئاواش بگەڕێتەوە". لە کاتێکدا بەشی کارگێڕی دەیانگوت "لە سەرەوە فەرمانمان بۆ هاتووە و دەبێ ئەو برادەرە بە هەر نرخێك بێت، بچێتەوە ژێر لێکۆڵینەوە". ئێمەش باوەڕمان بەو پەیمانانە نەدەکرد کە پێیان دەداین و ئەوەمان بۆ باس دەکردن، کە تاوەکوو ئێستا، بەرپرسانی بەندیخانەکە هیچ پەیمانێکی خۆیان نەبردووەتە سەر و جێبەجێیان نەکردووە، بۆیە باوەڕ بەو سۆزەشتان ناکەین.

هەرچۆنێك بێت، ئەوێ ڕۆژێ، ئەو برادەرەمان ڕادەست نەکرد. بۆیە ئاریشەکە تا ئێوارە درێژەی کێشا. شەویش بۆچارەکردنی پێشهاتەکە، دانیشتن و گفتوگۆ لە نێوان نوێنەرایەتی

بەندکراوان و بەرپرسانی زیندانەکە چێبوو، بەڵام هیچ ئەنجامێکی لێ دەرنەچوو. شەو دوای گەڕانەوەی برادەرانمان، ئیدی گەیشتینە ئەو بڕوایەی، لەناکاو ئۆپەراسیۆنێك بۆسەر ئەو قاوشە ساز دەکرێت. بۆیە ئێمەش وەك ئامادەکارییەك، لەدواوەی دەرگاکە، چەندان بەربەستی توندمان جێگیر کرد. هەرچی مێز و کەلوپەلی قورس هەبوو، بە پشت دەرگای قاوەشەکەمان وەنا.

ئەوێ شەوێ تەواوی برادەرانی قاوشەکە لەسەر پێ بوون. هەرکەسە و خەریکی خۆ ئامادەکردن بوو لەهەمبەر ئەگەری ئەو ئۆپەراسیۆنەی پێشبینی ئەنجامدانیمان دەکرد. نا ئارامی بە ڕووخساری هەمو لایەکەوە دیار بوو.

لەگەڵ سۆری سبەینێ، لە بەشی هەواگۆڕکێوە، تەقەکردن بۆ سەر قاوشەکەمان دەستی پێکرد. لە کۆشەیەکی پەنجەرەکەمانەوە سەیرمان کرد، سەربازەکان لە حاڵەتی ئامادەباشین بۆ وەرگرتنی فەرمانی هێرشکردن. چەکەکانیان بەرەو ڕووی قاوشەکەمان ڕاگرتبوو و میلیان هێنابۆوە بۆ تەقەکردن. ئەو گولانەی دەشتەقێندران، بەشێکی زۆریان بەر پێچکە ئاسنەکانی چوار پایەکانمان دەکەوتن و پاشان لە بنمیچ، یان دیوارێکی ژوورەکە دەچەقین. ئەمەش وایکرد، بەشێك لەو گێچ و لەبغە کەونەی ناو ژوورەکە بە سەر و گوێلاکی بەندکراواندا بەربێتەوە. لە چەند خولەکێکدا دۆخێکی زۆر ناهەموار لە قاوشەکە دروست بوو. بۆ خۆپاراستن لەو گولانەی بەرەو ڕوومان دەکرا، گەورە و بچووك دەیویست خۆی لە پەنایەك حەشار بدا، هەندێکیان خۆیان لەناو دۆلابی نان هەڵگرتن شاردەوە.

به خشکەخشك، خۆم گەیاندە ناو ئاودەستەکەمان، تا لە پەنجەرەکەیەوە سەیری بەشی پشتەوەی قاوشەکەمان بکەم. بەڵام چیم بینی! نەك تەنیا سەرباز، بەڵکو دوو تانکی سەربازی و کوتکی گەورەی ئاسنین بۆ کردنەوەی دەرگاکان و چەند هاوەنێك، ڕوویان لە دەرگا و پەنجەرەکانی قاوشەکە کرابوو.

دوای وەستانی تەقەکان، لە پڕ دەستیان بە هاوێشتنی گازی فرمێسك ڕێژکرد. ڕێژەی گازەکە تا دەهات زیاتر دەبوو. هەندێك لە برادەران یەکەمین جاریان بوو تووشی دۆخێکی وەها بن، کە گازی فرمێسك ڕێژیان بەسەردا بپرژێندرێ.

ئەو گازە وا لە مرۆڤ دەکات، لەو شوێنە داخراوەی لێیەتی هەڵبێت و، پەنا بۆ شوێنێکی کراوە ببات، بۆ هەڵمژینی ئۆکسجین. بۆیە زۆر بە خێرایی لە ژوورەوە مێز و کورسییەکانی پشت دەرگاکەیان لادا و دەرگای چوونە دەرەوەیان کردەوە. هەرکێ نزیکی دەرگا دەکەوتەوە، لە حەژمەتی گیانی، بەرەو دەرەوە ڕای دەکرد. بەو شێوەیە یەك لە دوای یەك بەرەو دەرەوە ڕامانکرد.

لە دەرەوەی دەرگاکە، سەربازەکان بە ڕیز، لە چاوەڕوانی دەرچوونی ئێمەدا بوون. لە ڕاست و چەپ ڕێڕەوێکی درێژیان پێك هێنابوو. لە دەست هەریەکێکیان چەکێکی جیاواز هەبوو. بەشێکی زۆریشیان زنجیر و دار و ئاسنیان پێ بوو. هەر کەسێك کە لە ژوورەوە دەردەچوو، بە ناچاری بەناو ئەو کۆڕیدۆرە تێدەپەڕی. هەر کە گەیشتیە ئەوێش، ئیدی لەیەکەم سەربازەوە تا دواهەمینیان، یەکێك بە زنجیر و ئەوی دیکە بە دار و ئەوی دیکەشیان بە قۆنداغ و یەکێکیش بە بۆری سەروسەکوتیان

دەشکاندی. ئەمە جگە لەوەی بەهەموو قورگیان چی جنێوی پیسە پێیان دەدایـن. بەڵام ئەو جنێـوە چەپەڵ و سـووکایەتی پێکردنـانە، وای لێکـردم هەسـت بەوە بـکەم، ئەوانەی لەوێ ئـاوا دارکاریـان کردین، سەرباز نەبوون. چونکە پێشتر چەند جارێك بە هۆکاری جیا جیا سەرباز هاتوچۆی قاوشەکەیان دەکردین. وەلێ هیچ کات گوێمان لە جنێو و سوکایەتی پێکردن نەبیۆوە.

ئیـدی بە ناچـاری منـیش لە قاوشـەکە، بەرەو دەرگـا ڕامکـردە دەرەوە و بەنـاو ئەو دەرچەیەدا تێپەڕیم. کـوتکی زۆرم خـوارد، تـا لە ژێـر دەسـتیان ڕزگـارم بـوو. لە کۆتایـدا خـۆم گەیانـدە لای فەرمانـدەی بەنـدیخانەکە، کە لە کۆتـایی ڕیـزکە وەسـتابوو، هەوڵـی ئەوەمـدا پێـی بڵـێم، ئیـدی ئەو ئەشـکەنجە و سـووکایەتی پێکـردنە ڕابگـرێ، وەلـێ لە پـڕ، یەکـێ لە دواوە، بە پـێلەقەیەك منـی فڕێـدا مەترێك ئەولاتر.

لەوێ زۆر قســەی ناشــرین و جنێــوی پیســیان بە ئیبــراهیم گوچلـوو دا. لە مـاوەی چەنـد خولەکێـك تەواوی بـرادەران، لەنـاو قاوشەکە ڕایان کردە دەرەوە. پاشان ناوی چل کەسیان خوێندەوە، گوایە ئەمانە سەرە گەورەکانی دروست بوونی ئەو ئالۆزیە بوونە. پاشـان ئامـاژەیـان بەوەکـرد، ئەو ژمـارەیە دەخـرێتە زینـدانی تـاکە کەسـییەوە. لەنـاو چـل نـاوەکەدا، لەگەڵ مـن، هەریەکە لە مـحەمەد ئەمـین بۆزئارسـلان و ئیبـراهیم گوچلـوو و ئیحسـان ئاکسـۆیی و فاروق ئاراس و ئەمین قالافات و جەمیل فازلا و سەبری چەپیك و کـاك ڕەشـید و یومنـوو بـوداك و حـیکمەت بۆزچـاڵی و چەنـد برادەرێکی دیکە بووین.

دوای خوێندنەوەی ناوەکانمان، ئێمەیان بردە ناو ئەو شوێنە سەر جەمەلۆنەی لەولاتری قاوشەکەی ئێمە هەبوو. لەوێ چل دانە زیندانی تاکە کەسی نەبوو، بەڵکو شوێنێك بوو هەر چوار دەورەی بە زیندانی تاکەکەسی چێکرابوو. ناوەڕاستی بۆش بوو. بە ناچاری دوو دوو، ئێمەیان خستە ناو یەك زیندان. ئەو کارانە لەژێر هەڕەشە و دۆخێکی تیرۆریستیدا جێبەجێ دەکرا. لە ژوورەوە لەبەر ئەوەی کارەبا نەبوو، بۆیە هەموو حوجرەکان تاریکە سەلاتێك بوو، چاو چاوی نەدەبینی.

لە پڕ بینیمان چەند سەربازێك هاتن و کەسێکیان لە یەکەمین زیندانی تاکەکەسی دەرهێنا و لە ناوەڕاستی شوێنە چۆڵەکەیان دانا. دەرگای حوجرەکانی ئێمەش بە دڵنیایەوە داخرا بوو. بەڵام لە کونێکەوە دەمانتوانی هەندێك دەرەوە ببینین.

ئەو برادەرەی سەربازەکان هێنایانە دەرەوە، ماوەیەك لە فەڵەستین مابۆوە. بۆیە هەموو بەیانییەك لە هەواگۆڕکێی زیندانەکە، بۆکسێن و زۆرانبازی فێری برادەرانمان دەکرد. پاشان تاکتیکەکانی هێرشکردنی گەریلایی فێرە هەڤاڵان دەکرد. کابرا لە فەڵەستین چی فێرببوو، پیشانی برادەرانی ئێمەی دەداوە.

ئەو چوار پێنج سەربازە لە هێزی تایبەت بوون. هەر زوو دەستیان بە لێدانی ئەو برادەرە کرد. هەندێکیان بە بۆکس و یەکێکیان بە شاپ و پێلەقە و یەکێك بە قۆنداغی چەکەکەی بێ وەستان لێیان دەدا. زوڵمێکی گەورە و نادادپەروەرانە بوو. جا لەگەڵ ئەوە، جنێو و سوکایەتی پێکردنیش بەردەوام بوو.

ئەو برادەرە لەگەڵ هەر زەربەیەك کە پێی دەکەوت هاواری

دەکرد "فریامکەون..! " بۆکس لەسەر بۆکسی پێدەکەوت و، لەگەڵ هەر پێلەقەیەك، کاتێك دەیویست خۆی کۆبکاتەوە و هەڵستێتەوە سەر قاچەکانی، ئەمجارە بە قۆنداغی چەکەکانیان لە پشتیان دەدا و دەیانخستەوە. ئەویش ئەمجارە بە دەنگێکی بەرزتر هاواری دەکرد "فریامکەون... کەسێك نییە ڕزگارم بکات؟ لێتان دەپاڕێمەوە ئیدی لێم مەدەن... " ئەو هاوار و ناڵانەی بە دەنگێکی بەرز و قورگێکی پڕ لە گریانەوە دەگوت.

بە ڕاستی ئەو دیمەن و دەنگانە، زۆر زۆر خەمبار و بێتاقەتیان کردم. لە کاتێکدا چاوەڕوانی وەها شتێکم نەدەکرد لەو برادەرە. بە بۆچوونی خۆم پێم وابوو خۆڕاگرتر بێ. جا لەگەڵ ناڵە و فیغانی ئەو، بێدەنگی و دەرنەچوونی هیچ دەنگێك لە زیندانە تاکەکەسییەکان، باری دەروونی زێدەتر ناڕەحەت کردم. دەنگی پرۆتێستۆی دژایەتی کردنی زوڵم لە هیچ لایەك نەدەهات. چونکە ئەو جەورە لەیەك حوجرەوە دەستی پێکردبوو و تا کۆتایی بە نۆرە سەرەی هەمووان دەهات.

دوای ئەو برادەرە، ئیبراهیم گوچلوویان هێنا ناوەڕاستی مەیدانەکە. چوار پێنج سەربازی هێزەکانی تایبەت، دەستیان بە بۆکس و شەق و پێلەقە وەشاندن کرد و، بە زاریش جنێو و قسەی ناشرین و سوکایەتی پێکردن. ئەوەی بۆتان باسدەکەم، لەچاو ئەوەی بینیم هەر هیچ نییە، چونکە بە وشە ناتوانم باسی ئەو لێدان و ئەشکەنجە قورسە بکەم. بەڵام ئیبراهیم نوقەی لە خۆی بڕی بوو و دەنگی لێ دەرنەدەهات. تەنیا ئەوە نەبێ لەگەڵ هەر زەربەیەك دەیگوت "حەق و حیسابی ئەو زوڵمەتان لەگەڵ

دەکرێتەوە". پاشان ئەوەشم دەبینی کە کاك ئیبراهیم چەندە بە چاوێکی پڕ ڕق و قینەوە لەو زاڵمانەی دەڕوانی. ئەمەش مانای وابوو "نەدۆڕاوم و ئەها وا لەسەر پێیەکانی خۆمم". ئەو خۆگرییەی ئیبراهیم، دڵخۆشییەکی زۆری بە مرۆڤ دەبەخشی. وەلێ بێدەنگی حوجرەکان بەرامبەر بەو کردەوە دڕندانەیە، ژێردەستەیی ڕۆحێکی کزی پیشان دەداین.

لە دوای ئەشکەنجەکەی ئیبراهیم گوچلوو، ئەو لێدان و کوتانەی ناو مەیدانەکە کۆتایی هات. پێم وابێ ئەو بەرگری و خۆگرییە، ئەوانی تووشی هەناسە ساردی کرد.

ڕۆژانی سەرەتای ناو زیندانی تاکەکەسی زۆر ناخۆش و پڕ کێشە بوو. لە ماوەی ٢٤ دەمژمێردا، تەنیا یەکجار، ئەویش بۆ ماوەیەکی کەم، بۆمان هەبوو بچینە سەرئاو. دوای چەند ڕۆژێك هەندێك مۆمیان بۆ هێناین، تا ژوورەکان ڕووناك بکاتەوە. وەلێ بەردەوام دەمانتوانی قسە لەگەڵ حوجرەکانی تەکمان یان ئەوانەی بەرامبەرمان بکەین. چونکە دەنگیشمان بە ئاسانی دەگەیشتە یەکدی.

## پەروەردە لە زیندانی دۆخی لەناکاو

لە گرتیگەی دۆخی ئاوەرتەی دیاربەکر، لە شێوەی چەند دەستەیەکی جیاواز، چەند چالاکییەکی پەروەردەیی هەبوو. لەناو ئەو چالاکییانەش، زۆربەی کات باسی فەلسەفەی مارکس و خوێندنەوە بۆ پەرتووکەکانی لینین و ستالین دەکرا. جا لەناویاندا چەند پەرتووکێکی وەك (پێویستە چی بکرێ – دەوڵەت و

شـۆڕش – مارکسـیزم و پرسـی نەتەوەیـی) لەهەرە لە پێشـینەکان بـوون. ئەو کـارەی ئـێمە لەلایەن فەرمانـدەیی بەنـدیخانەوەش دەزانـدرا، بەڵام خۆیـان لـێ نەبـان دەکـرد. ئەو چالاکییە زۆربەی کات ئێواران دوای شیڤ، لە نانـدینی زیندانەکە بەڕێوە دەچوو. ئەگەر بە ڕۆژیش با، ئەوا هەر لەناو قاوەشەکە ساز دەکرا.

## مەولوودی کوردی

ئێـوارەیەکی وەرزی زسـتانی سـاڵی ١٩٧٢، دوای خـواردنی شیڤ، لە نانـدینەکەوە دەنگی خوێنـدنەوەی مەولـوود هاتە گوێ. نزیکەی دە، تا پازدە لەوانەی خەڵکی لادێ بوون، لەگەڵ چەنـد دووکانـدارێك، دانیشتبوون و دەستیان بە خوێنـدنی مەولـوود کـرد. مەولوودەکە بە زمانی کوردی دەخوێندراوە. لەناو ڕستەکانیدا جگە لە دین و هەستی ئاینی، هیچ شتێکی دیکە نەگوترا، لەسەرەخۆ و بە هێمنی مەولوودەکە دەخوێندراوە.

نـــزیکەی دە خـــولەك دوای دەســـتپێکردنی مەولـــوودەکە، سـەربازێك هـاتە چێشـتخانەکە و گـوتی "بە دەسـتووری فەرمانـدە، دەبێ مەولـوود خوێنـدنەوە ڕابگـرن". دوای ئەو پەیامە سـەربازەکە ڕۆیشت. بەڵام خوێندنەوەی مەولوود بەردەوام بوو. نزیکەی پازدە خولەك دوای ڕۆیشتنی سـەربازەکە، بەرپرسـێکی بەشـی پاراسـتنی بەنـدیخانەکە هـات و فەرمـانی سـەربازەکەی پێش خـۆی دووبـارە کردەوە. بەڵام مەولوود خوێندنەوە هەر بەردەوام بوو.

دوای ڕۆیشـتنی سـەربازی دووەم بە دە خـولەك، ئەمجـارە،

ئەفسەری پلە یەکی چاودێری شەو هات و گوتی "بە دەستووری فەرماندەی دۆخی لەناکاو، دەبێ بە زووترین کات، کۆتایی بە خوێندنەوەی ئەو مەولوودە بهێنن". تا ئەوکاتەش ئەو برادەرانە جگە لە مەولوود خوێندنەوەکە، خۆیان بە نێردراوەکانەوە مژوول نەدەکرد و بەردەوام بوون لەسەر کارەکەی خۆیان. بۆیەش بەرپرسانی بەندیخانە دوای چەند ئاگادارکردنەوەیەك و گوێ پێنەدانیان لەلایەن ئێمەوە، پێداگیربوون لەسەر وەستاندنی خوێندنەوەی مەولوودەکە. بەڵام خوێندنەوەی مەولوود بە کوردی بەردەوام بوو. هەم ئەوانەی مەولوودەکەیان دەخوێندەوە و هەمیش ئەوانەی گوێگر بوون، ئاگایان لە هاتن و چوونی سەربازەکان بوو، بەڵام کەس خۆی لێ بە خاوەن نەدەکردن. مەولوود خوێندن بەردەوام بوو.

ماوەیەکی زۆر کەم دوای ڕۆیشتنی ئەفسەرە پلە یەکەکە، فەرماندەی بەندیخانەکە خۆی هات و گوتی "ئەو پرسە لەدەسەڵاتی مندا نییە و فەرمانی فەرماندەیی دۆخی لەناکاوە". لەسەر ئەوە دەمەقاڵێ لە نێوان مقدەمی فەرماندە و بەندکراوان دروست بوو. بەندکراوان بەشێوەیەکی توند پێداگیریان لەسەر ئەوە دەکرد، خوێندنەوەی مەولوود مافێکی یاسایی خۆمانە و دەرچوون نییە لە یاساکان. دوای ئەم بەرگری کردنە، فەرماندەکە گوتی "مادەم هەر مەولوود دەخوێننەوە، بە تورکی بیخوێننەوە". پاشان پشتی تێکردین و ڕۆیشت.

نزیکەی دوای دەمژمێر و نیوێك لە خوێندنەوەی، پاشان مەولوودەکە کۆتایی پێهات.

دەوڵەت و سوپا، بەوە نارەحەت نەبوون کە پەروەردە و چالاکی لەسەر بیرۆکەی مارکسیزم چێدەکەین، وەلێ بە خوێندنەوەی مەولوودی کوردی نارەحەت ببوون. جا بە بۆچوونی من، نارەحەتیەکەشی لەسەر ئەوە نەبوو کە مەولوود دەخوێندراوە، بەڵکو لەبەر ئەوە بوو مەولوودەکە بە کوردی دەخوێندراوە. لە کاتێکدا ئەو ڕاهێنانە پەروەردەییەی هەموو ئێوارەیەك ڕێك دەخرا بە مەترسی نەدەبینی بۆخۆی، وەلێ خوێندنەوەی مەولوودی بە زمانی کوردی بە هەڕەشە و مەترسی دادەنا و دەیویست هەرچی زووە بێ دەنگی بکات.

هەموو کات و لە هەموو شوێنێك، سیاسەتی دەوڵەت بەرامبەر بە کورد،پێداگیریی بووە لە قەدەغەکردنی زمانی کوردی. بۆیە هەموو هەوڵ و تەقەلایەك دژی ئەو قەدەغەکارییانە، زیندوو ڕاگرتنی زمانی کوردییە. بۆیە لەو باوەڕەدام، خوێندنەوەی مەولوود بە زمانی کوردی، لە حەفتاکانی سەدەی ڕابردوو، کارێکی شۆڕشگێڕانە بووە و مایەی ستایشکردنە.

## تراشینی ڕیش و قژ!

لەبەر خوێندنەوەی مەولوود بە کوردی، فەرماندەی گرتووخانەکە، زۆر لە بەندکراوەکان، پەست و تووڕە بوو. ڕۆژی دواتر دوای خواردنی تاشتی، ئاگادارییەك بڵاوکرایەوە، گوایە بە فەرمانی فەرماندەیی بەندیخانە، دەبێ هەموو بەندکراوەکان ڕدێن و پرچیان بتراشن. دوای ئاگادارییەکە، برادەران گفتوگۆیان

لەبارەی ئەوەوە دەکرد، دەبێ زۆر بە توندی بەرسفی ئەو بڕیارە بدرێتەوە. بۆئەمەش هەوڵی چێکردنی ڕێکخراوێکی بەرسڤکارییان دەدا.

دوای ئاگادارکردنەوەی یەکەم "هیچ کەسێك لە قاوشەکان نەمینێ و هەموو کەسێك بچێتە دەرەوە" ئاگادارکردنەوەیەکی دیکە بلاوکرایەوە. کە سەیرمان کرد، بەقەد سوپایەك، سەرباز لە هەواگۆڕکێ چاوەڕوانمان دەکەن. پاشان بە ناچاری و بە زۆری، هەموو بەندکراوەکانیان هێنا دەرەوە و هەرکەسە و لە شوێنێك دانیشێندرا و نزیکەی ٨ تا ١٠ سەرباز بەو کەلوپەلە سەرتاشیانەی دەستیان قژ و ڕیشیان تراشین، جا ناوە ناوە کارەکەیان بە توندی و ئەشکەنجەوە دەکرد.

## تاقیکردنەوەی زمانی کوردی
## بە سەرمایەی کارل مارکس

بەردەوام چەپی تورك، کاریگەری زۆری لەسەر چەپی کورد هەبووە. لە سالآنی شەست و حەفتاکان، بەشێکی زۆری نووسەرانی تورك، لە نووسینەکانیاندا پێیان وابوو، زمانی کوردی زمانێکی سەرەتاییە و نەبووەتە زمانی نووسین، بۆیە خاوەنی ئەدەبیاتی خۆشی نییە. لەوێ دەمێدا زۆر برادەرمان هەبوو زۆر بە جوان و ڕەوانی بە کوردی دەپەیڤین، وەلێ ئەوانەی بە کوردیان دەنووسی زۆر نەدەبیندران و ژمارەیان کەم بوو.

ئەو مژارەی لەسەرەوە باسم کرد، زۆر کات لە بەندیخانەی

دۆخی لەناکاو گفتوگۆ و قسەی لەبارەوە دەکرا. ڕۆژێك برادەران بۆ ئەوەی پەسنی ئەوە بکەن، کە کوردی زمانی نووسینە و نووسراوی هەیە، کەوتنە هەوڵی دۆزینەوە و سەلماندنی. پاشان گرەویان لەسەر چۆنیەتی نووسینی پەرەگرافێکی کوردی کرد... بۆ ئەمە من پێشنیازی ئەوەم بۆ کردن تا هەڵستن بە نووسینی نوکتە کوردییەکان، کە بە چڕی لەکاتی ئاخاوتن بەکار دەهێندرا. نووکتەکان نووسرانەوە. بەڵام یەکێك لە برادەران نووسراوەکەی بە کێماسی بینی و گوتی "بە نووسینی شتی وا سادە، ناکرێ ئەوە بسەلمێنی کە دەتوانرێ بە کوردیش بنووسرێ. بەڵکو لە شوێنی ئەو، با پەرەگرافێك لە پەرتووکی (کاپیتاڵ – سەرمایە)ی کارل مارکس وەرگێڕنە سەر زمانی کوردی".

جگە لە ئامانجی وەرگێڕانی پەرەگرافێك لە پەرتووکی کارل مارکس بۆ زمانی کوردی، ئامانجێکی گەورەتر لە پشت داواکاری ئەو برادەرە هەبوو، ئەویش خۆ پیشان دانی بوو وەکوو کەسێکی شۆڕشگێڕ و مارکسی. ئاخر لە سەردەمێکی پەنجا ساڵ بەر لە ئێستا، کەسێك کە هێشتا بە تەواوەتی لە پەرتووکی (کەپیتاڵ – سەرمایە)ی کارل مارکس بە تورکی نەگەیشتبوو، چۆن پەرەگرافێکی ئەوی دەکردە کوردی؟

# بەشی پێنجەم
# دادگاییکردنی ڕێبازی زانستی

## سەردانی مولکییە

مانگی حەفتی ساڵی ١٩٧٤ لە گرتووخانە ئازاد بووم. دوای گەڕانەوەم بۆ ئەنقەرە، ماوەیەکی زۆر، نەچوومەوە سەردانی کۆلێژ. لە نۆزدەمین ڕۆژی، مانگی شەشی ساڵی ١٩٧١، کاتێك لە کۆلێژ دەستگیرکرام و بردرام، پەرتووك و گۆڤار و نووسراو و هەندێك کەلوپەلی دیکەم، هەر لەوێ مابوونەوە. دوای دەرچوونم لە زیندان، تەنیا مەراقی ئەوانم کردبوو. کاتێك لە دیاربەکر و ئەدەنە لە زیندان بوون، هەواڵێکی وردم لەسەر ئەو کەلوپەلانەم نەبوو. لە کاتێکدا ئەو پەرتووك و گۆڤار و دەفتەرانە، بۆ توێژینەوەی نوێ پێویستیم پێیان بوو. من لەو باوەڕەدابووم، ئەوانە لەلایەن سەرۆکایەتی بەشەکەمەوە لە کۆگای زانکۆ هەڵگیردرابن.

لە کۆتایی مانگی نۆ، بۆ زانینی هەواڵی کەلوپەلە جێماوەکانم، بڕیاری ئەوەم دا بچمە کۆلێژ، تا بتوانم لەگەڵ خۆم بیانهێنمەوە. لەوێ ژووری کاك ئیبراهیمم دۆزییەوە. نزیکەی سێ ساڵ بەسەر ئەو ڕۆژە تێپەڕ بوو. دکتۆر ئیبراهیم یاسا، پرۆفیسۆری کۆمەڵناسی بوو. کاتێك دەستگیرکرام، لە ژووری کاك ئیبراهیم لە کۆلێژی زانستە سیاسییەکان دانیشتبووم. ئەو ڕۆژە چوون لەوێ

دەستگیرکرام، ئەوا منیان بردە فەرماندەیی دۆخی لە ناکاوی ئەنقەرە.

لە سەردەمی ڕژێمی ساڵی ١٩٧١، مامۆستای یاریدەدەری دیکەش، لە کۆلێژی زانستە سیاسییەکان دەستگیرکرابوون. جا هەندێکیان لەناو پۆل، لەکاتی وانە گوتنەوە لەلایەن پۆلیسەوە کەلەپچەیان لە دەستکرابوو و بردرابوون.

هەندێك شتم دەربارەی دادگاییەکانی ڕۆژهەڵات و بارودۆخی کورد بۆ باس دەکرد. ئەویش بە بێدەنگی گوێی بۆ گرتبووم. پاشان باسی ئەو زمانلێدانەم بۆ دەکرد، کە لە هەندێ زانکۆ و کۆلێژ لە پرۆفیسۆر و مامۆستا و قوتابییەکانیان دابوو. هەندێك لە کەسەکان تۆمەتباریان دەکردم و دەیانگوت "پێشکچی زانستی کۆمەڵناسی بۆ ڕامانە پووچەکانی خۆیی و دەستکەوتە ئایدۆلۆژییەکانی بەکاردەهێنێت". منیش دەمویست ئەوە بسەلمێنم کە بۆچوونی زانستی و کۆمەڵناسیم دژی ڕاستییەکانی مەیدانی کۆمەڵایەتی نین، چونکە لە ئەسڵدا بوونیان هەیە. دەمویست ئەو شتانە بۆ کاك ئیبراهیم باسکەم، لە پاڵ ئەوە لەسەر بەڕێوەچوونی دانیشتنەکانی دادگاش زانیاریم پێدەدا.

## پرۆفیسۆر دکتۆر نەرمین عەبدان ئونات
## "تۆ هیچ ناگۆڕێیت و ڕاستییەکان نابینیت"

کاتێك لەگەڵ کاك ئیبراهیم گفتوگۆمان دەکرد، بە پەلەپرووزێ و شڵەژاوی، پرۆفیسۆر دکتۆر نەرمین عەبدان ئونات بەژوور کەوت. لەژێر کورسییەکەی چەندان پەرتووك و دۆسیە و پەڕاو هەبوون. ئەو مامۆستای کۆمەڵناسی سیاسی بوو. دوای ڕۆنیشتنی، هەندێك زانیاری بەلەزی بە کاك ئیبراهیم دا، دەربارەی کۆبوونەوەی ئەنجومەنی پرۆفیسۆرەکانی زانکۆ، کە بڕیار بوو لە جڤینێکی نێزدا مژارەکان شەن و کەو بکرێ. بۆیە داوای هاوکاری لە کاکا ئیبراهیم دەکرد، سەبارەت بەو پرسانە.

ئەو ڕۆژەی لە زیندانی ئەدەنە دەرچووم، واتا لە کۆتا ڕۆژەکانی مانگی حەفتی ساڵی ١٩٧٤، لە یەکێك لە ڕۆژنامەکان، هەواڵێکی کورتم لەسەر مامۆستا نەرمین خوێندەوە. نوچەکە بەو شێوەیە بوو "پرۆفیسۆر نەرمین عەبدان ئونات، لە ئەمریکاوە گەڕاوە. ئەو لە چەندان زانینگەی ناوداری نیۆرك، وانە و کۆڕبەندی دەربارەی مژاری بەراوردکاری کۆمەڵگا و ژێرخانی سیاسیی ولاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و دەریای سپی پێشکەش کردووە". کاتێك کە مامۆستا نەرمینم بینی، ئەو نوچەیەم هاتەوە خەیاڵ.

"مامۆستا بەخێر هاتنەوە. ماوەیەك لەمەوبەر، لە ڕۆژنامەکانەوە هەواڵی گەڕانەوەتم خوێندبۆوە. هەروەها سەبارەت بە بابەتی

وانەگوتنەوە و کۆڕبەندەکانیشت لەهەمان نوچە هەندێك شتم کەوتە بەر دید". من ئاوام بە مامۆستا نەرمین گوت. پاشان هەوڵی ئەوەمدا ئەو پرسیارەی لێبکەم "ئایا لە وانە و کۆڕبەندەکانتاندا، باسی کوردتان دەکرد؟".

مامۆستا نەرمین بە پرسیارەکەم زۆر قەڵس بوو. "تۆ هیچ ناگۆڕێیت و ڕاستییەکان نابینیت" بۆیە ئاوا بەرسڤی پرسیارەکەی دامەوە.

کورد لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، کۆمەڵگا و هێزێکی دینامیکی سیاسی گرنگن. بۆ ئەمەش لە ڕێگای زانستەوە دەشێ لێکۆڵینەوە لەسەر زۆر لایەنی جیاوازی ئەو کۆمەڵگایە بکرێ. بەڵام مامۆستا نەرمین تووڕەبوو، بۆیە لەبەر هەڵچوونە دەروونیەکەی، تێکەڵ و پێکەڵی کەوتە ناو ئەو مژارەش کە لەبارەیەوە قسەی بۆ مامۆستا ئیبراهیم دەکرد. لە حەژمەتی قسەکانم، ئاگای لێنەبوو چی دەڵێ. بۆ نموونە، ڕوی لە کاك ئیبراهیم کرد و گوتی "کاك ئیبراهیم ئەگەر ئەرك نەبێ چاوێك لەو نووسراوانە بکەن... " دوای ئەوەی ئەو ڕستەیەی گوت، وەك ئەوەی قسەکانی بۆ کاك ئیبراهیم تەواو بکات، گوتی "پێویستە کەسانی ئەکادیمی و زانستی خەسڵەتی دۆگمایی و جێگیر بوونیان تێدا نەبێت. تۆ هێشتا لە قۆناغی یەکەمی زانستدای". بەو قسەیەی دەیویست هەڵچونەکانی خۆی هەڵڕێژێت. پاشان بەو شێوەیە بەردەوام بوو "کاك ئیبراهیم دواتر دەمەوێ بۆچوونی جەنابتان وەرگرم لەسەر ئەو نووسینە". پاشان دەیگوت "تۆ هەندێك ڕاستییەکان ببینە، نەك ئەوەی چاوت بەرامبەر بە ڕاستییەکان داخەی". پاشان ڕوی لە کاك ئیبراهیم

دەکـــرد و بەردەوام بـــوو "خـــۆی لە خۆیـــدا ئەو پێشـــنیازانە، لە لەنجومەنی پرۆفیسـۆرەکان دەخـرێتە بەربـاس و نیقاشـی لەبـارەوە دەکرێ". لەو سەرو بەندەدا مامۆستا ئیبراهیم بەو ئاخاوتنە هاتە نێو قسـەکانمانەوە "ئیســماعیل، هەم قوتابیمــانە و هەمــیش مامۆســتای هاوکارمانە. بە هۆی پەرتووك و بیروبۆچوونەکانیەوە، ماوەیەکی زۆر کەوتە کونجی زینـدان. ئێستاش ماوەیەکی زۆر نابێ لە بەندیخانە دەرچـــووە. ئەمــرۆش هــاتووەتە ســەردانی ئــێمە. ئەو بە هــۆی گەڕانەوەی جەنابتـان لە ئەمریکـا گـوتی: مامۆسـتا بەخێـر بێـنەوە. جەنابیشت هیچ نەبێ بڵێ: خۆشبی سوپاس".

بە ڕاستی ئەو پێشهاتە بێ خوڵقی کردم. وەك چۆن شاگەشکە بووم بەوەی بە گوێیەکانی خۆم بیستم. نزیکەی زیاتر لە سێ ساڵ بـوو، کە پرۆفیسـۆر نەرمیـنم نەبینـی بـوو. ئەو مامۆسـتایەك بـوو، هاوکـاری خوێنـدکاران و مامۆسـتا یاریـدەدەرەکانی دەکـرد. وەك چۆن زۆر هاوکـاری منیشـی کردبـوو. وەلێ وەك لەسـەرەوە باسـم کـرد، یەکەم دیـداری دوای دەرچـوونم لە زینـدان، بەو شـێوەیە تێپەڕی.

لە زســتانی ســاڵی ١٩٧٢، لە بەنــدیخانەی دۆخــی لەناکــاوی دیــاربەکر، مــاوەیەك لەگەڵ دکتــۆر جونەیــد ئاکــاڵن بەیەکەوە مــابووینەوە. ئەویـش لە کـۆلێژی زانسـتە سیاسـییەکان مامۆسـتای یاریـدەدەر بـوو. لەوێ دەمێـدا، لە ڕێگـای ڕۆژنامەکـانەوە هەواڵـی ئەوەمان خوێندبۆوە، نەرمین خان، لەگەڵ پرۆفیسۆر دکتۆر ئیلهان ئونـات هاوسـەرگیریان پێکهێنـاوە. لە بیـرمە، ئەوسـا لەگەڵ کـاك جونەید تەلەگرافێکی پیرۆزباییمان بۆ نارد. وەك نەرمین خان، کاك

ئیلهامیش مامۆستای هەردووکمان بوو. هەردووکیان ماوەیەك پێشتر، هاوسەر و هاوژینەکانیان کۆچی دواییان کردبوو.

بەرگرینامەکـانی دادگـایی کـردنم، لە دانیشـتنەکانی دادگـای سـەربازی دۆخـی لەناکـاوی دیـاربەکر، لە سـەر مـژاری کـورد و کوردستان، ڕەخنەگرتن بوو لە بۆچوونی فەرمی دەوڵەت سەبارەت بەو مژارە، بەڵام کاریگەری لەسەر مامۆستا و کەسایەتیەکانی ناو کـۆلێژ نەبـوو. ئەو زانیارییانەشـم لە ڕێگـای ئەو پـارێزەرانەوە دەگەیشـتە دەسـت، کە نـاوە نـاوە بـۆ بەرگـری لێکـردنم سـەردانیان دەکـرم. چەنـد نـامەیەکیش لەبەردەسـت بـوون سـەبارەت بە هەمـان پرس. وەك چۆن ئەو مەکتوبەی بۆ پرۆفیسۆر دکتۆر سوعاد بیلگە ناردبووم و هیچ کاریگەرییەکی لەسەر دروست نەکردبوو. وەلێ بە شـێوەیەکی زۆر ورد، بۆچـوون و هـزری ئەوانـم لەبـارەی بۆچوونەکـانی خـۆمەوە نەدەزانـی. کاتێـك لەگەڵ نەریمـن خـان هەڤدوومان بینی، چاوەڕوانی ئەوەم دەکـرد لەو بارەیەوە هەنـدێك هەستی مرۆڤدۆستی خۆی بێنێتە زمان. هیچ نەبێت لە بەندی ئەوە بووم بڵێ "کاك ئیسماعیل چۆنی؟ دەنگ و باست؟ سێ ساڵ لە زیندان چۆن تێپەڕی؟ ئایا قورس و گران نەبوو؟ چۆن دەتوانم هاوکاریتـان بـکەم؟". ئیـدی هـیچ قسـەیەکی دۆسـتانە و مرۆڤـانەی بەرامـبەرم نەکـرد. بـۆیە زۆر قەڵـس و بـێ تـاقەت بـووم. جـا هەر ئەوەش نا، بەڵکو کاتێك نەرمین خان لە دەرگاکە ویستی دەرچێ، ئـاوڕێکی داوە و بە هەڵچـوونەوە گـوتی "ئەو کـار و مـژارەی تـۆ دەیلێـی، بەردەوام لەلایەن ئەمپریالیستەکانەوە تەڤلی هەڤ دەکـرێ و پەنـــجەی تـــێ وەردەدەن. پرســـی کـــورد هەمیشـــە لەلایەن ئیمپریالیستەکانەوە تێکـدەدرێت". پاشـان بەو شێوەیە بەردەوام بـوو

"له ئەمریکـا، له هەنـدێك شـوێن پەیمانگـای کـوردی و بەشـی کوردۆلۆژی دەکرێتەوە، ئایا ئەوە بۆتۆ هیچ شتێك ناگەیەنێت؟". منیش له وەڵامـدا پێم گـوت "بەبۆچـوونی مـن دامەزرانـدانی ئەو پەیمانگـا کوردیـانه له ئەمریکـا چ کێشـەیەکی نییـە، وەلـێ بـۆچی پەیمانگـای لەو جـۆرە له تورکیـا نـاکرێتەوە؟ ئەوەیـان نـاواخنی کێشەکەیە بۆ من؟ بۆچی هەموو بیروبۆچوونێك سەبارەت بە کورد و کوردستان له تورکیا قەدەغەیە؟ کێشە گەورەکەش هەر ئەوەیە".

بۆچـوونەکەی دوایـی نەرمـین خـانم، هەڵوێسـتێکی ڕەخنەگـرانە نەبوو، بەڵکوو هەوڵێکی تۆمەتبارکردن بوو. وەلێ ئەو ڕامانەی ئەو، بـووە هـۆی تێفکرینـی زیـاتی مـن له مـژارەکە. بەوەی ڕاسـتییەکی کـۆمەڵایەتی کەس دەسـتی بـۆ درێـژ ناکـات و لێکـۆڵینەوە و بەدواداچـوونی بـۆ ناکـات. نەك هەر ئەوەنـدە، بەڵکـوو لەبەریشـی هەڵـدێن. لەکاتێکـدا، هەسـت بەوە دەکـرێ، ئیـدی ئەو ڕاسـتییە کـۆمەڵایەتییە له فـۆرمێکی سیاسیشـدا وردە وردە دەسـتی بە خـۆ دەرخستن کردووە. وەلێ هەرکەسێك لەو بابەتە نزیك بێتەوە، یان لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی زانستی لەبارەوە بکات، یاخود بنووسێت و بەرگری لێبکات، ڕاستەوخۆ تۆمەتبار دەکرێ و، پاشان لەکەدار و ناشـــرین پیشـــان دەدرێ. چـــونکە له ڕەخنەگـــرتن زیـــاتر، تاوانبـارکردن دەسـەڵاتدار و هێزداربـوو. له کاتێکـدا دەکـرا، بەبـێ تووڕەبـوون و هەڵچـوونیش هەنـدێك شـتی مەعقـول لەوبـارەیەوە بگـوترێ. بۆ نموونە "ئەو بۆچوونەی تۆ هەڵەیە، لەبەر ئەوەشـە کە هەڵەیە، ڕاستییەکەشـی ئەوەیە، یـان بەو شـێوەیەیە... " بەڵام لەبـڕی ئەوە بڵـێن، دەهـاتن و تاوانباریـان دەکـردی و هەڵـدەچوون و نەیاندەهێشت کەسێك تخونی بابەتەکە بکەوێتەوە.

پرۆفیسۆر دکتۆر سوعاد بیلگە، ساڵی ١٩٧٢ وەزیری دادی تورکیا بوو. لەهەمان کات مامۆستای کۆلێژی زانستە سیاسییەکانیش بوو. ئەوم لە نزیکەوە دەناسی. ئەو لە کابینەی پرۆفیسۆر دکتۆر نیهات ئەریم[١]، کە سەرۆك وەزیرانی تورکیا بوو، کاك سوعادیش وەزیری داد بوو. لە هاوینی ساڵی ١٩٧٢، مەکتووبێکی درێژ و وردم بۆ نووسی. نوسینێك بە دەست و خەتی خۆم نووسی بووم. لەوێ باسم لەوە کردبوو، زوڵم و ستەم لە کورد و زمانەکەی دەکرێ و لە هەموو لایەك پاڵەپەستۆی زۆریان دەخەنە سەر. لە کاتێکدا هەموو بیروبۆچوونێکیش لەبارەی کوردەوە لە هەموو شوێنێك قەدەغەیە. لە کاتێکدا ئەو قەدەغەکارییە، دژی ڕێکارەکانی زانست و زانین و کاری زانکۆکانن. لە نامەکە بە نووسینەوەی چەند نموونەیەك لە سکاڵانامەکانی کار پێکراو، هەوڵی پشتڕاستکردنەوەی بۆچوون و نامەکەم دابوو. مەکتوبەکەم ئەوکات لە بەندیخانەی سەربازی دۆخی لەناکاوەوە ناردبوو.

## دکتۆر عومەر کورکچوو ئۆغلوو: "ئیمپریالیزم کەپوو لە هەر مژارێك وەردا، پێویستە ئێمە خۆمانی تێکەڵ نەکەین"

---

[١] ئیسماعیل نیهاد ئەریم (١٩١٢-١٩٨٠) یاساناس و ئەکادیمیسیەن و سیاسەتمەداری تورك، لە نێوان ساڵانی (١٩٧١-١٩٧٢) سەرۆك وەزیرانی تورکیا بووە. جگە لەوەی لەچەند کابینەکی جیادا، پۆستی جێگری سەرۆك وەزیران و وەزیری لابووە. لەپاڵ ئەمانە چەند خولێکیش پەرلەمانتار بووە. (وەرگێڕ).

راســـتییە ڕەتنەکراوەکـــان و پەیوەنـــدییە واقعییەکـــان، لەگەڵ تاوانبارکردن... پەیوەندی نێوان دوو مژاری یەکەم، ببووە بابەتێك کە مێشـکمی بەخـۆیەوە سـەرقاڵکرد. پاشـان زۆر دواتـر، بە بـێ وەستان لەناو زیهنمدا گینگڵی دەدا. بە دوای وەڵامی ئەو پرسیارە دەگەڕام کە، ئەو بۆچـوونە نەرێتیـیە، هۆکـارەکەی دەبـێ بـۆچی بگەڕێـتەوە؟ چـونکە ئەگەر پەیوەنـدییە واقعیەکـان کاتێـك لەنـاو مێشـکدا گینگڵـی دا، ئیـدی بەبێ وەستان و ویستی خۆت بیری لێدەکەیتەوە. تا بتوانی شیکاری بکەیت و لێی تێبگەیت.

ئەو ڕووداوەی لەسەرەوە ویستم ڕوونی بکەمەوە، بەو شێوەیەی بۆتـانی بـاس دەکەم هـاتە بـوون: مـاوەیەك دوای ئەوەی پرۆفیسـۆر نەرمـــین عەبـــدان ئونـــات لە ژوورەکە دەرچـــوو، منـــیش لەوێ دەرچـووم و بەرەو ڕێـڕەوی کـۆلێژ چـووم. لەوێ بە ڕێکـکەوت دکتـۆر عـومەر کورکچـو ئۆغڵـووم بینـی. لەسـەر پێیـان هەنـدێك قسەمان کرد. دکتۆر لە بەشی مێژووی سیاسی مامۆستا بوو. ئەو تـوێژینەوەیەکی هەبـوو بە نـاوی (پەیوەنـدی تـورك و ئینگلیـز). کاتێك لە زیندانی ئەدەنە بووم، دەرفەتی ئەوەم بۆ هەڵکەوت تا بیخـوێنمەوە. لەوێ باسـی کـورد و سـەرهەڵدانی شـێخ سـەعیدی کردبـوو. لەگەڵ کـاك عـومەر بەیەکەوە چـووینە ژووری کـاك ئیبـراهیم. بەردەوام بـووین لەسـەر ئەو گفتوگـۆیەی دەمـانکرد، سـەبارەت بە کـورد و پەرتـووکەکەی کـاك عـومەر. منـیش دواتـر ویستم باسـی دادگاییکردنەکـانی ڕۆژهەڵات و بەرگـری نامەکـانی بکەم. ئەوەم بۆ باسکرد کە، لەوێ بەهەموو شێوەیەك ڕەخنەم لەو بۆچوونە دەگـرت کە کـورد و زمانەکەیـان ڕەتـدەکاتەوە و نکـۆڵی بوونیان دەکا. دکتۆر عومەر بە بێ ئەوەی شتێك بڵێ، گوێی بۆ

گرتبووم. تا قسەکانیشم تەواو کرد هیچی نەگوت، وەلێ لە کاتی ڕۆیشتنی، ئەمانەی گوت "کورد لەلایەن ئەمەریکای ئەمپریالیستەوە دنە دەدرێ". دەیویست بڵێ ئیمپریالیست کێشەی گەورە دروست دەکەن. کاك عومەریش گلەیی لەو ئینستیتوتە کوردیانە هەبوو کە لە ئەمریکا کرابوونەوە. منیش ئەوەم بە کاك عومەریش گوت "کێشە لە کردنەوەی بەشی کوردۆلۆژی و پەیمانگا کوردییەکانی ئەمریکا دا نییە، بەڵکوو کێشەکە لە نەبوون و نەکردنەوەی ئەو بەشانەیە لە تورکیا".

دەمویست ئەوە بەیانکەم، دۆخی کورد، دەشێ بە ڕێکار و میتۆدی زانستی لێکۆڵینەوەی لەبارەوە بکرێ. وەلێ ڕێژنەی تۆمەت و تۆمەتبارکردنەکان ڕێگرن لەبەردەم، ئەو لێکۆڵینەوانە. پاشان کاری نێهنی دەستە و ڕێکخراوە نادیارەکان لەبەردەم چارەسەرکردنی کێشەی کورد بە ڕێگای دیموکراتی و دۆخێکی هەموار بۆ موئامەرەکردن چێدەکەن. لە وەڵامدا عومەر گوتی "پێم وایە، ئیمپریالیزم کەپووی خۆی لە چ مژارێك ژەنی، پێویستە ئێمە خۆمانی تێکەڵ نەکەین". وەلێ من لەبەرامبەر ئەمەدا ئەوەم بۆ باسکرد، کە دواین کاری ئیمپریالیزم لە ناوچەکە بۆ ساڵی ١٩٢٠ دەگەڕێتەوە، ئەوکاتەی کورد و کوردستانیان بەسەر چەندان پارچە دابەشکرد.

## پرۆفیسۆر دکتۆر کۆرکوت بۆڕاتۆڤ: "هەموو دەوڵەتێك ڕێکاری خۆپاراستنی خۆی هەیە".

دوای ئەوەی سەردانی کاك ئیبراهیمم کرد، پرسیاری پەرتووك و نووسراو و گۆڤار و ڕۆژنامەکانی خۆمم لەو کرد. ئەویش لەوبارەیەوە بێ ئاگایی خۆی پێ ڕاگەیاندم و گوتی "تەنیا پەرتووکەکانی ئەردۆغان لێرەیە. ئەو کتێبانەی لەسەر ئەو ڕەفەوە دەیبینی، پەرتووکەکانی ئەون". بەڵام بۆ زانینی شوێنی ئەوانەی من، پێشنیازی ئەوەی بۆ کردم تا لەگەڵ بەڕێوەبەری مەکتەبی ڕاگەیاندنی زانکۆ قسە بکەم.

کاتێك چوومە لای عەلی جانی بەڕێوەبەر و خۆم پێناساند. ئەوەم بۆ باسکرد کە لە مانگی شەشی ساڵی ١٩٧١، لە کۆلێژی زانستە سیاسییەکان دەستگیر کرام. ئەوسا لە نهۆمی چوارەمی بەشی ڕاگەیاندن دادەنیشتم. ئەو ژوورەی بەسەر بەشەناوخۆیی جمهوریەت دەیڕوانی. پرسیاری پەرتووك و ڕۆژنامە و دەفتەر و شتەکانی دیکەم لێکرد، ئاخۆ چیان بەسەر هاتووە. کاك عەلی یەك لایەنە منی دەناسی، بۆیە بە ئاسانی لەیەك گەیشتین. جا بۆ ئەوەی پەرتووك و گۆڤارەکانم ڕادەستکاتەوە، چووینە ژێرزەمینی باڵەخانەکە، لەوێش بۆ بەشی کۆگا. کاك عەلی گوتی "کەلوپەلی کەسانی ئەکادیمسییەنی زانکۆم لێرە هەڵگرتووە، ناوەناوەش چەند برادەرێك هاتوون و بەشێك لە پەرتووك و گۆڤار و ڕۆژنامەکانیان بردووە". لە کۆگاکە دەستم بە گەڕان کرد، وەلێ ئەو جانتایەم نەدۆزیەوە کە شتەکانم لەناو دانابوو. لەوێ گۆڤاری کۆلێژی

زانستە سیاسییەکان بەهەموو لایەکدا پەرش و بلاو ببۆوە. وەلێ ئەوانە نەبوون کە من بەدوایدا وێڵ بووم.

لەگەڵ کاك عەلی بەیەکەوە لە کۆگاکە دەرچووین. ئەو گەڕاوە هۆدەکەی خۆی. منیش ئیدی کارێکم نەمابوو لەوێ. لە کاتی دەرچوون، لە ڕێڕەوی دەرگای چوونە دەرەوە، پرۆفیسۆر دکتۆر کۆرکوت بۆراتۆڤم بینی. جەنابیان منی داوەتی ژوورەکەی کرد. ئەو ژوورەکەی لەبەشی دواوەی باڵەخانەکە بوو. شوێنێکی بێ پەنجەرە، لەسەر باخچەی دواوەی کۆلێژی زانستە سیاسییەکان.

لەسەرەتای سالانی حەفتاکان، کۆرکوت بۆراتۆڤ، پەیامنێری ڕۆژنامەی (لۆمۆند) بوو. سەبارەت بە ڕووداوێکی هاوینی ساڵی ١٩٧١ کە لە بەندیخانەی دۆخی لەناکاوی دیاربەکر ڕوویدابوو، هەندێك زانیاریم پێدا. لەوێ هەندێك لە برادەرانی کۆمەڵەی کولتووری شۆڕشگێڕی ڕۆژهەلات سەرقاڵی ئامادەکردنی بەرگرینامەیەکی سیاسی بوون. داواکارە گشتیەکانی دادگاش لە لێپێچینەوەکانیاندا، لەو داوانامانەی ئامادەیان کردبوو، نکۆڵییان لە بوونی نەتەوە و کۆمەڵگای کوردی دەکرد. هەموو شتێکیشیان لەوبارەیەوە ڕەتدەکردەوە. هەروەها پشتگیری ئەو بۆچوونەیان دەکرد، کە کورد لە بنەچەدا تورکن. دەیانگوت "هیچ زمانێك نییە بەناوی زمانی کوردی. ئەوەی پێی دەڵێن زمانی کوردی، بنەچە سەرەتاییەکان و ڕەگ و ڕیشەکەی زمانی تورکییە". بۆیە هەر بۆچوون و بیروباوەڕێکی دیکەی پێچەوانە، لە دەرەوەی ئەوەی کورد و زمانی کوردی لە دەرەوەی تورکایەتی و زمانی تورکی بنوسرێ و بگوترێ، بە تاوان هەژمار دەکرێ. ئەو داواکارە

گشتیانە، بنەمای تۆمەتبارکردنەکانیان لەسەر ئەو بنچینەیە دەنووسی. بۆیە لە دژی ئەو بۆچوون و ڕامانەی داواکارە گشتیەکان، بەشێك لە برادەرانی کۆمەڵەی کولتووری شۆڕشگێڕانی ڕۆژهەڵات، بەرگریان لە بوونی نەتەوە و کۆمەڵگای کوردی دەکرد. وەك چۆن ئەوەیان ڕەتدەکردەوە کە زمانی کوردی ڕەگ و ڕیشە بنچینەییەکەی زمانی تورکی بێت. بەڵکوو زمانی کوردی، زمانێکی سەربەخۆیە. لە کاتی دادگایی کردنەکاندا ئەوان هەوڵی گوتن و دەربڕینی ئەو بۆچوونانەی خۆیان دەدا بەرامبەر دادگا. بۆ ئەمەش ئامادەکارییەکی چڕیان کردبوو. لە ڕژێمی دوازدەی ئازار لە ساڵی ١٩٧١، ئەو پێشهاتەم زۆر بەگرنگ زانی بوو، بۆیە لەوێ دەمێدا ڕووداوەکەم بە وردی بۆ کاك کۆرکوت ناردبوو، بەڵکوو مژارێکی باڵکێش بێت بۆ ڕۆژنامەی لی مۆند، تا نووچەیەکی لەبارەوە سازکا. هەتا نموونەیەکیش لە بەرگرینامەکەم بۆ ڕەوانە کردبوو. چونکە چەند هەواڵێکی لەو چەشنەمان گەیاندبووە میدیا تورکییەکانیش، بەڵام ڕۆژنامە تورکییەکان هیچ نوچەیەکیان لەسەر دروست نەکردبوو. بەڵکوو بە پێچەوانەوە، ئەوان خۆیان لێ نەبان کردبوو و چاو و گوێ و زاری خۆیان لەهەمبەر وەها پێشهاتێك داخستبوو. کاتێك کاك کۆرکوتم بینی، ئەو ڕووداوانەم هاتەوە بیر، بۆیە بە پێویستم زانی تا ئەوەی لێ بپرسم، ئاخۆ زانیارییەکانیان کردە هەواڵ یان نا؟ پرۆفیسۆر کۆرکوت لەوان ڕۆژاندا، تازە لە ئەفریقاوە گەڕابۆوە. پێم وابێ لە کۆنگۆ وەکوو ڕاوێژکار و شارەزا لە فەرمانگەی پلان دانان کاری دەکرد. لە ڕاستیدا هەواڵەکەم لە ڕێگای ڕۆژنامەکانەوە خوێندبۆوە. هەتا، هەواڵێکی بچووك سەبارەت بە گەڕانەوەی ئەویش بڵاوکرابۆوە.

کاك کۆرکوت باسی چۆنیەتی کارکردنی خۆی لە کۆنگۆ دەکرد. منیش باسی دادگاییەکانی دۆخی لەناکاوی دیاربەکر و بەرگرینامەکانی خۆم کرد، بەرامبەر بە دادگا سەربازییەکان. پاشان باسی دۆخ و گوزەرانی گرتووخانەکانم بۆ کرد. دەمویست ئەوە بۆ ئەویش باس بکەم، دەشێ لە ڕێگای میتۆد و تیۆرە زانستییەکان، لێکۆڵینەوە بۆ دۆخی کورد و زمانەکەی بکرێ، لەهەمبەر ئەو پێداگیری کردنەی بۆچوونی فەرمی دەوڵەت، بۆ نکۆڵی لێکردن لە کورد و زمانی کوردی. ئێمە ئەو گفتوگۆیانەمان وەك دوو کەسی ئەکادیمی و هاوپیشەی یەکدی دەکرد، کە چەندین ساڵ بەسەر لەیەك دوورکەوتنەوەیان تێپەڕی بوو. پاشان گوتم "ناتوانین نۆکڵی لە بوونی زمانی کوردی بکەین؛ کۆمەڵگای کوردیش بە هەمان شێوەیە". پێم وابێ ئەو بۆچوونەم چەند جارێك دووبارە کردبۆوە، بۆیە کاك کۆرکوت بەرامبەر ئەوە گوتی "ئێ، جا ئەگەر ئاوا بێ چییە؟..."

دوای ئەو ڕستەیەی، هەستم بەوە کرد، مامۆستا کۆرکوت قەڵس بووە بە بۆچوونەکانم. بۆیە بە پێویستیشم نەزانی بڵاوبوونەوە یان نەبوونەوەی ئەو هەواڵەی لێ بپرسم، کە کاتی خۆی لە گرتووخانەوە بۆم ناردبوو. بەڵام بەڕاستی بەو هەڵوێستەیانەوە بەرامبەر بە دۆزی کورد حەپەسام، بۆیە گوتم "ئەگەر قەدەغەیەك هەبێ و، قەدەغەییەکی نادادپەروەرانە بێ، بە دڵنیاییەوە پێویستە بخرێتە بەر نوکی ڕەخنە و بەدواداچوون. چونکە دەبێ بەرامبەر بە ناحەقیەکان خۆمان کوێر و کەڕ نەکەین و بووەستینەوە". وەلێ ئەو لە وەڵامدا گوتی "سەبارەت بەو قەدەغەکارییانەی باسی دەکەی، هەموو دەوڵەتێك، بۆ پاراستنی خۆی، کۆمەڵێك ڕێکار دەگرێتەبەر... ".

وەڵامە کـورت و بەرِێـکەرەکەی مامۆسـتا کۆرکـوت، ئەوەی گوتی "ئێ، جا ئەگەر ئاوا بێ چییە؟..." زۆر کاری لێکردم. دواتر، زۆر بیرم لەو هەڵوێسـت و ڕستەیەی کـردەوە. وەك ئەوەی بیـر لە ڕێگـای لادێـیەك بکەیـنەوە. بیهێنـنە بەرچـاوی خۆتـان، لەسـەر ڕێگاکە، بەلووعەیەکی ئاو هەیە، بەڵام بۆرِیەکەی شکاوە و ئاوەکە بەردەوام دەڕژێتە سەر شەقامەکە. ئەوەی بەوێدا تێپەڕ دەبێ، سوود لەو ئـاوە دەبینـێ و بـۆ زۆر شـت بەکـاری دەهێنـێ. جـا بـۆ ئەوەی هەموو کەسێك سوودی لێ ببینێ، جامێکیشیان لەبەردەم بەلوعەکە دانـاوە. ئەگەر هەمـوو کەسـێك، هەر کەی ویسـتی بەقەد ئەوەی دەیەوێـت سـوود لەو بەلـوعەیە ببینێـت، واتـا ژیـان بەشـێوەیەکی سروشتی بەردەوامە. واتا هیچ کێشەیەك لە گۆڕێ نییە. یان با وا بیـر بکەیـنەوە کە ڕووبەڕووی دۆخێکـی وەهـا دەبیـنەوە: لە ڕێگـا پێویستیمان بە ئـاوە و لای ئەو شـوێنەی ئـاوەکەی لێیە لادەدەیـن. نزیکـی بەلـوعەکە دەکەویـنەوە و دەسـتمانی بـۆ درێـژ دەکەیـن تـا قومێك ئـاو بخۆینەوە، لە پڕ دەنگێك دەڵێ "قەدەغەیە و لێرە ئاو خواردنەوە تابۆیە". ئەو دەنگە ڕێگر دەبێ لە خواردنەوەی ئاوەکە، بە بەهـانەی ئەوەی قەدەغەیە. لە کاتێکـدا ئـاوەکە هەمـان ئـاوە و بەلووعەکەش نەگۆڕاوە. چونکە ساڵەهای ساڵە، لە ڕێگای چوون و هـاتنی ئەو گونـدە هەمـان ئـاو و بەلـووعە هەبـووە. لەوێ هەمـوو کەس بینیـویەتی و بەکـاری هێنـاوە، بەڵام لە پـڕ، قەدەغە دەکـرێ. ئەمەش ئەوە دەگەیەنـێ کە ئیـدی ژیـان بە شـێوەیەکی سروشـتی بەردەوام نییە و دەستێك خراوەتە بەر ڕێڕەوی ئەو ئاوەی دەچێتە سـەر ڕێگـاکە. بـۆیە ئەوسـا پێویسـتە ئەو قەدەغەکـارییە لە ڕێگـای زانسـتەوە لێـی بکۆڵـدرێتەوە. بە بۆچـوونی مـن کـورد و زمـانی کوردی و دۆخی کورد لە تورکیا بەو شێوەیە.

بەلای منەوە، خوێندن و قسەکردن و خوێندنەوە و نووسین و فێرکردنی زمانی دایك بۆ هەموو کەسێك و هەموو زمانێك مافێکی سروشتی مرۆڤەکانە. چونکە مافێکی ئاسایی هەموو کۆمەڵگایەکە. بە پێچەوانەوە، قسەکردن و نووسین و خوێندنەوە و گوێگرتن، بە زمانی دایك کاتێك قەدەغە دەکرێ، ئەوسا ئەو ڕێڕەوە سروشتییە تێکدەچێ. هەموو قەدەغەیەك دەبێ توێژینەوە و لێکۆڵینەوەی لەبارەوە بکرێ. چونکە چارەسەرنەکردن و هێشتنەوەی دۆخەکە بە قەدەغەکراوی، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ، بە تێپەڕبوونی کات، خۆی دەخزێنێتە ناو قالبێکی سیاسی و، ئەوسا وەك پرسێکی ڕامیاریش دەبێتە هاوکێشەیەکی حەتمی و واقیعی.

## پرۆفیسۆر سەها مەرای و ئەکادیمیای میکرۆکۆسمۆگرافی

ئەوکاتەی لە گرتووخانەی ئەدەنە بووم، چەند نامەیەکم سەبارەت بە چەند وتارێکی پرۆفیسۆر سەها مەرایی و جاهید تالاس نووسی. لەناوەڕۆکی مەکتوبەکە هەندێك هزر و بۆچوونی خۆم، سەبارەت بەو وتار و ستوونە ڕۆژنامەوانییانەی بلاویان کردبۆوە، بەیان کردبوو. لەوێ ڕەخنەم لە هەندێ بۆچوونی ئەو مامۆستایانە گرتبوو دەربارەی زانست و زانکۆ و سەربەخۆیی بیرکردنەوە و ڕێکارەکانی لێکۆڵینەوەی زانستی. منیش باسی ئەوەم بۆ دەکردن، کە بنەماکانی جێبەجێکردنی کاری زانستی و توێژینەوە و ڕێکارە میتۆدیەکان و دەرخستنی ڕاستییەکانی ناو کۆمەڵگا بە شێوەیەکی بێلایەنانە، کارێکی گرنگ و پیرۆزە. وەلێ

لەبارەی دۆز و دۆخی کوردەوە، ئەو ڕێبازانە نەخراونەتە ناو کاری زانستی میتۆدەکانی تویژینەوە. لەبەر ئەوەی چەندان میکانیزمی جیا، ڕێگری لەوەها پێنگاڤێکی زانستی و کەسانی ئەکادیمی دەگرن. لەسەرووی هەمووشیانەوە، بۆچوونی فەرمی دەوڵەت بەرامبەر بەو پرسە، ڕێگریەکی سەرەکییە. هەر کەس و لایەنێکیش ڕەخنە و تێبینی هەبێ لەسەر ئەو پرسە، بە توندترین شێوە سزا دەدرێ و هەڕەشەی مەترسیداری لێدەکرێ.

لە پایزی ساڵی ١٩٧٤، لە کۆلێژ، ڕۆژێك لە ڕێڕەوی ناو باڵەخانەی مێژوو، لەگەڵ پرۆفیسۆر سەها مەرای تووشی یەك بووین. مامۆستا پەیوەندییەکی توندوتۆڵ و گەرمی لەگەڵ قوتابیان و مامۆستا یاریدەدەرەکان هەبوو. لە نزیکەوەش ئاگاداری ئەوە بووم، زۆر هاوکاری ئەو کەسانەی دەکرد کە لە کۆلێژ پێویستیان پێی بوو؛ بۆ منیش هەر وابوو. ساڵی ١٩٦٠، کاتێك لە ئەرزڕوومەوە هاتمە ئەنقەرە، زۆربەی کات لە کۆلێژ یەکدیمان دەبینی. قسە و باسی گەرم و خۆشمان دەکرد. مامۆستا ساڵی ١٩٦٧ هاتبووە ئەرزڕووم، ئەودەمیش زۆر گەرموگوڕ بوو لەگەڵ من. وەلێ لە دواین یەکتر بینینماندا، وەك جاران و ساڵانی پێشوو دەرنەدەکەوت. ئەوێ ڕۆژێ ساردوسوڕیەکی تەواوی پێوە دیار بوو. لەگەڵ مامۆستا بەیەکەوە چووینە ژوورەکەی خۆی. هەڵپەی ئەوەم دەکرد تا بزانم، ئاخۆ ئەو نامەیەی گەیشتۆتە دەست کە لە بەندیخانەوە بۆم نووسی بوو؟ چەند خولەکێك دواتر وەڵامەکەم وەرگرت، بۆیە ویستی ئەوەم هەبوو لەبارەی نامەکەوە قسەی لەگەڵ بکەم. وەلێ ئەو نەیدەویست لەسەر بابەتەکە بدوێ، چونکە دەیویست دەلاقەی مژارەکە بە داخراوی بمێنێتەوە. بە ڕوانین و

هەڵوێست و تۆنی دەنگی ئەوەم بە ئاشکرا هەستپێکرد. چونکە کردنەوەی ئەو مژارە لەلایەن منەوە، مامۆستای ناڕەحەت کردبوو. بۆیە منیش درێژەم پێنەدا و لە ژوورەکە دەرکەتم. لەبەر ئەوەی نەمدەویست پێداگیری لەسەر گفتوگۆیەکی وا بکەم، کە کەسی بەرامبەرم حەزی پێ نەکات. لە کاتێکدا نزیکەی ٣ ساڵ دەبوو کاك سەهام نەبینی بوو. ئەویش خۆی لەوە لە خەت دەدا کە من سێ ساڵە لە بەندیخانەم.

گەلێك شاگەشکە بووم بەوەی، مامۆستا سەها، نەیویست قسەوباس لەبارەی ئازادی بیروباوەڕ و مژارەکانی ناو زانکۆ بکات. لەکاتێکدا ئەو، کەسێك بوو، بە چڕی کاری لەسەر ئەو پرسانە دەکرد. لە ناو پەرتووکەکەی بەناوی *F. M. Cornford, Microcosmographia Academica* نووسینێکی هەیە بە ناوی (کێشە بنچینەییەکانی زانکۆ) لەوێ زۆر جەختی لەسەر ئەوە کردبۆوە کە ئازادی هزری پڕ گرنگە و ناکرێ وەکو پرسگرێکی سادە پشتگوێ بخرێ. هەر لە پەرتووکەکەیدا چەندین وتار و نووسینی خۆی کە لە ڕۆژنامەکانی (جومهوریەت و میللیەت) بلاو کردبۆوە، جارێکی دیکە لە پەرتووکەکەی شوێنی پێدابوون. نووسینەکانی سەبارەت بە کێشەکانی زانکۆ بوو، بۆیە نەدوانی سەبارەت بەو پرسانە، منی حەپەساند.

چەند مانگێك دواتر، بە مەبەستی سەردانیکردنی، هەمدیسان چوومەوە ژوورەکەی. دەمویست لەسەر ئەو پرسانە لەگەڵی بدوێم، کەلەسەرەوە باسم کرد. لەوێ دکتۆر دویگو سەزاریشم بینی. لەوێ دەمێدا دکتۆر سەزار، پەرتووکەکەی خۆی بەناوی

(بۆچـوونی گشـتی و سیاسـەتی دەرەوە) تـازە بڵاوکردبـۆوە. کە چوومە ژوورەوە باسی ئەو پەرتووکەیان دەکرد. لە سەردانەکەی ئەویّ ڕۆژێشدا دەرفەتی ئەوەم بۆ چێنەبوو، لەوبارەیەوە گفتوگۆی لەگەڵ بکەم. ڕاستتر بڵێم، مامۆستا دەرفەتی ئەوەی نەڕەخساند، لەبارەی وەها مژارێکەوە بدوێین.

لە ڕۆژێك لەو ڕۆژانەی لە سەرەوە باسم کرد؛ هەمدیسان لە کۆلێژ تووشی پرۆفیسۆر دکتۆر جاهید تالآس بووم. مامۆستا جاهید لە پەیژەکانەوە دەهاتە خوارێ، منیش بە پێچەوانەی ئەو. کە بینیم، ئەویش بەرامبەرم زۆر سارد و سوڕ بوو. هەتا دەیویست خۆی لە بینینی من نەبان بکا. ڕاستە کاك جاهید لەگەڵ خوێندکاران و مامۆستایانی یاریدەدەر، زۆر نێوانی گەرم و خۆش نەبوو، لەگەڵ ئەوەی بەردەوام خاوەن ڕوویێکی گرژ بوو، بەڵام بۆ کەسێك کە مامۆستای یاریدەدەر بێ لە هەمان کۆلێژ، کە نزیکەی سێ ساڵ لە کونجی زیندان بێ و تازە دەرچووبێ، پێم وابێ هەندێك پەیڤی مرۆڤدۆستی گوتنی زەڕووڕەتە. منیش چاوەڕوانی هەندێك ڕستە و پەیڤی ئاوام لە مامۆستا دەکرد. کاك جاهید یەکێك بوو لە بەڕێوەبەرانی ڕێکخراوی تورکی لە نەتەوە یەکگرتووەکان. هاوکات لە گۆڤاری (فۆرم) و چەند ڕۆژنامەیەکی وەکوو (ئۆنجوو و میللیەت و جومهوریەت و بارش) سەبارەت بە مافی مرۆڤ و ئازادی بیروباوەڕ نووسینی بڵاودەکردەوە. بۆیە ئەگەر مامۆستایەکی یاریدەدەر، ئەگەر بە هۆی نووسین و پەرتووك و ئەو وانانەی لە پۆل باسی کردوون، کەوتبێتە زیندانەوە، پێم وابێ دەبێ بە گەرمتر هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکرێ.

مامۆستاکان هەندێك بۆچوونی خۆیان لەسەر چەند بابەتێك لە ڕێگای نڤیسی ڕۆژنامەوە دەهێنا زمان. وەلێ خوازیاری بیستنی ڕەخنە نەبوون. ئەوەندەی لێکدانەوەشم بۆ ئەو هۆکارە کرد، ئەنجامەکەی تەنیا ئەوەبوو، کە پرسەکە تایبەتە بەکورد و زمانەکەی، بۆیە ئاوا هەڵسوکەوتیان دەکرد. چونکە ئەوان دەیانویست، تا دەکرێ لەو مژارە خۆیان بە دوور بگرن و سەروکارو قەڵەمەکانیان تێکەڵ بەو باسە نەکەن. بەڵام ئەمە هەرگیز لەگەڵ ڕێکارە زانستییەکان یەکانگیر نەبوو، چونکە چاوپۆشی کردن لە قەدەغەیی هزری، ئاخۆ لاواز کردنی توانای زانست نیە؟ بەڵام مامۆستاکان خۆیان لە وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارەش بە دوور دەگرت. ئەوەشم بە ئاشکرا هەست پێدەکرد. لە کاتێکدا من، هەرگیز بیرم لەوە نەکردووەتەوە، ئاخۆ باسکردنی ڕاستییەکان سەبارەت بە گەلی کورد و ڕەخنەگرتن لە بۆچوونی فەرمی دەوڵەت لەمبارەیەوە، تا چەند دەبێتە هۆی دروستکردنی ئاریشە و سەرئێشە. چونکە من لەو باوەڕەدابووم، بۆچوونی زانستی و میتۆدەکانی، دەتوانێ بەسەر بۆچوونی فەرمی دەوڵەت سەرکەوێ و بگاتە ڕاستی و دروستی بابەتەکان. وەلێ ئەوەی من بینیم ئاوا نەبوو.

لە سەرەوە ئاماژەم بەوە کرد، پرۆفیسۆر دکتۆر ئیبراهیم یاسا زۆر بە گەرموگوڕی منی وەرگرتەوە. وەك چۆن هەریەکە لە پرۆفیسۆر فەهمی یاڤوور و پرۆفیسۆر جەواد گەرایی و پرۆفیسۆر ڕوشەن کەلەشیش باوەشێکی گەرمیان بۆ کردمەوە. لەگەڵ ئەوەی چەند برادەرێکی دیکەش بەهەمان شێوە خۆیان لێ نەبان نەکردم و بە دەم و لفتێکی خۆش، بەخێرهاتنەوەیان کردم.

## باسنەکردنی پرسی کورد، لە زانکۆ تورکییەکان!

لــە ســەردەمی ڕژێمــی دوازدەی ئــازار، لە ســاڵی ۱۹۷۱، ژمارەیەکی زۆری خوێنـدکار و مامۆستای یاریـدەدەر و کەسـانی ئەکـادیمی، لە کـۆلێژی زانسـتە سیاسـییەکان و کۆلێژەکـانی دیـکە، دەستگیرکران. لە ساڵی ۱۹۷٤، کاتێك لێخۆشبوونی گشتی دەرکرا، هێشـتا بەشـێکی زۆری ئەو بـرادەرانە لە بەنـدیخانە بـوون، بە بـێ ئەوەی سزاکانیان دەرکرابێ. دۆسیەی ئەو گرتوانە، یان لە دادگای دۆخـی لەناکـاو بەڕێوەدەچـوو، یـانیش دادگـای بـاڵای سـەربازی. هەنـدێك لەو سـزایانەی بەسـەر بـرادەرانیش سـەپێندرابوو، لەلایەن دادگـای بـاڵای سـەربازییەوە هەڵوەشـێندرابۆوە. بـۆیە بەشـێك لەو هاوڕێـیانە، دووبـارە دادگـایی دەکـرانەوە. بەشـێکی زۆری ئەوانەی باسیان دەکەم، لە زینـدان دەرچـوون و گەڕانەوە سـەر کـاروئەرکی خۆیـان، وەلـێ بەشـێکی کەم نەیـانتوانی بگەڕێـنەوە سـەر شـۆلی خۆیـان لە زانکـۆ. دکتـۆر ئوغـور مومجـو[1] و دکتـۆر دۆغـوو

---

[1] ئوغـور مومجـو (۱۹٤۲-۱۹۹۳) ڕۆژنامەڤـان و نووسـەری بە بـنەچە ڕۆمـی، بە دانـانی بۆمـب لەنـاو ئۆتـۆمبێلەکەی خـۆی لەبەر دەرگـای مـاڵەکەی لە ئەنـقەرە، تیرۆرکرا و کردەکەش لەلایەن جەبهەی جوڵانەوەی ئیسلامی لە ئەستۆ گیردرا. دۆسیەی ئوغور مومجو لەناو فایلی تاوانی بکەر نادیارەکانی تورکیایە و تا ئێستا بکەرانی دەستگیر نەکراون. بە پێی زانیارییە نا فەرمییەکانی بێ، مومجوو بەهۆی نووسـینی چەنـد پەرتووکێـك لەسـەر چەنـد مژارێکـی هەسـتیار بەلای دەوڵەتەوە، بـووەتە قوربـانی. جـگە لەمە مومجـوو بەر لە کوشـتنی، سـەرقاڵی ئەنجامـدانی توێژینەوەیـك بـووە لەسـەر پرسـی کـورد و پەیوەنـدی پـارتە کوردییەکـان لەگەڵ ڕێکخستنی نهێنی چەند وڵاتێك. (وەرگێڕ).

پەرینچەك[1] و دکتۆر ئۆیە سەنجار نەگەڕانەوە زانکۆ. ئەوانە لەناو میدیا درێژەیان بە کارکردن دا. لەهەمان کات تیکەڵی چالاکی سیاسی بوون.

من حوکمم بەسەردا سەپێندرابوو، بۆیە کاری نەکردە بوو تا بگەڕێمەوە کۆلێژ. بۆ وەرگرتنەوەم تەنیا یەك ڕێگا هەبوو، ئەویش وەکوو هەمووکەسێك دەبێ دووبارە بەشداری ئەزموونی وەرگرتنم کردابا، پاشان شانسی وەرگرتنم هەبوو. تاقیکردنەوەکە تایبەت بوو بە وەرگرتنی مامۆستایانی یاریدەدەری بەشی کۆمەڵناسی لە ساڵی ١٩٧٤. زۆر بەربژێر خۆیان ناونووس کردبوو تا بچنە ناو ئەو ئەزموونەوە. جا تەنیا بۆ بەشی کۆمەڵناسی نا، بەڵکوو بەشەکانی دیکەش مامۆستای یاردەدەریان وەردەگرت. لە بیرمە، هەریەکە لە دکتۆر دۆغوو ئەرگیل و ئارتوون ئونساڵیش بەشداری تاقیکردنەوەکانیان کرد. من پێم وابوو ئەو دوو مامۆستایە، بەشداری ئەزموونەکان دەکەن، بۆ وەرگرتنەوەیان لە بەشی سیاسەت. بەر لە چوونە ناو تاقیکردنەوە، لەبەر دەرگای هۆڵەکە لەگەڵ دکتۆر ئارتون لەسەر پێ هەندێك دەمەتەقێمان کرد. ئەو لە نێوان مانگی پێنج و شەشی ساڵی ١٩٧٣، خەریکی

---

[1] دۆغوو پەرینچەك لە دایك بووی ساڵی ١٩٤٢ شاری عەنتابە. نووسەر و سیاسەتمەدارێکی تورکە و سەرۆکی پارتی (ڤەتەن)ە لە تورکیا. پەرینچەك تا ئێستا سەرۆکی چەند پارتێکی وەکو (پارتی کرێکارانی کوێلەی تورکیا و پارتی سۆسیالیست و پارتی کرێکاران) بووە. ساڵی ٢٠١٨ بەربژێری پارتەکەی بوو بۆ پۆستی سەرۆك کۆماری تورکیا، بەڵام دەنگێکی زۆر کەمی هێنا. پەرینچەك یەکێکە لەو سیاسەتمەدارانەی خاوەن هزری شۆڤێنی تورکیە و دژایەتیەکی ناڕاستەوخۆی گەلی کورد دەکات. (وەرگێڕ).

ئامادەکردنی تویژینەوەیەك بوو لەسەر (دوژمنداری خوێن). ئەو زانیارییەشم لە ڕێگای هەواڵی ڕۆژنامەیەکەوە خوێندبۆوە. لەوێ شارەکانی ڕوها و دیاربەکر و مێردینی وەکوو نموونەی مەیدانی لێکۆڵینەوەکەی هەڵبژاردبوو. لەوبارەیەوە دکتۆر مەحمود تەزجانیش تویژینەوەیەکی نزیك لەوەی هەبوو. نوچەی ئەو لێکۆڵینەوەیەشم لە یەکێك لە ڕۆژنامەکان خوێندبۆوە، کاتێك لە بەندیخانەی سەربازی دۆخی لەناکاوی دیاربەکر، منیان بردە زیندانی ناو شووراکانی دیاربەکر. بۆیە لەگەڵ کاك ئارتوون لەوبارەیەوە هەندێك بیروبۆچوونمان گۆڕییەوە. کاتێك ئەنجامەکانی تاقیکردنەوەکە بلاو کرایەوە، پێیان ڕاگەیاندم کە لە ئەزموونەکە سەرکەوتوو نەبوومە. ئەوانەی هەڵسەنگاندنیان بۆ ئێمە دەکرد، هەمان ئەو مامۆستایانە بوون، لەگەڵ من بەر لە ٣ ساڵ لە هەمان کۆلێژ کاریان دەکرد، بەڵام ئیدی دۆخەکە زۆر گۆڕابوو. بەو پێیەی گۆڕانکارییە سیاسییەکان بلەز کاریگەریان لەسەر زانکۆ دروست دەکرد. هەوڵەکان بەو ئاڕاستەیە بوون، تا کێشەی گەلی کورد نەخزێندرێتە ناو زانکۆ تورکییەکان و وەك چۆن پرسەکە، لەوەش ڕێگریی لێ دەکرا تا بچێتە ناو پارتە سیاسییە تورکییەکانەوە... ئەو سیاسەت و بۆچوونەی دەوڵەت، لەسەر ئەو مژارە، ئیدی گەیشتبووە سەر هێسك، زۆر کات لە چەندان شوێن دەگەیشتە ناو موخیش.

ئەوەی ڕاستی بێت، ژیانی ئەکادیمیم لە زانکۆ، لە گەڵ دەستگیرکردنەکەی ساڵی ١٩٧١ کۆتایی هاتبوو. ئیدی هیچ ڕووناکیەك لە ئاسۆی زانکۆ بەدی نەدەکرا، تا من بتوانم لێکۆڵینەو و تویژینەوەی لێ بکەم. جگە لە دەستگیرکردنەکەم، ئەو

بەرگرینامانەی لە دادگاییەکانی ڕۆژهەڵات کردبووم سەبارەت بە خۆم و ئەو پرسانەی لەسەری دەستگیرکراوم، وەك بەرگری کردن لە مافی گەلی کورد و ڕەخنەگرتن لە بۆچوونی فەرمی و پێداگری لەسەر هەندێك مژاری هەستیار کە بەلای دەوڵەتەوە بقەبوو، ئیدی هۆکار بوون بۆ داخستنی دەرگای زانکۆ بە ڕووی مندا. ئیدی لەوە تێگەیشتبووم هیچ هیوایەك بەو شوێنە نەماوە کە پێی دەڵێن زانینگە. بۆیە ئیدی منیش وەکوو پێشوو، ئەوەندە پەلەپرووزێی گەڕانەوەم نەبوو بۆ زانکۆ. بەڵکوو بە پێچەوانەوە، ئیدی کەڵکەڵەی ئەوە کەوتبووە سەرم، تا کار لەسەر ئەو مژارانە بکەم بۆ توێژینەوە، کە زانست لە تورکیا چۆن چۆنی و بە چ شێوازێك دەڕوات بەڕێوە. هاوکات ئەو مژارانەی ڕەخنە لە بۆچوونی فەرمی دەوڵەت دەگرن. بۆ ئەمەش پێویستیم بە کاتێکی درێژ و زۆر بوو. ئەمەش تەنیا کاتێك دەستمدەکەوت، ئەگەر هیچ ئەرك و کارێکم نەبا و بە تەنیا بام. بۆیە دوای زانکۆ، هەوڵی ئەوەم نەدا تا لە شوێنێکی دیکەش دەست بە کار بکەمەوە.

وەدات دالاکۆی، لە ساڵی ١٩٧٤، سەرۆکی شارەوانی گەورەی ئەنقەرە بوو. بە شێك لەوانەی دوای دەرچوونیان لە زیندان، نەیانتوانی بگەڕێنەوە سەر کارەکانی خۆیان، بە هاوکاری کاك وەدات، لە بەشی جیا جیای شارەوانی دەستیان بە کار کرد. تایلان ئەرتەن لە بەشی پەیوەندییەکانی ڕاگەیاندنی ئەوێ کاری دەکرد. شەباب بیلگچیش، لە فەرمانگەی هونەری سەر بە شارەوانی شۆلی دەکرد. لە زستانی ساڵی ١٩٧٢، لە زیندانی دۆخی لە ناکاوی دیاربەکر، ماوەیەك بەیەکەوە مابووینەوە. ئەویان لەگەڵ جونەید ئاکاڵن و چەند برادەرێکی دیکە، بەیەکەوە هێنایانە

لامان. لەگەڵ شەباپیش نزیکەی ساڵ و نیوێك لە نێوان ساڵانی ١٩٧١-١٩٧٣ بەیەکەوە بووین لە گرتووخانە.

لە یەکێك لە ڕۆژەکانی کۆتایی ساڵی ١٩٧٤، لەسەر شەقامی ئانافارتالار، کاك تایلانم لەبەردەم باڵەخانەی سەرۆکایەتی شارەوانی ئەنقەرە بینی. لەوێ ئەوەی پێگوتم "نزیکەی ١٢ کەس لە سەرۆکایەتی شارەوانی وەکوو دەستەی ڕاوێژکاران کار دەکەن. تۆش دەشێ لەگەڵمان کار بکەی، بۆ ئەمەش ئەگەر فۆرمی وەرگرتن پڕبکەیتەوە، ڕەنگە وەڵامێکی ئەرێنیت بۆ بێتەوە". بەشی پەیوەندییەکانی ڕاگەیاندن، بەرامبەر ژووری سەرۆکی شارەوانی بوو. ئەوێ ڕۆژێ کاك وەداتم لە کاتی دەرچوون لە هۆدەکەی خۆی بینی و لە دوورەوە سڵاوێکمان لە یەك کرد. بۆیە شەباپ پێی وابوو، ئەگەر لە هەر بەشێکی شارەوانی ویستی کارکردنت هەبێ، پێم وانییە داواکەت ڕەت بکاتەوە. وەلێ ئەو دەستپێشخەری و داوایانەم بەلاوە گرنگ نەبوو، چونکە خۆم بە دوای کاردا نەدەگەڕام. بۆ ئەمەش نەمدەویست هیچ هەوڵێك بدەم. وەك باسم کرد، پێویستیم بە کاتێکی زۆر بوو، بۆ ئەو توێژینەوەیەی لە خەیاڵمدا گینگڵی دەدا. بۆیە ئەو قسانەش هەروا لەگەڵ با بردینی. چونکە پێشم وابوو، سەرۆکی شارەوانی هیچ مژارێك نەبوو تا لەگەڵ من ڕاوێژی لەبارەیەوە بکات.

لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٤، بەر لەوەی تاقیکردنەوەی وەرگرتنی مامۆستای یاریدەدەر بکرێ، ناوە ناوە سەردانی کۆلێژم دەکرد و لەوێ لەگەڵ کاك ئیبراهیم و کاك فەهمی و کاك جەودەت یەکدیمان دەبینی. دە ڕۆژێك بەر لە ئەنجامدانی ئەزموونەکە، لە

ژوورەکەی کاك ئیبراهیم چەند کەسێکی بێگانە و تازەم دەبینی. ئەوان بە شلەژاوی لەناو کۆلێژ دەهاتن و دەچوون. ئەوان سێ کەس بوون، هەر سێکیشیان بەیەکەوە دەسوڕانەوە. جا چەند جارێك بینیم، دەچوونە ژووری مامۆستاکانی دیکەش. وەك چۆن بینیم، چوونە ژووری ڕاگری کۆلێژیش. وەلێ پرسیاری ئەوەم لە کاك ئیبراهیم نەکرد، ئەوانە کێنە و چی دەکەن و مەبەستیان چییە لەو هاتوچۆیانە. بەڵام کاك ئیبراهیم خۆی پێی گوتم "ئیسماعیل، بە هیچ شێوەیەك نایانەوێت بگەڕێیتەوە زانکۆ. دژەبەرییەکی گەورە هەیە لە بەرامبەرت... وەلێ تۆ سوور بە لەسەر ئەوەی بەشداری ئەو تاقیکردنەوەیە بکەیی و سارد مەبەوە و پشتگوێی مەخە. دوای ئەو قسانەی منیش، بنکۆڵی بۆ ئەو پرسە مەکە و وەك ئەوەی گوێت لە هیچ نەبووبێ، بەردەوام بە لەسەر هەوڵەکانی خۆت".

دوای ئەمە بە شێوەیەکی فەرمی پەیوەندییە فەرمییەکانم لەگەڵ زانکۆ و کۆلێژ بچڕا. وەلێ ناوە ناوە، لە پەیمانگا سەرم لە کاك ئیبراهیم دەدا. ڕۆژێك لەوان ڕۆژانەی دەچوومە ئەوێ، ژمێریاری ئەوێ ویستی ئەوەی هەبوو تا مژارێکم بە بیر بهێنێتەوە "نزیکەی چوار ساڵە، هیچ پارەیەك نەخراوەتە سەر سندوقی خانەنشین بوونەکەت. ئەگەر ئەوە تا پێنج ساڵ بەردەوام بێت، ناتوانی داوای ئەو مافە خوراوانەت بکەیتەوە و مافەکانت دەگەڕێتەوە ناو خەزێنە. بۆیە بەر لەوەی ببێتە پێنج ساڵ، دەتوانی ئەو موچە بڕاوانەت وەربگری، کە دەبێ بچێتە ناو سندوقی خانەنشین بوونت... یاخود بەر لەوەی ببێتە پێنج ساڵ و دووبارە بویتەوە فەرمانبەری حکومی، دەتوانی بخرێتە سەر سندوقی خزمەتی کۆمەڵایەتی...". کاتێك ئەو برادەرە باسی ئەو شتانەی کرد، من تا ئەوسا، بە خزمەتی

سەربازییەوە، نزیکەی نۆ ساڵ خزمەتی حکومیم هەبوو.

دەمویست هەرچی مافی خۆم هەیە، لە سندوقی خانەنشینبووم وەربگرم و ئیدی هیچ پەیوەندییەکم بەوانیشەوە نەمێنێ. لەوبارەیەوە برادەرێکی شارەزا گوتی "ئیسماعیل، مافی خانەنشین بوونی خۆت وەرمەگرەوە، وەلێ لە رێگەی عەریزەیەکی نووسراوەوە، داوای هەڵگرتن و پاراستنی مافەکەت بکە لە سندوقی خانەنشینی. بەو شێوەیە ئەگەر تەمەنت گەیشتە ٦٥ ساڵ، بە کەمترین مووچەش بێ، بەڵام ناچار دەبن خانەنشینت بکەن... " زۆر مناقەشەم لەسەر پێشنیازەکە نەکرد و ساڵی ١٩٧٥ پەیوەندییەکانی خۆم لەگەڵ سندوقی خانەنشینیش بڕی. لەو بارەیەوە هەستم بە خۆ کەمزانی نەکرد. ئەو پارەیەی وەرمگرت نزیکەی ٦٠٠٠ هەزار لیرەبوو، بەرامبەر خزمەتی نۆ ساڵ. لەوێ ڕۆژێوە، تا ئەمڕۆ، هیچ پەیوەندییەکم بە فەرمانگەی خانەنشین بوون و فەرمانگەی دیکەی لەو شێوەیە نەماوە و ڕدێتمان لە ڕدێتی یەك بووەتەوە.

لەبەر ئەو کارانەی کردم، دۆسیەی خۆم لەسەر مێزی ڕاگری کۆلێژی زانستە سیاسییەکان و سەرۆکایەتی زانکۆی ئەنقەرە بینی. وەلێ کە بینیم شاگەشکەبووم. لەبەر ئەوەی دۆسیەیەکی ئەستوور و قەڵەو بوو. جا هەموو شتێکیان تێ ئاخنی بوو. بۆ نموونە، سکاڵانامەکان و بڕیارەکانی دادگا و ڕاگەیەندراوەکانی دادگای باڵای سەربازی و ڕێنماییەکانی میت. باسی چیبکەم، چونکە دۆسیەکە بە هیچ شێوەیەك بە دۆسیەی مامۆستایەکی زانکۆ نەدەچوو.

## پرۆفیسۆر موبەجەل کرای: "پزیشکچی ئەوەت هەرگیز بیر نەچێ، کە زانستی پاقژ و ڕاست نییە."

ئیدی بەشێوەیەکی فەرمی، لە دەرەوەی بازنەی زانکۆ بووم. وەلێ جار نا جارێك، سەردانی کۆلێژم دەکرد. وەکو گوێگر، بەشداری کۆڕبەند و سیمینارەکان دەبووم. وەلێ بەردەوام بووم لەسەر لێکۆڵینەوەکانی خۆم لەسەر میتۆدە زانستییەکان، بە تایبەتیش لەسەر دیاردەگەرایی. بەردەوام و لە هەموو شوێنێك، پێداگیریم لەسەر پابەندبوونێکی ڕاستگۆیانە لەبارەی دیاردە دەکردەوە. بەردەوام ئەو بابەتەم لە مێشکی خۆم دەهێنا و دەبرد. ئیدی دوای خوێندنەوە و گوێگرتنێکی زۆر، هەوڵی دۆزینەوەی وەڵامی ئەو کێماسیەم دەدا کە لە نێوان زانست و بۆچوونی فەرمی دەوڵەتدا هەبوو.

لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٧٦، باڵوولەرمانگەی گشتی پەیمانگای (تورکیا – ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست) لە ئەنقەرە، سیمینارێك سەبارەت بە مژاری کۆمەڵناسی کارگێڕی سازدەکرا. پێم وابێ لە ناوەڕاستی مانگی دە بووین. سمینارەکە لەسەر ڕۆڵی قسە ڕۆیشتوو و کاربەدەستانی کۆمەڵگای عوسمانی و جڤاتی تورکی بوو. بۆ نموونە ڕۆڵ و کاریگەری موفتی سەردەمی عوسمانیەکان لەسەر کۆمەڵگا و پەیوەندییەکانیان بە پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکانەوە. هەروەها باس لە چەند پرسێکی وەك مۆدێرنیتە و بیرۆکراسی، ڕێکخراوەکانی ناو پێکهاتە کۆمەڵایەتیەکان و چەند مژارێکی دیکەی هاوشێوە دەکرا و گەنگەشەی لەبارەوە دەکرا. بەر لە دەستپێکی سمینارەکە، ناوی ئاخێڤەران و ناونیشانی پانێلەکان بلاوکرابۆوە. ئیدی زانیارییەکانم لەسەر ئەو جۆرە سمینارانە، لە

ڕێگای ئەو هاموشۆیانەی کۆلێژەوە دەزانی. ئەو ڕۆژەی بڕیار بوو سمینارەکەی لێبکرێ، بەیانییە زووەکەی، چوومە پەیمانگای فەرمانگەی گشتی. دەمویست وەکوو گۆهەدارێك بەشدار بم، چونکە هاتن بۆ هەمووان بوو.

زۆر کەس بەشداری کۆنگرەکەیان دەکرد و من لە زووەوە دەمناسین. هەندێکیشیان لە ڕێگای نووسین و پەرتووکەکانیانەوە، ئاشنای ناوەکانیان بووم. لەوانە دکتۆر ئیلبەر ئۆڕتایلی، دکتۆر مەتە تونچای، پرۆفیسۆر ئەمرە کۆنگار، پرۆفیسۆر موبەجەل کرای، دکتۆر بۆزکورت گوڤەنچ، پرۆفیسۆر ئۆنەدەر ئار، پرۆفیسۆر شەریف مێردین، دکتۆر جەواد گەرای، دکتۆر ئیلتەر توران، دکتۆر چیدەم کاغزچی باشی، دکتۆر ئایشە ئۆنجو، دکتۆر عومەر بۆزکورت، پرۆفیسۆر مەتین هەپەر، پرۆفیسۆر شەوقی گولەر، دکتۆر مەتین کازانجی، دکتۆر جۆشکون سان، دکتۆر بارلاس تۆلان، دکتۆر گەنجای شایلان، دکتۆر سامی گوڤەن، دکتۆر ئیلکەی سونار، دکتۆر سەڤیل ئاتاوز، پرۆفیسۆر کورتهان فیشەك، و دکتۆر نیهات گوندوز...

لەگەڵ کردنەوەی سمینارەکە، یەکەم کەس ئیلبەر ئۆڕتایلی، بابەتێکی پێشکەشکرد. لەوێ باسی کۆمەڵگای عوسمانی و پێکهاتەی خێزان لە سەردەمی عوسمانیەکان و دامەزراوەی دادگا و قازیەکانی سەردەمی عوسمانیەکانی کرد. دوای ئەو، پرۆفیسۆر دکتۆر موبەجەل کرای دەستی بە پێشکەشکردنی مژارەکەی خۆی کرد. سەرەتاش بەوە دەستی بە قسەکانی کرد، کە زۆر سەرسام بووە بە وتەکانی ئیلبەر ئۆڕتایلی. هەروەها باسی گرنگی دیاردەی ناو کۆمەڵگای عوسمانی و خێزانی عوسمانی و ژیانی ڕۆژانەیانی

کـرد. وەك چـۆن باسـی ئەوەی دەکـرد، ئەوە زۆر گـرنگە، کە دیاردە بە بێ ئەوەی بە لاڕێدا ببردرێت، شیکردنەوەی بۆ بکرێ. هەروەها ناشێ ویست و حەزەکانمان لە شوێنی دیاردەکان جێگیر بکرێ.

ئەوەی ڕاسـتی بـێ، ئەو ڕسـتانەی دوایـی، زۆر سـەرنجیان ڕاکێشـام. سـا ئەو ئاخـافتنەم بیـرکەوتەوە، کە دوو سـاڵ بەر لەو سمینارە، لە کۆلێژی زانستە سیاسییەکان لەگەڵ پرۆفیسۆر نەرمین ئابـادان کردبوومـان. ئەو قسـەیەی ئەو کە باسـی لەوە دەکـرد، بزوتنەوەی کـوردایەتی لەلایەن ئیمپریالیسـتەوە دەجولێنـدرێ؛ وەك چۆن هەرکەسێکیشی تاوانبار دەکرد کە، ئەو مژارە دەجولێنێت و ویسـتی ئەوەی هەیە کـاری لەسـەر بکـات. هەر لەوێ، ئاخـافتنی نێـوان خـۆم و دکتـۆر عـومەر کورکچـو ئۆغلـوو و پرۆفیسـۆر کۆرکوت بۆراتاڤیشم بیر کەوتەوە. ئەوەی کە خۆیان لە دیاردە و ڕاسـتییەك نەبـان دەکـرد و لە شـوێنی ئەو، باسـیان لە واقیعەتـی بۆچوونی فەرمی و فەرمانەکانی دەوڵەت دەکرد.

دوای ئەو دوو بابەتەی پێشکەشکرا، ناوبڕێك درایە سمینارەکە. بەشـێکی زۆری ئامـادەبووان، چـوونە نهـۆمی سـەر شـوێنی کۆڕبەندەکە، یانی سەر بانی باڵەخانەکە. لە ناوبڕەکە چا داندرابوو بۆ خواردنەوە. لەوێ بەشداربووان و ئاخێڤەرانی سمینارەکە، لەسەر پێ بەیەکەوە خەریکی دەمەتەقێی کورت کورت بوون. هەریەکەو باسـی ئەوەی بـۆ ئەوەی دیـکەی تەك خـۆی دەکـرد، کە چیـان لەگەڵ یەك کـردووە و چـوونەتە کـوێ بـۆ گەڕان و سـوڕان و پیاسـەکردن. منیش لەوێ لەگەڵ چەنـد برادەرێك چـاك و چۆنیم

کرد. هۆڵەکە تژی خەڵك بوو، دەنگە دەنگێکی زۆر و ناوەناوەش قاقای چەند کەسێك لە پاڵ یەك دەهاتە بەر گوێ. بە شێوەیەك ئیدی دەنگی کەنینەکان ئەوەندە بەرز ببۆوە، موجەبەل خانم ناچار بوو بڵێ "دەنگە دەنگ و غەڵبەغەڵبێکی زۆر هەیە، ئەو هەڵاو هۆریایەش هەمووی لەبن سەری مەتەیە... ". ئەو وشەیەی کۆتایی (لە بن سەری) زۆر سەرنجی ڕاکێشام و منی بردەوە سەردەمی زارۆکی. چونکە کاتی خۆی، لە ناوچەی ئیسکیلیپ، کاتێك منداڵ بووین، ئەو دەستەواژەیەمان لە یاری کردن زۆر بەکاردەهێنا. منیش دوای ئەو وتەیان، لە موجەبەل خانم نزیك بوومەوە و باسی ئەو کێشە و مژارانەم بۆکرد، کە لە هزرمدا بە بێ وەستان دەخولانەوە و بە خۆیانەوە مژوولیان کردبووم.

لەگەڵ موجەبەل خانم ئاوا سەری قسانم کردەوە "مامۆستا منیش گوێم لە ئاخافتنی ئیلبەر بوو. وەك چۆن گۆهداری قسەکانی جەنابیشتان بووم سەبارەت بە چەمکی دیاردە. بە دڵنیاییەوە کارکردن و لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو چەمکە، بەبێ لایەنگیری و بەلاڕێدابردن، کارێکی زێدە گرنگە، لەو بارەیەوەش هیچ گومانێکم نییە. بەڵام نەبینینی ئەو چەمکەش وەك خۆی شۆڵێکی زۆر هەڵەیە. وەلێ شتە ڕاستە گشتییەکان، هەموو کات ناچنە بواری جێبەجێکردنەوە. وەك چۆن هەموو سات، ئەو ڕاستیانە، وەك خۆی کاریان لەسەر ناکرێ. بۆ نموونە، لە پرسی کورددا، بە چاوێکی بابەتیانە لە دۆزەکە نزیك نابنەوە. بە ڵکو بە پێچەوانەوە، بەرامبەر ئەو مژارە بەردەوام نکۆڵیکردن و ڕەتکردنەوە و تاوانبارکردن ترۆپکی هەموو شتێکی گرتووە..."

هەروەها ویستم باسی ئەو گفتوگۆیەش بۆ موجەبەل خانم بکەم، کە لە نێوان من و پرۆفیسۆر نەرمین ڕوویدابوو. بۆیە بەو شێوەیە درێژەم بە قسەکانم دا "کاتێك باسی پرسی کوردم بۆ نەرمین خان کرد، دوای بیستنی تووشی هەڵچوونێکی دەروونی بوو. پاشان تاوانباری کردم. لە کاتێکدا لە بری ڕەخنەگرتن، تاوانبارکردن ڕێکارێکی هەڵەیە. چونکە ڕەخنەگرتن دەبێتە هۆی ڕۆشنکردنەوەی ڕێگای بەردەممان. لە کاتێکدا تاوانبارکردن و بە کەم زانین، دەبێتە هۆی ئەوەی نەتوانین بەشێوەیەکی زانستیانە لە چەمکی دیاردە بگەین و شیکردنەوە بۆ پەیوەندییەکان و کاریگەرییەکانی بکەین لەسەر کۆمەڵگادا. بۆیە بەلاڕێدابردن و نەبینین و بە هیچ هەژمارکردنی هەر دیاردەیەکی ناو کۆمەڵگا، پێچەوانەی ئەو بنەما زانستیانەن کە باست کردن...". هەروەها لەوە دەدوام، ئاخۆ چۆن دەتوانین باشتر بیربکەینەوە و چۆن هەڵسوکەوت بکەین و بۆچوونمان چی بێت، لەسەر ئەو بابەتە. بەڵام لە پڕ مامۆستا موجەبەل توڕەبوو، پاشان زۆر بە توندی و بە هاوارکردن گوتی "بێشکچی مێشکت کۆبکەوە سەر یەك، زانستی پاقژ و ساف بوونی نییە، هەندێك ڕاستی هەن، دەبێ بەردەوام لەبەرچاویان بگرین و لە بیریان نەکەین".

دەنگە دەنگی ناو هۆڵەکە، وەك دەنگێکی نا ڕۆن دەهاتە بەر گوێ. ئیدی لە ماوەیەکی کورت ئەوێ چۆڵ بوو و هەر کەسەوە گەڕاوە شوێنی خۆی. ناوبڕەکە خۆشی کورت بوو. وەلێ من بەردەوام بووم لەسەر ئەوەی کە دەبێ دیاردەکانی ناو کۆمەڵگا و ڕاستییەکان وەك ئەوەی هەیە ببیندرێت و بەڕاستی و لۆژیکی زانستی و دوور لە کاریگەری هیچ لایەن و بۆچوونی دیکە،

کاری لەسەر بکرێت. بە تایبەتی ڕەخنەگرتن لەو بۆچوونەی ئەو ڕاستیانە بەلاوە دەنێ و بە نەبوویان لە قەڵەم دەدا. ئیدی لەبەرامبەر ئەم قسانەم موجەبەل خانم وەك وەڵامێك گوتی "ناتوانی ئاوا هەڵسوکەوت بکەی، وەك ئەوەی هیچ ڕێسا و ڕێکارێك لای دەوڵەت بوونی نەبێت. بۆیە ناچاری، ئەو ڕێکار و ڕێسایانە لەبەرچاوی بگری. وەك گوتم، زانستی بێ خەوش و ڕاست بوونی نییە. ئیدی ئەوە لە مێشکی خۆت بچەقێنە. من ئەوشتانەم پێشووتریش بۆ باس کردبووی، بۆم ڕوونکردبوویەوە. پێداگیریش لەسەر هەڵە، چەقبەستوویی پێدەڵێن لە زانستدا... ".

ئەوەی موجەبەل خانم باسی کرد، دۆخێکی زۆر خەمهێنەر و بێ ئومێدی بوو. دوای پێنج ساڵ، یەکەمجار بوو موجەبەل خانم دەبینی. ئەو مامۆستایانە، لە بری ئەوەی لە حاڵ و ئەحواڵ و ژیانی زیندانم بپرسن و دڵنەواییم بدەنەوە، ڕق و قینی خۆیان پێ هەڵدەڕشتم و بەسەر خۆمدا دەیانشکاندمەوە و سەرکۆنەیان دەکردم.

ئەو بۆچوونەی پێی وابوو زانستی باقژ و ساف بوونی نییە، جا گوتنەوەی بە زمانێکی توند و پڕ لە قین، منی زۆر سەرسام کرد. وەك چۆن بووە هۆی ئەوەی ماوەیەکی زۆریش بیر لە دەربڕین و ڕستەکانی بکەمەوە. چونکە من دەمویست پێچەوانەکەی بڵێم و بە پێچەوانی ئەوانەوە باسی تواناکانی زانست بکەم. بەوپێیەی لەوبارەیەوە خاوەن جەرباندن و پاشخانێکی چاك بووین.

ساڵی ١٩٧٤، سەرەڕای هەموو ئەو شتانە، هێشتا بە شێوەیەکی دروست و ڕەوان، خاوەنی مەعریفە و زانیاری نەبووم دەربارەی زانست و ئایدۆلۆژیای فەرمی و ئازادی ڕەخنەگرتن و ئازادی

بیروبۆچوون و قەدەغەیی بیرکردنەوە. بۆ ئەمەش نەمدەزانی چۆن و لەکوێ لە ڕێگای ئەو زانیاری و زانستەی هەیتم، بەرگری لە بۆچوونەکانم بکەم. پێم وابوو لەهەڤ نەکردنی زانست و بۆچوونی فەرمی ئاشکراو و کراوەیە، وەلێ نەمدەتوانی ئەوە بە هێسانی دەرببڕم. زمانم بەرامبەر بەو پرسانە هێشتا تەتەڵەی دەکرد.

هەرچۆنێك بێت، دەمویست گوێگری بەشەکانی دیکەی سیمینارەکە بم. وەلێ ئامادەی هەموویان نەبووم. چونکە کارێکی بچووکم لە کۆلێژی زانستە سیاسییەکان هەبوو. ڕۆژێکی وابوو، کەش و هەوا باراناوی بوو. لە ڕێگا، ئاو لە قۆرتە قۆڵەکانی ناو ڕێگا کۆببۆوە. بۆیە بە پێ ڕۆیشتن لە ڕێگا و پەڕینەوە لە بەرێکی شەقامەکەوە بۆ بەرێکی دیکەی، کارێکی زەحمەت و گران بوو. ماوەیەکی زۆریش لە خاڵی وەستانی پاس وەستام. واتە وەك ئەوەی بیرم لێی کردبۆوە، چوون و هاتن بۆ کۆلێژ زیاتر لەو کاتەی خەیاند کە بۆیم دانابوو. کاتێك گەیشتمەوە ناو هۆڵی سمینارەکە، دکتۆر ئایشە ئۆنجوو وتارەکەی لەسەر تەواو بوون بوو.

***

سەرەتای ساڵی ١٩٧٨، لە ئەنقەرە، لە ژێر ناونیشانی (وەبەرهێنانی بچوك لە پیشەسازیدا) سیمینارێك لەلایەن ژووری ئەندازیارانەوە ڕێکخرا. لەوێ هەریەکە لە سیاسەتمەداران و کۆمەڵناسان و ئابووریناسان و مێژوونووسان و مامۆستایانی بەشی سیاسەت بەشداریان تێدا دەکرد. لەوێ هەریەکە لە پرۆفیسۆر موجەبەل کرای و دکتۆر ئیلبەر ئۆرتایلی وەکوو ئاخێوەر

بەشداربوون. ئەکادیمیسەکان لەوێش پێ پسانەوە باسیان لە گرنگی دیارەدە و حەقیقەتی ناو کۆمەڵگا دەکرد.

## هەڵوێست، بەرامبەر ئایدۆلۆژیای فەرمی

ئەو پەیوەنـدییەی لەگەڵ مامۆسـتاکانم بەسـەرمداهات، وای لە مرۆڤ دەکرد، جارێکی دیکە بیر لە چەمکی ئایدۆلۆژیای فەرمی بکـاتەوە. بۆچـوون و ئایـدۆلۆژیای فەرمـی، وەکـوو ئایـدیای دیـکە نیـیە. چـونکە ئەوە بۆچـوون و ئایـدۆلۆژیایەکە، کە بە سـزاکانی دەوڵەت پارێزگاریی لێ دەکرێ. بۆیە هەرکاتێك ویستتان ڕەخنە لە بۆچـوونی فەرمـی بگـرن، چـاوەڕوانی ئەوەش بـکەن، تـا سـزای ماددی و مەعنەوی دەوڵەتتان بەرامبەر جێبەجێ بکرێ.

پرۆفیسـۆر نەرمـین عەبـدان و پرۆفیسـۆر مـوجەبەل کرایـی و پرۆفیسۆر دکتۆر کەمال کارپات، هەر سێکیان مامۆستای بەرێزی بەشی زانستە مرۆڤایەتیەکان بوون. هەرسێکیشیان پسپۆری زانستی سیاسـەت و مێـژوو و کۆمەڵناسـی بـوون، وەلـێ هەر سێکیشـیان بەردەوام لە هەوڵـی گـوتنی ئەوەدابـوون، کە ناشـێ ڕەخـنە لە بۆچوون و ئایـدۆلۆژیای فەرمـی بگیردرێـت. ئەمەش بە ئاسـانی لە وەڵامـی نیقاشـەکانیاندا دەردەکەوت. ئەرێ، ڕاسـتەوخۆ ئەوەیـان نەدەگوت کە بۆچوونی فەرمیان وەکو خۆی پەسندە و ڕەخنەی لـێ نـاگرین، بەڵام بۆچـوون و ئاخافتنەکانییـان شـاهێدی ئەو بۆچوونەی من بوون.

پێویستە شتێکی دیکەش سەبارەت بە پرۆفیسۆر دکتۆر نەرمین

عەبــدان و پرۆفیســۆر مــوجەبەل کــرای بڵــێم. هەردووکیــان لە سەردەمی خوێندکاری و لەو سەردەمەی کە مامۆستای یاریدەدەر بووم، زۆر هاوکارییان کردووم. ڕەنجیان بە گەورە دەبینم، بۆیە سوپاســگوزاری هەردووکیــانم. وەلــێ کاتێــك مــژاری کــورد و دۆزەکەی دەهاتە بەرباس، هەموو شتێك سەرەوژوور بۆوە. نازانم بۆ ئەوەش چ ڕوونکردنەوەیەك بنووسم.

## خۆنەبانکردن، لەهەمبەر پاڵەپەستۆکانی سەر بیرمەندان، پەسەندکردنی سیاسەتەکانی ئایدۆلۆژیای فەرمییە

زانسـت واقعیـیە، سـا، زانسـتە مرۆڤایەتییەکـان بـن، یـان ئەوانـی دیکە. واقیعیەتی زانست، پەیوەندییەکانی نێوان دیاردەکان شرۆڤە دەکات. وەلی بۆ چێکردنی پێشنیارێکی زانستییانە، بەر لە هەموو شتێك، پێویستە حەقیقەت وەك خۆی ببینین و بەلاڕێیدا نەبەین. واتە گـرنگە نـاوی هەمـوو شـتێك و دەزگـایەك و کۆمەڵگـایەك و نەتەوەیەك بە ناوی خۆی یاد بکەینەوە و بیهێننیە سەر زاران. بۆ نموونە ناوهێنانی کورد بە کورد، گرنگی خۆی هەیە. لە ژیانی سیاسـی و کۆمەڵایەتیـدا، دەبـێ هەمـوو مـژار و ڕووداوێکـیش لە هزری توێژەردا ئامادەگی هەبێ. بۆ نموونە دەبێ پرسی کورد و زمـانی کــوردیش لەو هــزرەدا بخــولێتەوە. وەك چــۆن دەشــێ، لێکۆڵەر، کار لەسەر عەرەبەکانی فەڵەستینیش بکا. یان کار لەسەر تـوێژی گەنجـان بـکەن، یـانیش کۆمەڵگاکـانی باشووری ئەفریقیا بخەنە بەر میتۆدەکانی توێژینەوەی. بەڵام لێکۆڵینەوە لەسەر کورد،

بۆ توێژەران زۆر لۆژیکی ترە، بەتایبەت کە لەناو وڵاتی خۆیاندان و ناتوانن درێژە بە ژیانی خۆیان بدەن. هەردوو مامۆستاش زۆر بە ئاشکرا نەیاندەگوت "ئەو مژارانە لێیان ڤەناکۆڵدرێ". وەلێ دژی هەموو بۆچوون و بیر و ڕوونکردنەوەیەکن لەو بارەیەوە. پاشان دەیانگوت "ئەو مژارە لەلایەن ئیمپریالیزمەوە دەجولێندرێ" یان "ناشێ بە لەبەرچاونەگرتنی ڕێکارەکانی دەوڵەت، تـوێژینەوە بکەین". جا بە کورتی، ڕێکارەکانی دەوڵەت، واتا بۆچوونی فەرمی دەوڵەت. ئەویش قەدەغەی بیرکردنەوەی داناوە سەبارەت بەو بابەتانە. بەڵام بۆچوون و هەڵوێستی قەدەغەکاری دەربارەی عەرەبی فەڵەستین و خەڵکی باشووری ئەفریقیا و چەچەنەکان دانانێ. بەڵام هزر و باوەڕ سەبارەت بە پرسی کورد بە هەموو شێوەیەك بڤەیە دەست دەسووتێنێ دەکات.

یەژن "ناتوانی، خۆت بێ هەمپا بکەی بەرامبەر ڕێسا و ڕێکارەکانی دەوڵەت و پێوەرەکانی". ئەمەش بەو مانایە دێ، کە دەبێ خۆمان لەگەڵ بۆچوونی فەرمی دەوڵەت بگونجێنین. بەڵام ئەگەر وابێت چۆن دەشێ گونجان لە نێوان واقعیەتی زانست و ئەو قەدەغەکارییانە بنیاد بنرێت؟ چونکە ئاوێتە بوون و لەهەڤکردنی ئەو دووە بەیەکەوە، چاوەڕوانییەکی بێ هوودەیە. ئەی باشە لە هەمبەر ئەو هەموو قەدەغەکارییە، دەبێ هەڵوەستەی زانستە مرۆڤایەتییەکان چۆن بێ؟ ئایا سەرشۆڕکردنە بۆ ئەو قەدەغەکارییانە، یاخود شیکردنەوە و تێگەیشتن و توێژینەوە لەسەر بابەتە واقعیەکان و گەیشتنە بە ئەنجام؟ جا بە دڵنیاییەوە دەبێ ئەوەی دووەم هەڵبژێرین. وەلێ ئاشکرایە، بۆ کارکردن لەسەر ئەوەی دووەم و گەشەپێدانی، دۆخەکە پڕ مەترسییە بۆ ئەو بابەتە.

لەلایەکی دیکەوە، تایبەتمەندیەکانی تورک بوونی پرۆفیسۆرەکان و هەڵوێست وەرگرتن بە پێی ئەو ئیمتیازی تورک بوونە، شتێکی پێ پەردە و لەبەرچاوانە. لە کاتێکدا دەبێ ئەوەش بڵێن، ئەوان خۆیان هەست بە بوونی ئەو ئیمتیازە ناکەن لە نەستی خۆیاندا. بۆیە چاوەڕێی ئەوە لەو پرۆفیسۆر و ئەکادیمییانە ناکەم، تا بەرگری لە بۆچوونەکانی من بکەن. چونکە ئەگەر هات و بەرگرییان لەوە بکردبا کە منیش مافی دەربڕینی بۆچوونەکانی خۆم هەیە، کارێکی گرنگ دەبوو. ئیدی هەڵوێستە گشتیەکان لەسەر ئازادی دەربڕینی هزریدا بەو شێوەیە بوو.

ڤۆڵتێر (١٦٩٤-١٧٧٨) لە سەدەی هەژدە لە کاتی گفتوگۆیەکیدا بە دژەبیرێکی دەڵێ "من هاوبۆچوون نیم لەگەڵت. وەلێ لە پێناو دەربڕینی بۆچوونەکانت، ئامادەم گیانی خۆم بەخت بکەم... ". بەڵام لە سەت ساڵی بیست و یەکدا، کاتێك مافەکانی مرۆڤ و بۆچوونی زانستی ئەوەندە پێشکەوتووە، بۆچی ئەو هەڵوێستەی ڤۆڵتێر لەبەرچاو ناگیردرێ؟ بۆیە لێرە لە سەردەمێکی ئاوادابن، هەمدیسان بە ئاشکرا، لە بری بۆچوون و تێگەیشتنی زانستی، هێزی داپڵۆسینی بۆچوونی فەرمی پێشەنگی هەموو شتێکە.

وەك ئەوەی لەبەشەکانی پێشووش باسکرا، پرۆفیسۆر دکتۆر کەمال کارپات، سەبارەت بەوەی کە لە بارەی ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتەوە دەدوێم، گوتبوی "بێشکچی بە ئاگاهێنەرەوەی دۆزی کوردە. بۆیە بە هیچ کلۆجێك قبووڵکراو نییە...". هەر بۆیەشە بەشێکی زۆری ئەکادیمییەکان ئەوەیان بە ئاسایی دەبینی، کە لە سیمینار و کۆبوونەوە زانستییەکاندا، پۆلیس هێرش بکاتە سەر

شوێنەکە و ئاخێوەری ناو کۆڕبەندەکە دەستگیر بکات و لەگەڵ خۆی بیبات. جا بۆ ئەوەی دۆخێکی وەها نەیەتە پێش، دەبێ دژی قەدەغەکاری ئازادی بیر و بۆچوون بووەستینەوە، وەلێ ئەکادیمیەکان لە بڕی ئەوە، لە هەڵوێست و ئایدیاکانی خۆیان پاشەکشەیان دەکرد و پێشنیازی بێدەنگیان بۆ دەکردم.

ڕۆڵ پێدانێکی ئەوەندە زۆر بە قەدەغەیی فیکر، لەهەمبەر گرنگی پێدانێکی ئاوا زۆر بە ئایدۆلۆژیای فەرمی، چیمان بۆ دەردەخا؟ بە بۆچوونی من دەرخەری ئەوەیە کە قەدەغەیی زیاد بوون لەسەر هزر، واتا خنکاندنی ناوەندی زانستی لەلایەن ئایدۆلۆژیای فەرمیی و خالی کردنەوەی ناوەڕۆکە گرنگەکەی زانست بە گشتی.

نەبوونی ئازادی دەربڕینی بۆچوون، واتا نەبوونی زانست و زانکۆ. ئەگەر ئازادی فیکر نەبێ، زانستیش بوونی نابێت. جا ئەگەر ئازادی بیر و ڕا نەبێ، ئازادی ئەکادیمیش هیچ قیمەتێکی نییە.

نووسینی پەرتووکی قەبە قەبە، بە تەنیا دەرخەری بوونی زانست نییە. چونکە زانست بۆ ئەوەیە تا ڕاستییەکان بخاتەڕوو. یانیش ڕاستکردنەوەی هەڵەیەکی فیکرییە، کە چەندین ساڵ بە شێوەیەکی گشتی بە ڕاست زانراوە، یان داندراوە. جا بە تەنیا فێربوونی پەرتووکێکی گەورەی فیزیایی، یان فێرکردنی ئەو پەرتووکە بە کەسانی دیکە، بە تەنیا مانای زانست ناگەیەنێت. وەك چۆن پەرتووکێکی کۆمەڵناسی یان مێژوویش بە تەنیا، فێربوون و فێرکردنی بایەخی زانستی نییە. چونکە ئەوەی لەو پەرتووکانە نووسراوەتەوە، پێشتر لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی زانستی لەسەر

کراوە. بۆیە زانست بریتییە لەوەی، بۆ دەرخستنی بابەتی تازە، توێژینەوەی تازە بەردەوام بێ. بۆیە لە هەرشوێنێك ئەگەر هێلە گشتیەکانی ئایدۆلۆژیای فەرمی، ڕێگاکانی بیرکردنەوە و زانست و هونەری دیاری کرد، ئەوا لەو کۆمەڵگایە، گەیشتن بە حەقیقەت و دەرخستنی ڕاستییەکان کارێکی ئاسان نابێ. ئەمە بە شێوەیەکی گشتی بۆ سەرجەم بەشەکان ڕاستە، بە تایبەتی بۆ بەشی زانستە مرۆڤایەتیەکان. چونکە لەژێر ناوی زانست، لە زانستە مرۆڤایەتیەکاندا، دەشێ دووبارە ئایدۆلۆژیای فەرمی بەرهەم بهێندرێتەوە. وەلێ ئەگەر زانستێکی دروست بکەین، ئەوە تەنیا بە لەبەرچاوگرتنی مەترسیەکان دەشێ ئەو کارە بکرێ.

ئەو مامۆستایانە، تەنیا لەبەر ئەوەی باسی کوردم دەکرد، پێیان دەگوتم "بە هیچ شێوەیەك تۆ ڕاستییەکان نابینی و بوویتە کەسێکی چەق بەستوو..." ئەو ڕاستییەی من نەمدەبینی و ئەوان دەیانبینی، بریتی بوو لە نکۆڵی کردنی بۆچوونی فەرمی لەسەر کورد و هەڵوێستە لەناوبەرەکانی. کاتێك باسی ساڵانی ١٩٧٠ دەکەین، ڕاستییەکان بریتی بوون لە ماددە قانوونیەکانی (١٤١-١٤٢) ئەو دوو ماددەیە چەند سزایەکی ماددی بوون سەبارەت بە قەدەغەیی بیر و بۆچوون. ئەوان بە گوتنی "ناتوانی خۆت لەوە نەبان بکەیت، وەك ئەوەی دەوڵەت نەبێت" بە مانای ئەوە دەهات (پەرستشی ئەو حکوومەتە بکە). ئەمڕۆ پرسی کورد و کوردستان، گرنگترین مژاری تورکیایە. واتە هەم لە سیاسەتی ناوخۆ، هەمیش لە سیاسەتی دەرەوە پڕ بایەخترین پرسی ئەو وڵاتەیە. ئەمڕۆ چۆن بە بێ گومان دۆخەکە ئاوایە، ساڵانی حەفتاکانیش هەر وابوو. وەلێ

لەبەر زوڵم و سیاسەتە چەوتەکان، ئەوسا مژارێك بوو کە زۆر قسەی لەبارەوە نەدەکرا.

بەرامبەر ئەو تایبەتمەندیانەی لە دۆزی کورد و کوردستان هەبوو، پێیان دەگوتم "تۆ ڕاستییەکان نابینی، چەقبەستووی، چاوت بکەوە و ڕاستییەکان ببینە... ". ئیدی بەو شێوەیە تاوانباریان دەکردم. واتە ئەوسا منیان وەك گالیلۆ[1] تاوانبار دەکرد، وەك چۆن بەویان دەگوت "بە بێ وەستان دەڵێی گۆی زەوی بە دەوری ڕۆژدا دەسوورێتەوە و ڕاستییەکانی کڵێسا نابینیت...".

کاتێك باس دەهاتە سەر کورد و کوردستان، باسیان لەوە دەکرد، بۆچی ئەمریکا پەیمانگای کوردۆلۆژی دەکاتەوە. ئەوان بەو قسەیە دەیانویست هێما بۆ هێزە ئەمپریالیستەکانی جیهان بکەن. وەلێ بێ ئاگا لەوەی، لە سەردەمی ئەو هێزانە لە ساڵی ١٩٢٠، چ گەلەکۆمەیەك دژی کورد و کوردستان کرا، لەلایەن ئەو وڵاتە ئیمپریالانە. وەلێ کێشەی هەرە گەورە، هەست نەکردنە بەو پرسیارەی، بۆچی پەیمانگای کوردۆلۆژی لە ئەمریکا دەکرێتەوە و هەمان ناوەند لە تورکیا ڕێگا بە کردنەوەی نادرێ؟

بۆچوونی فەرمی دەوڵەت، گرنگترین دامەزراوەیە لە ژیانی

---

[1] گالیلۆ گالیلە (١٥٦٤-١٦٤٢) بیرکار، ئەستێرەناس، فەیلەسووف و زانای بواری فیزیک. خەڵکی ئیتاڵیایە و ڕۆڵێکی گرینگی هەبوو لە شۆڕشی زانستیی لە ئەورووپادا. دەستکەوتە بەنرخەکانی باشترکردنی چاوگێڕ و ڕوانینە ئەستێرەناسییەکان، پاڵپشتی لە تیۆریای کۆپێرنیکیسم. گالیلۆ بە ناوی (باوکی ئەستێرەناسی مۆدێرن) و (باوکی زانستی فیزیای مۆدێرن) و (باوکی زانستی مۆدێرن) دەناسرا. (وەرگێڕ).

سیاسی تورکیدا. جا دامەزراوەکە تەنیا ژیان و ڕێچکەکانی سیاسەت دیاری ناکات، بەڵکوو ئاسۆی زانست و هونەر و فیکریش هەر ئەو دایدەڕێژێت. بەڵام زیاتر لە ١٠٠ ساڵە، تەنیا زانست کاری لەسەر ئەوە کردوە تا ئەو بیرۆکە و ڕێچکەیە بە هەڵە دابنێت و بە ڕێکارە زانستییەکان، ڕەخنە لە بۆچوونی فەرمی بگرێ و بەرگری لە ڕەخنەگرتنی ئازادانە بکات. وەلێ بە هی خۆ زانینی بۆچوونی فەرمی و تاوانبارکردنی ئەوانەی ڕەخنە لە ئایدۆلۆژیای فەرمی دەگرن، لە چەقبەستوویی هزری زیاتر هیچی دیکە نییە.

لەلایەکی دیکەوە، ڕەخنەگرتن لە بۆچوونی فەرمی، لەلایەن چەند کەسانێکەوە دەکرێ، کە چاوپۆشی لە مەترسیەکانی ئەو ڕەخنەگرتنە دەکەن. پاشان ئەو پاڵەپەستۆیەی لەلایەن ڕژێمەوە لەسەر ژیان و بۆچوونەکانیان هەیە، بە مانای سیاسەتی خۆ لێ نەبان کردنی ئەو زوڵمە دێ. ئەوەش هەڵوێستێکی بێ پرەنسیپانە و گرگنانەیە.

## بزاڤی سۆسیالیستی کوردی
## لە دەستەی ئۆجاکەوە تا کۆمەڵە

دوای لێخۆشبوونەکەی ساڵی ١٩٧٤، لە ئەدەنەوە، گەڕامەوە ئەنقەرە. دوای ئازاد بوونم، بۆ ماوەی هەفتەیەك هاوشانی چەند دۆستێك، گوزەرێکمان بە ناوچەکانی، دیاربەکر و ئەرگانی و هازرۆ و سیلڤان و تاتوان و موش و سیوێرەگ کرد. لە دیاربەکر سەردانی یومون بوداکمان کرد و لە ناوچەی ئەرگانی چووینە لای گولفەر تاشەری پارێزەر و، لە تاتوانیش سەرێکمان لە فەقێ حوسێن دا. دوا کەسیش، لە موش چووینە لای کاك شەرەفەدین.

وەك پێشتریش گوتم، دوای زیندان، گەڕانەوەم بۆ کۆلێژ قەدەغەکرا. پێشتریش دکتۆر ئیبراهیم یاسا، بۆی باسکردبووم، کە کەس نایەوێت من بزڤرمە کۆلێژ. منیش پێداگیریم لەسەر ڤەگەڕیانم نەکرد. لەسەروبەندی چەند ساڵی دادگایی کردنم، بیروبۆچوونێکی چاکم لەبارەی زانست و ئایدۆلۆژیای فەرمی و کورد و کوردستان پەیدا کردبوو، بە بیرۆکەی جیا لەوانی دیکە. بۆیە دەمویست ئەو بۆچوونە تازانەم بنووسمەوە. بۆ ئەمەش پێویستم بە کاتێکی زۆر و ئازادییەکی ڕەها بوو. بۆیە ئەگەر هات و لە دامەزراوەیەکی حکوومەت فەرمانبەربام، هەرگیز نەدەهاتە بوون. بەوپێیەی پەیوەستی شوێنێك بام، دەبوونە ڕێگر لەبەردەم ئەو نیمچە ئازادیەی هەشمبوو. بە تایبەتیش لە پرسی کورددا...

لە (کۆمەڵەی ئۆجاك) پرۆژەی دامەزراندنی وەشانخانەی

کۆمەڵ هەبوو. ئۆرهان کۆتان پڕۆژەکەی فراوان کردبوو. بۆیە منیش لەگەڵیان بەشداربووم. دەزگای بڵاوکردنەوەی کۆمەڵ، ساڵی ١٩٧٤، دەستی بە کار کرد. یەکەم کتێبی خۆشمان بە ناوی (دۆسیەی دۆزی کۆمەڵەی کولتووری شۆڕشگێری ڕۆژهەڵات - *DDKO Dava Dosyası* ). لەوێ دەمێدا بڵاوکردەوە.

ئەو سەردەمەی وەشانخانەی کۆمەڵی لێ دەمەزرا، گۆڤاری (ئۆزگورلوك یۆڵوو)ش لە هەمان ئان و ساتدا دامەزرا. ئەوانیش لەوان ڕۆژاندا یەکەم ژمارەی گۆڤاری خۆیان بڵاوکردەوە. گۆڤاری (ئۆزگورلوك یۆڵوو) لەلایەن کەمال بورکایەوە[1] بەڕێوەدەبردرا. ئەو کەسانەی لەو شوێنانە کاریان دەکرد، ساڵی ١٩٧٥ ڕێکخستنەکانی پارتی سۆسیالیستی کوردستانیان دامەزراند.

لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٧٤، بەڕێوەبەرانی وەشانخانەی کۆمەڵ، لە پارکی (گەنچلیك)ی ئەنقەرە، لەگەڵ کەمال بورکای هەڤدیتنێکیان ڕێکخستبوو. منیش بەشداری دیدارەکەم کرد. لەوێ هەردوولا، لەسەر ئەوەی چی بکەن و چۆن هەنگاو باوێژن، بیروبۆچوونیان ئاڵوگۆڕ کرد.

لە دوای ساڵی ١٩٧٤ وە، پێشڤەچوونێکی گرنگ لە سیاسەتی کوردیدا هاتبووە ئارا. نزیکەی دوو ساڵ دوای دامەزراندنی وەشانخانەی کۆمەڵ، واتا لە ساڵی ١٩٧٦، گۆڤاری (رزگاری) دەستی بە بڵاوکردنەوە کرد. ماوەیەك دواتریش، ڕێکخراوی (دژە

---

[1] کەمال بورکای لە دایك بووی ساڵی ١٩٣٧ شاری دێرسیمە. نووسەر و سیاسەتمەدارێکی کوردە. دوای لێخۆشبوونی ساڵی ١٩٧٤، پارتی سۆسیالیستی کوردستانی دامەزراند. ساڵی ٢٠١٢ بە سەرۆکی (هاك پار) هەڵبژێردرا. (وەرگێر).

کۆلۆنیالیست - Anti-Sömürgeci) دەستی بە ڕێکخستن و سازکردنی چەندان چالاکی فەرهەنگی کرد.

لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٧٦، دەستەی (کاوە) لە کۆمەڵەی کولتووری شۆڕشگێڕی ڕۆژهەڵات جیا بوونەوە. وەلێ ساڵی ١٩٧٧ کۆمەڵەکە، ڕێکخستنەکانی پارتی کرێکارانی کوردستانی دامەزراند. ساڵی ١٩٧٨، (دەنگی کاوە) لە دەستەی کاوە جیابوونەوە. ئەوانە بۆ ئەوە دەڵێم، چونکە پێویستە بزانین کە ئەو ڕێکخراو و ڕێکخستنانە لەهەناوی کۆمەڵەی کولتووری شۆڕشگێڕی ڕۆژهەڵاتەوە دەرکەوتن.

ڕەگ و ڕیشەی دەستەی ڕزگاری گەلی کوردستان، ڕێکخستنی پارتی دیموکراتی کوردستان بوو لە ساڵی ١٩٦٥. دامەزراندنی پارتی کرێکارانی کوردستان لە ساڵی ١٩٧٨، دەگەڕێتەوە بۆ ڕەگ و ڕیشەی ڕێکخراوی فێربوونی باڵای دیموکراتی ئەنقەرە لە ساڵی ١٩٧٤ و سوپای ئازادی نەتەوەیی لە ساڵی ١٩٧٤.

دامەزراندنی (تیکۆشین) لە ساڵی ١٩٧٨ ڕەگ و ڕیشەی بۆ دامەزراندنی THKP-C لە ساڵی ١٩٧١ و ڕزگاری لە ساڵی ١٩٧٦ دەگەڕێتەوە. دامەزراندنی (پێنج پارچەییەکان - Beş Parçacılar) بنەچەکەیان بۆ THKO دەگەڕێتەوە کە لە ساڵی ١٩٧٠ دامەزرا، لەگەڵ ڕزگاری گەل کە لە ساڵی ١٩٧٥ دامەزرابوو.

کۆمەڵ - ڕزگاری و ئۆزگورلوك یۆڵ لە زیندان ئاماژەکانی جیابوونەوەیان دەرکەوتن. ئەو ڕێکخراوانە، زۆر بە خێرایی بە کوردستاندا بڵاوبوونەوە. بەشێوەیەك دەتوانین بڵێین گەیشتنە

هەمـوو ناوچەکـانی کوردسـتان. ئەوان کـاریگەرییەکی گەورەیـان لەسـەر خەڵکیش چێکـرد. وەلێ لەگەڵ ئەو پێشهات و بەرەوپێش چوونـــانە، لەنێـــوان ئەو ڕێکخـــراوانە، لەیەك تێنەگەیشـــتن و ڕووبەڕووبوونەوە دەستی پێکرد.

لە نێـوان سـاڵانی ١٩٧٨-١٩٨٠، پێکـدادانێکی زۆر لە نێـوان ڕێکخـراوی ڕزگـاری گەلـی کوردسـتان و پـارتی کرێکـارانی کوردسـتان ڕوویـدا. لە بیسـت و دووەمـین ڕۆژی مـانگی یـازدەی سـاڵی ١٩٧٨، فەریـد ئـوزونی ڕێـڤەبەری دەنگـی کـاوە، لەوێ سـەروبەندێدا کـوژرا. هەر لەوێ دەمێـدا، پەکەکە چـالاکییەکی هێرشکردنی بۆسەر محەمەد جەلال بوجاکی پەرلەمانتاری ڕوها لە سیەمین ڕۆژی مـانگی حەفتـی سـاڵی ١٩٧٩ ڕێکخسـت. هاوکـات پەکەکە، لەگەڵ ڕێکخـــراوە چەپە کوردییەکـــانی دیـــکەش ڕووبەرووی پێکدادان بۆوە. بە هۆی ئەو شەڕانەشەوە بەشێك لەو ناوچـانە تووشـی کەم بـوونەوەی دانیشـتوان بـوون، دەتـوانین سیوێرەگ بە نموونە بهێنینەوە.

زانیـارییەکی زۆر و وردم لەسـەر ئەو پرسـانە نیـیە، بەڵام، پەرتووکەکەی ڕۆمان کاهرەمان بە ناوی (١٩٧٨ *Kuşağının* *Çocuklan* *Şen*) هەروەها کتێبەکەی ئیبراهیم کورەکەن بە ناوی (*Parçası*, *Tanığı*, *Mahkumü*, Sürgünü Oldum) زانیاری ورد و چاکی لەوبارەیەوە تێدایە.

لە ژێرخانی ڕێکخراوی (کولتووری دژە داگیرکاری) برادەران زوو زوو بـۆ ڕێکخسـتنی میتینـگ و کۆبـوونەوەی جەمـاوەری دەچوونە شارەکانی قارس و موش و وان و وێرانشار و بەدلیس و

چەنـد نـاوچەیەکی دیـکە. لەوێ چەنـد میتینگێکیـان بەو نـاوانە چێکردبوو. ( میتینگـی شـیر لە قـارس، میتینگـی شـەکر لە قـارس، میتینگی توتن لە بەدلیس، میتینگی قاچاغچیاتی لە وێرانشار) ئەو گردبوونەوانە هەندێکجار چالاکوانانی (کۆمەڵ-رزگاری) سازیان دەکـــرد. هەنـــدێکجاریش، لەلایەن ڕێکخـــراوە ناوچەییەکـــانەوە ڕێکدەخرا. جا ئەو هەڤاڵانە، بە ئۆتۆبوس دەچوونە میتینگەکان.

سـاڵی ١٩٧٨، چەنـد دۆسـتێکی وەکـوو ئیبـراهیم گوچلـوو و ئیکـرام دەلان و خەدیـجە یاشـار دوای ئەوەی سـاڵی ١٩٧٦ لە (رزگاری) جیا بوونەوە، هەستان بە دامەزراندنی (ئاڵای ڕزگاری). پـێم وابـێ ئەو جیـابوونەوانە، زیـاتر لەوەی بە هـۆی جیـاوازی بیروبۆچوونی نێوانیـان بێ، هۆکـارەکەی بـۆ ژێرخـانێکی دەروونـی دەگەڕاوە.

## باڵوولەکانی خەدیجە

پایزی ساڵی ١٩٧٥، لە وەشانخانەی کۆمەڵ بووم. لە هۆدەی ڕۆژنامەکـــان دانیشـــتبووم و ڕۆژنـــامەم دەخوێنـــدەوە. ئەوســـا، وەشانخانەکە لە شەقامی ئیزمیر بوو لە شاری ئەنقەرە. جگە لە من، چەند برادەرێکی دیکەش لەوێ بوون. پێم وابێ ڕەجەب مارشاڵ و زولکوفور گونایش لەگەڵمان بوون. کاتەکە دوای نیوەڕۆ بوو. لە پر خەدیجە، کە ئەویش لەوێ کاری دەکرد، بە ژوور کەوت. خەدیجە دوو باڵوولەی لەدەست بوو. دوای چاك و چۆنی دوو باڵوولەکەی دەستی لەسەر مێزەکەی بەردەمم دانا، کە ڕۆژنامەم

لەسەر دەخوێندەوە. پاشان لە ژوورەکە چووە دەرەوە. پێم وابێ چوو تا چا تێکات.

کاتێك باڵووڵەکانم بینی، بیرێکی ئاوام بە خەیاڵدا هات: ڕەنگە خەدیجە لە دەرەوە نانی خواردبێ و ئەو خواردنەشی بۆمن هێنابێ. بۆ ئەوەی نەوەکا بیرکردنەوەکەم هەڵە بێ، ماوەیەکی زۆر چاوەڕێی هاتنەوەی خەدیجەم کرد؛ وەلێ هیچ دەنگ و ڕەنگێك نەبوو. ئیدی دوای نەهاتنەوەی پشتی دەمێکی درێژ، بەتەواوەتی باوەڕم بەوە هێنا، کە ئەو دوو باڵووڵەیەی بۆ من هێناوە. بۆیە بە پشت بەستن بەو باوەڕە، دەستم بە خواردنیان کرد.

دوای ماوەیەك لە خواردنی باڵووڵەی یەکەم، خەدیجە هەر دیار نەبوو. بۆیە هەڵستام و باڵووڵەکەی دیکەشم گرتە دەستم. باڵووڵەکەم بۆ دەمم برد و لایەکیم خستە ناو زار و لایەکەی دیکەشم هەر لەدەست بوو، کە خەدیجە بە ژوور کەوت. زۆر بلەز سەیرێکی سەر مێزەکەی کرد و پاشان چاوێکی لە دەمم گرت. ئەو بە زار بەشییەوە لەمنی دەڕوانی، بۆیە هەستم بە خراپی دۆخەکە کرد. لەگەڵ ئەو واق وڕمانە، زانیم خەدیجە باڵووڵەکانی بۆخۆی هێنابوو، نەك بۆ من. وەلێ من هەمووی لێ حەپەلووش کرد. زۆر شەرمم کردەوە و سوور هەڵگەڕام؛ لوقمەکان لە قورگمدا گیریان خوارد و نەدەچوونە خوارەوە. کاتێك خەدیجە بینی باڵووڵەکانیم خواردەوە گوتی "کاك ئیسماعیل، لەمان خانی خێزانت خواردنت ناداتێ؟ دەبێ لە لەمان خانم تووڕە بم کە بۆچی خواردن ناداتە کاك ئیسماعیل".

لەوێ دەمێدا نەبوونی و گرانییەکی زۆر بوو. وەشانخانەی کۆمەڵیش نەدار بوون. ئەو برادەرانەی لەوێش کاریان دەکرد، هەژار و نەدار بوون. من و خەدیجەش هەر کەم دەرامەت و دەست کورت بووین. یانی بە شێوەیەك فەقیر بووین، کە توانای کڕینی دوو باڵووڵەمان بۆ خەدیجە خانم نەبوو. بەبیرم دێ، ڕۆژێك هەڤاڵێکمان پێویستی بە ٢٠ لیرەبوو، بە هەموومان نەمانتوانی ئەو بڕەی بۆ دابین بکەین.

سەرەڕای هەموو ئەمانە، کەلەجانێکی زۆرمان هەبوو. وەشانخانەی کۆمەڵیش، بەو وزەیەی لەو کەلەجانەوە وەری دەگرت، لە کارکردن بەردەوام بوو. ئیدی بەو گەرموگوڕیەی هەمان بوو بۆ کارکردن، چەندان کتێبی وەکوو (دۆسیەی دۆزی کۆمەڵەی کولتووری شۆڕشگێری ڕۆژهەڵات و بەرگی یەکەمی دۆسیەی بێشکچی و بزوتنەوەی کوردی لە عێراق و نەتەوەپەرستی بەعس)مان چاپ و بڵاوکردەوە. لەپاڵ ئەمانە چەندان پەرتووکی وەکوو (ڕێبازی زانستی – جێبەجێکردنی ڕێبازی زانستی لە تورکیا – نیشتەجێکردنی زۆرەملێی کوردان – کورتە مێژووی تورك – تیۆری زمانی هەتاو و کێشەی کورد – میساقی پارتی گەل و پرسی کورد)مان بڵاوکردەوە. وەك چۆن بەهەمان کەلەجانەوە دەستمان بە بڵاوکردنەوەی گۆڤاری ڕزگاری کرد. هەڤاڵانیش، وەها کاریان لەو گۆڤارە دەکرد، تا وەکوو بزاڤێکی سیاسی بەرەو پێشەوەی ببەن. چونکە لە دەوری گۆڤارەکە چالاکی ڕێکخستنیش هەبوو. دەمەوێ ئەوەش بڵێم کە ڕێکخراوی کولتووری (دژە داگیرکاری)یش لەوێ سەروبەندێدا، بە هەمان وزە و کەلەجانەوە هاتبووە بوون.

لەوێ دەمێدا، خەدیجە، ئافرەتێکی باڵا ناوەندی لاوازی گەنج بوو. هەر کاتێك ئەوم ئاوا بە لاوازی دەبینی لە ڕووی جەستییەوە، یەکێك لە هۆکارەکانیم بۆخۆم دەگەڕاندەوە. چونکە باڵوولەکانی ئەوم خواردبوو و ئەویش ئاوا لاواز ببوو. بۆیە لەو بارەیەوە بەردەوام سەرەکۆنەی خۆم دەکرد.

دوای ئەوەی چەندان ساڵ بەسەر ڕووداوەکەدا تێپەڕی و کودەتای ١٢ ئەیلوول[1] ڕوویدا؛ خەدیجە چووە ئەورووپا. لە نێوان ساڵانی ١٩٩٧-١٩٩٨ لە بەندیخانەی بورسا، لە یەکێك لە گۆڤارەکاندا، وێنەیەکی خەدیجەم بینی. پێم وابێ لە کاتی چاوپێکەوتنێکدا وێنەکە چرکێندرابوو. لە فۆتۆکەدا دیار بوو خەدیجە قەڵەو ببوو و ڕەنگ و ڕووخساری باش دەهاتنە بەرچاو. واتە هیچ شوێنەوارێکی ساڵانی حەفتاکانی بەسەرەوە نەمابوو. بۆیە

---

[1] کودەتای دوازدەی ئەیلول، لە ساڵی ١٩٨٠ لەلایەن هێزە چەکدارەکانی تورك ئەنجامدرا و سوپا دەستی بەسەر دەسەڵاتدا گرت. کودەتاکە دەمژمێر سێی بەرەبەیان دوای دەستگرتن بەسەر کەناڵی تەرەتە و کەناڵەکانی دیکەی ڕاگەیاندن و پەیوەندی، ڕاگەیەندرا. ڕاستەوخۆ دوای کودەتاکە، حکومەتی سلێمان دەمیرەڵ لەکار خرا و پەرلەمان هەڵوەشاوە و پارێزبەندی لەسەر سەرجەم پەرلەمانتاران هەڵگیردرا و گەشتی دەرەوەی وڵات قەدەغەکرا و دۆخی لەناکاو لە تەواوی تورکیا بەیان کرا و کەنعان ئیڤرەنی سوپاسالاری تورکیا، بووە سەرۆك کۆمار. دوای هاتنە سەر دەسەڵاتی عەسکەر، یاساکانی بەر لە کودەتاکە هەڵوەشێندرانەوە و دەستوورێکی تازەی سەربازی ئامادەکرا و ساڵی ١٩٨٢ بە ڕێژەی دەنگی ٩١% دانیشتوانی تورکیا دەستوورە تازەکە پەسندکرا. بەپێی ژمارە فەرمیەکان بێ، دوای کودەتاکە ٦٥٠ هەزار کەس دەستگیرکرا و ٢٣٠ هەزار کەس لە دادگا سەربازیەکان دادگایی کران. نزیکەی ٣٠٠ کەسیش بەهۆی ئەشکەنجەوە لە زیندانەکان گیانیان لە دەستدا و ٤٨ کەسیش لە سێدارە دران. (وەرگێڕ).

زۆر دڵخۆش بووم بەو دۆخەی ئەوی تێدابوو. چونکە کاتێک ئەوم بە گۆشتنی بینی، ئیدی وازم لەسەرکۆنەکردنی خۆم هێنا.

***

خەدیجە یەشاری هاوکارمان، خەڵکی ناوچەی هایمانلی بوو، ئەوسا لە وەشانخانەی کۆمەڵە و گۆڤاری ڕزگاری کاری دەکرد. هەندێك پەیوەندیی لەگەڵ بڵاوکراوەی (Dev-Yol) هەبوو. ئەو لەگەڵ گوڵتەکین پاکدەمیر هاوسەرگیری کردبوو. مێردەکەی لە سەندیکاکان کاری پارێزەری دەکرد. یەك دوو کەڕەت، هاتە دانیشتنی دادگایی کردنەکانی منیش لە دیاربەکر.

لەو دۆخەی ئەوسا تێی دابووین، ڕۆژێك ئۆرهان کۆتان گوتی "کاك ئیسماعیل، لەم مانگە بەدواوە، ئیدی سەری هەموو هەیڤێك مووچەت پێدەدەین". منیش بەو قسەیە دڵخۆش بووم. مانگی دواتر، ٥٠٠ لیرەیان پێدام. بۆیە ئیدی لە تێچووەکانی ڕۆژانە، تۆزێك لاسەنگی باری سەرشانم، ڕاست بێوە. چونکە ئەوسا هات و چوون بە ئۆتۆبووس و کڕینی ڕۆژنامە و نان و سەموون خەرجی گرنگی ڕۆژانەبوون. ئەوەی پێویستی دیکەی ناوماڵیش بوو، لەمانی خێزانم دەیکرد. پەرتووك و گۆڤارەکانم لای ئومێد فورات، لە پەرتووکخانەی (بارش) دەهێنا. بۆ ئەمەش هیچ پارەیەکم نەدەدا. ئومێد گۆڤارە مانگانە و هەفتانەکانی، لەگەڵ ئەو کتێبانەی دەیزانی بۆمن پێویستن بە بێ بەرامبەر پێدەدام. جا یەکدی ناسینی من و کاك ئەحمەد عارف[1]، لەوان ڕۆژاندا، کە

---

[1] ئەحمەد عارف حیکمەت ئۆنال (١٩٢٧-١٩٩١). لە دیاربەکر گەورەبووە و =

ســـــەردانی پەرتووکخــــانەی ئاشـــــتیمان دەکـــــرد ڕوویـــــدا. برادەرایەتیەکەشمان لە ماوەیەکی کورت زۆر گەرموگوڕی کەوتە ناوێ.

ئەو مـووچەیەی کـاك ئۆرهـان کۆتـان باسـی کـرد، بەردەوام نەبـوو. چـونکە مـانگی دواتـر مووچەکەیـان نەدامــێ. وەك چـۆن مانگەکانی پاشتریش هەر نەیاندامێ. ئەمەشم بە پێویست نەزانی تا هۆکـارەکەی لە ئۆرهـان بپرسـم. ئەویـش هـیچ باسـی نەکـردەوە. چونکە دەمزانـی دۆخـی داراییـان چۆنە. ئـاوام بیرکـردەوە، ئەگەر هەبێت بە دڵنیاییەوە مووچەیان دەدامێ.

***

لەوێ دەمێـدا، لە وەشـانخانەی کـۆمەڵ و گۆڤـاری ڕزگـاری، زۆرتـرین پەیڤێـك کە گوێبیسـتی دەبـووین ئەمـانە بـوون "هەفتەی داهاتوو لە چاپخانەی ناوچەی مالازگرت، کۆبوونەوە ڕێکدەخرێ. لە دوای ئەویـش ڕاسـتەوخۆ بەرەو تـاتوان دەکەونە ڕێ. پێویسـتە بـودجە و تواناکـانی کـۆمەڵ بەو پێیە ڕێك بخەیـن"."زۆر گـرنگە

---

خوێنـدنی سـەرەتایی لە شـارۆچکەی سـوێرەک دەسـت پێکـردووە و قۆنـاغی ناوەنـدیی لە شـاری رووهـا تەواو کـردووە. بەشـی فەلسـەفەی زانکـۆی ئەنـقەرەی خوێندووە، لێ بەهۆی جموجۆڵی سیاسیی و زیندان کردنی، خوێندنی پێ تەواو نەکـراوە. سـاڵی ١٩٥٠ دەگیرێـت و دووسـاڵ زینـدانی دەکرێـت. بەرهەم و شیعرەکانی ئەحمەد عارف ئەگەرچی بە زمان تورکین، بەڵام بە هەستی کوردانە هـۆنراونەتەوە و ژان و ناسـۆری کـوردەواریی پێـوە دیـارە. شـیعرەکانی شـاعیر بە تورکی، لە ساڵانی ١٩٤٠-١٩٥٥ لە گۆڤارەکانی ئەوسا دێنە وەشاندن. هەندێک لە هەڵبەسـتەکانی لەلایەن هونەرمەنـدی کـورد، ئەحـمەد کایـا کـراوەتە گـۆرانی. ئەحمەد عارف شاعیرێکی هەست ناسك و عاشق بووە و نامە دڵداریەکانی بۆ لەیلا ئەربیل، گەواهیدەری ئەو هەستەی شاعیرن. (وەرگێڕ).

هەفتەی داهاتوو لەناو خەڵك، لە دیاربەکر کۆبوونەوەیەك ڕێك بخەین. چەندی ژمارەمان زیاتر بێ بۆ چوونە دیاربەکر، ئەوەندە چێترە"."پێویستە لە وان و دەوروبەری میتینگ ڕێکبخەین. جا لە میتینگەکە ڕەخنە لە فلانە سیاسەتی حکوومەت بگرین. پێویستە بە دەستەیێکی قەرەباڵغ لە ئەنقەرە بە ڕێ بکەوین و بچینە وان".
لەوێ سەردەمێدا، بۆ هاوتوچۆی نێوان شارەکان، ئۆتۆبووس بەکار دەهێندرا، یانیش شەمەندەفەر. پێم وانەبوو کەس ترومبێلی هەبووبێ؟ خۆم بیرم نایەت، لەو باوەڕش نیم کەسێك ترومبێلی خۆی هەبووبێ.

ئومێد زۆری فرۆشی پەرتووکەکانی وەشانخانەی کۆمەڵی پێ ڕادەگەیاندین. وەلێ پارەی پەرتووکەکان زیاتر بۆ ئەو چالاکیانە بەکاردەهێندرا.

***

ساڵی ٢٠١٧-٢٠١٨ لە دیاربەکر پێشانگای پەرتووك هەبوو. لەوێ ڕۆژێدا خەدیجە لە سویدەوە گەڕابۆوە و بەسەردان لە دیاربەکر بوو. لە میونخانەی (دەمیر) لەگەڵ ئەو تووشی یەکدی بووین. ڕووداوەکەی سەرەوەم بۆ گێڕاوە و بەیەکەوە پێکەنین.

ساڵێك دوای پێشانگاکەی دیاربەکر، لە پێشانگایەکی دیکەی پەرتووکدا، خەدیجە لە ستاندی وەشانخانەی وەقفی ئیسماعیل بێشکچی، پەرتووکێکی کڕی بوو. لەوێ گوتبووی "پارە نادەم، چونکە بێشکچی قەرزاری منە". ئیدی ویستبووی ئەو یادەوەرییە زیندوو بکاتەوە.

## ڕەجەب مارشاڵی و کۆمەڵەی ئۆجاك

لە مانگی پێنجی ساڵی ١٩٧٢، کۆمەڵێك برادەریان لە ئەرزڕوومەوە، هێنایە زیندانی دۆخی لەناکاوی دیاربەکر. ئەوانەی هێنایان، دونداری ئۆزدانی خاوەنی ڕۆژنامەی (شۆڕش) و کارمەندەکانی بوون، کە لە ئەرزرووم ڕۆژنامەکە چاپ و بڵاو دەکراوە. ڕەجەب مارشاڵیش یەکێك بوو لەو کەسانەی لەگەڵ ئەوان بوو. مارشاڵی ئەوسا، قوتابی پۆلی پێنجی ئامادەیی بوو. لە خوێندنگە گرتبوویان و هێنابوویانە زیندانی دۆخی ئاوەرتە.

دوندار ئۆزدان و کارمەندەکانی ڕۆژنامەکە، ماوەیەکی کەم دوای دەستگیرکردنیان، ئازادکران؛ وەلێ ڕەجەب مارشالی لە زیندان ماوە. مارشاڵی دوای ئەوەی هەڤاڵانی ئازادکران، دواتر چووە پاڵ کۆمەڵەی ئۆجاکی ناو زیندان. لەوێ دەمێدا هەریەکە لە مومتاز کۆتان و ئیبراهیم گوچلوو و یوموون بوداك و فیکرەت شاهین و نەزیر شەمیکانلی و باتاڵ باتە لە کۆمەڵەی ئۆجاك بوون. هەروەها من و حوسێن مووسا ساغنچیش هەر لەو کۆمەڵەیە بووین.

ڕەجەب، بەشداری هەموو چالاکیەکانی کۆمەڵەکەی دەکرد. هەر لە پەروەردەیی گشتی و پەروەردەیی گەنجان و چەندانی دیکە. ئەو گەنجێکی خوێن گەرمی عاشق بە فێربوون بوو. هەر شتێکی خوێندباوە، یانیش لە شوێنێك فێری ببا، زۆر بە جوانی بۆ ئێمەی دەگێڕاوە. جگە لەمانە بەشداری هەمو کارەکانی وەکوو

خاوێنکردنەوە و جل شوشتن و خواردن ئامادەکردن و سفرە دانان و قاپ شوشتنیشی دەکرد.

لەوێ دەمێدا، بەرگرینامەکانی بۆ ڕۆژی دادگایی ئامادەمان دەکرد، لە ڕێگای ئامێری چاپکردنەوە دەنووسراوە. لە ڕێگای کاربۆنیشەوە چەند دانەیەکمان لەبەر دەگرتەوە. ڕەجەب ببووە وەستایەکی چاکی ئەو بوارە. بۆیەش زۆر هاوکاری برادەرانی دەکرد لەو کارەدا.

رەجەب مارشاڵی کەسێکی خۆ نەویست و دەست کراوە بوو. پەیوەندییەکی چاکی لەگەڵ برادەرانی ئەوێ هەبوو، جا پەیوەندییەکی قوڵ و بە سەنگ. چونکە بەر لە هەر شتێك، کەسێکی باوەڕپێکراو بوو. لە هەموو چالاکیەك، دەتزانی لەگەڵ ڕەجەب دەتوانی تا کوێ بڕۆی. چونکە بە درۆی نەدەخستیتەوە، یان وات لێبکات پەشیمان ببیتەوە.

ئەو بەرگرییانەی ڕەجەب مارشاڵی لە دادگای دۆخی لەناکاو و دادگا سڤیلەکاندا کردی، زۆر گرنگە. ئەو لە ڕێگای ئەو بەرگرییانەی بەرامبەر بە دادگا خوێندیەوە، یاخود لە ڕێگای ئەو پەرتووك و نووسینانەی دواتر بلاّوی کردەوە، خزمەتێکی زۆری گەیاندە دۆزی کورد و ئەرمەن و ئاشووری و سووریانی و ڕووم و پۆنتوس. لەوبارەیەوە، چەندان پەرتووکی گرنگی وەك (بەرگرینامە سیاسیەکانی دۆزی ڕزگاری لە دیاربەکر- مافی چارەی خۆ نووسینی نەتەوەی کورد – نووسراوە قەدەغەکراوەکان – جولاّنەوەی دیموکراتی نەتەوەی ئەرمەن و کۆمەڵکوژی ١٩١٥) نووسی.

بەرگرینامەکـان و نووسـین و پەرتووکەکـان زۆر گـرنگن. جـا ڕەجەب مارشـاڵ تایبەتمەنـدیەکی دیـکەی بەقەد نووسـینەکانی گرنگتریشی هەیە؛ ئەویش هەڵوێستی ئەو کەسەیە. چونکە خاوەن هەڵوێستێکی جوامێرانەی ڕاست و گەورە بوو.

مـاوەیەکی زۆر، ڕەجەب مارشـاڵی، بەرپرسـی وەشـانخانەی کـۆمەڵ بـوو. ئەو پەرتووکـانەی ئـێمە لە دەزگـای بڵاوکـردنەوەی کـۆمەڵ بڵاومـان کـردەوە و لەسـەرەوە نـاوم هێنـان، لە سـەردەمی بەرپرسـیارییەتی ڕەجەب ڕووناکیـان بینـی. هەروەهـا لە سـەردەمی ئەو، سـەرەڕای پێـداگیریەکی زۆری، وەلـێ ئەو پەرتووکـانە چـاپ نەکران (یاسای تونجەلی ١٩٣٥ و کۆمەڵکوژی دێرسیم، کارنامەی پـارتی گەلـی کۆمـاری ١٩٣١ و کێشـەی کـورد و دۆسـیەکانی دابەشکاری ئەمپریالیست لەسەر کوردستان). بەڵام دواتر لە ساڵی ١٩٩٠ لەلایەن وەشانخانەی (بەڵگە)وە بڵاوکرانەوە.

ڕەجەب مارشاڵ لە سەردەمی حکوومەتی کودەتای سەربازی ساڵی ١٩٨٠، لە زیندانی ژمارە پێنجی دیاربەکر، ئەشکەنجەی زۆر درا. بە شـێوەیەك ئیـدی دوای ئازاد بـوونی، بە هـۆی ئەو لێـدان و ئەشکەنجانەوە نەیدەتوانی بە ئاسانی دەستەکانی بەکاربهێنێت. وەلێ هێ توانای بەکارهێنانی کۆمپیوتەری هەر هەبوو. ئەو ئەشکەنجانە قـانی گەورە گەورەی لەسـەر جەسـتەی ڕەجەب جێهێشـتبوو. بیروبـاوەڕی بەو دۆزەی کـاری بـۆ دەکـرد و ڕێـك و ڕاسـتی هەڵوێستەکانی، هۆکـارێکی گەورەبـوون تـا لە ڕووی جەسـتەییەوە زوو بکەویتەوە سەر پێیەکانی. وەك چۆن گرۆتینی هێزی دەروونی کـاریگەرییەکی ئەرێنـی زۆریـان خسـتە سـەر زوو چـاکبوونەوەی برینە قوڵ و ناسۆرەکانی جەستەی.

جگە لەوانەی باسم کرد، ڕەجەب کەسێکی زۆر ڕوو خۆش و دەم و لفت بە پێکەنین بوو. باڵەخانەی وەشانخانەی کۆمەڵ لە شەقامی ئیزمیری ئەنقەرە، بەرامبەر باڵەخانەی پارتی دیموکرات[1] بوو. هەردوو لامان لە نهۆمی سێیەمی دوو باڵەخانەی بەرامبەر یەکدی سەر شەقامەکە بووین. پارتی دیموکرات لەوێ دەمێدا لە پارتی عەدالەت جیا ببۆوە. بۆیە سەرلەنوێ دەستیان بە کاری ڕێکخستنەکانیان کردبوو. ئەوان زوو زوو لە وتار و کۆنگرەکانیاندا دەیانگوت "بە هەموو شێوەیەك بەرامبەر بە دابەشکارانی وڵات دەوەستین". کەناڵی (TRT) لە هەموو بوڵەتەنێکی نیوەڕۆ و ئێوارانی، شوێنی بە چالاکی و ڕاگەیاندراوەکانی پارتی دیموکرات دەدا. لە یەکێك لە بوڵەتەنەکانی نیوەڕۆ، باس لە ڕوونکردنەوەیەکی لەو شێوەیە دەکرا کە لەسەرەوە باسم کرد. ڕەجەبیش ئەوسا گوتی "باشە تێگەیشتین بەردەوام بەرامبەرمان دەوەستنەوە. جا دەشتانبینین کە بەرانبەرمانن. وەلێ بۆچی هەموو ڕۆژێك ئەوە دەڵێنەوە و دەتانەوێ هەموو کەسێك گوێی لێ بێت؟".

جیا لەو شتانەی لەسەرەوە باسم کرد، کاك ڕەجەب نیگارکێشێکی بەتواناش بوو. وێنەکانی یەکی مایسی، تاوەکوو

---

[1] لە دوای پارتی گەلی کۆماری CHP، بە دووەمین پارتی سیاسی دادەنرێت لە مێژووی کۆماری تورکیا. پارتی دیموکرات دوای ماوەیەکی زۆر لە سەردەمی تاك پارتایەتی لە تورکیا، لە ساڵی ١٩٤٦ دادەمەزرێت، لە ساڵانی (١٩٥٠-١٩٦٠) دەبێتە فەرمانڕەوای تورکیا. لە ٢٧ مایسی ١٩٦٠ کودەتایەکی سەربازی بەسەردا دەکرێت و دوای لە دەستدانی دەسەڵات، پارتەکەش لە تورکیا دادەخرێت. (وەرگێڕ).

ئێستاش لەلایەن چەندان ناوەند و فەرمانگەوە بەکار دەهێندرێت. بۆ نموونە ساڵی ١٩٧٤، ماوەیەکی کەم دوای دەرچوونی بڕیاری لێبووردنی گشتی. لە ناوچەی ئیزمیت، لە کارگەی دروستکردنی مافوور، وەك دیزاینەر کاری کردبوو.

رەجەب هێشتا بیروبۆچونەکانی خۆی، سەبارەت بە کورد و ئەرمەن و ئاشووری لە رۆژهەلاتی ناوەڕاست و جیهان لە ڕووی ئابووری و سیاسی و دیپلۆماسی و سەربازیی و کولتووریەوە بە هەموو دنیادا دەوەشێنێ. بەیانکردنی هزروبۆچوونەکانیشی بەشێوەیەکی ئاوا ئازایانە، دوای ئەو هەموو ئەشکەنجە و ئۆپەراسیۆنی لەناو بردنەی، دڵخۆشییەکی نەپێوراوە.

## ڕۆژنامەیەك و دكتۆر ئەرگین ئاتاسوو

لە یەکێك لە ڕۆژەکانی پایزی ساڵی ١٩٧٦، بەشداری یەکێك لە کۆبوونەوەکانی ڕۆژی چوارشەممەی کۆلێژی زانستە سیاسییەکانم کردبوو. ئەوسا پارەی ئەوەم هەبوو، ڕۆژانە ڕۆژنامەیەك بکڕم و بە پاسی شارەوانیش هاتوچۆ بکەم. ئەوێ ڕۆژێ دانەیەك ڕۆژنامەم کڕی بوو. دوای کۆبوونەوەکە، دەمەو ئێوارە، بە لۆژە لۆژ بەرەو ماڵ دەبوومەوە. دوای ماوەیەك گەیشتمە بەردەم سەرۆکایەتی شارەوانی ناوچەی مامـاك. کەش و هەوا خۆش و دڵگیر بوو، تیشکی هەتاوی ئێوارە لەنێوان گەڵای دار و باڵەخانەکانەوە جارنا جارێك دەگەیشتە سەر جەستەی ماندووم. لەوێوە بەردەوام بووم لە ڕۆیشتن تا لەناوچەی (دش کاپی)

سواری پاسی شارەوانی بم و بچمەوە ماڵ لە ناوچەی ئەتلیك. سەیری باخەڵم کرد، تەنیا ئەوەندە پارەم پێ بوو، کە پارەی پاسی شارەوانی پێبدەم بۆ گەیشتنە ماڵ.

لە کاتی ڕۆیشتن، چاوم کەوتە سەر یەکێك لەو ڕۆژنامانەی، لە کۆشکی ڕۆژنامەفرۆشەکانی سەر شەقامەکە هەبوون. سەردێڕی ڕۆژنامەکە سەرنجی بۆلای خۆی ڕاکێشام. چونکە هەواڵێك بوو سەبارەت بە بەرەنگاربوونەوەی بزوتنەوەی کورد بەرامبەر سەددام حوسێن و زانیاری وردی تێدابوو لەسەر جەنگی نێوانیان و سەرکەوتنی کورد لە شەڕەکاندا. نوچەکە لە مێشکمدا پانتاییەکی گەورەی گرت و شەیدای خۆی کردم. بۆیە نەمتوانی ڕۆژنامەکە نەکڕم و هەروا سەر پێیی بەلایدا گوزەر بکەم. دوای کڕینی ڕۆژنامەکە، پارەی ئەوەم پێ نەما تا سواری پاس بم. بۆیە بیرم لەوە کردەوە بە پێ تا ناوچەی (دش کاپی) بچم، لەوێشەوە تاوەکوو (ئەتلیك) دەتوانم ڕێگاکە بە پێ تەی بکەم. خۆشی کەش و هەواکەش وایکرد، زیاتر ئەو بیرۆکەی خۆمم بۆ گەڕانەوە ماڵ لا ئاسایی بێ. ملی ڕێگام گرت و هەنگاوەکانم خێراترکرد، وەلێ لە پڕ، کەش و هەوا گۆڕانێکی خێرای بەسەرهات و پڕوشکە باران دەستی بە بارین کرد. بە ئومێدی ئەوەی ئێستا نا ئێستا کەشەکەی خۆش دەکاتەوە، بەردەوام بووم لە ڕۆیشتن. وەلێ لەگەڵ هەر پێنگاڤێکی من، دڵۆپی باران گەورەتر و بە خوڕتر دەبوو. ئیدی زۆری نەبرد و پڕوشکە باران بووە ڕێژنەیەکی خێرا و بە گوڕ. لە چەند خولەکێکدا قۆرتەکانی سەر شۆستەکە تژی ئاو بوون. من بەردەوام بووم لە ڕۆیشتن، وەلێ ئیدی بە زەحمەتیەکی زۆر مەودایەکی کەمم دەبڕی. ئەو ڕۆژە

چەترێکیشم لانەبوو بۆ خۆپاراستن لە تەڕ بوون، بۆیە لەگەڵ ئەوەی خۆم دەخستە ژێر بنمیچی دەرچووی باڵەخانەکان و شوێنە داخراوەکانی سەر شۆستەکە، وەلێ بێ هودە هەموو گیانم، سەرتاپا تەڕ ببوو. نە ڕێژنە باران دەوەستا و نە منیش لە ڕۆیشتن. هێشتا لەو ڕێگایەی لەبەردەمم بوو، کەمم بڕی بوو و زۆرم مابوو. بەڵام تووشی دۆخێکی ناهەموار و خراپ ببووم. بۆیە نەمدەزانی لەوێوە چۆن دەگەمەوە ماڵ. چونکە بەو پارەیەی دەبوو پێی بچمەوە، ڕۆژنامەم کڕی بوو. بۆیە نەمدەتوانی سواری پاسیش ببم. بەبێ چارە و سەرلەبەرخۆ، هەر بەردەوام بووم لە ڕێ کردن. ڕێگا و بان بە هۆی باران بارینی بە لێزمەوە، بەقەد چەمێك ئاوی لێ خڕ ببۆوە. لەبەر ئەوەی ئاوەڕۆکانی ژێر زەویش گیرابوون، بەشێك لە شەقامەکان لافاوێکی بە خوڕ دەڕۆی. لەناو ئەو بێ چارەییەی خۆمدا کە بیرم لەوە دەکردەوە چیبکەم و چۆن بگەمەوە ماڵ، دکتۆر ئەرگین ئاتاسوم بە خەیاڵدا هات. بیرم لەوە کردەوە بچمە لای کاك ئەرگین و داوای هاوکاری لێبکەم. لەگەڵ دکتۆر لە نێوان ساڵانی ١٩٦٩-١٩٧٠ لە ئوناس بەیەکەوە کارمان دەکرد. دوای ڕژێمی ١٢ ئازار، ئەوێ گاڵە درا و لە دادگا دۆسیە لەسەر ڕێڤەبەرانی کراوە. لەناو ئەواندا فایلی لێپێچینەوە لەسەر ئەرگین ئاتاسوش دروست کرا. دکتۆر لە نێوان ساڵانی ١٩٦٩-١٩٧٠ لە بەشی پزیشکی دەروونی کۆلێژی پزیشکی زانکۆی ئەنقەرە بوو. ئەوسا چەند جارێك لەگەڵ برادەران، هەم لەکۆلێژ و هەمیش لە نۆرینگە پزیشکیەکەی، سەردانمان کردبوو.

ئەرگین ئاتاسوو، ئەوسا، لە نەخۆشخانەی دڵنیایی کۆمەڵایەتی لە ناوچەی دیش کاپی کاری دەکرد. ئەمەش وایکرد ئۆخەیەکم

بێتەوە بەرێ. پێنج خولەك مابوو، بۆ دەمژمێر پێنجی ئێوارە. بۆیە بەپەلە و هەنگـــــاوی گەورە گەورە، بەرەو نەخۆشـــــخانەکە کەوتـــــمەڕێ. دەمزانـــــی ژوورەکەی ئەو لە نهـــــۆمی یەکەمە. خۆشـبەختانە ئەرگیـنم بینـیەوە، لە کـاتێکی بـاش پێـی گەیشـتم، چونکە دەوامی تەواو ببوو و بۆ دەرچوون، خۆی ئامادە دەکرد. بێ ئەوەی کات بە فیڕۆ بدەم، دۆخەکەم بۆ باس کرد و داوای هاوکاریم لێکرد. تەنیاش داوای ئەوەندە پارەیەم لێکرد تا بیدەمە پاس و بگەمەوە ماڵ. وەلێ ئەو ٥٠٠ لیرەی دامێ. دێتەوە بیرم، پـارە کاغەزەکـان ڕەنگیـان مـۆر بـوو، لەگەڵ هەنـدێك خـوردەی ئاسن. دکتۆر ئەرگین ئاتاسو، کەسێك بوو لە نزیکەوە دۆخی من و ماڵباتەکەمان و لەمانی خێزانمی دەزانی. ماوە ماوەش، لە ماڵەوە سەردانی دەکردین. دوای ئەوەی پارەکەی دامێ، دەستێکی لەسەر شـانم دانـا و گـوتی "ئیسـماعیل، لەمەودوا، بە ڕێـك و پێکـی هاوکاریـت دەکەم. چـونکە دۆخـی مـاددیم باشـە و داهـاتم زۆرە". منیش دوای سوپاسکردن وەڵامم داوە "پێویست ناکات. چونکە لە ڕاستیدا دۆخەکەم باشە، وەلێ ئەمڕۆ شتێکی بێ بەختی ڕوویدا. بە بێ لێکدانەوە شتێکم کڕی، لە بەختی منیش لە پڕ باران دایکرد".

کاك ئەرگین دکتۆری دەروونی بوو لەو نەخۆشخانەیەی کاری دەکـرد. لەهەمـان کـات ئەنـدامی کۆمسـیۆنی دیـاری کردنـی (*ناسـگەری ئـوجرەت* - کەمترین مووچەی فەرمانبەران) بوو. دۆخی ماددی باش بوو. جگە لەمانە لە ناوچەی مارماڕا و ئایڤاڵك باخی دار زەیتوونی هەبوو. جا کاتێك باسی دار زەیتوونەکانی دەکرد، باسی پرۆفیسۆر ڕاسیم ئاداساڵی دەکرد. ماڵباتی ئەوان لە دوورگەی گیریتـــی یۆنـــانەوە هـــاتبوون. بەرامـــبەر بە زەویـــی و

زارەکانی گیریتیان، لە ئایڤاڵك زەویان وەرگرتبوو. ڕاسیم ئاداساڵ، لە ساڵانی شەستەکان، دکتۆرێکی دەروونی زۆر ناودار بوو. کاك ئەرگینیش خوشکەزای ڕاسیم ئاداساڵ بوو. ئەرگینیش لەگەڵ خاتوو ئەرەندیز دەستگیراندار بوو. ئەوڕۆژەی چوومە لای، خەریکی ئامادەکاریەکانی هاوسەرگیری بوون. ئەرەندیز، لە کۆلێژی دەرمانسازی مامۆستا بوو. ئیدی ئەو سۆزەی کاك ئەرگین کە گوتبوی "ئیسماعیل لەمەودوا، هەموو مانگێك هاوکاریت دەکەم" نەهاتە جێ. بۆیە دواتر نە من و نە ئەرگین باسی ئەو پەیمانەمان نەکردەوە. ئەرگین برادەرێکی زۆر مێرخاس و دەست کراوە بوو. ئاگاداری ئەوەبووم هاوکاری چەند برادەرێکی دیکەشی دەکرد، کە وەکو من دۆخێکی ناهەمواری ماددیان هەبوو.

لەگەڵ کاك ئەرگین لە کۆتایی شەستاکان، لە سەندیکای مامۆستایانی هاوکاری زانکۆ، بەیەکەوە کارمان دەکرد. عەزیز ئەکشی، ئەوسا سەرۆکی ئوناس بوو. ئۆرهان عیزەتیش پارێزەری ئوناس بوو.

## سەندیکای نووسەرانی تورك
## عەزیز نەسین و دیسان پێشکچیی "ئاژەوەگێڕ"

لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٧٩، کۆبوونەوەیەکی دەستەی گشتی سەندیکای نووسەرانی تورك بەڕێوەچوو. جڤینەکە لە ناوچەی چاغال ئۆغلو لە ئیستانبوول، لە باڵەخانەی کۆمەڵەی ڕۆژنامەنووسان بەسترا.

بەیانی کۆبوونەوەکە، بەر لەوەی بچینە هۆڵی جڤینەکە، بە لاقرتێوە گوتیان "ئەمڕۆ تۆ پاسەوانت دەبێ" بۆیە داوای گەیشتنی شەفیق دوندار دەکەین تا بەیەکەوە بچنە ژوور. دوای هاتنی، لەگەڵ شەفیق بەیەکەوە چووینە کۆبوونەوەکە.

سەرەتا عەزیز نەسین[1]، وەکوو سەرۆکی گشتی وتارێکی دا و باسی "گەشتی ئەدەبی ڕۆژهەلاتی" کرد. مەبەستی لەو گەشتە ئەوەبوو، چەند نووسەر و شاعیرێك، بە شێوەیەکی کۆمەڵ، بچنە شارە کوردییەکان و لەوێ بەشێك لە شیعر و ڕۆمان و چیرۆکەکانی خۆیان بە تورکی بخوێننەوە.

دوای وتارەکەی عەزیز نەسین، من دەستم بە ئاخافتن کرد. وتارەکەم ڕەخنەگرتن بوو لەو هەڵوێست و بیرۆکەی ئەوان خستیانە بەر گوێیان. لەوێ باسم لەوە کرد، دەبێ بە پلەی یەکەم ئەو نووسەرانە، دژی ئەوە بوەستنەوە، کە دەوڵەت بۆچی نکۆڵی لە کورد و زمانی کوردی دەکات و سڵ لە جێبەجێکردنی سیاسەتی تواندنەوەی گەلی کورد ناکاتەوە؟ جا لەوەش خراپتر، ئێوە کە بەرامبەر بەو کارانەی دەوڵەت ناوەستنەوە، دێن و دەتانەوێت بچنە شارە کوردییەکان، تا چیرۆك و شیعر و ڕۆمان بە زمانی تورکی بخوێننەوە؛ بۆ ئەوەی هاوکاری حکوومەت بن لە تواندنەوەی زمانی کوردی و نەهێشتنی لە ناوچەکە.

---

(1) مەهمەت نوسرەت نەسین، ناسراو بە عەزیز نەسین (١٩١٥-١٩٩٥) نووسەرێکی تەنز نووسە. یەکێکە لەو نووسەرانەی، لە دوای ئۆرهان پاموك و یاشار کەمال و نازم حیکمەت، پەرتووکەکانی بۆ سەر ژمارەیەکی زۆری زمانەکانی جیهان وەرگێڕدراون. چەندان کتێبیشی کراونەتە زمانی کوردی. (وەرگێڕ).

ئەوانەی لە ڕیزی پێشەوەی ئەوێ دانیشتبوون، دژی قسەکانی من، دەستیان بە هەڵوێست وەرگرتن کرد، بە تایبەتی نووسەرە ئیختیارەکان. جا نووسەرە پیرەکان، تا من زیاتر بەردەوام بووم لە ئاخافتن، ئەوانیش دژایەتییان بەرامبەر بە وتارەکانم زێدەتر کرد. ئیدی نەك تەنیا بە قسە وەڵامیان دەدامەوە، بەڵکو بەرگەی بۆچوونەکانیان نەگرتم و هەڵسانە سەرپێ و دەیانویست قسەبڕم بکەن؛ چونکە دەمێك بوو پرۆتێستۆی وتارەکەیان دەکردم و منیش گوێم پێ نەدەدان. پاشان دەستیان بەوە کرد، تا هەرچی کەلوپەلی بەردەمیان بوو، بە مێزکانی پێش خۆیان دادا. یەکێك لەوان، گۆچانێکی بەدەستەوە بوو و ڕمب ڕمب بە زەویدا دەکێشا... جا لەوە خۆشتر، نارەزاییان بەرامبەر بەوانەش پیشان دەدا، کە وتارەکەی منیان پرۆتێستۆ نەدەکرد. پاشان ڕوویان لە سەرۆکی دیوانی سەندیکا کرد و بەسەریدا هاواریان دەکرد "بۆچی مافی ئاخافتنت بەو پیاوە داوە؟ زوو ئەو دنەدەرە ئاژاوەگێڕە لەسەر سەکۆی وتاردان بهێنە خوارەوە؛ چونکە سەندیکا بە داخستن دەدا...". دوو سێیەك لەو نووسەرە بە تەمەنانەم باش لە یادە. لەوانە ئیلهامی بەکیر تەز (١٩٠٦-١٩٨٤) نەجاتی جومعالی (١٩٢١-٢٠٠١) حەسەن عیزەدین دینامۆ (١٩٠٩-١٩٨٩).

غەڵبەغەڵب و هەرا و هۆسیای سەرکۆنەکردنی من لە ڕیزی پێشەوەبوو. وەلێ هیچ کەسێك لەوانەی دواوە نەدەبوونە هاوبیر و هاوشانییان. بەڵام ئەوانیش وەنەبوو، داوای پاراستنی مافی دەربڕینی بۆچوونەکانم بکەن و وەڵامی ئەوانەی پێشەوە بدەنەوە؛ لە کاتێکدا، زۆر نووسەر و دۆست بەشداری کۆبوونەوەکەیان کردبوو.

ئۆرهان ئاپایدنی (١٩٢٦-١٩٨٦) سەرۆکی دیوانی سەندیکا بە گوتنی "بێشکچی، ئێمەش ئەو شتانە دەزانین، بۆیە پێویست بە گوتنی ئەو ڕستانە ناکات و بە کورتی بیبڕەوە..." هەوڵی ئەوەی دەدا بەربەست لەبەردەم ئاخافتنەکەم چێکات.

ئەو هەرا و هۆریا و دەنگە دەنگە، منی زار بەش کرد. هاوکات، هۆشیشمی پەرش و بڵاوکرد بەخۆیەوە. چوونکە، لەبەر قارە قاڕ و هەرا و هۆسیای خۆپیشاندەرانی پێشەوە، گوێم لەخۆم نەبوو چی دەڵێم. وەلێ سەرباری ئەوان، توانیم نزیکەی حەفت تا هەشت خولەك بدوێم.

چوومەوە شوێنی خۆم دانیشتم و بە شەفیق دونداریم گوت "ئەرێ توانیم وتارەکەم بگەیەنم؟ تۆ شتێك لە ئاخافتنەکەم حاڵی بووی؟". شەفیقیش ئاوا وەڵامی دامەوە "کاك ئیسماعیل، کاتێك دەستیان بە هات و هوش و کەلوپەلەکانی بەر دەمییان بە مێزەکانیاندا دەکێشا، بیرم لەوە کردەوە، ئێستا نا ئێستا، هێرشت دەکەنە سەر و لێتدەدەن، بۆ ئەوەی ئەو دیمەنانە نەبینم، چوومە ئاودەست". جا بۆم ڕۆن بۆوە، ئەو شەفیقەی بەناوی پاراستنی من لەگەڵم هاتە ژوورەوە و لەتەکم ڕۆنیشت، لە ترسی تەق و هۆڕی پێشەوە ڕایکردبووە ئەدەبخانە.

***

دەمەوێت لێرەدا، هەستێکی خۆم بەیانکەم. لەسەرەوە باسی چەند نووسەرێکی ئیختیارم کرد. ئەو بەروارەی کۆبوونەوەی سەندیکای نووسەرانی تورکی لێ بەڕێوەچوو لە ساڵی ١٩٧٩، ڕێز و حورمەتێکی زۆر بۆ ئەو نووسەرانە هەبوو. بۆ نموونە کاتێك

دەیانویست بەسەر پەیژە بکەون، یان پێیدا بێنە خوارەوە، خەڵك دەچوو دەستیان دەگرتن. بۆ هەموو شوێنێك بە پێش خۆیان دەدان و لە پێش خۆیان دایان دەنیشاندن. جا ڕێز و حورمەت و ستایشێکی زێدە دەکران. لەوی بەروارێدا، ئیلهامی بەکیر تەز تەمەنی ۷۳ ساڵ بوو و نەجاتی جومعالی ۵۹ ساڵ و حەسەن عزەدین دینامۆ ۷۰ ساڵان بوو. ئۆرهان ئاپایدنیش ۵۳ ساڵ. من ئەمڕۆ کە ئەو دێڕانە دەنووسم لە ساڵی ۲۰۲۰، تەمەنم ۸۱ ساڵە. وەلێ خۆم وا نابینم کە بەتەمەن بم و پێویستیم بە دڵنەوایی کردن بێ.

***

لەناو چوارچێوەی ئەو پەیوەندیانەدا، دەمەوێ ڕووداوێکی دیکەش بهێنمە زمان:

لە نێوان ساڵانی ۱۹۹۸-۱۹۹۹، کاتێك وەك بەندکراوێك لە زیندانی بورسا بووم، نووسینێکی سەننور سەزارم (۱۹٤۳-۲۰۱۵) دەخوێندەوە، لە بڵاوکراوەی (رادیکاڵ کیتاب ئەکی). لەوێ نووسەر باسی پەرتووکەکەی مەڕاڵ چەلەنی[1] دەکرد بە ناوی (ساڵەکانی گەڵ عەزیز نەسین). مەڕاڵ چەلەن لە پەرتووکەکەی، من وەك (سیخوڕێکی دنەدەر) دەناسێنێ و لەوبارەیەوە لەسەری نووسی بووم. وەلێ سەننور سەزار بە ڕەخنەگرتن لە مەڕاڵ چەلەن لە وتارەکەیدا بۆی نووسی بوو "تۆ نە بێشکچی دەناسی، نە

---

[1] مەڕاڵ چەلەن لە ساڵی ۱۹۳٤ لە دیاربەکر لە دایك بووە. لە ساڵی ۱۹٥٦ لەگەڵ عەزیز نەسین هاوسەرگیری پێك دەهێنن و تا ساڵی ۱۹٦۷ لە پرۆسەکە بەردەوام دەبن. لەو ماوەیەدا دوو منداڵی دەبێت بە ناوەکانی حوسێن عەلی و ئەحمەد نەسین. (وەرگێڕ).

شارەزایت لە کێشەی کوردیدا هەیە...".

جگە لەو نووسینەی سەنتور سەزار، دەمەوێ ئاماژە بە وتارێکی ڕەجەب مارشاڵیش بکەم لەسەر پەرتووکەکەی مەڕاڵ چەلەن:

وتارێك هەیە لە پەرتووکی (ئیسماعیل بێشکچی)، کە لەلایەن ڕەجەب مارشاڵ و بارش ئونلوو و ئۆزان دەیار ئامادەکرابوو. ناونیشانی وتارەکە ئاوایە (ئیسماعیل بێشکچی و جوڵانەوەی کوردی). لە پەراوێزی لاپەڕە ٢٥١ پەرتووکەکە، چەند ڕستەیەك لە پەرتووکی مەڕاڵ چەلەن وەرگیراوە و ئاوا نووسراوەتەوە "یەکێك لە ئەندامەکان، کە هەستم کردبوو کەسێکی ئاژاوەگێڕ و بە ڕەگەز کوردە، کە دەستی بە وتاردان کرد، بەڕاستی بەهەموو جوڵە و ئاخافتن و ڕێکخستنی ڕستەکانیدا دیاربوو، ئەو سیخوڕێکی پۆلیسییە. چونکە ئەگەر وانەبێ، هیچ نووسەرێکی دیکە نەیدەتوانی وتارێکی ئاوا لەسەر سۆسیالیزم، یاخود پرسی کورد پێشکەش بکات. ئێستا ناوی ئەو کەسەم بەبیر نایەتەوە، نایەتەوە خەیاڵیشم لەوێ چی گوت، وەلێ ئەوەم لەبیرە کە لە دوای ئەو، عەزیز نەسین چۆن چووە سەر سەکۆی وتاردان و دەستی بە ئاخافتن کرد، جا زانیم وتەکانی چەند لەسەر حەقە".

چەلەنی نووسەریش، پێی وایە "عەزیز نەسین بە هۆی ئەو موناقەشەیەی لەسەر کورد دروست بوو، لە هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی سەندیکای نووسەرانی تورك کشایەوە". ئەوە ڕاست نییە، چونکە عەزیز نەسین، لە کۆنگرەی دوای کودەتای ١٢ی ئەیلوول، دەستی لە ئەندامییەتیی سەندیکا کشاندبۆوە. ئەو نووسەرەی چەلەن ناوەکەی نازانێ و بێ خەبەر لەوەی چی نووسیووە، چونکە هیچی ئەوی نەخوێندۆتەوە، بەڵام ئەو کەسەی

ئەو پێـی دەڵـێ کـوردێکی ئـاژاوە گێـڕ، بە بۆچـوونی ئێـوە لە ئیسماعیل بێشکچی زیاتر دەبێ کێ بێ؟.

بـا سـەرنج بـدەین لەوەی بـۆچی کە گـوتم "دەوڵەت و حکـوومەت، نکـۆڵی لە کـورد و زمـانەکەی دەکەن، بە هەمـوو شێوەیەك دەیانخەنە ناو سیستەمی تواندنەوە. بۆیە نووسەران، بەر لەوەی بچن نووسینە تورکییەکانی خۆیان لە شارە کوردییەکان بخوێننەوە، دەبێ بەرامبەر بەو نکۆڵیکردنەی دەوڵەت بووەستنەوە... " دەبنە هۆی ئەوەی یەکێك بڵێ سیخوڕ و یەکێکیش بە ئاژەوەگێڕ بمناسێنێ و بەو تۆمەتانە تاوانبارم بکەن.

بەلای ئەوانەوە، ناوی کـورد و وشـەی کـوردی تەنیا لەلایەن سـیخوڕ و ئـاژاوە گێـڕانەوە بەکاردەهێنـدرێت. ئـاخۆ سـیخورە پۆلیسییەکان بۆچی ئەو وشانە بەکار دەهێنن؟ بە بۆچوونی ئەوان بۆچی تەنیا سیخوڕ و پۆلیس ئەو دەستەواژە و ئەو ناوانە بەکار دەهێنن؟ با من پێتان بڵێم کە ئەوان بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە ئاوا بیردەکەنەوە: ئەگەر هات و کەسێك هەبوو پێشوازی لێیان کرد، تا زوو زمانی لێ بدەن و بە گرتن بچێ... لە کاتێکدا هیچ بیر لەوە ناکەنەوە، با ئەو واقیعیەتە لە ڕێگای میتۆد و ڕێبازی زانستییەوە لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی لەبارەوە بکرێ. بەڵام هەرگیز شتێکی ئاوایان بە عەقڵیشدا نایەت. هەرگیز درك بەوەش ناکەن، بۆچی هەر کەسێك لە نووسین و وتار و پەرتووکەکانیدا باس لە وشە و ناوی کورد بکات، ڕووبەڕووی سزای توندی کارگێڕی و ماددی دەبێتەوە؟ چونکە ئەو شتانەیان بەلاوە ئاساییە. جا دەزانن بۆچی ئەمانەیان بەلاوە ئاساییە؟ چونکە بۆچوونی فەرمی ڕێگا و ڕێکاری بیرکـردنەوە و زانسـت و هـونەر و هەمـوو شـتێکی بـۆ دیـاری کردوون.

ئیدی ئەوە دەرخەری ئەو ڕاستییەیە کە تا ساڵانی نەوەدەکانی سەدەی ڕابردووش، فیکر و ڕامانی تورك، چەند پڕ کێشە و نا تەندروست بووە. سیاسەتی نکۆڵیکردن، هۆشی تورك و تێگەیشتنی سۆسیالیزمی خنکاندووە.

مەڕاڵ چەلەن، باس لە نووسەرێك دەکا، کە ناوی بیر نایەتەوە و دوو دێڕی ئەوی نەخوێندۆتەوە، تا بزانێ باسی چی دەکات، بەڵام بە ئاسانی بە ئاژاوەگێڕی دەناسێنێ! وەك ڕەجەب مارشاڵ دەڵێ، ئەو نووسەرە ئیسماعیل بێشکچییە.

من زۆر لە نزیکەوە مەڕاڵ چەلەن دەناسم. ساڵی ١٩٥٤ کاتێك دەستم بە خوێندنی ئامادەیی کرد لە چۆرم، ئەو لە پۆلی سێیەم بوو. لەوێ دەمێدا قوتابیانی پۆلی سێیەم، شیعرەکەی نامیق کەمالیان[١] بە ناوی ( ڤەتەن یاهووت سیلیستەر) خستبووە سەر سەکۆی شانۆ. جا وێنەیەکیشیان لە دەرگای چوونە ژوورەوەی کتێبخانە هەڵواسرابوو، کە ڕێڕەوی چوونە ژوورەوەی قوتابخانە بوو. مەڕاڵ چەلەن ڕۆڵی زەکییە ڕۆلوندی نواندبوو. من ئەوسا، قوتابی ئامادەیی بووم. بۆیە لەو باوەڕەدامە ئاساییە ئەگەر ئەوێ سەردەمێی بیر نەیەتەوە، وەلێ من لە نزیکەوە ئەو دەناسم. پێم وابێ ئەوەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە قوتابیانی پۆلەکانی دواوە، بەردەوام هەست بە جۆرێك لە پەیوەست بوون دەکەن بەو قوتابیانەی لە پۆلەکانی سەرووی خۆیانن. ساڵی ١٩٥٥ مەڕاڵ چەلەن ئامادەیی تەواو کرد. پێم وابێ هەر هەمان ساڵ بوو کە

---

[١] نامیق کەمال (١٨٤٠ – ١٨٨٨) نووسەر و شاعیر و ڕۆژنامەڤانێکی تورکە و بە شاعیری نیشتیمان دەناسرێت. (وەرگێڕ).

لەگەڵ عەزیز نەسین هاوسەرگیرییان کرد. لەوێساڵێدا بەبیرم دێ پەرتووکێکم خوێندەوە بەناوی (گوللوو).

ساڵی ٢٠١٨، لە پێشانگای پەرتووکی دیاربەکر، لەگەڵ عەدنان ئۆزیالنەری هاوسەری سەنوور سەزەر یەکدیمان بینی. مامۆستا جەلال تەمەلیشم لەگەڵ بوو. ئەو ڕووداوانەم بۆ کاك عەدنان باسکرد، ئەویش باسی ئەوەی کرد کە، سەنوور سەزار و مەڕاڵ چەلەن لە نزیکەوە یەکدییان دەناسی. لە زۆر شوێن و دەزگای میدیایی و ناوەندی بڵاوکردنەوەش بەیەکەوە کاریان کردووە.

ئیسماعیل بێشکچی، لە ناو شەمەندەفەری هێلی نێوان ئەنقەرە و ئیستانبوڵ.
لە ئەرشیفی ئونساڵ ئۆزتورك.

سالّی ١٩٩٠، زیندانی (مەتریس) لە دیدارێکی کراوەدا، لەمان بێشکچی
خێزانی ئیسماعیل بێشکچی، لەگەڵ هاوسەرەکەیی و هاوڕێکانی زیندانی.

# بەشی شەشەم
# ئەودیووی زانین دادگاییکردن و زیندانییەکانی
# نێوان ساڵانی ۱۹۷۹-۱۹۸۷

## پەرتووکەکەتان ناوی چی بوو؟

ساڵی ۱۹۷۹، بڕیاری دادگای تاوانی قورسی ئیستانبووڵ لەسەر دۆسیەیەکم، بریتی بوو لە تاوانبار کردنم. ناوەڕۆکی تۆمەتبارکردن و کردنەوەی دۆسیەکەم لەسەر پەرتووکی (بە زۆر نیشتەجێکردنی کورد) بوو.

دادگایی کردنەکەم، وەکوو هەواڵێکی کن، لە بەشێك لە میدیاکان بڵاوکراوە. ڕۆژی دادگایی کردنەکە چەند پارێزەرێکیش لەوێ ئامادە بوون. پێم وابوو ئەوان داواکارییەکیان پێشکەشی دادگای باڵا کرد، بۆ درێژکردنەوەی ماوەی دادگایی کردنەکە. لە ڕووی یاساییەوە پێویست بوو داواکارییەکە لە ماوەی حەفت ڕۆژدا بنووسرێت و پێشکەش بکرێ. وەلێ من لە ڕۆژی حەفتەمدا زانیم داواکارییەکە نەنووسراوە. چونکە پارێزەرەکان بێ خەمییان لێکردبوو و بیریان چووبوو.

دوای ئەوەی بە هەواڵەکەم زانی، ڕاستەپێ دەستم بە نووسینی داواکارییەکە کرد و هەر خۆشم بردمە دادگای باڵا. بە هۆی بلەز

نووسین و نەبوونی کاتەوە، ناچار بە دەست و خەت نووسراوەکەم بۆ دادگا بەرز کردەوە.

ئەو بویەرە لە مانگەکانی هاوینی سالّی ١٩٧٩ ڕوویدا. بیرمە ئەو ڕۆژە بەپەلە چوومە دادگای بالّا و پاسەوانانی بەر دەرگا دوای زانینی داواکەم، منیان ڕێنوێنی بەشی دیاریکراو کرد. لەوێ منیان ناردە لای دادوەرێك. کاتێك چوومە ژوورەوە، داواکاریەکەم پێشکەشی دادوەرەکە کرد، لەوێ ئەوەم بۆ باس کرد کە، لەسەر نووسینی پەرتووکێك دۆسیەم لەبارەوە کراوەتەوە، بڕیاری تاوانبارکردنم دەرچووە و بڕیارەکەم تەمیز کردووە، بەلّام ئەو داواکارییەم بۆ وەستاندنی کات نووسیوە. لە ماوەیەکی کورتیش وردەکاری نارەزایەتییەکەم بە داواکارییەکی دیکە پێشکەشتان دەکەم.

دوای قسەکانی من، دادوەرەکە داواکارییەکەی لە پێش خۆی دانا و فەرمووی دانیشتنی لێکردم. کە چوومە ژوورەوە خەریکی چا خواردنەوە بوو، بۆیە داوای چایەکی بۆ منیش کرد و دەستی بە ڕەخنەگرتن کرد لە حکوومەت و دەولّەت و بەو شێوەیە بەردەوام بوو "زۆر شەرمە بۆ تورکیا، تا ئەم سەردەمە، نەیتوانیووە ئازادی بیروڕا بۆ ولّاتەکەی دەستەبەر بکات...". دادوەر ئەم قسەیەی کرد و چایەکەم بە دەستی چایەچیەکەوە بۆ هات و لەسەر مێزە بچووکەکەی تەك شوێنی دانیشتنەکەمیان دانا. منیش قوم قوم، دەستم بە خواردنەوەی چایەکە کرد.

دادوەرەکە داواکارییەکەی بە دەست گرت. دوای واژوو کردنی ئاماژەی بەوە کرد کە دەینێرمە پێنووسی تایبەت. پاشان

لێی پرسیم "پەرتووکەکەتان ناوی چی بوو؟". منیش وەڵامم داوە (بە زۆر نیشتەجێکردنی کورد). هەر کە ناوەکەم لە نێو زار دەرچوو، سەروشکڵ و دەموچاوی دادوەر ترشا و شوێنەواری ڕووکەنییەکەی تۆزێك بەر لە ئێستای بەسەر دەموچاو نەما. لە شوێنی ئەو، نێوچاوانی بەیەك دادا و برۆکانی گیف کردەوە. پاشان ئەو دەستەی داواکاریەکەی منی پێ گرتبوو، کەوتە لەرزین. پێم وابێ هەستی بە پەشیمانی دەکرد لەوەی، منی لای خۆی دانیشاندووە و داوای چای بۆ کردووم؛ بەڵام ئیدی داواکاریەکەی واژوو کردبوو. بۆیە داوای لێکردم بیبەمە لای پێنووسی تایبەت. منیش بێ دواکەوتن، چایەکەم بە فرێك تەواو کرد و لە ژوورەکە دەرکەوتم. بەڵام دادگای باڵا لە ماوەیەکی زۆر کورتدا، بڕیارەکەی پەسەند کردبوو. بۆیە سەردەمی زیندانی تۆپتاشی لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٧٩ دوای ئەو پەسەند کردنە دەستی پێکرد.

## زیندانی تۆپتاشی

دوای پەسەندکردنی سزاکەم لەلایەن دادگای باڵاوە، لەسەر پەرتووکەکانی (کورتە مێژووی تورك - تیۆری زمانی هەتاو و کێشەی کورد - بە زۆر نیشتەجێکردنی کورد) بەرەو ڕێگای زیندان کوتامانەوە. لەوێ سەردەمێدا، لە ناوچەی ئوسکوداری ئیستانبووڵ دوو گرتووخانە هەبوون بە ناوەکانی (تۆپتاشی و پاشا کاپسی). حکوومەت چەپەکانی دەخستە بەندیخانەی تۆپتاشی و پارێزگارەکانیشی دەخستە ئەوەی دیکەیان. ئەم دابەشکردنەش

دوای گفتوگۆیەکی کورت لەگەڵ بەندکراوان، لەلایەن داواکاری گشتییەوە بڕیاری لێدەدرا.

بڕیاریان لەسەر مندا، تا بمبەنە گرتووخانەی تۆپتاشی. ئەو ڕۆژەم بە تەواوی لەبیرە، ناوەڕاستی مانگی نۆی ساڵی ١٩٧٩ بوو. لەناو ئەو پەرتووکانەی لەناو هەمبانەکەی مندا هەبوو، کتێبێکم لەگەڵ خۆم بردوو، کە تایبەت بوو بە فێربوونی زمانی عوسمانی. کاتێك لە دەرەوە ئازاد بووم، ئەوەم بیستبوو کە شۆڕشگێڕەکان، کاریگەرییەکی زۆریان لەسەر کاربەدەستانی بەندیخانەی تۆپتاشی هەیە. دوای ئەوەی لەژێر دەرگا لەلایەن چەند گاردیانێکەوە، پشکندرام، دواتر کارەکانی ناو تۆمارکردنم لەلایەن چەند کەسێکەوە بۆ تەواو کرا. دواتر هەستمکرد ئەوان لە شۆڕشگێڕەکانن؛ هەر ئەوانیش منیان بردە هۆڵی دیدارەکان. کە چوومە ژوورەوە، بە بینینی وێنە هەڵواسراوەکانی سەر دیوارەکان و درووشمە نووسراوەکانیان، زانیم ئەوان سەر بە ڕێکخراوێکی پارتیزانینە. ئەوانیش دوای گەڕانی جانتا و کۆڵە پشتەکەم، پەرتووکی فێربوونی زمانی عوسمانیان دۆزییەوە. لەناو کتێبەکە نووسینی پیتی عەرەبی هەبوو. بۆیە کە پەرتووکەکەیان بینی، وایانزانی منیش لە پارێزگار و ڕاستڕەوەکانم. بۆیە ڕوویان تێکردم و گوتیان "تۆ لە لێپێچینەوە زۆر دەچێژیت، ئیدی لەوێ دەبینی... ".

من هیچم پێ نەگوتن، چونکە بیرم لەوە دەکردەوە ئەوانە باسی لێپێچینەوەی چی دەکەن؟ لەوێ زۆر نەمامەوە، چونکە دوان لەوان، منیان لەگەڵ خۆیان برد و بەسەر پێبلقەیەك سەرکەوتین و

چووینە قاوشێك کە نهۆمێك لەسەر ڕێڕەوی هاتنە ژوورەوەی بەندیخانەکە بوو. قاوشەکە هەر چوار لای بە چارپای دوو قاتی گیرابوو، وەلێ شوێنێکی بچووك بوو. ئەو دوو کەسەی منیان هێنا، لە نێوان خۆیان گوتیان "هەبێ و نەبێ، دەبێ ئەوە لە دەستەی پارێزگارەکان بێ، وەلێ بەهەڵە هێناویانەتە ئێرە". لە کاتی قسەکردنیشدا پەرتووکی فێربوونی زمانی عوسمانیان بەیەك پیشان دەدا. پاشان بەو شێوەیە بەردەوام بوون "خراپ نابێ ئەگەر ئەو برادەرە بخەینە ژێر لێپێچینەوەیەکی توند، تا بزانین لە دەرەوە چی کردووە ...؟".

زۆر برادەری دیکە لە قاوشەکە بوون. ئەوان لێیان دەپرسیم کێم و چ کارەم، تاد... لەوێ سەروبەندێدا، گەنجێك بەژوور کەوت، کە بەرپرسی خاوێنکردنەوەی قاوشەکە بوو. گیسك و فڵچەی پاقژکردنەوەی پێ بوو. وەلێ کاتێك منی بینی، ڕاست هاواری کرد "کاك ئیسماعیل، کاك ئیسماعیل...! " و لێم هاتە پێش. بانگردن و هاتنە پێشەوەکەی زۆر گەرموگوڕ و دۆستانە بوو. بۆیە کاتێك بینی منیان خستۆتە ژێر لێپێچینەوە، بە کوڕەکانی قاوشەکەی گوت "چۆن کاك ئیسماعیل ناناسن؟ ئەو چەندان پەرتووکی هەیە. هەتا لە ماڵی ئێمە زۆرترین کتێبی کاك ئیسماعیل هەیە. برا گەورەکەشم زۆرترین کات پەرتووکەکانی ئەو دەخوێنێتەوە. منیش لەگەڵ ئەوەی خوێنەر نیم، وەلێ چەندین جار هەوڵی خوێندنەوەی پەرتووکەکانی ئەوم دا... " ئەو پێی گوتم خەڵکی شاری وانە و ناوی تێکەڵ بە ناوی چەند کەسێك بووە کە کاری دزیان کردووە. دوای ئەو قسانە، برادەرانی ئەوێ بەرامبەر من هەستیان بە ڕوو زەردی کرد، زۆریش شاگەشکە

بوون بە قسەکانی، بەڵام بە وردی گوێیان بۆ وتەکانی گرت. بۆیە دوای ئاخافتنی ئەو گەنجە، سزادراوانی قاوشەکە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ من گۆڕا. ئەوجارە لە بڕی لێپێچینەوە، دەستمان بە گفتوگۆ و دەمەتەقێ کرد. لەوێ باسی پەرتووکە بڵاوکراوەکانم کرد، کەلەسەری دادگایی کراوم و سزادراوم، لە سەردەمی ڕژێمی دوازدەی ئازار. ئەوانیش بە وردی گوێیان بۆ ڕادێرابووم. دواتر بڕیاری ئەوەیان دا، تا لەلایان بمێنمەوە.

لەوێ دەمێدا، زیندانی تۆپتاشی سێ قاوشی ۱۲۰-۱۳۰ کەسی لێ بوو. هەڤاڵە شۆڕشگێڕەکان، لە قاوشی دووەم دەمانەوە. ئەو ژوورە بچووکەی لەسەرەوە باسم کرد، بەشێك بوو لە قاوشی دووەم. لەوێ نوێنەری ڕێکخراوە شۆڕشگێڕییەکان لێی نیشتەجێ بوون. لەوێش حەفت چارپای دوو قاتی هەبوو بۆ خەوتن.

هەرچی تایبەتە بە هۆڵە گەورەکە، لەوسەرەوە بۆ ئەوسەر، بە دار، یاتاغی تەختەیان لەسەر زەویەکە دروستکردبوو. بەڵام ئەوانیش دوو شوێنی خەوتنیان لەسەر یەك بوو. تەختەکانی سەر زەوی بەبێ ئەوەی هیچ بۆشاییەکیان لە نێواندا هەبێ، نوێنیان لەسەر داندرابوو و، لەوسەروە بۆ ئەمسەر درێژ دەبۆوە. ئەمە لە هەردوولا بەڕێکی دەکەوتە بەرچاو. لە ناوەڕاستیش، دۆڵاب و چەکمەجەی سزادراوان و گرتووان داندرابوو. لەوێ بۆ هەرکەسێك بالینگانێك هەبوو بۆ خەوتن، وەلێ بۆ هەر کەسێك دۆڵابێك نەبوو. بۆیە دوو دوو و سێ سێ دۆڵابێکیان بەیەکەوە بەکار دەهێنا.

لە لای سەرەوەی قاوشەکە تەلەفزیۆنێك هەبوو. لە ڕاست و

چەپی تەلەفزیۆنەکەش، لەسەر دیوارەکەی پشتی، وێنەی دەنیز گەزمیش[1] و ماهیر چاپان و ئیبراهیم کایپاککایا هەڵواسرابوو. هاوکات لەوێ هەر ڕێکخراوە و بەشێکی تایبەت بەخۆی هەبوو. لەوێ وێنەی هەموو ئەندامانی کوژراوی ئەو ڕێکخراوە هەڵدەواسرا، کە لە شەڕەکان گیانیان لەدەستدابوو. لەپاڵ ئەمە، چەندان دروشمی سیاسی بە جیا جیا لە چەند شوێنێك، بە دیوار هەڵواسرابوون.

ئێواران، گەشتی هەواڵەکان بە هەوەسێکی زۆرەوە گوێی لێ دەگیرا و دواتر گەنگەشە دەکرا. هەموو ئێوارەیەکیش لەگەڵ زەردەپەڕ، پەروەردە و چالاکی ڕێکخراوەکان، بە جیا جیا دەستی پێدەکرد.

دەرگای قاوشەکانی زیندانی تۆپتاشی، بە درێژایی ڕۆژ ڤالا بوون و گاڵە نەدەدران. بۆیە هەر کەسێك ویستبای، دەیتوانی سەردانی قاوشەکانی دیکە بکات بۆ سەردانی کردن. شوێنی هەواگۆڕکێش لە سۆری سبەینێوە تا کەوتنی هەتاو، هەر بەکراوەیی دەهێڵدراوە. بەڵام زەویەکەی هەواگۆڕکێ خۆڵ بوو، وەلێ داری زۆر بە هەیبەت و جوانی لێ بوو.

قاوشی سێیەمی زیندان، پێی دەگوترا هۆڵی قاچاغچییەکان. ئەوان بە نهێنی لایەنگیری پارێزگارەکانیان دەکرد. لەوێ بە دەستی

---

[1] دەنیز گەزمیش (١٩٤٧-١٩٧٢) قوتابیەکی شۆڕشگێڕی تورکی مارکیسی، لینینی بوو. یەکێك بوو لە دامەزرێنەرانی سوپای ئازادی میللی تورکیا. لەدوای کودەتای ساڵی ١٩٧١ لە تورکیا، دەستگیر دەکرێ و سزای لە سێدارەدانی بۆ دەردەچێ و ساڵێك دوای بەندکردنی لە دار دەدرێ. (وەرگێڕ).

ڕاست هۆڵێکی بچووك هەبوو. برادەران دەیانگوت، یڵماز گونەی[١] لەوێ ماوەتەوە.

قاوشی دووەم و سێیەم، بە پەیژەیەك بۆی سەردەکەوتی، کە لەناوەڕاستی گرتووخانەکە بوو. پێبلقەکە شوێنی هەواگۆڕکێی دابەشی سەر دوولا کردبوو. هەردوولاش زەویەکەیان خۆڵ بوو. وەلێ چیمەن و گوڵ و گوڵزاری جوان و داری بالاّ بەرزی لێ بوو. بەلاّم لەوێ زوو زوو دەبووینە بینەری جرت و فرتی مشکەکان. چونکە ئەوانمان لە قاوشەکان کەم دەکەوتە بەرچاو. هۆکاری سەرەکیش بۆ ئەوە دەگەڕاوە، کە ناوە ناوە ئاوەڕۆکانی ژێر زەوی دەتەقین؛ جا ئەوکات مشك و جورج لە شوێنی هەواگۆڕکێ، زیاتر دەردەکەوتن. هەندێك لە جورجەکان بەقەد فەرخە پشیلەیەك و هەندێکیشی گەورەتر. هەندێکیان تێدابوو لە گەورەییان توانای هەپروونکردنی پسیکێکیان هەبوو.

پاسەوانەکانی گرتووخانە، هەموو ئێوارەیەك سەرژمێری

---

[١] یڵماز گونەی (١٩٣٧-١٩٨٤) نووسەر و دەرهێنەر و سینەماکاری کورد. لە شاری ئەدەنە لە دایك بووە. ساڵی ١٩٥٩ یەکەم کاری دەرهێنانی فیلمی سینەمایی کردووە بە ناوی (منداڵەکانی ئەو نیشتیمانە). بۆ یەکەمجار ساڵی ١٩٦١ لەلایەن دەوڵەتی تورکیاوە دەستگیر دەکرێ و ماوەی ساڵ و نیوێك لە زیندان دەبێ. ساڵی ١٩٦٧ لەگەڵ نەباهەت چەهرە هاوسەرگیری دەکەن، بەلاّم دوای ساڵێك لەیەك جیا دەبنەوە. ساڵی ١٩٧١ جارێکی دیکە دەستگیردەکرێتەوە. ساڵی ١٩٨١ دوای دەرچوونی لە زیندان، چووە فەرەنسا. ساڵی ١٩٨٣ لەلایەن کەنعان ئیڤرینی سەرۆك کۆماری تورکیاوە رەگەزنامەی تورکیای لێ سەندراوە. لە پاریس، لەگەڵ جگەرخوێنی شاعیر و عەبدولڕەحمان شەرەفکەندی و کەندال نەزان و چەند رووناکبیرێکی دیکەی کورد، ئینیستیتوتی کوردی پاریسیان دامەزراند. یڵماز گونەی دۆستی هەریەکە لە مووسا عەنتەر و یاشار کەمال بوو. (وەرگێڕ).

بەندکراوانیان دەکرد. لەکاتی جێبەجێکردنی کارەکەش، برادەران لەسەر یاتاغەکانی خۆیان دادەنیشتن و گاردیانەکان دەهاتنە ناو هۆڵەکە و لەوسەر بۆ ئەوسەر سزادراوانیان دەژمارد.

لە هۆڵەکە ئاودەستێك هەبوو، وەلێ بەکارنەدەهێندرا. لەگەڵ ئەوەی بۆ چاککردنەوەی، چەند کەرەتێك وەستا هاتن و لێیان نواڕی، وەلێ هەرچی کردیان پێیان چاك نەکراوە. بۆیە پێویستی خۆمان لە ئەدەبخانەی هەواگۆڕکێی زیندانەکە دەکرد. شوێنەکەشی لە ژێرەوە بوو، نزیك پەیژەکانی چوونە خوارەوە. ئەگەر شەوانیش چووباینە سەرئاو، بە ناچاری دەچووینە ئاودەستە خراپ بووەکەی ناو قاوش. لە کاتێکدا ئەدەبخانەی قاوشی یەکەم و سێیەم هیچ کێشەیەکی نەبوو.

لە تەك ئاودەستە گەورەکە، خۆشۆرێکیش هەبوو. وەلێ ئەویش بە ڕێك و پێکی کاری نەدەکرد. بۆ چاکردنەوەی ئەوێش، چەند جارێك وەستا هاتن، وەلێ بێ فایدە. چونکە یەك دوو ڕۆژ دوای نۆژەنکردنەوەکە بە ڕێك و پێکی کاری دەکرد و دواتر هەمدیسان خراپ دەبۆوە. بە هۆی گەورەیی خۆشۆرەکە، لە یەك کاتدا ٢٠- ٢٥ کەس دەیانتوانی خۆیانی لێ بشۆرن. لە زیندانەکە سەرتاشێکیش هەبوو. پێم وابێ دەستبەسەرێك و بەندکراوێك بەیەکەوە لەوێ کاریان دەکرد. بۆیە هەرکەسێك لە چ کاتێك ویستبای، دەیتوانی بچێتە سەرتاشخانە.

باسیان لەوە دەکرد، گرتووخانەی تۆپتاشی، لە سەدەی نۆزدە،

لە سەردەمی سالآنی تەنزیمات[1]، وەکوو کاروان سەرای بەکارهاتووە؛ وەلێ دواتر کراوەتە بەندیخانە. لەوێ باسیان لەوەش دەکرد، کە لە دوای بەرواری ٢٧-٥-١٩٦٠، سەرکردەکانی پارتی دیموکرات لەوێ ماونەتەوە، لە نێویشیاندا جەلال بەیار[2] یەکێك بووە لە گیراوان.

لە سەرەوەی پەیژەی چوونە ژوورەوەی قاوشی یەکەم و دووەم، پەرتووکخانەیەك هەبوو، وەلێ بەردەوام داخرابوو. یەك دوو جار لەگەڵ بەڕێوەبەر، لەسەر ئەو مژارە قسەم کردبوو. یەکێك لەو کارگێڕانەی بەندیخانەکە، کە بەرپرس بوو لە کۆگای ئەوێ، کلۆمدراوی ئەوێی بەباش زانی بوو، لەبەر ئەوەی گوایە هەندێك شتی دیکەی کەسانی دیکەی تێدا هەڵگیرابوو. هەروەها ئەوەی بە بەڕێوەبەریش گەیاندبوو، کە کەسێك نییە سەرپەرشتی کتێبخانەکە بکات. لە کۆتا ڕۆژەکانی ساڵی ١٩٧٩، چەند برادەرێکم بینی، چوونە ژوورەوە و دوای ماوەیەك دەرچوون. بۆیە

---

[1] سەردەمی تەنزیمات لە ساڵی ١٩٣٩ لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، بەو ساڵانە دەگوترێ، کە بڕیار لەسەر نوێبوونەوە و بە مۆدێرنکردن دەرکرا. بە واتایەکی دیکە بڕیار درا بۆ (ڕێکخستنەوە و ریفۆرم). ئەم تەنزیماتە تا هاتنە سەر تەختی عەبدولحەمیدی دووەم لە ساڵی ١٨٦٧ درێژەی کێشا و لەوێ بەروارێ بەدواوە، دوای ڕاگەیاندنی مەشروتیەت، سەردەمی تەنزیمات کۆتایی پێهێندرا. ئەمە لەگەڵ ئەوە باس لەوە دەکرێ، بە نا ئاشکرا، تا کۆتایی هاتنی دەسەڵاتی عوسمانیەکان، ئەم تەنزیماتە هەر درێژەی کێشاوە. (وەرگێڕ).

[2] جەلال بەیار (١٨٨٣-١٩٨٦). لە نێوان ساڵانی (١٩٣٧ – ١٩٣٩) لە سەردەمی سەرۆك کۆمار مستەفا کەمال ئەتاتورك سەرۆك وەزیرانی تورکیا بووە. لە نێوان ساڵانی (١٩٤٦ – ١٩٥٠) سەرۆکی پارتی دیموکرات بووە. لە نێوان ساڵانی (١٩٥٠ – ١٩٦٠) سێیەمین سەرۆك کۆماری تورکیا بووە. (وەرگێڕ).

چوومە لایان پرسیاری دۆخی کتێبخانەکە و پەرتووکەکانی ناویم کرد. ئەوانیش وەڵامیان دامەوە کە، پەرتووکێکی چاك و زۆری لێ کەڵەکەکراوە. هەتا بیرمە گوتیان "پەرتووکی وای تێدایە، بەلاتەوە زۆر سەرنج ڕاکێش دەبێ". پاشان باسیان لەوە کرد، کیلۆنەکەی سەری شکاوە و تەنیا بۆ ناو لەسەری هێڵدراوەتەوە، بۆیە هەر کاتێك ویستت، دەتوانی بچیت و سەیری پەرتووکەکان بکەی.

هەموو ڕۆژێك، لەگەڵ کازیوەی بەیانی لەخەو ڕادەبووم. بیرم لەوە دەکردەوە، ڕۆژێك بچم و چاوێك بە پەرتووکەکانی ناو کتێبخانەکەدا بگێرم. یەکێك لەو ڕۆژانەی دەمویست بچمە هەوا گۆڕکێ، بۆ هەڵمژینی هەوای پاقژی سپێدە، لەسەر پەیژەکان، بەر لەوەی بچمە خوارەوە، سەرنجم کەوتە سەر پەرتووکخانەکە. منیش ڕووم تێی کرد و کیلۆنە شکاوەکەم لەسەر دەرگاکە هەڵگرت، چونکە پێویستی بە مفتە نەبوو بۆ کردنەوە؛ بۆیە بە ئاسانی چوومە هوندری پەرتووکخانەکە. لە دەرەوە وا دیار نەبوو، وەلێ لە ژوورەوە هۆدەیەکی گەورە و فراوان بوو... شوێنەکە لە هەرچوار لایەوە، بە ڕەف تا بنمیچ گیرابوو. ڕەفەکانیش پڕی کتێب بوو. وەك چۆن، دۆڵابی ژێر ڕەفەکانیش تژی پەرتووك کرابوون. لەوێ چاوێکم بە کتێبەکاندا خشاند و بڵاوکراوەکانی کۆلێژی یاسا و ئابووری و پەیمانگای تورکیا سەرنجیان ڕاکێشام. ئەو پەرتووکانەی لە نێوان ساڵانی ١٩٣٠ و ١٩٤٠ بڵاوکرابوونەوە، خەریك بوو بێنە ناو چاوان. لەبەر ئەوەی ژمارەی ڕەف و دۆڵابەکان ئەوەندە زۆر بوو، شوێنێك نەبوو تا مێز و کورسیەکی لێ دابندرێ و سەیری دوو پەرتووکی لەسەر بکەی. ڕاستە شوێنی دانیشتنی نەبوو، وەلێ

دەتوانرا لە ڕێگای کەسێکەوە، کە سەرپەرشتی ئەوێ بکات، بۆ خوێندنەوە پەرتووك بدرێتە ئەوانەی لەگەڵ خوێندنەوە سەر و کاریان هەبوو.

دوای ماوەیەك مانەوە لەناو پەرتووکخانەکە، ئیدی بیرم لەوە کردەوە دەرچم، بەڵام بەو بیرۆکەیەی تا دوای ماوەیەکی دیکە لەگەڵ یەکێك لە برادەران جارێکی دیکە سەردانی ئەوێ بکەمەوە؛ بۆیە ڕووم لە دەرگای چوونە دەرەوە کرد، تا بەرەو قاپی هەنگاو بنێم، لە پڕ، چاوم کەوتە سەر پەرتووکێکی بەرگ ڕەشی قەبارە گەورە. پەرتووکەکە سەرنجی بۆ لای خۆی ڕاکێشام؛ لە ناخمدا ویستی سەیرکردن و هەڵدانەوەی پەڕاوەکانیم لا چەکەرە بوو، بۆیە دەستم بۆی درێژ کرد و کتێبەکەم بەدەستەوە گرت و بینیم، پەرتووکی دەستوور بوو. ئەو کیتابەی یاساکانی لەخۆ گرتبوو، نزیکەی ٢٠٠٠ لاپەڕەبوو لەناو دوو بەرگی ڕەقدا. دەستم بە ئەمدیو و ئەودیو کردنی کرد، وەلێ کە ناوەڕاستی کتێبەکەم کردەوە، لە پڕ دەمانچەیەکم بینی؛ حەپەسام، هەندێکیش ترسم لێنیشت. زۆر بە وەستایانە ناوەراستی پەرتووکەکەیان بەقەد قەبارەی دەمانچەیەك هەڵکۆڵی بوو و چەکەکەیان لەناو حەشاردابوو. کە ئەو شتەم بینی، دەمودەست پەرتووکەکەم داخستەوە و لە شوێنی خۆیم داناوە و لە پەرتووکخانەکە دەرچووم. دواتریش هیچ شتێکم لەوبارەیەوە بۆ کەس باس نەکرد.

ڕۆژانی دواتر، چەندجارێك، بە تەنیا چوومەوە ئەوێ، دەمانچەکەش هەر لە شوێنی خۆی بوو، ماوەیەك دواتر هەستم بەوە کرد، دەمانچەکەیان لەوێ هەڵگرتووە.

***

یەکێـك لە ڕۆژەکـانی مـانگی دوازدە، لە بەشـی کـارگێڕی بەندیخانە، دەمویست چاوم بە بەڕێوەبەری بەندیخانەکە بکەوێ. وەلێ کە چووم هێشتا بەڕێوەبەر و جێگرەکەی لەوێ نەبوون. لەبەر دەرگـای ژووری بەڕێوەبەر، لەسەر کورسیەك دانیشتم و چاوەڕوانی هـاتنەوەی ئەوانم کـرد. لەوێ چـاوم کەوتە سـەر کۆسـپەیەکی گەورە لەبەردەم ژوورەکە. دەبـوو بەسـەر ئەوێ بکەویت پاشان بچیتە لای بەڕێوەبەر. کاتێك بەسەر پەیژەکان سەر دەکەوی و لە بـانیژەکەی تێـدەپەڕی و لە دەرگـاکە نزیـك دەبوویتەوە، لەبەردەم دەرگـاکە پاسـەوانێك وەستابوو. پاسـەوانەکە لەوێ، هەمـوو ئەو کەسـانەی لە تـۆقی سـەری تـا بنـی پێـی دەپشکنی، کە دەیانویست بچنە لای بەڕێوەبەر. منیشی ئاوا پشك پشك پشکنی.

لەبەردەم ژووری بەڕێوەبەر، شـوێنێکی دانیشتن هەبوو، کە لە تەختە و دار دروسـت کرابـوو. منـیش چـووم و لە کۆشـەیەکی دانیشتم و چاوەڕێی بەڕێوەبەر و کارگێڕانم دەکرد.

کەسێکی دیکەش هاتە بەردەم بەشی بەڕێوەبەرایەتی زیندان. ئەویـش چـوو تۆزێك لەولاتـر ڕۆنیشـت. لەسـەر کۆسپی بەردەم ژوورەکەش چەند کەسێك هاموشۆیان دەکرد. کەسێکی دیکەش چووە پاڵیان و دەستی بە هاموشۆکرد، وەلێ نەمزانی کەسە نوێیەکە لە دەرەوە هاتە ژوووڕەوە، یاخود هەر لە دەورووبەرەکە بوو. کەسە نـوێیەکە بەرەو پەنـجەرەکەی ئەوێ، ڕووی خـۆی وەرگێـڕا و لێـی نزیـك بـۆوە. دەمەکـی خـۆش، لە پەنـجەرەکەوە سـەیری شـوێنی

هەواگۆڕکێی کرد. دواتر گەڕاوە و خۆی لەو کەسە نزیک کردەوە، کە لە کە کە تۆزێك لەولاتری من دانیشتبوو. نزیکەی سێ مەترێکی مابوو بیگاتێ، لە پڕ دەمانچەیەکی لە تەنگەی بەر پشتی دەرهێنا و تەقەی لە کابراکەی ئەوێ کرد. کابرا دەمودەست دوای پێکانی گولەکان، کەوتە سەر زەوی. لە ماوەی چەند چرکەیەك لەگەڵ تەقەکردن، شێواویەکی زۆر دروست بوو...

دوو هەفتە دوای ئەو ڕووداوە، وەکوو گەواهیدەرێك، منیان بردە دادگای ناوچەی ئوسکودار لە ئیستانبووڵ. تەقەکەرەکە، لەبەر ئەوەی بەسەر تاوانەکەوە گیرابوو، بۆیە دانی بە هەموو شتێك نا بوو، بەڵام شایەدیەکەی من سەبارەت بە دۆسییەیەك بوو، کەلەسەر گاردیانی بەر دەرگای بەڕێوەبەر کرابۆوە. ئەو پاسەوانەی فایلی لێکۆڵینەوەی لەسەر کرابۆوە، خۆشی لەوێ بوو. دادوەر لەوێ لێی پرسیم، ئاخۆ کە چوویە بەشی بەڕێوەبەرایەتی، ئەو پاسەوانە تۆی پشکنی یان نا؟ منیش پرسیارەکەم بە بەڵێ وەڵامداوە، ئەوەشم بۆ باسکرد، نەك تەنیا من، بەڵکوو هەموو ئەو کەسانەی دەپشکنی کە دەهاتنە ئەوێ.

دوای دانیشتنەکەی دادگا، کاتێك لەبەر دەرگای هۆڵی دادگایی کردنەکە دانیشتبووم، پارێزەر بۆزکورت نوح ئۆغڵووم بینی. ئەویش لە دانیشتنێکی دیکەی دادگا دەرچووبوو و لەگەڵ بریکاردەرەکەی قسەی دەکرد. ویستم چاومان بکەوێتە سەر یەك و هەڤدوو ببینین، بۆیە ماوەیەك سەیرم کرد، وەلێ ئەو مژوول بوو و

چاوی نەکەوتە سەر چاوم. چونکە ماوەیەکی کەم دواتر لەگەڵ بریکاردەرەکەی لەوێ دوور کەوتنەوە.

***

بۆزکورت نوح ئۆغلوو، لەوکاتەوە دەناسم، کە لە نێوان ساڵانی ١٩٦٨-١٩٧٠ وەکوو قوتابی لە کۆلێژی یاسا بوو بە نوێنەری خوێندکاران و چالاکی جیا جیای بەڕێوەدەبرد. ئەوسا لەگەڵ ئەحمەد کەتەنجی بەیەکەوە نوێنەرایەتی قوتابیانیان دەکرد.

***

لە سەرەتای مانگی یەکی ساڵی ١٩٨٠، منیان بردە دادگای سزای دەستپێکی چاپەمەنی لە ناوچەی سوڵتان ئەحمەد لە ئیستانبووڵ. بە هۆی قەرەباڵغی ڕێگا وبان، زەحمەتییەکی زۆرمان لە چوون و هاتن بینی و کاتێکی زۆرمان پێچوو. شوێنی ژێرچاوکردنی دادگا، تژی خەڵك بوو. لەوێش ماوەیەکی زۆر لە چاوەڕوانی مامەوە. لە شوێنی چاوەڕوانیدا، لە من زیاتر کەسی دیکەی لێ نەبوو. دۆسیەکە لەسەر نووسینێك کرابۆوە. بە یاسای ژمارە ١٥٩ قانوونی کۆماری تورکیای کۆن.

لە بەندیخانەی تۆپتاشی، هەفتەی ڕۆژێك دیدار و سەردانی زیندانیان هەبوو لەگەڵ ئەوانەی دەهاتنە سەردانی. سەرلێدانی قاوشەکانی دیکەش لە ڕۆژی دیکە ڕێك دەخرا. وەلێ شوێنی دیدار زۆر تاریك بوو، ئاسنی بەردەمی نێوان میوان و بەندکراویش، تاریکیەکەی زێدەتر دەکرد. جگە لەوەی سەری ئاوەڕۆی شوێنی دیدارەکەش زۆر پیس و پەڵۆخ بوو. بەڵام کات دیاری نەکرابوو بۆ دیدارەکان، واتا میوان چەندی ویستبای،

دەیتوانی بمێنێتەوە. سا خوای دەکرد، لە سۆری سبەینەوە تا ڕۆژ کەوتن لەوێ دەبووی. لەوێ یلْماز ئۆزتورکی دۆستم، زوو زوو سەردانی دەکردم.

پاسەوانەکان ڕێگایان بەوە نەدەدا، میوانەکان خواردن و جلوبەرگ لەگەڵ خۆیان بۆ بەندکراوان ببەن؛ وەلێ پەرتووك و گۆڤار و ڕۆژنامە بە ئاسانی ڕێگایان پێدەدا. بۆ ئەمەش چەندی هێنابایان، لێیان نەدەگێڕانەوە. هەندێکجار وا ڕێك دەکەوت کە دیدارەکە بە بێ هیچ ناوبڕێك بکرێت. بەڵام ئەو چاوپێکەوتنانە، یان لە ژووری بەڕێوەبەر، یانیش لە هۆدەی جێگرەکەی دەکرا. هەندێکجاریش لەسەر سەکۆی بەردەم ژووری بەڕێوەبەر دەبوو. دیداری نێوان سزادراو و پارێزەرانیش هەر لەوێ ڕێك دەخرا.

تاوانباران و تۆمەتبارانی زیندان، چێشتی گەرمییان بۆ چێ نەدەکرا. شتێك نەبو بەناوی تاشتی و فراڤین و شیڤی، ناندینەکەش خۆی دەمێك بوو، لەکار کەوتبوو. هەرچی مەنجەڵ و قاپوقاچاغ و گونییەی خۆراکە وشکەکان و قووتوو هەڵگیراوەکان هەیە، تێکەڵ و پێکەڵ، بەسەریەکدا لە شوێنێك کەوتبوون. لە بڕی ئەوە، ناوەناوە، هەندێك خواردنی وشکی وەك زەیتوون و حەلوا و نیسك و نۆك و چایان بەسەردا دەبەش دەکردین... ناوەناوەش سابوونیان دابەش دەکرد. لەناو خواردنەکان بە هیچ کلۆجێك سەوزە و میوە دابەش نەدەکرا. جا لە بەندیخانەکە چێشتخانە و چایخانەی لێ نەبوو، ئەگەر دڵ ویستبای، دەبوو خۆت چا دروست بکەی.

بۆ دروستکردنی خۆراك لە نێوان خۆماندا، بتلی غازی

بچووکمــان بەکــار دەهێنــا. ئەو غــازە، یەکێــك بــوو لەو کەلــوپەلە گرنگـانەی پێویستیمان پێی بـوو. ڕاسـتە غـازی لەوە گەورەتـریش هەبوو، بەڵام ئەو غازە بچووکانەی بۆ سەیران بەکار دەهاتن، بۆ ئێمە باشتر بوو، چونکە بەکارهێنانی ئاسانتر بوو.

***

لە بەرواری حەفتەمـین ڕۆژی مـانگی دوازدەی سـاڵی ١٩٧٩، پرۆفیسـۆر دکتـۆر جاویـد ئۆرهـان توتەنگیـل، لە گەڵە کۆمەیەکـدا دەکـوژرێ. ئەوکـات مـن لە زینـدانی تۆپتاشـی بـووم. بەشێك لە بـرادەرە چەپەکـانی نـاو زینـدان، پێیـان وابـوو ئەوە چـالاکیەکە و لەلایەن چەپەکـانەوە ڕێکخراوە؛ بۆیە بە چەپڵەڕێزانەوە دەیانگوت "هەڤاڵان پارێزگارێکی دیکەشمان بەڕێکرد...". بەڵام زۆری ویست تا تێمگەیاندن کە مامۆستا جاوید ئۆرهان توتەنگیل، مامۆستایەکی گەورەی دیموکراسـی بـوو. جاویـد ئۆرهـان توتەنگیـل لە نێـوان سـاڵانی ١٩٧٣-١٩٧٤، ئەو سـەردەمەی لە زینـدانی ئەدەنە بـووم، چەند جارێك سەردانی کردم.

ئەو ڕووداوانەی بۆتـان بـاس دەکەم، لەو سـەروبەندە بـوو، کە شـارەوانی دیـاربەکر، لەگەڵ شـارەوانی چەنـد شـارێکی فەڕەنسـا لە چوارچێوەی لەیەك نزیـك بوونەوەی شـارەوانییەکان، بـوونە دەسـتە خوشـکی یەکـدی، بـۆیە لەلایەن سـەرۆکایەتی شـارەوانییەکانی فەڕەنسـاوە، چەنـد پاسـێکی گواسـتنەوەی بەکۆمەڵیـان وەرگرتبـوو. مەهدی زانا، لەوێ دەمێ، سەرۆکی شارەوانی دیاربەکر بوو. بەو هـۆیەوەش تووشـی چەنـدان کێشـە ببـوو، لەگەڵ حکـوومەت و دەوڵەت.

لەهەمان سەردەمدا، کەشتیەکی بارهەڵگری نەوتی ڕۆمانیا، لە گەرووی بۆغاز لە ئیستانبووڵ، ئاگری تێبەربوو. ئێمە لە پەنجەرە بچووکەکانی ژوورەکانی خۆمان لە زینـدان، گـڕی بە تینـی ئاگرەکەمان دەبینی لەنێو دەریا. باس لەوەدەکرا، کەشتییە بار هەڵگرە ڕۆمانییەکە، لەگەڵ کەشتیەکی بارهەڵگری نەوتی یۆنانی بەریەك کەوتوونە و بووەتە هۆکاری ڕووداوەکە و دواتر کەشتییە ڕۆمانییەکە لەقەراغ ئاویەکانی گەرووی بۆغاز لەنگەری گرتۆتەوە. وەلێ چاوەڕوانکراوە تا هەموو سووتەمەنی بارکراوی ناو کەشتییەکە بسووتێ، پاشان بە فریایەوە بچن.

کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٧٩، ڕووداوێکی دیکەش بووە ڕۆژەڤی میدیاکانی تورکیا. بویەرەکە، شۆڕگێڕەکانی ناو زیندانی تۆپتاشی زۆر لە نزیکەوە پێ عەلاقەدار دەبوو. بە پێی هەواڵی ڕۆژنامەکان بێ، مووچەی مانگێکی نەخۆشخانەی کۆلێژی پزیشکی چاپا لە ئیستانبووڵ، لەلایەن شۆڕشگێڕانەوە دەستی بەسەردا گیرابوو. کاتێك ئەو ترومبێلەی مووچەی دکتۆر و پەرستار و کارگێڕانی نەخۆشخانەکەی گواستۆتەوە، لە ڕێگای وەستێندراوە و ڕفێندراوە. بە پارەی ئەوسا، بڕی ئەو پارەیەی بردرابوو، ١٤ ملیۆن لیرە بووە.

لە بەندیخانەی تۆپتاشی، کۆڕبەندێك، یان پانێل و کۆڕێك ڕێکنەدەخرا، کە هەموومان بەیەکەوە کۆ بکاتەوە. لەلایەن بەشی کارگێڕی بەندیخانەوەش، هیچ فیلمێك نمایش نەدەکرا. وەکوو گرتووخانەکانی دیکە، ناوە ناوە سترانبێژێکیشیان داوەتی ئەوێ نەدەکرد، بۆ ئەوەی کۆنسێرتێکی گۆرانی و میوزیکمان پێشکەش بکات. وەلێ هەر ڕێکخراوێکی چەپ، پرۆگرامێکی پەروەردەیی

بۆ ئەندامانی خۆی ڕێکدەخست. زۆربەی کاتیش ئەو بەرنامەیە دوای شیڤی دەستی پێدەکرد و زۆربەی دەمیش، پەرتووکەکانی لینین و ستالین دەخوێندرانەوە. یانیش ئەو پەرتووکانەی هزر و رامانی ڕێکخراوەکەی زیاتر ڕۆشن دەکردەوە. سەبارەت بە ڕێبەرایەتی و بیرۆکەی ڕێکخراوەیی.

جارێك، نوێنەرانی ئەو ڕێکخراوە چەپانەی لە ژووره بچووکەکە دەمانەوە، داوایان لێکردم کۆڕبەندێکیان پێشکەش بکەم. کۆڕبەندێك کە هەموو گیراوانی ناو بەندیخانەکە بتوانن بێن و ئامادەی گوێگرتن بن. کۆڕبەندەکەمان لە چێشتخانە بەکارنەهاتووەکەی زیندان پێشکەش کرد. ئاخافتنەکەم سەبارەت بە ناوەڕۆکی ڕۆمانەکانی یاشار کەمال بوو. لەگەڵ ئەوەی زۆر قەرەباڵغ بوو، وەلێ زۆر زیندوو نەبوو. هەڤالانی ئەوێ یاشار کەمالیان دەناسی، بەڵام هیچیان سەبارەت بە ناوەڕۆکی نووسین و ڕۆمانەکانی نەدەزانی.

لەناوەڕاستی مانگی نۆی ساڵی ١٩٧٩، کاتێك هاتمە ئەو قاوشە، برادەرێك هەبوو بە تێکۆشین عەلی بانگیان دەکرد؛ ئەو خەڵکی دێرسیم بوو. دواتر، لە قاوشی دووەمەوە هەریەکە لە وەیسی تەتیك و ئەنوەر ئۆکچوئۆغڵووش هاتنە لامان. مامۆستا وەیسی خەڵکی سیوێرەگ و ئەنوەر ئۆکچوئۆغڵووش خەڵکی دەپ بوو. هەندێك کەسیش هەبوون بە تۆمەتی ئەنجامدانی تاوانی کۆمەڵایەتی دەستگیرکرابوون، کاك حەسەن یەکێك بوو لەوانەی دۆسیەکەی لەسەر ئەوەبوو. ئەو خەڵکی بازید بوو و لە نانەواخانە کاری دەکرد. باوك و کوڕێکی قارسیش هەبوون لەوێ. لەگەڵ

ئەو بـــرادەرانە بەیەکەوە، کۆمەڵەیەکمـــان پێکهێنـــا. بەیەکەوە دەمانخوارد و دەمانخواردەوە. ئێوارانیش لە چوارچێوەی قسە و دەمەتەقێ، هەوڵی خۆ پەروەردەکردنمان دەدا. لەکاتی دەستکردن بە بەرنامەکـانی پەروەردە، دەرکەوت سـێ چـوار لەو بـرادەرانە خوێندەوارییان نییە.

لەوێ سەردەمێدا مستەفا سەراج نوێنەری (دەڤ یۆڵ) بوو، کەمال ئاسکەریش نوێنەری (دەڤ سۆڵ) بوو. کاك عەلی ئاك گـون نـوێنەری (رزگـاری گەل) و کـاك مەولـوودیش نـوێنەری (دەڤ ســەڤاش) بـوو. لەوێ بە نــوێنەرانی ئەو رێکخراوانەیـان دەگوت (سەرە پیاو). لەگەڵ بەشێك لەو برادەرانە، ساڵانی دواتر لە زیندانی دیکەش تووشی یەکدی بووینەوە.

## بەرەو کودەتای ١٢ی ئەیلوول

ڕۆژژمێر، ساڵی ١٩٨٠ پیشان دا و، من هێ لە بەندیخانەی تۆپتاشی بووم. وەك لە بەشی پێشووش باسم کرد، شۆڕشگێڕانی ناو زیندان، کاریگەرییەکی گەورەیان لەسەر بەڕێوەبەرانی بەندیخانەکە هەبوو. لە ناوەڕاستی مانگی تەباخی ساڵی ١٩٨٠، پشکنینێکی ئاسایش لە زیندان ئەنجامدرا. وەلێ ئەو گەڕانەی ئەوێ جارێ کرا، بەوانەی پێش خۆی نەدەچوو. چونکە پێشتر، کارەکە، لەلایەن پاسەوانانی بەندیخانەکە خۆیەوە جێبەجێ دەکرا. ئەوانیش زۆر بە وردی لە ڕاست و چەپیان نەدەڕوانی. بە تایبەتی زۆر سەیری پەرتووك و گۆڤارەکانیان نەدەکرد.

بەڵام ئەو پشکنینەی بۆتانی باس دەکەم، لەلایەن تیمێکی سەربازی سازکرا. ئەگەر وردتر بڵێم، گەڕانەکە لەلایەن تیمێکی تایبەتی سەر بە فەرماندەیی سوپا جێبەجێ کرا. لەناو تیمەکە پۆلیسیش هەبوو. ئەوان ڕێگایان نەدا تا پاسەوانانی بەندیخانەکە لەگەڵیان بەشداربن. چونکە پشکنینێکی زۆر توند و وردیان دەستپێکرد. چارپا و نوێن و بەتانی و بالیف و دۆشەکەکانیان سەر و بن کرد و، ورد ورد لە هەموو شتێك دەگەڕان. پەرتووك و گۆڤار و ڕۆژنامەکانیشیان دانە دانە، پشکنی و بەو ناوەیاندا بڵاو کردەوە.

لە قاوشەکە چەندان وێنەی هەڤاڵانی شۆڕشگێڕی وەك دەنیز گەزمیش و ماهیر چایان و ئیبراهیم کایپاکایا بە دیوارەکانەوە

هەڵواسرابوو. هەروەها لەسەر کارتۆن، بە پیتی گەورە چەندان ڕێنمایی شۆڕشگێڕەکان هەڵواسرابوو. ئەو تیمە تایبەتەی پشکنینەکەی کرد، هەرچی وێنە و درووشم و ڕێنمایی نوسراوی سەر دیوارەکان هەبوو، لێیان کردەوە و دڕاندیان و فڕێیاندا، جا بە پۆستاڵەکانیان بەسەریان دەکەوتن؛ لەوەش گەڕێ هەرچی جوێنی پیسیشە، بەوانەیان دەدا کە ئەو کارەیان کردبوو. سەرباری ئەو ڕەفتارانەیان، بەڵام دڵیان ئاوی نەدەخواردەوە و بە ڕیز، جنێویان بە کارگێڕانی بەندیخانە و بەڕێوەبەر و داواکاری گشتی دەدا، لەبەر ئەوەی ڕێگایان بە وەها کارێك دابوو.

پشکنینەکە دوای نیوەڕۆ دەستی پێکرد و نزیکەی دوو دەمژمێری خایاند. دواتر لە بڵندگۆکانەوە، ناوی ١١ کەسیان خوێندەوە و داوایان لێکردن، بەبێ ئەوەی هیچ شتێك لەگەڵ خۆیان بهێنن، لە شوێنی دیاری کراو کۆ ببنەوە. لەوێ ئاماژەیان بەوە کرد، ئەو ١١ کەسەی نوێنەری ڕێکخستنی ڕێکخراوەکان بوون، بۆ بەندیخانەیەکی دیکەیان دەگوازنەوە.

ڕێگایان نەدا ئەو ١١ کەسە لەگەڵ هیچ یەکێکی دیکەی ناو زیندان یەکدی ببینن و هیچ شتێکیش لەگەڵ خۆیان بهێنن. دەمەو ئێوارە، ئەوانیان بۆ بەندیخانەیەکی دیکە گواستەوە. وەلێ ئاماژەیان بەوە نەدا دەیانبەنە چ زیندانێك.

ئەو پشکنینەی لەلایەن هێزە تایبەتیەکەوە کرا، بووە هۆی ئەوەی نوێن و یاتاغ و قاپوقاچاغ و پەرتووك و دەفتەر و پەڕاوی نووسراو و ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی قاوشەکە، بەو ناوەدا پەرش و بڵاو ببنەوە. دوگمەی بەشێك لە ئامێرەکانی چاپ و تایپ

کردنەکەیان شکاند. بۆ ئەوەی ئەوانە بخەینەوە شوێنی خۆیان، پێویستیمان بە دەمێکی زۆر بوو. بە چەند ڕۆژێك دوای پشکنینەکە، یەلاّ هاتینەوە سەر دۆخی جاران. جیا لەمانە، لەگەڵ لێکردنەوەی وێنە و درووشمەکان، ڕووی دیوارەکانیشیان پیس و خراپ کرد.

پازدە ڕۆژ دوای پشکنینەکە، هەمان تیم جارێکی دیکە هاتنەوە بەندیخانە و بەسەریان داداینەوە. هەمدیسان پشکنینیان دەکرد. بۆ ئەمەش دەبوو لە کاتێ ئەوان ئەو کارە دەکەن، هیچ کەسێك لە قاوشەکان نەمێنێت. جگە لە مانەوەی یەك کەس وەکوو نوێنەری قاوش. ئەوەی دیکە دەبوو لە شوێنی هەواگۆڕکێ چاوەڕوانی تەواو بوونی ئۆپەراسیۆنەکە بکەن.

ئەو دەمەی لەگەڵ هەڤالاّن لە هەواگۆڕکێ لە چاوەڕوانی تەواو بوونی پشکنینەکان هاموشۆمان دەکرد، لە بڵندگۆی بەندیخانەوە دەنگێك دەرچوو. بەپەلە داوای ئەوەیان لە من کرد، تا بچمە ژووری بەڕێوەبەر.

کە چووم، قەرەباڵغییەکی زۆرم لەبەردەم دەرگای بەڕێوەبەر بینی. سەربازی هێزە تایبەتەکە و پاسەوانی بەندیخانە و بەشێك لە بەندکراوانی لێ بوو. بە نێوان ئەوانەی لەوێ بوون، چوومە ژووری بەڕێوەبەر و بینیم ئەفسەرێکی پلەی عەمید، لەسەر کورسی بەڕێوەبەر دانیشتووە؛ جا ژوورەوە لە دەرەوە قەرەباڵغتر. لە دەورەی ئەو مێزەی عەمیدەکە لە پشتی دانیشتبوو، بەڕێوەبەر و ئەفسەرانی زیندانەکە و کارگێڕانی ئەوێ و داواکاری گشتی تۆپتاشی دەبیندران.

کە چوومە ژوورەوە، خۆم ناساند و چوومە بەردەم ئەو مێزەی عەمیدە سەربازییەکە لێی دانیشتبوو و ڕەق وەستام. عەمدیەکە دووبارە لێی پرسیم ئاخۆ، ئیسماعیل بێشکچی منم یان نا؟ دواتر بڕۆشەرێکی پیشان دام و پرسی "لە کاتی پشکنینەکان، ئەو بڕۆشەرەمان لە قاوشەکەی ئێوە دۆزیەوە، ئایا هیچ زانیارییەکت لەبارەیەوە هەیە؟ ئەوە ڕاستە کە تۆ نووسیووتە؟" بە خێرایی چاوێکم بە بڕۆشەرەکە خشاند و ئاوا وەڵامم داوە "بەڵێ ئاگاداری ئەو بڕۆشەرەم و خۆشم نووسیوومە... ".

عەمیدەکە سەری قسەی گرتەوە و هیچ کەسێك لە ژوورەوە نقەی لەدەم دەرنەدەچوو، پاشان پرسی "لەو بڕۆشەرەدا باسی کورد و زمانی کوردی و ئەو شتانە دەکەی، ئایا شتێکی وەها بوونی هەیە؟" بەر لەوەی دەرفەتی وەڵامدانەوە بدات، نزیکەی هەشت بۆ نۆ خولەك گوتی "کورد و زمانەکەی بوونی نییە؛ هەموو کەسێك تورکە، ئەو زمانەی باسی دەکەی هەر زمانی تورکییە... ".

دیسان هاتینەوە سەر ئەوەی، ئەمجارە لە بەندیخانەش، ئەفسەرێك بڵی کورد و زمانی کوردی بوونی نییە و ئەوەی هەیە زمانی تورکییە و هەموشمان تورکین. پاشان گوتی "من ماوەیەکی زۆر لەو ناوچانەی تۆ پێیان دەڵێی ناوچەی کوردین، ئەرکی سەربازییم بە جێهێناوە، هیچ کات ڕووبەڕووی نەتەوە و زمانێکی لەو چەشنە نەبووم. بە پێچەوانەوە، بەردەوام تووشی تورك دەبووم و ئەوانیش هەر بە تورکی دەدوان... زۆر دۆست و ئەحبابم هەیە لە ناوچەکە، کەسی نزیکم لەوێ دەژین، هیچ کات شتێکی وەهام لەوانەوە نەبیستووە. هەموو دەڵێن ئەوەی لەوێنە هەمووی تورکن..." ئەوانەی لە ژوورەوەبوون خۆیان کردبووە ماری مردی و

گوێچکەیان بۆ قسەکانی عەمید قیت کردبۆوە و بە وردی گوێیان دەگرت. هەمووشیان متەقیان لە خۆیان بڕی بوو.

دوای قسەکانی ئەو گوتم "دەتوانم پرسیارێکتان لێبکەم؟" وەلێ ئەو خۆی لە قسەکەی من نەبان کرد و بەردەوام بوو لەسەر ئاخافتنەکانی خۆی. بەڵام من دووبارەم کردەوە و ویستم پرسیاری لێبکەم. ئەوجارە عەمیدەکە بە دەرخستنی ئەو شەهامەتەی خۆی، گوتی " ئا ئا دە بپرسە... "

منیش پرسیم "ئۆغوزەکان، لە سەرەتای چارەگی دووەمی سەدەی ١١ بە دواوە، لە ناوەڕاستی ئاسیاوە بەسەر ئیران هاتنە ناوچەکە. سا کاتێك ئۆغوزەکان هاتنە ئێرە، لە دەوروبەری دەریاچەی وان و ئورمییە و ناوچەی چیای زاگرۆس کێ دەژیا؟ ئایا ئەو ناوچانە چۆڵ بوون و هیچ نەتەوەیەك لێی نەدەژیا؟"

پرسیارەکەم جەنابی عەمیدی زۆر پەستکرد، بۆیە گوتی "ئەوە چ پرسیارێکە دەیکەی؟". پاشان دووبارە باسی لەوەکرد، هەموو دانیشتوانی ناوچەکە تورکن و دڵخۆشیشن کە لەنەتەوەی تورکن. پاشان بە هەڵچوونەوە لێمی خوڕیەوە "ڕێز و حورمەتمان گرتی ڕێگام پێدای پرسیار بکەی، وەلێ تۆ ئەو دەرفەتەت بەلاڕێدا برد". منیش هەوڵی ئەوەمدا تا بڵێم، ئەوە پرسێکی گرنگە و لازمە تا گفتوگۆی لەسەر بکرێت. عەمیدەکە گۆچانێکی پێبوو و بە مێزەکەی بەردەمی خۆی ڕاگرتبوو. لە پڕ گۆپاڵەکەی هەڵگرت و چەند جارێك تاق تۆق بە توندی لە زەوی کوتا و گوتی "گفتوگۆی لەسەر دەکەین دەکەین، خەمت نەبی... " پاشان لە مێزکەی بەردەمی دوور کەوتەوە و بەرەو دەرگا هەنگاوی نا. دوای

ئەو، لە پڕ ژوورەکە کەسی لێ نەما. بەڕێوەبەر و جێگرەکەی و داواکاری گشتی بەندیخانە بەدوای عەمید کەوتن و چوون بۆ ئەوەی بەڕێی بکەن.

منیش لە ژوورەکە دەرچووم و بەرەو قاوشەکەم دەگەڕامەوە؛ لە پڕ ئەفسەرێکی مقەددەم بە خێرایی خۆی لێم نزیك کردەوە و گوتی "من چەرکەسم[1]، بەڵام تورکم". منیش لە وەڵامدا "خۆت دەڵێی چەرکەسم". وەلێ ئەو بەردەوام بوو لەسەر پێداگیریەکی و گوتی "... بەڵام تورکم". منیش وەڵامم داوە "ناکرێ لەیەك کاتدا هەم چەرکەس بیت و هەمیش تورك، چونکە یان دەبێ چەرکەس بی یان تورك". پاشان لەسەری بەردەوام بووم "ئەگەر چەرکەس بی، دەبێ بەدوای وەرگرتنی ئەو حەق و مافانەت خەبات بکەی کە لێتیان زەوت کردووە و لەناوخۆیاندا زمان و کولتوورەکەتیان تاواندۆتەوە. بۆ ئەمەش دەبێ ئەو زانیارییانەت لە نەستتدا هەبێ". هێشتا قسەکانم تەواو نەکردبوو، کاکی مقەددەم گوتی "دەبێ بڕۆم تا لە کۆمەڵەکەم دانەبڕێم... " و بە خێرایی لێم دوورکەوتەوە.

گەڕامەوە قاوشەکەم. هەموو لایەك خەریکی ئەوەبوون ئەو کەلوپەلانە کۆبکەنەوە کە لەکاتی پشکنین بەویدا پەرشوبڵاوکرابوون. منیش دەستم بە کۆکردنەوەی هیربارەکانی

---

[1] چەرکەس گەلێکە بنەچەیان دەگەڕێتەوە بۆ باکووری قەفقاسیا. ئەوان بەشی هەرەزۆریان لە تورکیان و هەندێکیشیان لە ئیسرائیل و سووریا و ئوردون دەژین. چەرکەسەکانی ناو تورکیا، وەکو نەتەوەی لاز و عەرەبی ئەو وڵاتە، بە تورککراون و ئێستا ژمارەیان ئەوەندە کەم بۆتەوە، خەریکە لە تورکیا بەرەو لەناوچوونێکی تەواوەتی دەچن. چەرکەس بەشێکی زۆریان موسوڵمانن، جگە لە بوونی سێ هەزار کریستیان. (وەرگێڕ).

خۆم کرد و پاشان پەرتووك و ڕۆژنامەکانم خڕکردەوە و لەسەر یەکم دانان. کاتێك سەرقاڵی ئەو کارانە بووم، دووبارە لە بڵندگۆکەوە گوتیان "ئیسماعیل کەلوپەلەکانت کۆبکەوە و دەمژمێر شەشی ئێوارە، لەبەردەم ژووری کارگێڕی ئامادەبە و بۆ بەندیخانەیەکی دیکە دەگوازرێیەوە".

## ڕووبەڕووبوونەوەی بەندیخانەی جۆری (E) ساکاریا

لە بەشی پێشەوە ئاماژەم بەوەکرد کە، پشکنینەکەی جاری یەکەم لەلایەن تیمێکی تایبەتەوە ئەنجامدرا و نزیکەی دوای دوو هەفتە، جارێکی دیکە هاتنەوە. پشکنینی دووەم لە چواری ئەیلوولی ۱۹۸۰ بوو. دوای ئەو ئاگاداریەی بۆ من بلاّوکراوە؛ لە قاوشەکە جوڵەیەك دەستی پێکرد. هەڤالانی ئەوێ، دوای ئەوەی ناوی من خوێندراوە، دەستیان بە پارە کۆکردنەوە کرد، تا بۆ نوێنەرانی ڕێکخراوەکانیان ببەم. یەکێك ٥٠ لیرەی دا بۆ ڕێکخراوی (دەڤ یۆڵ) و ئەوی دیکە ٤٠ لیرەی دا بۆ ڕێکخراوی (پارتیزانی) و یەکێك لە برادەران ٤٠ لیرەی دیکەی دا بۆ ڕێکخستنەکانی (کورتولوش) و ئەوانی دیکەش هەریەکە و برێك پارەیان ڕادەست کردم بۆ (دەڤ سۆڵ و هالکن کورتولوش و هالکن بیرلیی تاد...) ئیدی بە هەموویان، پارەیەکی زۆریان پێدام. چونکە منیش دەگوازرامەوە هەمان ئەو بەندیخانەیەی نوێنەری ڕێکخراوەکانی بۆ گوازرابۆوە. دەشبوو چەند پارە بۆ کامە برادەر چووە، لە مێشکی خۆمدا ئەزبەری

بکەم. لەبەر ئەوەی هەڤالانم لە نزیکەوە دەناسی، بۆیە لەو بارەیەوە چ کێشەیەکم بۆ دروست نەدەبوو.

لەبەر دەرگا، سواری ئەو ترومبێلە بووم کە چاوەڕوانی دەکردم. لەناو ماشێنەکە، سەربازێکی چەك لە دەست لە چاوەڕوانی مندا بوو. شۆفێرەکەش دوای ئەوەی دەرگای لەسەر داخستم، چووەوە شوێنی خۆیی و یاغر یاغر ملی ڕێگامان گرت. ماوەیەك دوای ڕۆیشتن، ئەو سەربازەی لەتەکم بوو گوتی "نزیکەی ١٥ ڕۆژ بەر لە ئێستا، پانزە هەڤالی ئێوەمان بردە بەندیخانەی ساکاریا. تۆش دەبەینە هەمان شوێن. ئەوان لەسەرەتای چوونە ژوورەوەیان، زۆر ئەشکەنجەدران؛ وەلێ ئەوان لەبەر ئەوەی بەیەکەوە بوون، دەستیان بە پرۆتێستۆکردنی ئەشکەنجەدەران کرد و ڕێگایان نەدا زۆریان پێبکەوێت و کوتکی زۆر بخۆن... "

ئەو قسانە تووشی دڵەڕاوکێی کردم و بە هەواڵەکە تووشی شڵەژان بووم. هەر بەو هەستانەشەوە گەیشتینە زیندانی ساکاریا. کە لە ترومبێل هاتمە خوارەوە، دەمژمێر نۆی ئێوارە بوو.

گاردیانەکانی زیندانەکە لە ڕێڕەوی چوونە ژوورەوە کۆببوونەوە. ئاماژەیان بەوەدا بۆ پشکنینی جەستەی، پێویستە خۆی ڕووت بکاتەوە و جلەکانی داکەنێت، وەلێ بەر لەوەی دەرفەتی جل داکەندنم بدەن، دەستیان بە پشکنینی کەلوپەلەکانم کرد و هەر زوو، بەوێیان پەرش و بڵاوکردەوە. پەرتووك و ڕۆژنامە و گۆڤارەکانیان بە ڕاست و چەپدا داوێشت و بە پۆستاڵەکانیان بەسەری دەکەوتن.

لەناو باخەڵمدا ئەو پارەیان دۆزیەوە کە بۆ هەڤالانم هێنابوو.

منیش ویستم ئەوەیان پێ بڵێم "ئەو پارانەم بۆ ئەو هەڤاڵانە هێناوە کە ١٥ ڕۆژ بەر لە ئێستا لە بەندیخانەکەی ئێمەوە هێنرانە ئێرە. ئەو پارانە لەلایەن برادەرانی ئەو ١٥ کەسەوە کۆکراونەتەوە و منیش بەسەریاندا دابەشی دەکەم". سەر پاسەوانی بەندیخانەکە قسەکانی پێ بڕیم و ڕووی لە پاسەوانەکانی دیکە کرد و گوتی "لای ئەوانە عادەت وایە، پارەکان لای ڕێبەر کۆدەکرێتەوە؛ سەرجەم تێچووەکانیش هەر خۆی دەیکات. ڕێبەری ئەو گەنجانەش ئەوەیە". وەڵامم داوە "من ڕێبەر و شتی وا نیمە... ". وەلێ نەیانهێشت قسەکانم تەواو بکەم، پاسەوانەکان بە شەق و پێلەقە و بۆکس، کەوتنە گیانم. پاشان بەدەم شەق وەشاندنەوە دەیگوت "ئێستا ڕوون بۆوە ئەوەی گەنجە بەستەزمانەکانیشمان دنە دەدا، هەر ئەوە خۆیەتی..." و لە لێدانم بەردەوام بوون.

لە باخەڵێکمدا، باجێکی سەندیکای نووسەرانی تورکیای تێدابوو، ئەو باجەی ئەندامیەتی سەندیکام دووبات دەکاتەوە... ناسنامەکە لە باخەڵم کەوتە سەرزەوی، جا ئەوان هەڵیانگرتەوە و خستیانە سەرمێزێکی لای خۆیان. کە بینیانەوە هەر بەدەم لێدانەوە "ئەو کابرایە نووسەریشە. بۆیە با پەنجە و مەچەکی بشکێنین، تا جارێکی دیکە نەتوانێ دەستکاتەوە پێنووس... " شڵپ و تەپ، لێدان بەردەوام بوو.

چەندی هاوارم دەکرد و دەمویست بۆیان ڕوون بکەمەوە کە هەڵە تێگەیشتوون، وەلێ کەس گوێی پێ نەدەدام. هەندێك پاسەوان و گاردیانی زۆر گەنجی لێ بوو، پێدەچوو تازە دامەزرابن. ئەوانیش بەو لێدانە، دەبوو خۆیان بۆ بەرپرسەکانیان بسەلمێنن، کە چەند بەهێز و خێران لە شەق وەشاندن. ماوەیەکی خۆش، پیسیان لێدام. ئیدی کەوتبوومە سەر زەوی و تواناى بە پێ

وەستانم نەمابوو. هەر کاتێکیش دەمویست خۆم کۆبکەمەوە و هەڵستمەوە سەر پێ، بە پێلەقەیەکی بەهێزی ئەوان، جارێکی دیکە دەکەوتمەوە سەر زەوییەکە. پاسەوانەکان بە زنجیر و داردەست و کەلەپچە لێیان دەدام و سڵیان لە هیچ شتێك نەدەکردەوە.

ئەوەندەم پێکەوت، تا خوێن لە سەر و دەموچاو و مل و لاقەکانم چۆڕەی دەکرد و لە زەوی خوێنی خۆم دەبینی. پانتۆڵەکەی بەرم دڕا و کراسەکەی بەرم پارچە پارچە بوو. بۆ ئەوەی پارێزگاری لەسەرم بکەم، بە هەردوو دەستم سەرم گرتبوو، وەلێ بێ فایدە سەریان بە زنجیر تەقاندم و پەنجە و مەچەکیشم بەو هۆیەوە خوێنی لێ دەتکا. بەڵام سەرباری ئەو هەموو ئەشکەنجەیە، دەنگم لە زار دەرنەچوو. چونکە ئیدی گەیشتبوومە ئەو باوەڕی ئەوانە لە وشە و ڕستە و ئاخاوتن تێناگەن. بۆیە هەوڵی قسەکردنم نەدەدا و لە بری ئەوە دەمویست بەرگەی ئەو لێدانە بگرم، کە نەمدەزانی کەی ماندوو دەبن و دەستم لێ هەڵدەگرن.

بە بۆکس و دار و کەلەپچە، لە سەریان دەدام و بە شەق و ڕاژدی لە دەموچاوم و، بە زنجیریش لە جەستەم. گوێم ئەوەندە ئازاری پێ گەیشتبوو، لەو ڕۆژەوە تا ئیمڕۆ کە ئەم دێڕانەتان بۆ دەنووسم، ئەو لێدانانە بوونە هۆی ئەوەی تووشی گوێ گرانی ببم و نەتوانم بە باشی ببیستم. لە هەمووی بێ ویژدانەتر ئەوەبوو، پاسەوانە بە تەمەنەکان دەیانویست لە پاسەوانە گەنجەکان توندتر و خراپتر و خێراتر لێمبدەن، ببووە ڕکابەری لە نێوان پاسەوانە گەنج و بە تەمەنەکان، لەسەر ئەوەی کێ دەتوانێ باشتر ئەشکەنجەم بدا. بە شێوەیەك ئیدی پاسەوانەکان بۆ لێدانم چەند هەنگاوێك

دەچوونە دواوە و قۆڵیان دەكردەوە و پەنجەكانیان ڕژدتر دەكرد لە زنجیرەكـانی دەسـتیان و پاشـان بە خێرایـی دەهـاتنەوە پـێش و، بەهەمـوو هێـزی خۆیـان و خێرایـی مەچەكیـان لێیـان دەدام. چەنـد كەسێك ئاوایان بەرامبەرم كرد، بە هۆی زۆری ئازاری گیانم، بە هۆی ئەو زنجیرەی پێم دەكەوت، ویستم هەندێك شت بەو كەسە بڵێم، وەلێ لە تاو ئازاری جەستەم زمانم تەتەڵەی دەكرد. بەڵام بە هەر جۆرێـك بـێ بە شـەپرێویی و دەنگێكـی كـز، بە پاسـەوانە بە تەمەنەكەم گـوت "مـن و تـۆ یەكـدی ناناسـین. بـۆ ئەوەی بە باشـی زنجیـرەكەی دەسـتم بخەوێنێی و شـوێنەواری لێدانەكە بـۆ مـاوەی چەندان مانگ لە جەستەم نەڕوا، ئاوا لێم دەدەی؛ وەلێ پێم بڵێ ئەو ڕق و دڵڕەشییەت لە چییەوە سـەرچاوەی گرتـووە بەرامـبەرم، كە ئاوا لێم دەدەیی و كوڵی دڵی خۆتم پێ دەردەكەی؟ ". دوای ئەو قسەیەی من، كابرا ڕووی لە كۆمەڵەكەی خۆی كرد و گوتی "كوڕینە من ماندوو بووم" پاشان زنجیرەكەی دەستی دانا و چووە لایەك دانیشت. دوای ئەو، پاسەوانە گەنجەكانیش دەستیان لەسەرم هەڵگرت، جا شەكەت و ماندوو، هەریەكە و لەلایەك پاڵكەوت.

تا ئەو كـاتەی ئەشكەنجە تەواو بوو، بەڕێوەبەر و جێگرەكەی، لەوێ دیـار نەبـوون، وەلـێ لەو بـاوەڕەدام لەپشـت دەرگاكـانەوە سەیری ئەو ئەشكەنجەیان كردبێ، هەتا پێم وایە پێشتر هانیشیان دابن.

ماوەیەك، پاسەوانەكان بە هۆی ئەشكەنجەدانی من پشوویان دا و منیش لەسەر زەوی لەناو خوێن و خیزاوی خۆم گینگڵم دەدا؛ لە زاریشم خوێن و لیكاو تێكەڵ ببوون و لە لێوەكانمەوە دەڕژانە

زەوی. لە پڕ یەکێك، کە پێم وابێ سەر پاسەوانەکە بوو، بەسەرمدا نەڕاندی و گوتی "خێراکە کەلە و پەلت کۆبکەوە و دەتخەینە حوجرە. جا کەلوپەلەکانت باش کۆبکەوە، دواتر نەیەیت بڵێی فلانە شتم لێرە کەوتە و فلانە شتم بیر چووە و دەیبەمەوە".

خۆم خستە سەر چۆکەکانم بۆ ئەوەی کەلوپەلە، پەرش و بلاوەکانی ئەوێم کۆ بکەمەوە، وەلێ نە شتێکم بەباشی دەبینی و نە توانای کۆکردنەوەی پارچە شتێکم هەبوو. نەك هەر ئەوە، بەڵکوو نەمتوانی هەستمە سەر پێیەکانی خۆشم. بە خشکە خشکە و لەسەر زگ خشان، چەند پەرتووکێك و کراس و دەرپێ قوتەیەکم کۆکردەوە، بە تایبەت ئەوانەی هەر لە چواردەوری خۆم بوون. دەمویست ئەوان لە باوەشی خۆم بگرم، چونکە نەمدەزانی کۆڵەپشتەکەم لە کوێیە، وەلێ ژان و ئازاری پەنجەکانم، توانای هەڵگرتنی هیچ شتێکیان نەبوو. بۆیە دەمویست ئەو چەند پارچە شتە بخەمە ناو یەکێك لەو کراسانەی هەڵمگرتبۆوە، بە خشین هەندێك چوومە پێش، وەلێ لە بێهێزی و ژانی جەستەمدا، ئەو چەند پارچەیەی کۆشمکردبۆوە، هەر لەوێ لێم کەوتەوە.

چەند پاسەوانێك هاتن و بن هەنگڵیان گرتم و قیتیان کردمەوە؛ هەر لەگەڵ ئەوانیش، چەند مەترێك چوومە پێش، وەلێ قاچەکانم بەدوامدا دەخشان. بەو شێوەیە تا لای پەیژەیەك چووین؛ شوێنەکە تاریك و چۆڵ بوو و چاو چاوی نەدەبینی. وەنەبوو لەبەر بێ کارەبایی شوێنەکە تاریك بێ، بەڵکوو خۆیان، بە زانین ئەوێیان تاریك کردبوو. بە هەزار حاڵ، بەسەر چەند پایەکی پلیکانەکان کەوتین. جا لەوێ دەنگێکی زۆری شۆڕەی ئاویش دەهات.

دەنگەکە وەك ئەوەبوو لە شوێنێکی بەرزەوە ئاو بڕژێتە سەر پارچە زەوییەکـی چیمەنتـۆکراو؛ وەلـێ دەنـگەکە گەلێـك زێـدەبوو، بەشێوەیەك گوێم لەوە نەدەبوو کە ئەوەی تەك من چی دەڵێ. هەر چـۆن بـێ، بەسـەر پێـبلقەکە سـەرکەوتین، پاسـەوانەکانیش لەو تاریکاییە دەیانویست بەزۆر و خێرا سەرم بخەن.

بۆ یەکەمجار لە زینـدانی سـاکاریا بەنـدیخانەی جۆری (E)م بینی و لێی مامەوە. زیندانەکە چوار نهۆم بوو، لە هەر نهۆمێکیش دە زینـدانی تاکەکەسـی لـێ بـوو. یەکەمجـار بـۆو ئەو جـۆرە بەندیخانەیە ببینم، وەلێ دواهەمین کەرەت نەبوو؛ چونکە دواتر لەچەند شوێنێکی دیکەش، منیان خستە هەمان جۆری بەندیخانە.

هەرچۆنێك بێ، بە خشکەخشکە و پێنگاف پێنگافی کورت، دوای مـاوەیەکی زۆر، گەیشـتینە نهـۆمی چـوارەم. وەلـێ گەلێـك زۆری خایانـد، لە کاتێکـدا مـن توانـای دانیشتینشـم نەبـوو، نەك بەسـەر پلیکـانە کەوتـن، کەچـی پاسـەوانەکان بەسـەرمدا هاواریـان دەکـرد "دەی خێـراکە و سـەرکەوە...! ". وەلـێ نە هـاوارکردن و نە قسەکانیان ئەو وزەیەی پێنەدەدام تا خێراتر بم. چونکە پەرێشان و سەروسەکوت شکاو بووم. کە گەیشتینە سەرەوە، ڕووناکی مۆم لە زینـدانە تاکەکەسـیەکانەوە دەردەکەوت. لەوێـش مـاوەیەکی درێـژ چووینە پێش، پێم وابێ لە بەردەم دەرگای شەشەم یان حەفتەم وەسـتاین. یەکێـك لە پاسـەوانەکان دەرگـای حـوجرەکەی کـردەوە، ئەوەی دیـکەش بە پێلەقەیەك کە لە دواوە لێـی دام، منـی فڕێـدا ژوورەوە. دوای ئەوەی منیـــان خســـتە ژوورەوە، یەکێـــك لەو بـرادەرانەی گوازرابـووەوە ئەوێ و لە هەمـان حـوجرە بـوو گـوتی "کـاك ئیسـماعیل تۆشـیان هێنـا ئێـرە؟" دۆزینـەوەی ئەو هەڤـاڵانە و

چوونە لایان، بەو حاڵە پەرێشانەی خۆشمەوە، هەر دڵخۆشی کردم.

لە ژوورەوە پێنج شەش هەڤاڵی دیکەی لێبوو. هەندێکیان لەسەر پارچە قوماشێك پاڵ کەوتبوون، هەندێکیشیان لاقیان ڕاکێشابوو و پشتیان بە دیوارەکە دادابوو. ژوورەوە وەك گوتم، بە مۆم ڕووناك کرابۆوە. بە بەکارهێنانی چەند مۆمێکیش چایەکیان لێنا.

لە گۆشەیەکی حوجرەکەدا، ئەدەبخانەیەکی تەنگەبەر هەبوو؛ لەوەها دۆخێکدا، بوونی ئاودەست لە زینداندا، بە دەستکەوتێکی مەزن و ئازادییەکی گەورە دادەنرێت...

ئەوەم بە برادەران گەیاند کە، هەڤاڵانتان هەندێك پارەیان پێدا ناردووم، وەلێ لەهاتنە ژوورەوەم دەستیان بەسەردا گرت، بەڵام ڕەنگە بڕی پارەکە لای بەشی کارگێڕی بەندیخانە، لە دەفتەرێکدا بنووسرێ.

تا بەرواری دوازدەی ئەیلوول، لە هەمان حوجرە مامەوە. لە دوای ئەو بەروارەوە، ئێمەیان بردە قاوشەکان. پاشان لەوێ دەستیان بە سەرژمێری ڕۆژانەکرد.

چەند هەفتەیەك دوای ئەو ڕووداوە، شتێکم لەیەکێك لە برادەرانی قاوشەکەوە بیست، گوایە لە حوجرەی نهۆمی چوارەم، قاچاغچییەك دەمینێتەوە. لەو تاریکییەی بۆم باسکردن لە پاڵ دەنگی شوڕەی ئاوەکە، کاتێك بەبەردەم حوجری قاچاغچییەکە تێپەڕیووین و کابرا منی بینیووە، دواتر گوتویەتی "ئەمشەو پاڵەوانێکی وایان هێنا، ڕۆیشتنێکی وا بە هەیبەتی هەبوو

نەبێتەوە!..." من بە هەزارحاڵ ڕێم دەکرد و لەتاو ئازاری گیانم کوڕ ببوومەوە، کەچی کابراش ئاوای باسکردبووم...!

لەسەرەوە باسم لەوەکرد، کە لە بەرواری چوارەمین ڕۆژی مانگی نۆی ساڵی ١٩٨٠، لە زیندانی تۆپتاشی ئۆپەراسیۆنێکیان کرد. لەوێش دوای موناقەشەکەم لەگەڵ عەمیدەکە، کە گوتبوم "ئەو بابەتانە گرنگن و پێویستیان بە گفتوگۆیە". ئەویش لە وەڵامدا "ئا ئا گفتوگۆی لەسەر دەکەین، دەکەین ... " وەڵامی دابوومەوە. پاشان دواتر ژوورەکەی بە جێهێشت. ئەو ڕۆژە بۆ من ئەو وەڵامەی ئەو هیچ گرنگ نەبوو؛ وەلێ دوای دوازدەی ئەیلوول؛ بووینە شایەتحاڵی ئەوەی سەرباز و پۆلیس و داواکاری گشتی و دادگاکان، زۆر بە چڕی، دەستیان بە گفتوگۆکردبوو لەسەر ئەو مژارەی من باسم کردبوو...

لێرە بە پێویستی دەزانم، لەسەر ئەو مژارە چەند شتێك بڵێم. یەکێك لەو مژارانەی زوو زوو دەهاتە ڕۆژەڤ، سزادان بوو. هەروەها باسیان لەوە دەکرد، پێویستە ئامانجی سزا و سزادان چی بێت؟ چونکە پێیان وابوو، ئەو تاوانەی دەکرێ، نیزامی کۆمەڵگای تێکداوە. بۆیە بە سزادانی کەسەکە، دەیانویست کەسی تاوانبار دووبارە بە سوودی کۆمەڵگا بشکێننەوە و چاکسازیش بەسەر کەسەکەدا بێت، چونکە جەختیان لەسەر ئەو ئامانجە دەکردەوە؛ بەوپێیەی بە بۆچوونی ئەوان، بە وەها ڕێکارێك، دووبارە دەتوانن نیزامی کۆمەڵگا ڕێك بخەنەوە.

گەنگەشەکردن و گفتوگۆکردن لەسەر ئەو مژارە، لە سیستەمێکی سیاسی وەها، کە ئازادی بیروڕای لێ

بەرتەسککراوەتەوە و سزای کارگێڕی و ماددی دەسەپێنرێت، هیچ مانایەکی نییە. ئاخر چۆن دەتوانرێ کەسێك بە قۆناغی چاکسازیدا تێبپەڕێنن، کە هزر و ڕامانی لەلایەن بۆچوونی گشتی و فەرمییەوە ڕێبەند بکرێ؟ یاخود ئەگەر فیکر و ئایدۆلۆژیای دژی بۆچوونی فەرمی بوو، بێ هیچ سێ و دووێك بخرێتە کونجی زیندانەوە؟ ئەمە دێتە ئەو مانایەی ئەوانە توانای واقیع بینیان نییە، بەڵکوو تەنیا ئامانج لە سزادانەکە، بریتییە لە مەغدوور کردنی ئەو کەسانە.

لە سیستەمێکی سیاسی، کە دەربڕینی بیر بەرتەسککرابێتەوە و، ئاشکراکردنی فیکر ڕووبەڕووی سزای کارگێڕی و ماددی ببێتەوە و، لە کایەی زانست و هونەردا بۆچوونی فەرمی باڵادەست بێ؛ ئامانجی سزادان، تەنیا بێ بەشکردنە لە هەموو شتێك و وەرگرتنی تۆڵەیە لەکەسەکە و هیچی تر.

## تێکۆشینی عەلی و "خانەی بەلەنگازان"

ئەو برادەرانەی لەسەرەوە باسم کردن، بەناوەکانی تێکۆشینی عەلی و وەیسی تەتیك و ئەنوەر ئۆکچوئۆغڵوو، هەموویان کورد بوون. جگە لەوان چەندان کوردی دیکە بە تاوانی دزی و شەڕکردن و تاوانی کۆمەڵایەتی لە زیندان گیرکرابوون. ئەوان هەریەکە و لە پیشەیەك وەکوو شاگرد کاریان دەکرد. لە زیندان کۆمەڵەیەك هەبوو زۆربەیان، شاگردی دارتاشی و فڕن و چەند پیشەیەکی دیکە بوون.

ڕێکخستنی ڕێکخراوە چەپەکانی ئەوکات، لەشێوەی کۆمەڵ

دەژیان؛ ئێوارانیش لە نێوخۆیاندا بەرنامەی پەروەردەییان جێبەجێ دەکرد. ئێمەش لەگەڵ ئەو برادەرانەی لەسەرەوە باسم کردن، کۆمەڵەیەکمان پێکهێنابوو. بەیەکەوە دەمانخوارد و دەمانخواردەوە. ئێمەش ئێواران خڕ دەبووینەوە و بەیەکەوە دەمەتەقێمان دەکرد و خۆمان لە ڕێگای پەروەردەوە پێش دەخست. ئەو پەروەردەیەی من باسی دەکەم ئەوەبوو، کە من کتێبم دەخوێندەوە و ئەوانیش گوێیان دەگرت؛ دواتر لەسەر ئەو بەشەی خوێندبوومانەوە گفتوگۆمان دەکرد. بەشێوەیەکی گشتیش، زیاتر لەسەر مێژووی کوردستانمان دەخوێندەوە. تێکۆشین عەلی خەڵکی دێرسیم بوو، ئەو گەنجێکی باڵا بەرز و ڕەش ئەسمەر بوو؛ سمێڵێکی بابڕی قەترانیشی هەبوو، لەگەڵ دەست و پلێکی گەورە... تێکۆشین عەلی سەرەتا لە ڕێکخراوی (کورتڵوش) بوو، دواتر لەوان جیا ببۆوە و چووبووە ڕیزەکانی (تێکۆشین) بۆیە پێیان دەگوت (تێکۆشین عەلی). ئەو چەکی لە دەست گیرابوو و خرابووە زیندان، چونکە لە پاڤیۆن – قەحپەخانە وەکوو پاسەوان - بۆدی گاردی بەردەرگا کاری دەکرد. کاتێک لە ژوورەوە کێشەیەك ڕوویدابا، یان کەسێك پارەی نەدابا، تێکۆشین دەچووە ژوورەوە کارەکەی چارە دەکرد.

ماوەیەك دواتر، لە ڕێکخراوی تێکۆشینەوە برادەرێك نامەیەکی بۆ ناردم. ئەو لە مەکتووبەکە نووسی بووی "هیچ کەسێك لە ڕێکخراوەکەی ئێمە نییە بە ناوی تێکۆشین عەلی". دەشێ مرۆڤ لە ژیانیدا، نازناوی جیا بەکاربهێنن، بە تایبەتی لە زیندان. جا ئەوانەی چەپن و لەناو کۆمەڵە کوردییەکانیان دابنێین؛ ئەو کەسانەی لەناو سیاسەتیشدان، بەو کەسانەی لەناو سیاسەت نیینە دەڵێن "لەناو ئەو سیاسەتەم و لەناو ئەو سیاسەتە نییمە...".

لەنـاو کۆمەڵەکەمانـدا، بـاب و کوڕێـك هەبـوون؛ ئەوان دوو مرۆڤـی خـاوێن و خـاوەن ویژدانێکـی زینـدوو بـوون. ئەوان بە تـۆمەتی ئەوە گیرابـوون، گـوایە، لەو مـاڵەی بـوونەتە میـوان، تەلەفزیۆنیان دزیووە و دواتر لەکاتی فرۆشتنەوەی دەستگیرکراون. یەکێك هەبوو بەناوی حەسەن، ئەو شاگردی فڕنێکی نان بوو؛ ئەو لەسەر دزینی بـانتۆڵێکی کـاوبۆی، خرابـووە زینـدان. ئیـدی ئێمە لەگەڵ ئەو بـرادەرانە، خۆمـان پەروەردە دەکـرد. پەرتووکەکـان زۆربەی کـات مـن و، هەنـدێك دەمـیش مامۆسـتا وەیسـی دەیخوێندەوە.

یەکێك لە ڕۆژانی زیندان، قوتابییەکی قۆناغی ئامادەییان هێنا لامان. ئەو کەسێکی پارتیزان بوو. خۆی لە کۆمەڵەی پارتیزانی بـوو. وەلـێ لە نێوان ئێمە، کەسێکی دەناسـی کە لە گەڕەکەکەی خۆیان بوو. بۆیە هاتە ناو کۆمەڵەکەی ئێمە. ئەویش لەگەڵ ئێمە بەشداری بەرنامەی خوێندنەوەی پەرتووکی دەکرد. بیرمە ڕۆژێك باسی باشووری کوردستان و شێخ مەحمود بەرزنجیمان دەکرد؛ وەلـێ قوتـابییە گەنـجەکە نـاڕەزایەتی پیشـان دا و گـوتی "ئەوە چ جۆرە پەروەردەیەکە؟ ئێمە بـۆچی باسـی ئەو شێخانە دەکەیـن؟ لە کاتێکدا پێویستە باسی پرۆلیتاریا و کرێکاران و خەڵکی گوند و سۆسـیالیزم بکەیـن. بـۆیە پێویسـتە هەرچـی زووە کۆتـایی بەو ڕێچکەیەی پەروەردە بهێنین". گەنجەکە، ئەو قسانەی بە دەمێکی گەرمەوە دەکـرد. منیش لە وەڵامـدا بەشێوەیەکی مەعقـول باسـی ئەوەم بۆکرد "ئەوە مێژووی کـوردە و پێویسـتە گفتوگۆی لەبارەوە بکەیـن و بیزانین" وەلـێ ئەو پێداگری لەوە دەکـرد تـا باسـی پرسە نێودەوڵەتییەکـان و ڕووبەڕووبوونەوە و سـەرمایەداری بکەیـن، نەك

شـێخ و ئاغاکـان. منـیش دووبـاره بەشـێوەیەکی ڕێـك و پێـك، دەمویست بۆچوونەکانی خۆم و گرنگی ئەو زانیارییانەی بۆ بەیان بکەم.

لە بەندیخانەی تۆپتاشی، وەکوو پێشووتریش باسم کرد، چارپا دوو قاتەکانی لە تەختە دروستکراوبوو. لەوسـەری بۆ ئەوسـەری قاوشـەکە بەو شێوەیە درێژ ببۆوە. بەنـدکراوان هەر جێیەك چۆڵبا، نـوێنی خۆیـان لـێ دادەخسـت. ئـێمە بە پێـوە و باسـی ئەوانەمـان دەکـرد. مامۆسـتا وەیسـی و ئەنوەر ئۆکچوئۆغڵـوو، دەیانویسـت ئەو برادەرە پێبگەیەنن؛ وەلێ لاوەکە بە توندی بەرپەچی پەروەردەکەی دەداوە. لەپڕ، گوێم لێبوو لە دواوە، زلەیەك بە بناگوێی گەنجەکە کەوت و شـریقەی لێوەهـات و وەکـوو مـزراح بەدەوری خۆیـدا خـولێکی خـواردەوە، جـا کەوتە سـەر زەوی. ئـێمە لە کەنـار چارپاکان بووین، کە گەنجەکە بەربۆوە. کوڕە قاچەکانی بەرامبەر کۆریدۆرەکە درێژ بۆوە. کە ئاوڕمداوە و پرسیم کێ لێیدا؟ دیار بـوو گوتیـان، تێکۆشـین عەلـی بەرگەی ئەو گەنـجەی نەگرتـووە و زلەیەکی توندی خێواندێ. بەڵام من ڕاستەپێ، بەرپەچی تێکۆشینم داوە و لێم پرسی "بۆ لێتدا؟" ئەویش ئاوا وەڵام داومەوە "چۆن و بە چ غیرەتێك بەرامبەر جەنابت دەوەستێتەوە؟ ئەو کێیە تا پێت بڵێ ئەوە بخوێنینەوە و ئەوە نەخوێنینەوە؟" منیش گوتم "کاکە، من دەتوانم بەرگری لە بیروبۆچوونی خۆم بکەم، ئاخر بەرگری کردن چۆن بە لێدان و توندوتیژی دەبێ؟" وەلێ ئەو هەر ئەوەی دووباره دەکـردەوە "چـۆن ئـاوا بەرپەچـی مامۆسـتا بێشـکچی دەداتەوە، ئەو کێـیە؟" ئەوەی دەگـوت و هیچـی دیـکەی نەدەگـوتەوە. خۆشـی تورکییەکی زۆر باشی نەدەزانی و لەقسەکردن باش نەبوو. کاتێك

ئێمە مژوولی ئەو قسانە بووین، گەنجەکە هەستاوە سەرپێ و سەروسەکووتی خۆی خاوێن دەکردەوە. پاشان ڕووی لە تێکۆشین کرد و گوتی "لای ئەنجومەن سکالات لێدەکەم".

لەوێ سەردەمێدا، زیندانەکە لەلایەن ئەنجومەنی شۆڕشگێڕەکانەوە بەڕێوەدەبردرا. لەو ژوورە بچووکەی پێشتریش باسم کرد، منیش لێی دەمامەوە. دوای سکالاکە، تێکۆشین عەلیان بانگی ژوورەکە کرد. بە گومانی ئەوەی، ڕەنگە تێکۆشین نەتوانێ بەباشی چۆنیەتی ڕووداوەکە باس بکات، منیش لەگەڵی چووم. چونکە لەهەمان کات، ئەندامانی ئەنجومەنەکەشم دەناسی. ئەوان لە تێکۆشینیان پرسی تا ڕووداوەکە بگێڕێتەوە. ئەویش لە وەلامدا "ئەو کێیە تا بەرەوڕووی مامۆستا ئیسماعیل بێتەوە؟"، ئەوەی دەگوت و لەوە زیاتر هیچی دیکەی نەدەگوت. بەهەر شێوەیەك بێ، من بوویەرەکەم بۆ گێڕانەوە. پاشان بەیەکەوە چووینە هەواگۆڕکێ و بەدەم پیاسەکردنەوە ئەوەم بۆ باسدەکرد، کە کارێکی هەڵەی کردووە. وەلێ ئەو بەردەوام بوو لەسەر گوتنەوەی ئەوەی، ئەو کێیە بەرامبەر بە تۆ هەڵدەستێتەوە و ڕاست و چەپت پیشان دەدا. ئیدی لەوە زیاتر هیچی دیکەی نەدەگوت.

ئەو لاوە قوتابییە، سەرەڕای ئەو ڕووداوە، وەلێ لە کۆمەڵەکەمان دەرنەچوو و لەلامان ماوە. ئێوارەیەك دووبارە پەرتووکمان دەخوێندەوە، منیش بە تێکۆشینم گوت "ئەم ئێوارەیە تۆ بەشێکمان لە پەرتووکەکە بۆ بخوێنەوە". وەلێ ئەو بە دەنگێکی وا بەرز گوتی "ناخوێنمەوە" من هەر هۆیەیەکم لەخۆم کرد و حەپەسام. لێم پرسی "برای خۆم تۆ بۆ ناخوێنیتەوە؟" ئەویش

وەنەبوو بڵێ "نەخۆشم و توانای خوێندنەوەم نییە". دوای ئەو گوتم "حەسەن مادەم وایە تۆ بخوێنەوە". ئەویش بەهەمان کاردانەوە گوتی "منیش ناخوێنمەوە". وەڵامەکەی ئەو زیاتر حەپەساندمی. بە سەرسوڕمانەوە لە خۆم پرسی ئاخۆ بۆ ناخوێننەوە؟ لە پڕ مامۆستا وەیسی گوتی "مادەم وایە من دەخوێنمەوە کاك ئیسماعیل"...

ڕۆژی دواتر، کاتێك لەگەڵ تێکۆشین عەلی، لە هەواگۆڕکێ هاموشۆمان دەکرد، پرسیاری ئەوەم لێکرد بۆچی دوێنێ داواکەی منی ڕەتکردەوە، بۆ کتێب خوێندنەوە؟ تێکۆشینیش وەستا و ڕووی لە من کرد و بۆم چەماوە و گوتی "کاك ئیسماعیل، من نووسین و خوێندنەوە نازانم". کە وای گوت، من زۆر سەرم سوڕما، چونکە تا ئەوڕۆژە، هەر کاتێك ڕۆژنامە بهاتبا زیندان، تێکۆشین دەیگرتە دەست و لاپەڕە لاپەڕە هەڵی دەداوە و سەر و بنی دەکرد. دواتر زانیم، حەسەنیش خوێندەواری نییە.

ڕۆژێك پەروەردەکەمان سەبارەت بە ئاینی ئیسلام بوو. باسی کۆچی حەزرەتی محەمەدمان دەکرد لە مەککەوە بۆ مەدینە. ئەو باب و کوڕەی تەلەفزیۆنیان دزی بوو، پاشان باوکەکە، لەتەك من دانیشتبوو. منیش ڕووم لێی کرد و پرسیارم لێکرد "حەزرەتی محەمەد لە چ بەروارێك لە مەککەوە بەرەو مەدینە کۆچی کرد؟". ئەویش ئاوا وەڵامی دامەوە "زۆر بەر لە ئێستا". منیش لەسەری ڕۆیشتم "ئاخر چەند پێش ئێستا؟" ئەویش وەڵامی دامەوە "زۆر زۆر پێش ئێستا" وەلێ سوور بووم لەسەر پرسیارەکەم "واتە چەند پێش ئێستا، ڕۆژێك؟ مانگێك؟ ساڵێك؟" کە وا تەنگاوم کرد، وەڵامی دامەوە "سەت هەزار ساڵ پێش ئێستا" یانی بەو مانایەی

زۆر پێش ئێستا! ئاخر خۆ من نەمزانی ئەوانیش خوێندن و خوێندنەوە نازانن. بۆیە ئاوا وەڵامی دامەوە.

ئیدی ئێمە لە زیندان لەگەڵ ئەو جۆرە برادەرانە بەرنامەی پەروەردەییمان جێبەجێ دەکرد...

## ژانە ددان، لە بەندیخانەی سەربازیی سەیمەن

لە نێوان ساڵانی ١٩٨٠-١٩٨٢، لە زیندانی سەربازی هێزی دەریایی گۆلجوك و بەندیخانەی فەرماندەی دۆخی لەناکاوی سەیمەن بەندبووم. لەوێ، ناوە ناوە، لەگەڵ بەشی کارگێڕی، ئاڵۆزی دروست دەبوو؛ جار جارەش ژیانێکی ئاسایمان دەگوزەراند.

سەرەتای بەهاری ساڵی ١٩٨٢، ددانەکانم زۆر بە ژان کەوتن. کاتێك ئەوەم بە برادەرانی قاوشەکەم گوت، ئاوا وەڵامیان دامەوە "بەهیچ جۆرێك نەکەی بچییە لای دکتۆری بەندیخانە؛ چونکە پزیشکێکی زۆر ڕەگەزپەرستە، بۆیە هەم تێروپڕ قسەی ناخۆش بە شۆڕشگێڕەکان دەڵێ، هەمیش بە هەڵە چارەسەرت دەکا، جا لە بری ئەوەی باشتر بی، خراپتر دەبی... "

چەند ڕۆژێك، بە لۆکەی بە کۆلۆنیا کراو و ئەسپرین بەرگەی ژانەکەم گرت. وەلێ ژان و ئازارەکە زیاد دەبوو، کەم نەدەبۆوە. لە نێوان ساڵانی ١٩٧٥-١٩٧٦ لە نێوان دوو کۆتا ددانی شەویلاگی سەروو و خوارووم، دکتۆر پردێکی دروست کردبوو. لە چوارەمین ڕۆژی مانگی نۆی ١٩٨٠ بە دواوە، لە زیندانی

ساكاریا، به هۆی ئەو ئەشكەنجەیەی لەبەر دەرگا خواردم، پردەكە لەناو دەوم شكابوو. بۆیە ددانەكانم بەردەوام ئازاریان دەدام.

به هـــۆی زۆری ژانـــی ددانەكـــانمەوە، ســـەرباری ئاگاداركردنەوەكەی برادەران، ناوی خۆم بۆ چوونە نەخۆشخانە تۆماركرد. چەند ڕۆژێك دواتر، بەیانیەكی زوو، چوومە بیمارستان. لەگەڵ من چەند كەسێكی دیكەش بۆ چارەسەری نەخۆشی دیكە، هاتبوون.

سەربازەكەی ئەوێ، منی بردە ئەو بەشەی دكتۆری ددانی لێبوو. منیان لەبەردەم نۆرینگەی پزیشكی ددان دانیشاند و دەستم به چاوەڕوانی هاتنی نۆرەكەم كرد. له ژوورەوە نەخۆشێكی لێ بوو، دوای ئەو، بڕیار بوو نۆرە بەر من بكەوێت.

كاتێك لەبەردەم نۆرینگەی دكتۆرەكە من له چاوەڕوانی چوونە ژوورەوە بووم، بینیم، له ڕێڕەوی نەخۆشخانەكە، عەمیدە لەخۆباییەكەی سەرۆكی دادگا هاتە ژوورەوە. به دووری حەفت هەشت مەترێك بەبەردەممدا گوزەری كرد. لەتەكەییەوە كیژێكی هەرزەكاری تەمەنی قۆناغی ناوەندیشم بینی. پێدەچوو كچی بێ و هاتبێ تا دكتۆر ببینێت. چەند چركەیەك لەگەڵ سەرۆكی دادگا، چاومان كەوتە سەریەك؛ وەلێ كه چاوی پێكەوتم، ڕێگاكەی گۆڕی و ڕووی له نۆرینگەی دكتۆری ددان كرد. بەبێ چاوەڕێكردن چووە ژوورەوە. وەلێ عەمیدەكە له ژوورەوە، زۆری پێنەچوو و هاتە دەرەوە. پێم وابێ خولەكێكی نەخایاند له ژوورەوە مانەوەی؛ ئەمەش منی زۆر ترساند و دڵەڕاوكێیەكی زۆری له ناخمدا چێكرد. هەر ئەو عەمیدە سەربازییە، له دانیشتنی دادگا، زۆر له من پەست و توڕە ببوو.

هۆکـاری ئەو دادگـایی کـردنەم، کە عەمیـدەکە لە دانیشـتنی دادگـا زۆر لـێم توورەبوو، بریتـی بـوو لە نووسـینی نـامەیەك بـۆ یەکێتی نووسـەرانی سویسرا. من نامەکەم لە بەهاری ساڵی ١٩٨٠، ئەوکـاتەی لە زینـدانی تۆپتاشـی بـووم، نـاردبوو. لەوێ باسـم لەوەکردبـوو، لە تورکیـا نکـۆڵی لە بـوونی کـورد و زمـانەکەی دەکـرێ، هەروەهـا بە سیسـتەمێکی ئەسیملاسـیۆن و لەناوبردنیـان تێـدەپەڕێنن، بـۆ ئەمەش پێویسـتە نووسـەران دژی ئەو کـارە بووەسـتنەوە. لەوێ باسـم لە پـێگەی کوردسـتانیش کردبـوو لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ڕۆژهەڵاتی نزیك.

لەکـاتی دادگاییکردنمـدا، ئەو عەمیـدە پرسـیارێکی وەهـای لێکردبووم "بەبێ وەستان ناوی کوردستان دەهێنی و ناوەستی، ئەو نـاوەی دەیهێنـێ کـوێیە؟" منـیش ئـاوا وەڵامـم دابـۆوە "مەهابـاد و سلێمانی و ئەربیل و موسڵ... " ئەو ناوانەم بەدوای یەك ڕیز کرد، وەك وەڵامێك، وەلێ کە هاتمە سەر ژماردنی ناوی "... دیاربەکر، وان... " عەمیدەکە زۆر بە توندی بەرپەچی دامەوە؛ بە شێوەیەك لە وەڵامەکەم حێرس و تورەبوو، بەپەلە لەسەر کورسییەکەی هەڵستاوە سـەرپێ، ئەوەنـدە بە تونـدی و بەخێرایـی ئەو کـارەی کـرد، ئەمە بووە هۆی ئەوەی لەگەڵ ڕابوونی، کورسیەکەی ژێری بەربێتەوە.

کاتێك عەمیدەکە بە پێوە باسی تورك و نیشتیمانەکەی دەکرد، لە دواوە کورسـیەکەیان بـۆ ڕاسـت کـردەوە و دەسـتیان بە هێمنکـردنەوەی کـرد و لە شـوێنی خۆی، دایـان نیشـاندەوە. وەلـێ ئیفادەی ڕۆژی دادگا بەردەوام بوو. چەند پرسیارێکی دیکەی لەو شـێوەیان دووبـارە لێکـردمەوە. منـیش دووبـارە وەڵامـم دانەوە کە

کوردستان لە "مەهاباد و سلێمانی و ئەربیل و دیاربەکر و وان و بەدلیس و ئاگری و تاد... " پێك دێت. وەلێ لە جاری دووەم، عەمیدەکە تورە نەبوو، یاخود ڕاستترە ئەگەر بڵێین غەزەبەکەی ناو ناخی بۆ دەرنەخەستین.

دادگایی کردنەکانی من، نەدەبووە هەواڵی میدیاکان. چونکە لە دانیشتنەکاندا، تەنیا من و پارێزەرێك ئامادە دەبووین. ئەوێ ڕۆژێ، دوو پارێزەری دیکەش ئامادەی دانیشتنەکە بوون. ئەوانیش هەریەکە لە عەلی یلماز بالکش و سەرحەد بوجاك[1] بوون.

دڵەڕاوکێیەکەی من، دوای بینینی عەمیدەکە لەبەردەم نۆڕینگەی دکتۆری ددان، هۆکارەکەی بۆ ئەوانە دەگەڕاوە کە بۆم باسکردن.

جا بڕیاری دادگا، لەدانیشتنەکە بە تاوانبارکردنی من کۆتایی پێهات. سزاکەشم بریتی بوو لە ١٠ساڵ زیندانی گران و سێ ساڵ ڕاگواستنم. ئەوان بە ماددەی (١٤٠ یاسای کۆنی کۆماری تورکیا) کە بریتییە لە خراپ کردنی وێنەی دەوڵەت لای وڵاتانی بێگانە، سزایان دام. ئەوکاتەی هاتمە نەخۆشخانە، دۆسیەکەم لەلای دادگای باڵابوو. لە دڵی خۆم، لەکاتی چاوەڕوانی کردندا گوتم "خۆزیا نەهاتباما و بەرگەی ئازاری ددانەکەم گرتبا".

بەو مێشك و خەیاڵە ئاڵۆسکاوەمەوە، چوومە ژوورەوە، بۆ لای

---

[1] سەرحەد بوجاك، لە دایك بووی ساڵی ١٩٥١ی شاری روهایە. کوڕی فایەق بوجاکی رووناکبیری ناوداری کورد و سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستانی تورکیا و دۆستی دێرینی مووسا عەنتەرە. (وەرگێر).

دکتۆر. ئەویش ئاماژەی بۆ کورسی دانیشتنی نەخۆش کرد، تا لەسەری دانیشم. منیش دەوم کردەوە و ئاماژەم بۆ ددانە خراپ بوو و نەخۆشەکە کرد. ئەویش بە خولانەوە بە دەورمدا، دەستی بە پشکنینی دەم و ددان و پوکەکانم کرد. بە پێچەوانەی ئەوەی بیرم لێی کردبۆوە، زۆر هێمن و لەسەرخۆ، سەیری یەك بە یەکی ددانەکانی دەکردم. هەموو ئامێرەکانی پشکنینی ددانیشی زۆر بە ئارامی بەکاردەهێنا. جا دوای تەواو کردنی پشکنینەکان گوتی "بەهەڵە کاریان بۆ ئەو ددانە کردووە، کە ئازارت دەدا. بۆیە ئێستا ئەو پارچەیە بەیەکەوە دەنووسێنمەوە، کە لە ددانەکەت کەوتووە. وەلێ ڕەنگە لە داهاتوو دووبارە بکەوێتەوە. کە کەوتەوەش، دەبێ هەمدیسان ئاوا پێوەی بلکێندرێتەوە. بەڵام چارەسەری بنەڕەتی بۆ نەهێشتنی کێشەی ئەو ددانەت، دەبێ لە نەخۆشخانەکانی دەرەوەی زیندان بێت. چونکە لێرە هەر ئەوەندە ئامێرە هەیە تا تیمارت بۆ بکەم".

دوای ئەوە، ئیدی دکتۆر، پێکهاتەیەکی تێکەڵکراو لە چەند ماددەیەکی ئامادەکرد و پارچە کەوتووەکەی بە ددانم لکاندەوە. بەوێ شێوەیێ لەدەست ژانی ددان ڕزگارم بوو.

تا ئەوسا نەمزانی، کاتێك عەمیدەکە چووە ژوورەوە بۆ نۆڕینگە، ئاخۆ لای دکتۆرەکە چی گوتووە؟ وەلێ پێدەچوو هەندێك شتی باشی گوتبێت.

بەو شێوەیە زڤڕیمەوە بەندیخانەی سەیمەن، هەڤاڵانیش چاوەڕوانی گەڕانەوەی منیان دەکرد. چونکە ببووە مەراق لەلایان، ئاخۆ ڕووبەڕووی دۆخێکی ناهەموار بوویمەوە یان نا؟ منیش

تەواوی بەسەرهاتەکەم، وەك ئەوەی بۆ ئێوەم گێڕاوە، بۆ ئەوانیش باسکرد.

***

لێرە بە پێویستی دەزانم تا باس لە مژارێك بکەم: سالآنی هەشتاکان، ئەو سالآنەی لە ئەڵمانیا، لە هەندێك شوێن، لە کرێکاری تورکیان دەدا و سووکایەتیان پێدەکردن؛ حکوومەتی ئەڵمانیا، بڕێك پارەی چاکی بە هەموو کرێکارێکی تورك دەدا، ئەگەر ئەڵمانیا جێبهێڵن. لێرە و لەوێ، دەربارەی کرێکاری تورك، کاریکاتێریشیان بلآو دەکردەوە. وەلێ بەرپرسانی تورك لە تورکیا، ئەوانەیان بە ئاسایی دەزانی و ئەوەیان وەکوو بێڕێزی کردن و ناشرینکردنی تورکایەتیەکەیان نەدەبینی. وەلێ عەقڵی دەوڵەتی تورك لەهەمبەر وتەکانی من، کە گوتبووم "لە تورکیا نکۆڵی لە کورد و زمانی کوردی دەکرێ و ئەوان بەرەو تواندنەوەی نەتەوەیی دەبەن..." ئاوا پێناسە دەکات، کە من بێڕێزیم بەرامبەر بە تورکایەتی و دەوڵەتی تورکیا کردووە و لەلای ولآتانی بێگانە بە ناشرینم پیشان داون.

## مانگرتن لە خواردن

کۆتاییەکـانی سـاڵی ١٩٨١، لە زیـندانی سـەیمەنی سـەربازی فەرماندەی دۆخی لەناکاو بووم. لە قاوشەکان، بە درێژایی ساڵ، بەرنامەی (بەگژ یەکیان بخە - ئاشتیان بکەوە) یان جێبەجێ دەکرد. ئەوەش ببـووە هـۆی ئەوەی (دەڤرمجیەکـان و ئولکوجیەکـان) کاردانەوەیـان بەرامـبەر پـیلانەکە هەبـێ. کاتێـك دەچـووینە هەواگۆڕکێ، یان لەکاتی هاتنە ژوورەوە، بەریەککەوتن و موناقەشە و دەمەقـاڵێ ڕووی دەدا. وەلـێ ئەو پـیلانەی کـارگێڕی زینـدان دەیویست بۆ (بەگژ یەکیان بخە - مەسرەتیان لە نێوان بکە) بە هیچ کلۆجێك سەری نەدەگرت. لە پایزی ساڵی ١٩٨١ قاوشەکان لەیەك جـودا کـرانەوە و دەڤرمجیەکـان و ئولکوجیەکـان، ئیـدی لە دوو قاوشی جیا دەمانەوە.

دوای ئەم جیاکردنەوەیە، بڕیارێك لە بەڕێوەبەرایەتی بەندیخانە هات بۆ ئەوەی قژ و سمێڵی هەموو بەندکراوان بتراشرێت. وەلێ زۆر بە توندی بەرامبەر ئەو بڕیارە وەستاینەوە. کاتێك دەچووینە شوێنی هەواگۆڕکێ، یاخود لەکاتی دەرچوونمان لە هەواگۆڕکێ و گەڕانەوەمـان بـۆ قاوشـەکان، بە گـوتنەوەی درووشـمی دەسـتە جەمعی، ئەو بڕیارەی بەندیخانەمان پرۆتێستۆ دەکرد. وەلێ بەشی کارگێڕی زیندان، سوور بوو لەسەر جێبەجێکردنی بڕیارەکەی، بۆ بڕینی پرچ و سمێڵی بەندکراوان.

چەپەکان، لە گرتووخانەی سەیمەن، لە قاوشی نهۆمی دووەمی

لەوێ دەمانەوە. وەلێ ئەوان لە سێ چوار قاوشی جیا نیشتەجێبوون. جا هەر قاوشە و بە جیا دەچوونە هەواگۆڕکێ و ڕێگایان نەدەدا بەیەکەوە دەرچن. لە دوو قاوشەکەی خوارەوەش پارێزگارە ڕاستڕەوەکان دەمانەوە.

ئەوێ ڕۆژێ، سەرجەم چەپەکانی هەموو قاوشەکان، بەیەکەوە چوونە هەواگۆڕکێ. لە کاتێکدا، کارگێڕانی زیندان، ئەوەیان پێ خاس و خۆش نەبوو. وەلێ ئەوان بەیەکەوە، سەرەڕای ناڕەزایەتی کارگێڕانی زیندان، کارەکەیان کرد. سا لەبەر ئەوەی هەموو بەندیانی قاوشە جیاکان هاتبوونە خوارەوە، هەواگۆڕکێ زۆر قەرەبالغ بوو. لەوێ بەدەنگێکی گڕ و بەرز، هەموو زیندانیان بەیەکەوە، دژی تاشینی قژ و ڕدێن و سمێڵ، درووشمیان دەگوتەوە و پێداگرییان لەسەر جێبەجێ نەکردنی بڕیارەکە دەکردەوە. لەبەرامبەریشدا، بەڕێوەبەرایەتی زیندان، زوو زوو و بێ پسانەوە، لە ڕێگای بڵندگۆکانەوە بەندکراوانیان ئاگادار دەکردەوە، تا بگەڕێنەوە قاوشەکانی خۆیان. وەلێ کەس خۆی لەو ئاگادارکردنەوانە نەکردە ساحێب.

دوای ئەوە، بەڕێوەبەرایەتی زیندان لە ڕێگای پاسەوانەکانەوە، دەستیان بە دانانی بەربەستی چوونە ناو شوێنی هەواگۆڕکێ کرد و هەستان بە ڕیزکردنی ئەو بتڵە غازانەی لە نانەدینەکە هەبوو، تا ڕێگای بەندکراوانی پێ بگرن. پاشان بووە مقۆ مقۆی ئەوەی، ئەو بتڵە غازە دوازدە کیلۆییانە، ئەگەری تەقینەوەیان هەیە.

بەو حاڵ و حیسابەوە، لە پڕ کۆمەڵێك سەربازی دارلەدەست، ڕاستتر بڵێم، تیمێکی تایبەتی سەربازی، هاتنە ناو شوێنی

هەواگۆڕکێ و بەشێوەیەکی زۆر توند و بێ بەزەییانە دەستیان بە لێدانی زیندانیان کرد. خۆی، بەر لە هاتنی تیمە تایبەتەکە، هەواگۆڕکێ تژی مرۆڤ بوو، لەگەڵ هاتنی تیمەکەش، گوشارەکە زیاتر بوو. ئەمەش ببووە هۆی ئەوەی نە سەربازەکان بتوانن بەدوای بەندکراوان بکەون بۆ لێدانیان، نە بەندکراوەکان توانای لەدەست ڕاکردنیان هەبوو. وەلێ سەربازەکان، هیچ دەرفەتێکیان لە کیس خۆیان نەدەدا و شلم کوتم، کێیان بکەوتبا بەر دەست بە ڕاست و چەپ دەیانوەشاند و لە بەندکراوانیان دەدا.

بەندکراوان بۆ خۆپاراستن لە دارکارییەکە، ئەوەی لە دەستیان دەهات دەیانکرد. بۆیە هەندێکجار، لەکاتی ڕاوەشاندنی دارەکانی دەستیان، سەربازەکان دەست و دارەکانیان بەر دیواری ئەوێ دەکەوت. ئەمەش دەبووە هۆی ئەوەی، بەشێك لە لەبغی دیوارەکان هەڵوەرن. جا لە بەدبەختی ئەوەش، هەر بە سەروگوێلاکی بەندکراوان دەکەوتەوە. یەکێك لەو پارچە چیمەنتۆیانەی لە دیوارەکە بەربۆوە، بەر دەموچاوی من کەوت و لچی بریندارکردم و تووشی خوێن بەربوون بووم. جا گەرماوگەرم هەستم پێنەکردبوو، وەلێ کە دەستم بۆ دەمولوتم برد، پاشان بینیم خوێنم لێ هاتووە. جا لەو ئانوساتە، لەگەڵ فەرماندەی هێزە تایبەتەکە کەپوومان لەیەك گیر بوو، کە بینیم زۆر واقم وڕما. فەرماندە سەربازییەکە، ئەوکەسە بوو کە لەبەشەکانی پێشوو ئاماژەم پێکردبوو کە هاتبووە لام و پێی گوتبووم "چەرکەسم، بەڵام تورکم".

لە پڕ، فەرماندەکە فەرمانی وەستانی هێرشەکەی دا. لەهەمان

کات، فەرمانی دا هەرکەس و لە شوێنی خۆی لەسەر چینچکان دانیشێت. سەربازەکان ڕاستەپێ، بەندکراوانیان لە شوێنی خۆیان دانیشاند. ئەوانی داشنەدەنیشتن، بە زۆر دایان نیشاندن. سەرباز ئەوەندە زۆر بوو، هەرکەسە و دانەیەکی بەردەکەوت. بۆیە بە تۆبزی، قژ و ڕدێن و سمێڵمانیان تاشی.

دوای تەواوبوونی ئۆپەراسیۆنەکە، هەر کەسە بردراوە قاوشی خۆی. ئیدی دوای ئەو کارە، وەکوو کاردانەوەیەك، بووە هۆی ئەوەی زیندانیان دەست بە مانگرتن لە خواردن بکەن.

منیش یەکێك بووم لەوانەی بەشدا بووم لە مانگرتن لە خواردن. لەوێ دەمێدا، من لەو قاوشە دەمامەوە کە هەڤالانی (دەف یۆل) لێی دەمانەوە. هەموو ئەوانەی لە قاوشەکە بوون، بەشداری مانگرتنەکەیان کرد، کە ژمارەمان نزیکەی ٣٠ کەسێك دەبوو. جا کاتێك لە هەواگۆڕکێ پرچ و سمێڵ و ڕیشیان تاشین، ئێمەیان لەسەر بەرد دانیشاند، بۆیە ئەمە ببووە هۆی ئەوەی گەدەم ساردی بخوا و نەخۆش بکەوم. هەندێك لە برادەرانیش هەمان شتیان بەسەردا هات و نەساغ بوون. وەلێ ئێمە بەو شێوەیەش دەستمان بە مانگرتن لە خواردن کرد.

## مفتەی ئەدەبخانە "دەچمە ئاودەست فەرماندەم"

کاتی خۆی دەرگای قاوشەکان بەردەوام کراوە بوون، بۆیە چوونە ئاوەدەستیش هێسان بوو. بەڵام لەگەڵ دەستپێکی مانگرتن لە خواردن، دەری قاوشەکانیش داخران. جا لەبەردەم قاپیەکە، سەربازێکی ئێشکگریش داندرابوو. بۆ چوونە ئەدەبخانە، هەرجارە و نۆبەت بە قاوشێك دەدرا. بەشێوەیەك تا گیراوانی قاوشێك پێویستی چوونە سەر ئاویان تەواو دەبوو، جا ڕێگا بە یەکێکی دیکە دەدرا بچنە ئاودەست. پاشان یەك یەك دەنێردراینە ئاودەست. واتە کاتێك کەسی نێردراو دەگەڕاوە، سا کەسێکی دیکە دەنێردران. لە کاتێکدا دوازدە ئاودەست لەتەك یەك هەبوو، وەلێ بۆ ئەزیەتدانمان، ئەو کارەیان دەکرد.

لە بابەتی چوونە سەرئاو، کێشەیەکی گەورەتریشمان هەبوو؛ بەتایبەتیش لە ڕۆژانی سەرەتای جێبەجێکردنی ئەو ڕێکارە تازەیە. چونکە کاتێك دەمانگوتە ئەو سەربازە ئێشکگرەی لەبەر دەرگا وەستابوو "دەمەوێ بچمە ئاودەست" لە وەڵامدا دەیگوت "ئەگەر نەڵێی فەرماندە، دەرگاکە ناکەمەوە". ئەو دەیویست بڵێین، فەرماندەم دەمەوێ بچمە سەرئاو. جا ئەگەر وامان نەگوتبا، دەرگای بە ڕوودا نەدەکردینەوە. بۆیە تەنیا لەبەر ئەو ناوهێنانە، زۆر دەمەقاڵێ و ناخۆشی دروست بوو. بۆیە هەر کاتێك بەو شێوەیە دەرگا دەکراوە، بە تەنیا دەیانناردین، بۆ ئەوەی تا ئەدەبخانەکە، سەرباز تێر شەق و شولاقمان بکەن. لەوسەریش هەر بە لێدان دەیانهێنایەنەوە.

لەهەمووی ناخۆشتر ئەوەبوو، کاتێك دەچووینە ئاودەست و دادەنیشتین، دەبوو دەرگاکە بە کراوەیی جێبهێڵین. لەهەمان کات، دەمێکیان دادەنا تا پێویستی خۆت جێبەجێ بکەی. زۆر جار ئەو ماوەیە کەمتر لە دوو خولەك بوو. هەموو ئەوانەی باسم کرد، ببووە هۆی ئەوەی ئاریشەیەکی زۆر لە قاوشەکە ڕووبدات. بۆیە بوونی ئەدەبخانە لە زینندانی جۆری E لەناو حوجرەکان، بە ئازادییەکی گەورە هەژمار دەکرا. لەگەڵ ئەوەی بوونی ئاودەست لەناو حوجرەی مانەوە بۆنی ناخۆشی دەردەخست. وەلێ بەهەر حاڵ و بارێك بێ، کێشەی بۆنی ناو حوجرەکان زۆر چاکتر بوو، لەوەی ڕێگا نەدرێت بە ویستی خۆت بچیتە ئاودەست و لە دانیشتنیش کاتێکی کەمت بۆ دابندرێت.

ڕۆژی پێنجەمی مانگرتنەکە، هەڤاڵێکمان دۆخی تەندروستی تێکچوو و بردرایە نەخۆشخانە و بۆ ئێوارە هێنایانەوە. چەند ڕۆژی پاشتریش، چەند برادەرێك بەهەمان دۆخ تێپەڕین و گەیاندرانە بیمارستان. وەلێ لەبەر ئەوەی ئەو برادەرانە ڕێگایان نەدەدا چارەسەر بکرێن، بۆیە بە ناچاری چۆنیان دەبردن، هەر ئاواش دەیانهێنانەوە.

منیش ورده ورده هەستم بە ناڕەحەتییەك کردبوو لە گەدەم، ئیدی کەم کەم ژانەکەی زێدە بوو و، ڕۆژی یازدەهەمین منیشیان گواستەوە نەخۆشخانە. لەوێ منیان لە ژوورێکی نهۆمی یەکەم دانا، کە پەنجەرەکانی بەسەر باخچەی نەخۆشخانەکەی دەڕوانی. ژوورەکە دوو نەفەری بوو، بۆیە دوو یاتاغی نەخۆشی لێبوو. کە منیان برد، لە ژوورەوە زیندانییەکی دیکەشی لێبوو، بۆیە منیشیان لە بالینگانەکەی دیکە پاڵخست.

ماوەیەك دواتر دکتۆر هات و بە وردی پشکنینی بۆ کردم، منیش باسی ئەوەم بۆکرد، کە مانم لە خواردن گرتووە، بەڵام ئازارێکی زۆر لە گەدەم هەیە. پزیشکەکەش دەستی بە پشکنینی گەدەم کرد. چەند جارێك بە دەوروخولی یاتاغەکەم هات و چوو. هەستم بەوە کرد، دکتۆرەکە گرنگییەکی تایبەتم پێدەدا، بۆیە ئەو بەدەم و خولق هاتنەم بەلاوە سەیر و عەجیب بوو. ماوەك دواتر دکتۆرەکە بە حوزنەوە گوتی "لە نزیکەوە جەنابت دەناسم. ئاشنایەتیم لەگەڵ پەرتووك و نووسینەکانت هەیە. وەك چۆن دەزانم، کوو لە زانکۆی ئەتاتورك دەریانکردی، چونکە لەوێ بەیەکەوە کارمان دەکرد. ئەوسا من لە کۆلێژی پزیشکی بووم و تۆش لە کۆلێژی ئاداب. تۆ هاوڕێی کیرکۆر بووی، ئەو دۆستی منیش بوو... تا بەبیرمە، ئەوسا، ئێوە دەستەیێکی بە کەیف و جۆشتان هەبوو. ئێمەش لە دوورەوە سەیری ئێوەمان دەکرد...".

پەیڤەکانی دکتۆر، تووشی حەپەسانی کردم. پاشان بەردەوام بوو لە ئاخافتن "ئێستا لە دۆخێکی زۆر تەنگاودام، چونکە لەگەڵ ئەوەی ڕێز و حورمەتم بۆ بیرکردنەوە و بڕیاری مانگرتنەکەت هەیە، وەلێ منیش وەکوو دکتۆرێك کۆمەڵێك بەرپرسیارەتی ئەخلاقیم لە ئەستۆیە. بۆیە دەمەوێ پێت بڵێم ژانی گەدەکەت پەیوەندی بە مانگرتنەکەت نییە، وەلێ گەدەت ساردی خواردووە. دەمێکی زۆرە ئاوایە و هیچ چارەسەرێکیشی بۆ نەکراوە، بۆیە ئەگەر ماوەیەکی دیکە ئاوا بەردەوام بێ، کێشەی گەورەت بۆ چێدەکات. بۆیە پێویستە مغەزیت بۆ دانێم...".

کاردانەوەیەکی زێدەم بۆ ئاخافتنەکەی دکتۆر نەبوو، بۆیە

مغەزییان بۆ دانام. نزیکەی پازدە ڕۆژ لە نەخۆشخانە مامەوە. لەو ماوەیەدا، ناوە ناوە دکتۆرەکە خۆی، هەندێکجاریش پەرستارەکان دەهاتن و چاودێری دۆخی تەندروستیان دەکردم. دوای ئەوەی لە نەخۆشخانە دەرچووم و گەڕامەوە بەندیخانە، زانیم کە چەند ڕۆژێکە کۆتاییان بە مانگرتن هێناوە. بۆیەش ژیانێکی ئاسایی لە زیندان دەستی پێکردبۆوە.

## لەگەڵ ئیحاسن کاچماز، لە زیندانی جۆری *E* لە چەنەقەلە

لە مانگی یازدەی ساڵی ١٩٨٢ وەوە، لە قاوشی D-8 زیندانی جۆری E چەنەقەلە بووم. لەوێ چەندان قاوشی جیا جیای گەورە و بچووکی لێبوو. قاوشەکەی من شوێنی ٣٠ نەفەری لێدەبۆوە. لەوێ، چەندان هەڤاڵی شۆڕشگێڕی ناو ڕێکخستنە جیا جیاکانیشی لێبوو.

ئەو زیندانەی منیان تێ خست، تازە دروستکرابوو. لەوێدا، لە گرتووخانەکان، شۆڕشی یەك پۆشی هەبوو، بۆیە هەرچی بەرهەڵستکاری ڕێك پۆشی زیندانەکانی دیکە هەبوو، لەوێیان ئاخنی بوو.

من و مووسا ئۆتوفانیان بەیەکەوە بردبووە بەندیخانەکە. کاك مووسا ئەندازیاری کارەبا بوو، سزاکەشی لەلایەن دادگای باڵای سەربازییەوە پەسندکرابوو. ئێمە بەیەکەوە لە بەندیخانەی سەربازی سەیمەن لە گۆلجوك نێردرابووینە زیندانی کۆجائەلی.

سـزادراوانیش، لەوێـوە زیـاتر دەنێـردرانە ئەو گرتووخانـانەی لە جۆری E بـوون، لەبەر ئەوەی زینـدانی چەنەقەلەش تـژی بەنـدی بوو، بۆیە ئێمەیان گواستەوە بەندیخانەی چەنەقەلە.

دەسـتی مـن و مووسـا ئۆزتوفانیـان بەیەکەوە کەلەپـچە کـرد، هەریەکە و دەستێکیشـمان ئـازاد. هەر ئـاواش سـواری تڕومبێلـی زینـدانیان کـردین. لەنـاو تـڕومبێلەکە لەسـەر سـندووقێك دانیشـتین. تۆزێـك دواتـر دوو کەسـی ئەنـدامی ( ئولکـو ئۆجـاکلاری)[1] سواری تـڕومبێلەکەی ئێمە کران. ئەوانیش وەك ئێمە دەستیان بە دەسـتبەندی ئاسـنی بەیەکەوە بەسـترابۆوە. لەو شـوێنەی لە دواوەی تڕومبێلەکە دانیشتبووین بەرامبەر بەیەك، هیچ سـەربازێکی لێنەبوو. بەڵکوو لە تەك شۆفێرەکە، سەربازەکانیش لە پێشەوە ڕۆنیشتبوون.

لە دواوەی تـڕومبێلەکە، لە نێـوانی ئـێمە و ئەو دوو کەسـەی لە هەمبەرمان دانیشتبوون، چەند پارچە حەیزەرانێکی بیست سانتیمی هەبـوو. ئـێمە چـوار کەس لە دواوە، هەر دووانێکمـان دەسـتمان بە کەلەپـچە بەیەك بەسـترابۆوە و هـیچ سەربازێکیشـمان لا نەبـوو. لەگەڵ ئەوەش چەنـــد حەیزەرانێـــك لەوێ دانـــدرابوو، ئەوەش دۆخێکـی سـەرنج ڕاکـێش بـوو. کە ئەو حـاڵ و حیسـابەم بینـی، باوەڕم بەوە هێنا، فەرماندەی زیندانەکە بە زانین ئاوای کردبێ، تا

---

[1] ئولکـــو ئۆجـــاکلاری، ڕێکخراوێکـــی رادیکـــاڵی تـــورکە پارێزگارەکـــانە و پەیوەندییەکی نزیکی لەگەڵ پارتی نەژاد پەرستی تورکی (مەهەپە) هەیە. هەروەها ئەو ڕێکخـراوە بە هێـزی میلیتـانی مەهەپەش دەناسـرێت. ڕێکخـراوەکە لە سـاڵی ١٩٦٦ لە شـێوەی وەقـف لەلایەن ئاڵـپ ئارسـلان تـورکەش و دونـدار تاشـەر دامەزراوە. (وەرگێڕ).

ئێمه له ڕێگا بکەوینه سەرو گوێلاکی یەکدی و لەیەك بدەین. ئەمه وای کرد به ئاگاییەوه بجولێمەوه. لەگەڵ ئەوەی هەردوو لامان نیەتێکی وەهای له چاو نەدەبیندرا. باشبوو تا گەیشتینه زیندانی چەنەقەله، هیچ کێشەیەك له نێوانمان ڕووی نەدا.

لەبەر ئەوەی بەندیخانەی چەنەقەله نوێ بوو، بۆیه ئێمه له کۆمەڵەکانی سەرەتای ئەو کەسانه بووین که چووینه زیندانەکە. بەر له ئێمەش چەند دەستەیێك بردرابوونه ئەوێ. ئێمه هێشتا له دەرگای چوونه ژوورەوه بووین، دەنگی سلۆگانەکانی ژوورەوه دەهاته بەر گوێمان. ئیدی بۆمان ڕوون بۆوە، شۆڕشی یەك پۆشی بەردەوامه.

ئەوێ ڕۆژێ، له دەرگای چوونه ژوورەوه، فەرماندەی زیندانەکە ئاوا هەڕەشەی له من و مووسا کرد "له ڕێکارەکان دەرنەچن، چونکه به پێچەوانەوه، له عەنتاب زیندانێکی تایبەت دروست دەکرێت که حەفت نهۆم له ژێر زەوییه ، کەر سەرپێچی بکەن دەتاننێرمه ئەوێ...".

له ڕۆژانی سەرەتا، له قاوشی D-8 نزیکەی حەفت هەشت کەسێك دەبووین. وەلێ هەموو ڕۆژێك کەسی تازه دەهاتن. له زیندانەکانی ئیزمیر و کۆنیا و چەلێ، زیندانییەکانیان دەهێنا لای ئێمە؛ بۆیه هێندی هێندی قاوشەکەمان قەرەباڵغ بوو. ئەوسا له زیندانی ئیزمیرەوه جۆشکون ئوستەرجی و له ئیستانبووڵ جەمیل ئۆزکان هاتنه قاوشەکەی ئێمه. هەروەها برادەرێکیشمان به ناوی حوسێن تەمەل هاته لا، که له گۆڤاری (ڕزگار)ی کاری دەکرد، ئەویان له ئەدەنەوه هێنا لامان. له پاڵ ئەوان، یوسف ئەنوەریش له ناوچەی یومورتەلیکی ئەدەنەوه گوازرابۆوه لامان.

شوێنەکە دوو نهۆمی بوو، جا بۆ ئەوەی ئەوانەی سەرەوە و ژێرەوە لەگەڵ یەك پەیوەندی نەبەستن، کارگێڕی زیندانەکە هەموو هەوڵێکی خۆی خستبووە گەڕ. جا زیندانەکە خاوەن شوێنێکی هەواگۆڕکێی گەورە بوو، وەلێ بە نۆبەت، هەر جارە و قاوشێك دەنێردرانە هەواگۆڕکێ.

کاتێك سەرقاڵی خۆگونجان و دەستپێکی ژیانێکی تازە بووین لەوێ، دەنگۆی ئەوە بڵاو بۆوە، گوایە کاك ئیحسان، یان بڵێین ئیحسان بابا دهێننە لامان. ئەو خەڵکی ئەدەنە بوو، لێ لە زیندانی کۆنیا بوو. هەندێك لە برادەران دەیانگوت کاك ئیحسان، هەندێکیش بە خاڵە ئیحسان بانگیان دەکرد، بەعزێکیشیان بە ئیحسان بابا ناویان دەهێنا، لەگەڵ ئەوەی هەندێك دەیانگوت مامە ئیحسان. دوای ئەوەی زۆر پرسی بە مەراقیان کرد لەسەر ڕاستی و دروستی نوچەکە، جا گوتیان، ئەو برادەرەی دێ، ناوی ئیحسان کاچمازە. ئەو دەنگۆیە نزیکەی دە ڕۆژی خایاند. لە کۆتایدا ئیحسان کاچماز هات و لە قاوشی ئێمەیان دانا. ئیحسان کاچماز کەسێکی باڵابەرزی بەخۆوە بوو. کەسێکی زۆر بە هێز بوو، جا شان و شەوکەتێکی پانیشی هەبوو، بۆیە بەردەوام پاڵتۆیەکی درێژی لەبەر دەکرد. لەکاتێکدا لە زیندان شۆڕشی نەهێشتنی یەك پۆشی بەردەوام بوو. بۆیە ئێمەش لە قاوشەکەی خۆمان، باسی ئەوەمان دەکرد، ئاخۆ ئێمەش بچینە پاڵ ئەوان یان نا؟ لە کاتێکدا ئێمە سەرنجیشمان لەوە دەدا، ئەو برادەرە تازەیە چۆن توانیویەتی بەو پاڵتۆ درێژەوە بێتە ناو زیندان. وامان بیرکردەوە، ڕەنگە هۆکارەکەی بۆ ئەوە بگەڕێتەوە، کە قاوشەکەی ئێمە نەچوونەتە ڕیزی خۆپیشاندەران و شۆڕشگێڕانی دژ بە یەکپۆشی.

کاك ئیحسان خەڵکی نسێبین بوو، ئەو دەیگوت "نیوەم کوردە و نیوەکەی دیکەشم عەرەب. خەریکی کاری قاچاغچیەتیشم، بۆیە چەند جارێك، کەوتوومەتە زیندانەکانی سووریاش". ئیحسان کاتێك مژوولی کاری قاچاغچییەتی بووە، لە دەورووبەری فەڵەستین، لەگەڵ چەند شۆڕشگێڕێکی خەڵکی تورکیا یەکدییان ناسیووە. ئیدی لەوێوە چووەتە ناو کۆمەڵەی سیاسییە پارتیزانەکان. بۆیە بە تۆمەتی پڕوپاگەندە بۆ کۆمۆنیستی، دادگایی کرابوو و سزای زیندانی کردنی بەسەردا سەپێندرابوو.

من لە قاوشەکە ناوی ئیحسانم بە کاك ئیحسان دەهێنا، لەگەڵ ئەوەی وەك لە سەرەوە باسم کرد، هەندێك لە برادەرانی دیکە بە پێشگر و پاشگری جیا جیا بانگیان دەکرد. ئەویش بە منی دەگوت کاك ئیسماعیل. کاك ئیحسان سەرەڕای ئەوەی تەمەنی لە من گەورەتر بوو، بەڵام هەر بە کاك ئیسماعیل ناوی دەهێنام، منیش ئەوەم وەکوو ڕێزگرتنێك لێکدەداوە. بۆیە پەیوەندییەکانمان بەو شێوەیە بەردەوام بوو.

وەکوو قاوشەکانی دیکەی زیندانەکە، قاوشەکەی ئێمەش هەندێك داواکارییان هێنابووە زمان. هەروەها پێداگیریمان لەوە دەکرد، کە کارگێڕی بەندیخانە، دەبێ ئەو داخوازییانەمان بێنێتە جێ. بۆ ئەمەش جۆشکون ئوستەرجی وەکوو نوێنەری قاوشەکەمان لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتی گرتووخانە دەپەیڤی. بۆ ئەمەش چەندان جار لەگەڵ بەڕێوەبەر و جێگرەکەیی و سەرۆکی پاسەوانەکانی گرتووخانە دانیشتبوو. لە کاتێکدا، کارگێڕانی بەندیخانەکە دەیانویست، ڕێگر بن لەوەی، قاوشەکەی ئێمەش

بچێتە پاڵ قاوشەکانی دیکە بۆ دەستپێکردنی شۆڕشی دژە یەك پۆشی. جا بۆیە لە دیدارەکاندا ئیحسان کاچماز ڕۆڵێکی دیاری دەگێڕا.

ئیحسان کاچماز قسەکەرێکی باش و لێهاتوو بوو، واتە لەو ڕووەوە لەبلەبان بوو. بۆیە بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا بۆچوونەکانی خۆی دەخستە ڕوو، جا لەناو ئاخافتنەکانیشیدا زانیاری لە بارەی یاساکانی لە داردان و چۆنیەتی جێبەجێکردن و ماددە یاساییەکانی ناو دەستوور و تاد... بەکار دەهێنا. بۆیە زۆرجار بەرامبەر بەو ئاخافتنانە، بەڕێوەبەر، یانیش جگری بەڕێوەبەر و بەشی کارگێڕی هیچیان پێنەدەما بۆ وتن، تەنیا ئەوە نەبێ کە بڵێن لە یاسا و ڕێساکان دەرنەچن. دواتر دەگەڕانەوە شوێنی خۆیان. ئەو پێشهاتە لە بەهاری ساڵی ١٩٨٣ زوو زوو دووبارە دەبۆوە. دیدار و جڤینەکانی نێوان ئێمە و بەشی کارگێڕی، هیچ ئاکامێکی لێ دەرنەکەوت، چونکە ئەوان هەموو داواکارییەکانی ئێمەیان ڕەتکردەوە. بۆیە ئێمەش چووینە پاڵ قاوشەکانی دیکە، دژی جێبەجێکردنی یاسای یەکپۆشی. لەگەڵ ئەمە، دەستمان بە مانگرتن لە خواردنیش کرد. بەڵام لە هەمووی سەیرتر ئەوەبوو، بەیانی ڕۆژی دووەمی مانگرتنەکە، بەڕێوەبەرایەتی بەندیخانە لە ئۆپەراسیۆنێکی خێرادا هاتن و هەرچی شەکر و خوێی قاوشەکەمان هەبوو، هەموویان برد. تا ئەوێ دەمێ، بە نۆبەت دەچووینە شوێنی هەواگۆڕکێ، بیرمە هەواگۆڕکێی قاوشەکەی ئێمە، ئەو تاوانبارانەش دەیهاتنێ، کە بە هۆکاری ئەنجامدانی تاوانی کۆمەڵایەتی خرابوونە زیندان. بۆیە برادەرانمان بە دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵ ئەوان، لە ڕێگای پەنجەرەکانەوە، توانییان شەکر و خوێ بۆ قاوشەکەمان دابین بکەن.

دوای دەستپێکردنی شۆڕشی دژە یەکپۆشی و مانگرتن لە خواردن، سزاکانی کارگێڕی زیندانیش یەك بە دوای یەك بەسەرماندا جێبەجێ کرا. بۆ نموونە هەواڵگۆڕینەوە و نووسینی نامە و دیداری هەفتانە و چوونە هەواگۆڕکێ و پەیوەندی گرتن لەگەڵ قاوشەکانی دیکە و چوونە حەمام و خوێندنەوەی ڕۆژنامەی ڕۆژانە و هاتنی گۆڤار و پەرتووکیش قەدەغەکرا. بە شێوەیەك، بۆ پاشگەزکردنەوەی ئێمە لەو بڕیارەی داومانە، کارگێڕی بەندیخانە هەموو ڕێکارێکیان بەکارهێنا، بە شێوەیەك سزاکان گەیشتبوونە ئاستی ئەشکەنجەدان و توندوتیژی. لێ سەرباری هەموو سزاکانیان، شۆڕش و مانگرتن بەردەوام بوو.

بۆ وەستانی ئەو هەنگاوەی هاویشتبوومان، کارگێڕی بەندیخانە هەندێکجار بەرپرسی پاسەوانەکان و هەندێك جاریش خوودی پاسەوانەکانی نارد، بۆ ئەوەی لەو بڕیارە پاشگەز ببینەوە و بگەڕێینەوە دۆخی ئاسایی خۆمان. لە بەرامبەر ئەمە، ئێمەش داواکارییەکانی خۆمانمان پێدەگوتن تا بیگەیەننە سەرووی خۆیان، وەلێ کەس لەبەر ئەوەی دیکەی دانەدەهێنا و پێیان دەگوتین "ئەو فەرمانانە لە سەرووی خۆمان هاتووە و ناتوانین خۆمان تێی هەڵقورتێنین".

ئیدی ئێمە گەیشتینە ئەو باوەڕەی، بەڕێوەبەرایەتی زیندانەکەمان دەیەوێ بە زەبری هێز بێتە ناو قاوشەکان و کۆتایی بە شۆڕش و مانگرتن بهێنێت. بۆیە دەستمان بە دروستکردنی ڕێگریی و پەرژین و لەمپەر کرد لە پشت دەرگاکانی هاتنە ژوورەوە.

بەیانییەکی زوو، دەنگی درووشم لە یەکێك لەو قاوشانەوە

گەیشتە بەر گوێمان کە لە باڵەخانەی کارگێڕی زیندانەکە نزیك بوو. تا دەهاتیش، دەنگی درووشمەکان زیاتر و بڵندتر دەبوون. کە دەیانگوت "کۆتایی بە ئەشکەنجەدان بهێنن، چونکە شۆڕش بەسەر ئەشکەنجەدا سەردەکەوێ".

ئیدی بیرۆکەکەمان ببووە ڕاستی و پاسەوان و هێزە تایبەتیەکان بەیەکەوە، بە زەبری هێز چووبوونە ناو قاوشەکەی ئەوێ. بەڵام تا دەهات دەنگی درووشمەکان نزیکتر دەبۆوە، ئەوەش مانای ئەوەبوو کە هێزەکە قاوشێکیان تەواو کردووە و چوونەتە قاوشێکی دیکەی نزیکتر لە ئێمە. ئیدی وای لێهات دەنگی گوتنەوەی درووشمەکان و سلۆگانەکان لەهەموو قاوشەکانەوە بەرز دەبۆوە.

زۆری پێنەچوو، کە بەڕێوەبەر و جێگرەکەیی و سەرۆکی پاسەوانەکان و سەربازەکان و هێزە تایبەتەکە، گەیشتنە بەر دەرگای قاوشەکەی ئێمەش. سەرەتا ویستیان بە مفتەکانیان دەرگاکە بکەنەوە، وەلێ کە بینیان ناکرێتەوە، بۆیە، ویستیان بەهێز ئەو کارە بکەن و بەربەستەکان لابەن.

ئەوێ ڕۆژێ، ئیحسان کاچماز ڕۆڵێکی گەورەی گێڕا لە ڕووبەڕووبونەوەکەماندا لەگەڵ ئەو هێزەی دەیانویست بێنە ناو قاوشەکەمان. چونکە بە قاچەکانی ڕێگر بوو لەبەردەم کردنەوەی دەرگاکە، بە دەستەکانیشی مژوولی شەڕکردن بوو لەگەڵ سەربازەکان و، دوور خستنەوەیان لای دەرگاکە. ئیدی بە هۆی ئەو بەرگرییە سەخت و بەربەستە قایمانە، بە ئاسانی نەیانتوانی بێنە ژوورەوە.

ڕووبەڕووبـــوونەوەی قاوشـــەکەی ئـــێمە زۆری خایانـــد، بەڵام هێـزەکە هەر لەدەرەوە بـوون و توانـای هـاتنە ژوورەوەیـان نەبـوو، بـۆیە بڕیاریانـدا بە کـونکردنی دیوارەکـان هەوڵـی هـاتنە ژوورەوە بـــدەن، بـــۆ ئەمەش بە دە تەور و کوتـــك، هەوڵـــی بە ئەنجـــام گەیاندنی ئەو بیرۆکەیان دەدا. بۆ ئەمەش زۆر ماندوو بوون، وەلێ دیـار بـوو لەوەش سـەرکەوتوو نەبـوون، تـا بەو شـۆلە لەو دیـوی دیوارەکانەوە بێنە هونـدوڕ، بەڵام لە پڕ و لەو پەنـجەرانەی بەسـەر شوێنی هەواگۆڕکێیەکەی دەڕوانی، گازی فرمێسك ڕێژیان هەڵدایە ژوورەوە. مـاوەیەکی زۆر بەرامـبەر بەوەش خـۆگر بـووین، وەلـێ لەگەڵ زیاد بوونی ڕێژەی گازەکە و کەم بوونەوەی ئۆکسـجین، بە ناچـاری ئەوجـارە خۆمـان بەربەسـتەکانمان لە ژوورەوە تێکـدا، چونکە پێویستیمان بە چوونە دەرەوە بوو. زۆرمان لە خۆمان کرد تـا بەرگـری لە خۆمـان بکەیـن، بەڵام لە کۆتاییـدا سـەرکەوتوو نەبـووین و بەرەو دەرەوە ڕامـانکرد. دوای دەرچوونمـان دەسـت بەسـەر هەرچـی کەلـوپەل هەیە گیـرا، جـا چیشـمان لەبەربـا پێیـان داکەنـدین، بـۆیە تەنیـا دەرپێ قوتەیـان بەبەر هێشتینەوە و ئێمەیـان نـاردە زینـدانی تاکەکەسـی. ئەو جـل و بەرگەی دەسـتی بەسـەردا گیرابـوو، هەمـووی لە چەنـد گـونیەیەك کـرا و خـرا شـوێنێکی تایبەتی زیندان.

لەو جـۆرە زینـدانەی مـن لێـی بـووم، لەناوەڕاسـتی نهۆمەکـانی سەرەوەی گرتووخانەکە، زیندانی تاکەکەسی لێبوو. لەهەر نهۆمێك نزیکەی دە حوجرەی لە خۆ دەگرت. جا تـاکە شتی چاکی ئەو جـۆرە زینـــدانە تاکەکەســیانە بــریتیە لەوەی لەنــاو حــوجرەکەدا ئاودەستی خۆی هەیە. جا هەر بەندکراوێك لە حوجرەیەك زیندان دەکرێ و بە تەنیا دەمێنێتەوە.

دوای ئەو ئۆپەراسیۆنە، مانگرتن لە خواردن کۆتایی پێهات. وەلێ شۆڕشی دژە یەکپۆشی بەردەوام بوو. بۆیە هێرشیان کردە سەر قاوشەکەی ئێمەش. ئامانجیان بوو، بمانخەنە زیندانی تاکەکەسی. لەگەڵ ئەوەی هەڤاڵانمان چاوەڕوانی وەها ئۆپەراسیۆنێکیان دەکرد، بۆیە هەموومان پێڵاوەکانمان لە پێ کردبوو، بە توندییش پێڵاو بەندەکانمان گرێ دابوو. منیش وەك برادەران لە ئامادە باشیدا بووم.

لە گەڵ دەستپێکی ئۆپەراسیۆنەکە، لەبەر ئەوەی هەموومان ئامادەبووین، بۆیە هەر کە لە قاوشەکە دەرچووین، ئێمەیان ئاڕاستەی حوجرەکان کرد. من چەند پەرتووکێك و یەك دوو فەرهەنگم لابوو، بۆیە بەپەلە لەناو دۆڵابەکەم دەرهێنان و خستمە ناو تورەگەیەکەوە، بەڵام ئەمە کاتی لێگرتم، بۆیە لەوێ دەمێدا، یەکێك لەو پاسەوانانەی ئێمەیان بەرەو حوجرەکان بەلکێش دەکرد، لێمی خوڕیەوە "وەڕەس بووم بەدەست ئەو پەرتووکانەی تۆوە، هەموویان دەرچوون و تەنیا تۆ ماویتەوە، یەڵا پەلەکە... ".

کە بەرەو حوجرەکان چووین، بینیم هەرکەسێك بەشداری شۆڕشی دژە یەکپۆشی کردبووبێت، لە زیندانی تاکەکەسی ئاخنراوە، بۆیە حوجرەی ڤاڵا نەمابۆوە. لەبەر نەمانی شوێن، منیان لە حوجرەی ژمارە شەشی نهۆمی سێیەم، لەگەڵ هەریەکە لە جۆشکون ئوستەرجی و مووسا ئۆزتوفان دانا. حوجرەکانی دیکەش هەر ئاوابوو، لە کاتێکدا ژمارەی ئەو حوجرانەی تەنیا کەسێکی لێبوو، زۆر کەم بوو.

ئیدی هاوینی ساڵی ١٩٨٣ وا تێپەڕی. کارگێڕی بەندیخانەش،

سـەرجەم ئەو قەدەغەکاریـانەی لەسـەرمانی سـەپاندبوو، بەهەر شـێوەیەك بـێ درێـژەی پێـدەدا. هەرچـی تـایبەتە بە چـۆنیەتی خواردنیشمان، دوای هێنانی لەسەر عارەبانەیەکی خواردن گێڕان، لەلایەن ئێشـکگری نهۆمەکـانەوە بەسـەرماندا دابەش دەکـرا، جـا ئێشکگرەکە هەر ڕۆژە و یەکێك لە هەڤالان بوو.

بیـرمە، ڕۆژێـك منـیش بـوومە ئێشـکگر و خـواردنم بەسـەر نهۆمەکان دابەشکرد. بەڵام لە تەبەقەی سەرەوە بوویەرێك ڕوویدا، کە جێگای سەرنج بوو. بە تەواوی بیرم نەماوە، وەلێ پێم وابێ لە حـوجرەی ژمـارە حەفـت یـان هەشـت بـوو، کاتێـك خـواردنم پێدەدان، گەنجێك گـوتی "کـاك ئیسـماعیل، لە ڕێگـای وێنەکـانی سـەر بەرگـی پەرتووکەکانـت دەتناسـمەوە". پاشـان خـۆی ناسـاند و گوتی "ناوم موستەفا تۆپاڵە". گەنجەکە بەردەوام بوو لە قسەکردن "کـاك جاهیـدی هـاوڕێی نـاوچەی ئیسـکیلیپ برادەری بـاوکمە". بە پێوە دەمەتەقێیەکی کورتمـان کـرد، بۆیە ئەو یەکـدی ناسـینە زۆر بەلامەوە سەرنج ڕاکێش بوو.

لەسـەر ئاسـنەکانی بەردەم حـوجرەکەی مسـتەفا تۆپـاڵ، چاویلکەیەك هەبوو، منیش هەڵمگرت و لەچاوم کرد و سەیرێکی دەوروبەری خۆم کـرد، عەجیـب هەمـوو شـتێك ڕوونتـر و جوانتر دەبینـدرا! هەمـوو شـتێك ڕوونـاکتر بـوو! تا ئەوێ دەمێ بەرچاڤکم بەکارنەهێنـابوو، ئیـدی بیـرم لەوەکـردەوە، لەمەودوا پێویسـتە چـاویلکەیەك لەچـاو بـکەم. بـۆیە لەوێ ڕۆژێ بەدواوە، هەوڵـی دروسـتکردنی دانەیەك دا و سـاڵی ١٩٨٥ لە بەنـدیخانەی عەنتـاب، بە فەرمی دەستم بە لەچاوکردنی چاویلکە کرد.

ئەو ڕۆژانەی شۆڕش بەردەوام بوو، لە هەمو لایەکەوە دەنگی گۆرانییەکانی ئیبراهیچ تاتلیسێس دەهاتە بەر گوێ. بەڵام دەنگێکی بەرز، نزم نا. بۆیە دڵتەنگی و خەمباری باڵی بەسەر هەموو هەڤالانی قاوشەکە کێشابوو. چونکە ئەوە بەو مانایە دەهات، کە گرتوویەکی تازە هاتووەتە زیندان و بەر لەوەی بیهێننە لای ئێمە، ئەشکەنجەی دەدەن. بەڕێوەبەرایەتی زیندان سترانەکانی ئیبراهیم تاتلیسێسیان بۆ نەهاتنە بەرگوێی هاوار و ناڵەی کەسی ئەشکەنجەدراو بەکار دەهێنا. بەو شێوەیە کارگێڕی بەندیخانەکە کەسی تازە هاتووی چاوترس دەکرد. بەڵام بەکارهێنانی گۆرانی هونەرمەندێك، بۆ شاردنەوەی کارێکی قێزەوەن و دڕندانە، بەدڵنیاییەوە شۆڵێکی زۆر نا مرۆڤانە و بێ ئەخلاقانە بوو.

***

لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٨٣، کارگێڕی زیندان، ئۆپەراسیۆنێکی توندوتیژیی و ئەشکەنجەی چڕی دژی حوجرەکان دەستپێکرد. ئامانجی ئۆپەراسیۆنەکەش، لە ماوەیەکی کن بۆ هەموو لایەك ئاشکرابوو. برادەران، یەك بە یەك لە حوجرەکان دەهێنندرانە دەرەوە و دەیانبردنە شوێنێکی تایبەت. لەوێ دەستەیێك لە پاسەوانەکان و هێزە تایبەتە سەربازیەکان لە ئامادەباشیدا بوون. لە دەستی هەر یەکێکیشیان زنجیر و بۆڕی و دار هەبوو. هەرکەسێك کە دەبردرا لایان، ئەوان بەوانەی لە دەستیان بوو، گیراوەکانیان مارکوژ دەکرد، پاشان بە شەق و بۆکس و پێلەقە، جلە تایبەتیەکانی تایبەت بە بەرگی یەك پۆشی زیندانیان لەبەر دەکردن. جا ئەوانەیان دەناردە قاوشێکی تایبەت و جیا.

هەمان ڕۆژ نۆرەی منیش هات، یەکێك لەو سەربازانەی لە هێزە تایبەتەکە بوو، بۆکسێکی زۆر توونـد و بەهێزی لە دەممدا، یەکێکی دیکەش، پێلەقەیەکی لێدام و گوتی "قەینا ئەوانی دیکە گەنجـن، ئەی بە تـۆ چـی؟ سـەر و بنـت بـکەی دە ساڵێکت لە تەمەن مـاوە، کەچـی لەگەڵ ئەو گەنجـانە خـۆت لەو ئیشـانە هەڵدەقورتێنی؟". ساڵێك دواتر، واتا لە ١٩٨٤، کاتێك گوازرایـنەوە بۆ بەندیخانەی عەنتاب، لەبەردەرگا، ئەوکاتەی مامەڵەی وەرگرتنیان بۆ دەکردین، سەرۆکی پاسەوانەکانی بەندیخانەکە هەمان شتی پێ گوتم.

ئەوێ ڕۆژێ، بە هێـزی تیـرۆری دەوڵەت، جلـی فەرمـی بەندیخانەیان لەبەر هەمووماں کرد. قاوشە تازەکەشم D9 بوو. لە قاوشـە تـازەکەدا، دوو شـوێنی لێبـوو بەسـەر دەرەوەیـدا دەڕوانـی. شـوێنەکەمان لە نهـۆمی دووەم بـوو. بـۆ چـوونە شـوێنی هەواگـۆڕکێش، بە پەیـژە دەهـاتینە خـوارەوە. وەك چـۆن خـواردنەگەکەش هەر لە کۆتـایی شـوێنی هەواگـۆڕکێیەکە بـوو. لە قاوشەکەی پێشوومان، چارپاکانمان دوو قات بوو، بەڵام لە شوێنە تازەکەمـان سـێ قـاتی. لەوێ نـزیکەی ٤٠ چارپـا هەبـوو. لەگەڵ ئەوەی شـوێنەکەش زۆر تەنـگەبەر بـوو. لەبەر سـێ قـاتی قەروێڵەکـانیش، ژوورەوە تاریـك ببـوو. بەڵام ئیـدی بە تێپەڕینـی کـات، لەگەڵ ئەوێـش ڕاهـاتین. جـا ئیحسـان کـاچبەڕووش هەر لەگەڵمان بوو.

ئیحسان کاچماز، کەسێکی قسەخۆش و بە بەزم و ڕەزم بوو. وەلێ سەرەڕای قاوشێکی تەسك، بەڵام هەموو شەوێك ئیحسان

کاچماز چالاکیەکی لە نێوان خۆمان ڕێکدەخست. جا شەوێك چیرۆك دەخوێندراوە و شەوێك مەتەڵۆك و شەوێك گۆرانی و ستران گوتن و، هەندێك شەویش ئاهەنگ و بەزم و ڕەزمی خۆش، لە کەش و بارێکی حەنەك ئامێز و پڕ گاڵتە و گەپ دەکرا. من لە قاتی سێیەمی قەروێڵەکەدا دەخەوتم. هەر لەوێش سەیری ئەو هەرا و هۆسەی بەزمی شەوانم دەکرد. وەلێ ئیحسان کاچماز داوای لە من دەکرد تا منیش بەشداری وازی و دەمەتەقێ و چالاکیەکان ببم. وەلێ ئەوانەی ڕاستەوخۆ بە من نەدەگوت و ئەوەی لە ڕێگای هەندێك لە برادەرانی قاوشەکەوە دەکرد. منیش بە شێوەیەکی ماقول، داوام لێدەکردن تا لەوبارەیەوە تخونی من نەکەون. ئەوانیش پێداگیریان لەسەر داواکەیان نەدەکرد و دەڕۆیشتن. ڕۆژێك دوای نانخواردنی شێوان، ئەو پاسەوانەی دەبوو لە چێشتخانەکەوە بمانباتەوە قاوشەکە، درەنگ کەوت، چەندی چاوەڕێمان کرد، پاسەوانەکە دەرگای نەدەکردەوە تا بمانباتە سەرەوە.

ئەو پاسەوانەی باسی دەکەم، خەڵکی ئەلازغی بوو، هەروەها یەکێك بوو لە ئەندامانی بگرە و بشکێنەی جەنابی بەڕێوەبەری بەندیخانە. جا کابرا کاتێك لە بەندیخانەیەکەوە دەگوازرایەوە یەکێکی دیکە، ئەو تیمەشی لەگەڵ خۆی دەبرد. پاسەوانەکە بەردەوام لەبەردەم قاوشی D٩ بوو. ئەو یەکێك لە کارەکانی ئەوەبوو، لەسەر فەرمانی کارگێڕی گرتووخانە، هەندێك نووچەی ناو ڕۆژنامە ڕۆژانەکان ببڕێت، پاشان بەسەر ئێمەدا بڵاوی بکاتەوە. وەکوو شوێنەکانی دیکەش، کاتێك ڕۆژنامەکان دەهاتنە قاوشەکەی ئێمە، سەرەتا دەگەیشتنە دەستی ئەو پاسەوانە، کاتێکیش

دەیانگوت ئەو ڕۆژنامانە بنێرە ژوورەوە، ئاوا وەڵامی دەدانەوە "بەر لە هەر شتێك دەبێ من وردبینیەك بۆ هەواڵەکان بکەم و پاشان پێتانی دەدەم". لە کاتێکدا کابرا خوێندەواریشی نەبوو.

بە هۆی درەنگ کەوتنمان، دەنگە دەنگێکی زۆر لە ناندینەکە دەهاتە بەرگوێ. ئیحسان کاچماز لەو سەروبەندە، دەستی بە دەهۆڵ کوتین کردبوو. جا بە کەلەپچە و ملاك و قاپوقاچاغەکەش تەق و هۆڕێکی نابووەوە، ئەوسەری دیار نەبێ. داوای لە برادەرانیش دەکرد، تا بێنە ناوەڕاست و دەست بە شایی و گۆڤەند بکەن. لەگەڵ تێپەڕینی هەر خولەکێك و دەرنگتر کەوتنی پاسەوانەکە، بەزم ورەزم زێدەتر دەبوو و دەنگەکە بەرزتر دەبۆوە.

هاوڕێیان قۆڵیان خستە ناو قۆڵی هەڤدوو و بە قەرەپەستانێ، هەوڵیان دەدا بە پێی ئاوازی تەق و هۆڕ و دەهۆڵ کوتینەکە، هەڵپەڕن. هەمدیسان کاك ئیحسان لە ڕێگای چەند برادەرێکەوە داوای لە من کردبو تا منیش بەشداری هەڵپە و داپەکەیان بکەم. وەلێ قبووڵم نەکرد و داواشم لە برادەران کرد تا لەسەر ئەو پرسە پێداگیری نەکەن. بەڵام کاك ئیحسان وازی نەدەهێنا و بە هێمای چاو و برۆ داوای لە برادەران دەکرد تا دەستبەرداری من نەبن و بەشداری خۆشییەکەیان بکەم. بۆیە هەڤالان ئەوجارە لەسەر ئەو پرسە پێداگیریان کرد، بۆیە منیش زۆر تووڕە بووم و بە دەنگێکی بەرز گوتم "ئەو دەنگە دەنگەی دروستتان کردییە بەس نییە، ئێستا هاتوون دەتانەوێ ئیلا منیش بەشداری بکەم".

دوای ئەو قسە، لە پڕ بەزم و ڕەزمەکە نەما، بێدەنگییەك باڵی بەسەر شوێنەکە کێشا. لەو سەروبەندە، پاسەوانەکەش دەرگای چێشتخانەکەی کردەوە و گوتی "یەڵا بۆ قاوشەکانتان". جا

کەبەسەر دەکەوتین، وەك ئەوەی لە تازییەیەك بین، هەموو لایەك بە بێ دەنگی پێنگاڤی دەهاوێشت، تا گەیشتینەوە قاوشەکەمان. لە کاتێکدا منیش بەو دۆخەوە دەڵتەنگ بووم، وەلێ لەو ژاوەژاوەی هەبوو، لەوەی گوتم شتێکی دیکە نەدەکرا.

***

میوانێکی زۆر دەهاتنە لای کاك ئیحسان، بە تایبەتی خێزان و منداڵەکانی زوو زوو و بێ پسانەوە سەریان لێدەدا. جا کە لە هەواگۆڕکێ بەدەم قسەوە هاموشۆمان دەکرد، باسی ناوەڕۆکی دیدارەکانی خۆی بۆ دەکردم. لەبەر ئەوەی لەوێ زوو زوو بەیەکەوە پیاسەمان دەکرد.

بە بیرمە ڕۆژێك لەو ڕۆژانەی پیاسەمان دەکرد پێی گوتم "دوێنێ ماڵ و منداڵەکانم هاتبوون. پێیان گوتم کچەکەت داخوازی هاتووە، چەند جارێکیشە چەند ماڵباتێك دێنە داوای. بۆیە پرسیاریان لێکردم بیدەینە کامەیان، منیش پێم گوتن بیدەنە ماقولترینیان. جا کاك ئیسماعیل ئایا شتێکی باشم وەڵام داینەوە؟". لە وەڵامدا گوتم "بە دڵنیاییەوە شتێکی باشت گوتووە، بۆیە با بیدەنە ماقولترینیان".

یەکێك لە دیدارەکانی دیکەی ئاوا بۆ گێڕامەوە "کوڕە بچووکەکەم، قۆناغی سەرەتایی تەواو کردووە، بۆیە دێن و دەڵێن بۆ قۆناغی ناوەندی ناوی لە چ قوتابخانەیەك تۆمار بکەین؟ منیش پێم گوتوون لە قوتابخانەیەکی ماقولی دانێن. کاك ئیسماعیل ئایا وەڵامێکی باشم داونەتەوە؟". منیش لە وەڵامدا "بەڵێ بەرسڤێکی گونجاوت داونەتەوە، تا لە قوتابخانەیەکی ماقولی تۆمار بکەن".

## بەسەرهاتی نووسین و خوێندنەوەی ئیحسان

یەکێك لەو ڕۆژانەی لە هەواگۆڕکێ هاموشۆمان دەکرد، کاك ئیحسان شتێکی زۆر سەرسوڕهێنەری پێ گوتم "کاك ئیسماعیل، من نووسین و خوێندنەوە نازانم، بۆیە خوازیارم فێرم بکەی؛ وەلێ با ئەو شتە بە نهێنی لە نێوانمان بمێنێتەوە و کەسی دیکە پێی نەزانێ". منیش واقم لە قسەکە وڕما. لە کاتێکدا لە دەمێکی کنی بەر لەو داخوازییە، لەگەڵ کاربەدەستانی بەندیخانە زۆر بە جوان و ڕێکی دەدوا. هەتا، باسی یاساکانی ناو دەستوور و ماددەکانی جێبەجێکردنی سزای لە سێدارەدان و دەستگیرکردن و بابەتەکانی پەیوەست بە یاسای سزادانی لەگەڵیان نیقاش دەکرد. بۆیە وامزانی گاڵتە و گەپم لەگەڵ دەکات. وەلێ لەکاتی درێژەدان بە دەمەتەقێکەمان، دەرکەوت ئەو ڕاست دەکات. بۆیە ئاوام وەڵامی داخوازیەکەیم دایەوە "هاوڕێیانیش لەو بارەوە ئاریکاریت دەکەن. لێ ناکرێ بە دزی و فزی کارەکە بکەین، بەڵکوو پێویستە بە ئاشکرا بێ، چونکە ئەگەر وابێ باشترە...".

چەند ڕۆژێك دواتر لە قاوشەکەمان، بینیم پەرتووکی (ڕۆبینسۆن کروس) ئەو دەست و ئەم دەست دەکا. کتێبەکە هی نووسەر (دانیال دەفۆ - ١٦٦٠-١٧٣١)یە، لە چوارچێوەی پەرتووکێکی ٧٠٠ لاپەڕەیدا نووسیویەتی. ئەوەی من بینیم پەرتووکێکی شێست حەفتا لاپەڕەیی بوو بە وێنەی منداڵان . چوار پێنج لاپەڕەی سەرەتای دڕابوو، ئەوانی دیکەش هەمووی خێچ و

خوار و قەپ و قۆپ ببوون. جا هەندێك جار، پەرتووکەکەم لەسەر مێزی نان خواردن، یان لەسەر تەلەفزیۆن، هەندێکجاریش لە دەلاقەی ئەدەبخانەکەدا دەبینی. بۆیە مەراقی ئەوەم لا دروست بوو، ئاخۆ ئەو پەرتووکە بۆ وا لە قاوشەکەمان دێت و دەچێ؟ ئاخۆ هیچ برادەرێك دەیخوێنێتەوە یان نا؟

ڕۆژێك پەرتووکەکەم لە دەستی کاك ئیحسان بینی، بۆیە هەر کە منی بینی "ڕێك سێزدە لاپەڕم لێ خوێندۆتەوە" ئەو بە پەلە ئاوای پێ گوتم. جا قسەکەی وا کرد، وەك ئەوەی خوێنەرێك لەشەوێکدا پەرتووکێکی شەشسەت لاپەڕەیی خوێندبێتەوە، ئەویش بەو لە خۆبایی بوونەوە گوتی ١٣ لاپەڕەم خوێندۆتەوە. وەلێ کاتێك دەستی بە باسکردنی کتێبەکە کرد، دیار بوو گێڕانەوەکانی زۆر درێژتر بوون لەوانەی خوێندوویەتیەوە، جا بەردەوام بوو لەسەر باسکردنی ڕۆبنسۆن کروس... یانی گێڕانەوەکانی زیاتر ئەو شتانە بوو کە گوێبیستی ببوو لەسەر ڕۆمانەکە، نەك ئەوەی خوێندبوویەوە. بۆیە منیش وێنەیەکی ناو پەرتووکەکەم پیشان دا و گوتم "کاك ئیحسان ئەو دێڕانەی ژێر وێنەکەم بۆ بخوێنەوە...". جا کە دەستی پێ کرد، هەستمکرد ناتوانێ بە جوانی بیخوێنێتەوە. نەیدەتوانی پیتەکان بەیەکەوە بلکێنێ و بە ڕەوانی وشەکان بە دوای یەکدیدا بڵێ. ئەو دۆخەی منییشی سەرسام کرد، هەر ئەوەبوو.

## "بێشکچی زۆر پارێزگارە، دەڵێ یاشار کەمالی بخوێنەوە"

لەو گفتوگۆیانەی دەمانکرد، ڕۆژێک ئیحسان گوتی " کاک ئیسماعیل لە خوێندنەوەدا زۆر چوومەتە پێش، بۆیە پێشنیاز دەکەی کتێبی کێ بخوێنمەوە؟". منیش وەڵامم داوە "پەرتووکی (چوکورئۆڤا)ی یاشار کەمال بخوێنەوە، زۆر بە جوانی باسی ناوچەکەی ئێوە دەکات..." کاک ئیحسان کە گوێبیستی وەڵامەکەم بوو، تۆزێک تورە بوو، پاشان ئاوا دوا "یاشار کەمال کێییە تا من بیخوێنمەوە؟ دەست لە باخەڵم بنێم دە دانە یاشار کەمال دەردەهێنم. جا من سەت قاتی یاشار کەمال شارەزاییم لە ناوچەکەی خۆمان هەیە". منیش ئاوا وەڵامم داوە "مادەم وایە، ئیدی پێت ناڵێم چی بخوێنییەوە و چی نەخوێنیتەوە".

چەند ڕۆژێک دواتر دیسان هەمان بەزم و ڕەزم و وەڵام و پرسیار لە نێوانمان دروست بۆوە.

چەند ڕۆژێک پاشتر دیسان کاک ئیحسان هاتەوە و بۆ جاری سێیەم گوتی " کاک ئیسماعیل لە خوێندنەوە زۆر چوومەتە پێش، بە بۆچوونی تۆ چ نووسەرێک بخوێنمەوە؟" منیش لە وەڵامدا هەمدیسان گوتم یاشار کەمالی بخوێنەوە. دیسان هەڵچووەوە و قسەکانی چەند ڕۆژ پێشتری سێبارە کردەوە. منیش ئەوجارە وەها بەرسڤم داوە "مادەم وایە، پێویست ناکات هیچ شتێک بخوێنیتەوە، بۆیە یەکێک لەو یاشار کەمالانەی ناو باخەڵت دەربهێنە و دەبیتە

کەسـێك کە شـارەزای هەمـوو شـتێك هەیە و پێویسـتت بە خوێندنەوەش نابێ...".

دوای ئەو وەڵامەم، کـاك ئیحسـان لای تـاقمی شۆڕشـگێڕانی قاوشـەکەمان، سـکاڵای لێکردبـووم و گوتبـووی "بێشـکچی زۆر کەسێکی پارێزگارە. من هەر لێی دەپرسم پەرتووکی چ نووسەرێك بخوێنمەوە، ئەویش دەڵێ یاشار کەمال. لێ هیچ ناڵێت مارکس و ئەنگلس و لینین و ستالین بخوێنەوە. چونکە دەبێ ئیلا یاشار کەمالی بخوێنمەوە. جا پێشم گوتووە: یاشار کەمال کێیە؟ دەستم لە باخەڵم بنێم دە دانەی وەك ئەو دەردەهێنم. ئاخۆ باشم وەڵام داوەتەوە؟ چونکە ئەو بێشکچییە زۆر کابرایەکی کۆنەپەرستە".

"جەنابی دادوەر، ئاخۆ رێکارەکانی بوون بە کریستیان چییە؟ چونکە تەمەنم بووە ٤٠ ساڵ و هیچ خێرێکم لە ئیسلام نەبینی!"

لە بەشـەکانی پێشـووتر باسـی ئەوەم کـرد، لە سـەروبەندی شۆڕشی دژە یەکپۆشی و مانگرتن لە خواردن، هێزە تایبەتەکان لە رێگای کونکردنی دیوارەوە، هەوڵی هاتنە ژوورەوەیان دا، چونکە کیلـۆنی دەرگاکەیـان شـکاندبوو، تـا بتـوانن بێـنە ژوورەوە، لـێ سەرکەوتوو نەبـوون. بـۆیە لە کۆتاییەکـانی سـاڵی ١٩٨٣ لەبەر ئەو بەرهەڵستکارییەمان، لەلایەن داواکـاری گشـتییەوە، دۆسـیە لەسـەر ٨١ کەسـمان کرابـۆوە. هۆکـاری کـردنەوەی داواکەش لەسـەر ئەوەبـووە، کە ئەو کەسـانە، زیانیـان بە مـاڵ و مـوڵکی میـری و

دەوڵەت گەیاندووە. جا لە دۆسیەکەدا باس لەوە دەکرا، هەموو ئەو تۆمەتانە بە بابەتی پاڵنەری سیاسییەوە گرێدراون.

ئەوکات قاوشەکەمان گۆڕابوو و لە قاوشێکی ١٢٠ کەسی دەماینەوە. بەشێکی زۆری ئەو برادەرانەی بە هۆکاری سیاسی تاوانبارکرابوون، هەر لەوێ دەمانەوە. لەوێش بۆ چوونە هەواگۆڕکێ، دەبوو بە پەیژەکان بێینە خوارەوە. چێشتخانەکەش لە تەك ناوچەی هەواگۆڕکێیەکە بوو. لەوێش بە نۆبەت دەچووینە هەواگۆڕکێ، بە پێی دەم و کاتی دیاری کراو.

وەك لەسەرەوە باسم کرد، بە هۆی ئەو چالاکییانەی لەسەرەوە گێڕامەوە، دۆسییە لەسەر ٨١ کەسی زینندانیکراوی بەندیخانەی تاوانە گرانەکانی چەنەقەلە کرایەوە. بەیانییەکی زوو ئێمەیان بردە دادگا. هۆڵی دادگای سزا گرانەکان، گەورە و فراوان بوو. لە دواوەی هۆڵەکەش، خزم و کەس و کاری ئەو ژمارەیەی باسم کرد، لەوێ ئامادە بوون.

سەرەتا دووپاتی ناسنامەکانیان کردینەوە، لەوێ نۆبەتی ئیحسان کاچماز هات، قازی لەسەر ئەو دۆسیەیەی لەبەر دەستی بوو، دوای ئەوەی گوتی "لە فلانە کەسی و کوڕی فلانە کەسی". گوتی ئیحسان کاچماز لە دایك بووی ١٩٤٥. من کە گوێبیست بووم، زۆر سەیرم پێهات. لە کاتێکدا پێم وابوو، ئەو زۆر لە من گەورەترە. وەلێ لە دڵی خۆمدا گوتم، ئاخۆ لە بڕی ١٩٣٥ نەیانگوتبێ ١٩٤٥؟ ئیدی دادوەر زانیارییەکانی دەخوێندەوە، ئەو کەسەی زانیارییەکانیشی دەخوێندرایەوە، دەیگوت بەڵێ ڕاستە.

دوای ئەوانە، پاشان دادوەر گوتی ئاینت ئیسلامە. لە ڕاستیدا

ئەوە لە دۆسیەکەدا نەنووسرابوو. بەڵام دادوەر ویستی لێی زیاد بکات، بەڵام ئیحسان کاچماز دەستی ڕاکرد و گوتی "من تەمەنم چل ساڵانە و هیچ سوودێکم لە ئیسلام نەبینیووە. بۆیە دەمەوێ ببمە کریستیان. جا ڕێکارەکانی بوون بە ئیسلام چییە جەنابی دادوەر؟". جا وەهای نەگوت، وەك ئەوەی مەیدانخوازی تورکایەتی و دادگا و دادوەر بکات. بەڵکوو وەکوو کەسێکی ناو کۆڵانان ئەو قسەیەی کرد. بۆیە دوای تەواو بوونی وتەکانی دەنگی قاقا لەناو هۆڵەکە بەرز بۆوە، تا دەستەی دادوەرانیش خەنینەوە.

دوای ئەو ئاخافتنەی ئیحسان، دادوەری دۆسیەکە، هەمدیسان زانیارییەکانی ئیحسان کاچبەڕوو دووبارە کردەوە، دیسان گوتی لە دایك بووی ساڵی ١٩٤٥.

دوای دانیشتنەکەی دادگا بیرم لەوە کردەوە، لە ڕێگای گەڕانەوەی بەندیخانە لە ئیحسان بپرسم ئاخۆ لە دایك بووی ١٩٤٥ ی؟ بۆیە کاتێك سواری هەمان ترومبێل کراینەوە و دەستی من و ئەویان بە کەلەپچەیەك بەستیەوە، پرسیارەکەم لێکرد.

لە ڕێگا وەڵامی پرسیارەکەی ئاوا دامەوە "هەندی نێرەکەرێکیت، تۆ برا گەورەی نەك من، چونکە شەش ساڵ لە من مەزنتری". وەلێ شێوە و جۆری ئاخافتن و وەڵامەکەی و ئەو جوڵانەی کردی لە کاتی وەڵامدانەوەکە، لەگەڵ ئەوەی وشە و شتی نەشیاوی تێدابوو، بەڵام بە هەموو ڕوویەکیەوە دیار بوو کە مەبەستی بێڕێزی کردن نەبووە، بەڵکوو هەر خۆی شێوازی قسەکردن و ئاخافتنی وەهابوو، بۆیە پێم وایە لەوبارەیەوە جۆری تەعبیرکردنی وەك مووسا عەنتەر بوو. چونکە کاك مووساش

هەنـدێکجار زۆر جنێـوی لەنـاو قسـەکانی بەکـار دەهێنـا، بەڵام ناوەڕۆکەکەی بۆ بەکەم زانینی و سووك کردن و بێقیمەت کردنی کەسی بەرامبەری نەبوو.

دوای ئەو قسەیەی ئیحسان کاچماز گوتم "بەڵام من هەر پێت دەڵێم کاك ئیحسان، چونکە تۆ منداڵت هەیە و خاوەن و بووك و زاوایت، جا لەسەرووی هەمووشەوە، باپیرەیت...

***

سـاڵی ۲۰۱۷، لە پێشـانگای پەرتـووکی ئەدەنە، یوسـف ئەنـوەر سەردانی کردم. کاتی خۆی لەگەڵ کاك یوسف، لە بەندیخانەی چەنەقەلە، بەیەکەوە بـووین؛ ئەو لە نـزیکەوە ئیحسـان کـاچبەڕوو دەناسی. ئەوسا، کاك یوسف جێگری سەرۆکی شارەوانی ناوچەی یومورتەلیـك بـوو. ئێمەش دوای پێشـانگاکە چووینە یومورتەلیـك سەردانمان کردەوە. لەکاتی گفتوگۆکردندا، ئاماژەی بەوەدا ئیحسان کاچمـاز کـۆچی دوایـی کـردووە و باسـی لەوەش کـرد، دوای دەرچوونی لە زیندان، لێرە دووکانێکی خواردنی کردبۆوە تا ئەو ساتەی کۆچی دوایی کرد.

بەداخەوە هیچ وێنەیەکمان بەیەکەوە نییە، چونکە لەوێ دەمێدا، هاتنە ژوورەوەی کامێرا بۆ زیندان، قەدەغە بوو...

ئەوە لە دۆسیەکەدا نەنووسرابوو. بەڵام دادوەر ویستی لێی زیاد بکات، بەڵام ئیحسان کاچماز دەستی ڕاکرد و گوتی "من تەمەنم چل ساڵانە و هیچ سوودێکم لە ئیسلام نەبینیووە. بۆیە دەمەوێ ببمە کریستیان. جا ڕێکارەکانی بوون بە ئیسلام چییە جەنابی دادوەر؟". جا وەهای نەگوت، وەك ئەوەی مەیدانخوازی تورکایەتی و دادگا و دادوەر بکات. بەڵکوو وەکوو کەسێکی ناو کۆڵانان ئەو قسەیەی کرد. بۆیە دوای تەواو بوونی وتەکانی دەنگی قاقا لەناو هۆڵەکە بەرز بۆوە، تا دەستەی دادوەرانیش خەنینەوە.

دوای ئەو ئاخافتنەی ئیحسان، دادوەری دۆسیەکە، هەمدیسان زانیارییەکانی ئیحسان کاچبەڕوو دووبارە کردەوە، دیسان گوتی لە دایك بووی ساڵی ١٩٤٥.

دوای دانیشتنەکەی دادگا بیرم لەوە کردەوە، لە ڕێگای گەڕانەوەی بەندیخانە لە ئیحسان بپرسم ئاخۆ لە دایك بووی ١٩٤٥ ی؟ بۆیە کاتێك سواری هەمان ترومبێل کراینەوە و دەستی من و ئەویان بە کەلەپچەیەك بەستیەوە، پرسیارەکەم لێکرد.

لە ڕێگا وەڵامی پرسیارەکەی ئاوا دامەوە "هەندی نێرەکەرێکیت، تۆ برا گەورەی نەك من، چونکە شەش ساڵ لە من مەزنتری". وەلێ شێوە و جۆری ئاخافتن و وەڵامەکەی و ئەو جوڵانەی کردی لە کاتی وەڵامدانەوەکە، لەگەڵ ئەوەی وشە و شتی نەشیاوی تێدابوو، بەڵام بە هەموو ڕوویەکیەوە دیار بوو کە مەبەستی بێڕێزی کردن نەبووە، بەڵکوو هەر خۆی شێوازی قسەکردن و ئاخافتنی وەهابوو، بۆیە پێم وایە لەوبارەیەوە جۆری تەعبیرکردنی وەك مووسا عەنتەر بوو. چونکە کاك مووساش

هەنـدێکجار زۆر جنێـوی لەنـاو قسـەکانی بەکـار دەهێنـا، بەڵام ناوەڕۆکەکەی بۆ بەکەم زانینی و سووك کردن و بێقیمەت کردنی کەسی بەرامبەری نەبوو.

دوای ئەو قسەیەی ئیحسان کاچماز گوتم "بەڵام من هەر پێت دەڵێم کاك ئیحسان، چونکە تۆ منداڵت هەیە و خاوەن و بووك و زاوایت، جا لەسەرووی هەمووشەوە، باپیرەیت...

***

سـاڵی ٢٠١٧، لە پێشـانگای پەرتـووکی ئەدەنە، یوسـف ئەنـوەر سەردانی کردم. کاتی خۆی لەگەڵ کاك یوسف، لە بەندیخانەی چەنەقەلە، بەیەکەوە بـووین؛ ئەو لە نـزیکەوە ئیحسـان کـاچبەڕوو دەناسی. ئەوسا، کاك یوسف جێگری سەرۆکی شارەوانی ناوچەی یومورتەلیك بـوو. ئـێمەش دوای پێشـانگاکە چووینە یومورتەلیـك سەردانمان کردەوە. لەکاتی گفتوگۆکردندا، ئاماژەی بەوەدا ئیحسان کاچمـاز کـۆچی دوایـی کـردووە و باسـی لەوەش کـرد، دوای دەرچوونی لە زیندان، لێرە دووکانێکی خواردنی کردبۆوە تا ئەو ساتەی کۆچی دوایی کرد.

بەداخەوە هیچ وێنەیەکمان بەیەکەوە نییە، چونکە لەوێ دەمێدا، هاتنە ژوورەوەی کامێرا بۆ زیندان، قەدەغە بوو...

## بەندیخانەی کاینارجە

دوای بەرواری ١٢ی ئەیلـــوول، لە بەنـــدیخانەی ســـاکاریا، ئێمەیـان بـردە بەشێکی تـایبەت و هەمـوو ڕۆژێ، سـەرژمێرییەکی تونـد و وردیـان دەکـردین. لەوێ نەمانـدەتوانی بچیـنە شـوێنی هەواگۆڕکێ، بەڵام شوێنێك هەبوو بەناوی (ژووری جل شۆرین) ئەوێ لەبەر ئەوەی گەورە بوو و ئاسایش بوو چەند لێی بمێنینەوە، بۆیە ئەوێمان لە بڕی هەواگۆڕکێ بەکاردەهێنا و هەڤدوومان لێ دەبینی. لەوێ حەفت هەشت کرێکاری دیکەش دەیانتوانی بێنە شوێنەکە، کە لە چۆرممەوە هێنابوونیـانە بەنـدیخانەکە. لە ڕێگـای پەنجەرەی ژووری جل شۆرینەکە دەمانتوانی باخچەی سـەوزە و میوەی ماڵەکانی دەوروبەری زیندانەکە ببینین.

لە ژوورەکە بەرۆشێکی گەورەی ئامێری جل شوشتنی لێبوو. جا پەردە و چەرچەفی سەر یاتاغەکانیش هەر لەوێ دەشووردرا. بەڵام ئامێری جل شوشتنەکە تێکچووبوو. خۆش ئەوەبوو یەکێك لە بـرادەران، دەچـووە نـاو ئەو قـازانە گەورەی ئەوێ و کـاتێکی زۆری لـــێ بەســـەر دەبـــرد. هەنـــدێك دەم ســـەری مەنـــجەڵە گەورەکەشـی بەسـەر خۆیـدا دادەخسـت. بەڵام هەر کاتێـك ئەو چووبـا نـاوی، مـن تووشـی ئەندێشـەیەکی زۆر دەبـووم، چـونکە لەگەڵ ئەوەی ئامێری جل شۆرینەکە کاری نەدەکرد، بەڵام ئەگەر بەهەڵە دەســتیان بە دوگــمەیەکەوە نابـا و کــاری کردبــا، کەس نەیـدەزانی چـی دەبـوو؟ هەرچەنـدی ئاوامـان پێدەگوت، بەڵام ئەو گوێی پێ نەدەداین و لەوێ دەرنەدەچوو.

لە مانگی نۆی ساڵی ١٩٨٠ ئێمەیان لە قاوشێکی ئاسایی دانا، کە نزیکەی سی کەس دەبووین. بەڵام لە ١٢ ئەیلوول، ئۆپەراسیۆنێکی لەناکاو و تایبەتیان بۆسەر ئێمە ئەنجامدا، چونکە لە ڕۆژانی پێشتر، لە دیداری پارێزەرەکانماندا، هەستمان بە جێبەجێکردنی ڕێکارەکانی ئۆپەراسیۆنەکە کرد.

لە قاوشەکە برادەرێکی سەر بە ڕێکخراوی (دەڤ یۆڵ)مان لابوو؛ ئەو خەڵکی مەلادی بوو. بەیەکەوە ئێمەیان بردبووە زیندانی تۆپتاشی. ئەو لەگەڵ کاك تەسلیم تۆرە خەڵکی هەمان لادێ بوون. ئەوان بە هۆی دراوسێیەتییەوە بەزم و بەسەرهاتی خۆشیان هەبوو.

مستەفا سەرچە، برایەکی زۆر فیداکار و بە وەفای هەبوو و زوو زوو دەهاتە سەردانی؛ لەگەڵ خۆی هیچ کێماسییەکی لە هێنانی خواردن و خواردنەوە و جل و بەرگ نەدەکرد. لەبەر ئەوەی دوای بەرواری دوازدەی ئەیلوول زۆر ڕێگرییان لەسەر چۆنیەتی ژیانی ناو زیندانمان کرد، بۆیە دەبوو پاشگری ناوی میوان و کەسی بەندکراو یەکانگیر بێت، پاشان دەیانتوانی هەڤدوو ببینن. ئەمە هۆکاری ئەوەبوو کە نەتوانم لەگەڵ ئەو برایەی یەکدی بناسین. لێ کاك مستەفا ئاخافتنی دیدارەکانی خۆی بەردەوام بە وردیی بۆ دەگێڕامەوە.

تاوەکوو مانگی دووی ساڵی ١٩٨١ لە گرتووخانەی ساکاریا مامەوە. لەسەرەتای ڕۆژەکانی مانگی دوو، ئێوارەیەکی دەمەو زەردەپەڕ، لیستێکی دووروودرێژی ئەو ناوانە خوێندرایەوە، کە فەرمانی گواستنەوەیان بۆ دەرچووبوو. جا ناوەکانیش بەسەر

چەندان بەندیخانە دابەش کرابوو. منیش یەکێك بووم لەوانەی کە بۆ بەندیخانەی کاینارجە دەگوازرامەوە.

ڕۆژی دواتر، لەبەردەم دەرگای چوونە دەرەوە، قەرەباڵغیەکی عەجێب دروست ببوو، چونکە هەموومانیان دەخستە ناو یەك زیلی سەربازی داخراو، جا کەلوپەلەکانیشمان لەگەڵ خۆمان هەر بەو ترومبێلە دەبرد.

ئەو زیندانەی بۆی دەچووم، شوێنێکی بچووك بوو، لەناویدا تەنیا چوار قاوش هەبوو. لە قاوشە بچووکەکان چوار کەس و لە گەورەکانیش دە کەسێکی لێ داندران. وەلێ ژمارەیەکی ئێجگار زۆر مانەوە، چونکە ژمارەی هاتوان زۆر لەوە زیاتر بوو کە لەوێ شوێنیان ببێتەوە.

پاسەوانەکانی ئەوێ ماوە ماوە، گیراوەکانیان دەبردە دەرەوە، ئەوانیش لە دەرەوە هاوکاری هەندێك کاری حکومی ناوچەکەیان دەکرد. بە تایبەتیش ئەو کارانەی کە هێشتا بۆ زیندان دەکرا، چونکە شوێنەکە تازە دروست کرابوو.

ڕۆژێك، یەکێك لە دەرگەوانەکان، بە هێما کردن بۆ ئەو ئاڵا دڕاوە کۆنەی، بەسەر ستونی زیندانەکە لەگەڵ با دەشەکاوە گوتی "ئەگەر ئەو ئاڵایە تازە بکەیەوە کارێکی باش دەبێ، جا ئەگەر ئەو کارە بکەی، ڕەنگە بەڕێوەبەرایەتی زیندان بە شێوەیەکی ئەرێنی لێت بڕوانن...". منیش لە وەڵامدا "ئەوە ڕاست نییە کە دەتەوێ ئەو کارە بە کەسێکی زیندانی کراوی وەك من بکەی، چونکە لە زیندان و بەشی ژمێریاری، بودجەی پێویست هەیە بۆ جێبەجێکردنی وەها کارێك". کەچی دوای ئەو بەرسڤەم،

دەرگەوانەکە ڕووی خۆی موڕ و مۆچ کرد و هەڵسوکەوتی لەگەڵ گۆڕیم. بۆ نموونە هەر کاتێك لە قاوشەکەی ئێمە گەڕان و پشکنین هەبوایە، ئەو خۆی دەهات و هەموو کەلوپەلەکانی منی سەروبن دەکرد و هەر بە ئەنقەسد، بەوێیدا پەرش و بڵاوی دەکردنەوە.

لە زیندانەکە دەرگەوانێکی زۆر مەعقولیشی لێبوو، بەردەوامیش بە چاکەوە لێم نزیك دەبۆوە. چونکە دەیزانی من چەندان پەرتووکم نووسیووە و لە نزیکەوە مژوولی لێکۆڵینەوەم لەسەر پرسی کورد.

یەکێك لە ڕۆژەکانی پشکنین، داواکارێکی گشتیش بەشداری گەڕانەکەی کرد. دەستی دابووە پەرتووك و نووسراوەکانم و بە وردی دەیپشکنی و لێی ورد دەبۆوە. کاتێك ئەو سەرقاڵی ئەو کارەبوو، وێنەیەکی لەناو پەرتووکەکان بینی و بووە هۆی سەرنج ڕاکێشانی. لە وێنەکەدا چەند منداڵێك دەبیندران لە گوندێکی کوردی ناوچە کوردییەکانی تورکیا. پێم وابێ وێنەکەم بە دیاری سەری ساڵ، یان یەکێك لە بۆنە ئاینیەکان بۆ هاتبوو. وێنەکە دەرخەری نەبوونی و ژیانی نەهامەتی منداڵ و گوندییەکانی دەردەخست. داواکارە گشتیەکە، دوای ئەوەی یەك دوو خولەك لە وێنەکە ڕاما، ڕووی لە من کرد و گوتی "بۆچی ئەو وێنانە هەڵدەگرن؟ لە بری ئەوەی وێنەی جوان و دڵخۆشکەر لای خۆتان بهێڵنەوە؟" جا ئەوکاتەی لە زیندانی کاینارجە دەرچووم، دوای ئەوەی داواکاری گشتی زیندانەکە کاغەزی دەرچوونەکەی واژوو کردم، ئەو ڕستەیەی پێ گوتم "خۆت بەو کارانەوە مژوول مەکە و خۆت تووشی بەڵایەك مەکە...".

لە کـاتی دەرچـوونم لەبەر دەرگـا، هەردوو دۆسـتم، یڵمـاز ئۆزتورك و ئەرگون تاندەر چاوەڕوانی منیان دەکرد. لە پاڵ ئەوان چەنـد دۆسـتێکی دیـکەش هەبـوون. بیـرمە هەمـان ڕۆژ، ڕەجەب مارشاڵی و قادر بۆزتیموری سەرۆکی (پۆل دێر) یش لەوێ بوون.

ئەو ڕۆژە برادەران زۆر هەوڵی ئەوەیان دا تا من ڕازی بکەن و بمنێـرنە ئەوروپـا، لـێ قبـووڵم نەکـرد. ئەوانـیش جەختیـان لەوە دەکـردەوە کە نـاتوانین لێـرە پارێزگاریـت لێـبکەین، منـیش بەوە وەڵامم دانەوە، کە پێویست بە پاراستن و پاسەوان ناکا و ژیانم بە ئاراستەی خۆی بەردەوام دەبێ.

لەهەمـان سـەردەم، تاجیسـەر بەلـگە و مـوراد بەلـگە و عـومەر لاچیـنەر و ئومێـد کڤانچیشـم بینـی. کـاك مـوراد پەرتـووکێکی مـاڵەکەی خـۆ پیشـان دام، کە لە بورهـان بەلـگەی بـاوکییەوە بـۆی جێمابوو بە ناوی (هێلە سەرەکیەکانی مێژووی تورك). پەرتووکەکە سـاڵی ١٩٣٠ تەنیـا ١٠٠ دانەی لـێ چـاپ کرابـوو. بـۆیە کەوتبـووە دەسـتی چەنـد کەسـێکی زۆر دیـاری کـراو. پەرتـووکەکە لەنـاو بەرگێکـی ڕەشـی ڕەقدا نزیکەی ٤٠٠ لاپەڕە دەبوو. من نـاوەڕۆکی پەرتووکەکەم دەزانـی، لـێ بینینـی پەرتووکێـك کە تەنیـا ١٠٠ دانەی لێ چاپ کرابێ، مرۆڤی تووشی کەلەجانێکی تایبەت دەکرد.

## لە پۆلیسی ئەنقەرەوە بۆ قەرەقۆلی ساکاریا

دوای ئەوەی لە دوازدەمین ڕۆژی مانگی چواری ساڵی ١٩٨١ لە زیندان دەرچووم؛ لە نۆزدەمین ڕۆژی مانگی شەشی هەمان ساڵ، هێزێکی ئاسایش، هەڵیانکوتایە سەر ماڵەکەم. هەمان ڕۆژ دەستیان بەسەر چەندان پەرتووك و گۆڤار و نووسراوی نێو خانوچکەکەمدا گرت و منیشیان دەستگیرکرد و بردمیانە بنکەی پۆلیس. ئەوان منیان بردە نهۆمی حەفتەمی بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسی ئەنقەرە...

بە دڵنیـــایەوە مەراقـــی ئەوەم دەکـــرد، ئـــاخۆ لەســـەر چـــی دەستگیرکراوم؟ بەڵام بە پێویستم نەزانی ئەوە لە پۆلیسەکانی ئەوێ بپرسم.

نۆزدەمین ڕۆژی مانگی شەش، بۆ من بەروارێکی گرنگە، چـــونکە ڕێـــك لەو ڕێکـــکەوتەدا و ١٠ ســـاڵ بەر لە ڕۆژی ئەو دەستگیرکردنەم، لە کۆلێژی زانستە سیاسییەکان دەستبەسەرکرام و منیان هێنابووە هەمان شوێن. لەوێ سەروبەندێدا، مەهمەت عەلی ئاغجا، لە ڕۆما هێرشی کردبووە سەر پاپا. بۆیە مژاری تاوانی عەبدی ئیپەکچی و ئەو هەوڵی کوشتنەی پاپا زۆر لەسەر زاران بوو.

لە حەفتەمین نهۆمی بەڕێوەبەرایەتی پۆلیس، دوای دڵنیابوونەوە لە ناسنامەکەم و پشکنینی جل و بەرگەکانی بەرم، بە ئامێرێکی قژ تاشینی زۆر کۆر و کۆن، پرچیان نەتاشیم، بەڵکوو ئەتکیان

کـــردم. جـــا بە عەزیەت و ڕاکێشـــانەوە ئەو کارەیـــان دەکـــرد... پۆلیسێکی بەرامبەرم کاتێك سەیری دۆسیەکی منی کرد، هەستی بەوە کرد کە نووسین و پەرتووکم لەسەر پرسی کورد هەیە، بۆیە بە ڕقەوە گـوتی "هەتیـوو مـن کە کـوردم و خـۆم بەو کـارانەوە سەرقاڵ ناکەم، بە تۆیەکی نا کورد چی، حاڵ و ئەحواڵی ئێمە؟". جـــا هەر ڕســـتەکانی لەزار تەواو نەبـــوون، یەك دوو بـــۆکس و مشتەکوڵەی بەهێـزی خێوانـدە سـەر و چـاوم و پاشـان دەسـتی بە جنێودان کـرد؟. منیش ئاوا بەرسڤم دایەوە "جا تخوا بە خۆشت دەڵێی کورد؟".

هەمـان پـۆلیس بە هەڵچوونەوە بەردەوامـی دایـێ "سەرسـەری، کەی مـن ئـاوام گـوت؟ سـەرەتا تـورکم، دوایـێ..." قسـەی تەواو نەکـرد و کـوڵی دڵـی خـۆی بە شـەق و پـێلەقە لە مـن دەردەکـرد. لەنـاو شـــەپ و هـــۆڕی ئەو شـــەق و پێلەقـــانەی پـــێم دەکەوت، پۆلیسـێکی دیـکە گـوتی "ئەگەر وەك تـۆ بیـربکەمەوە، لە ڕۆژێکـدا ١٠ پەرتـووك دەنووســم. بەڵام ئەوەی گـــرنگە، بەیەکەوەبـــوون و یەکبـوون و بـرایەتییە...". جـا ناسـنامە و دەمژمێـرەکەی دەسـتم و جزدانەکەیان لێ وەرگرتم.

دواتر منیان بردە شوێنێك، نزیکەی دە پازدە کەسێکی لێبوو، لەوێ پۆلیسەکە پێی گوتم "ڕووت لە دیوار بکە و لەسەر یەك پێ بووەســتە. سەریشــت بــۆ ڕاســت و چەپ لار مەکەوە، چــونکە قەدەغەیە. هەروەهـــا نـــابێ لەگەڵ هـــیچ کەســـێکیش بـــدوێی، ئەگەرنا...".

ئەوان لەدەرەوە چاودێری ئێمەیان دەکرد، بۆیە هەر جوڵەیەکم

لای ئەوان دیار بوو. لە پاڵ من هەمان هەڵسوکەوتیان لەگەڵ نزیکەی هەشت نۆ کەسی دیکەش کرد. وەلێ من ناوەناوە بەبێ ڕووسووڕان، بە تیلەی چاو، سەیری ئەو گەنجانەم دەکرد کە دەیانهێنا تەکم و دایان دەنیشاندن. لە سەر و سیمایاندا دیار بوو، لە لێپێچینەوە ئەشکەنجەیەکی زۆر درابوون.

ئێوارە نزیکی دەمژمێر هەشت، منیان بردە هۆڵێکی گەورە، لەوێ نزیکەی ٧٠-٨٠ کەسی دیکەی لێبوو. هەرکەسە و لەلایەك، پەرێشان لەسەر زەوی ڕاکەتبوون. هەندێکیشیان لەسەر پارچە قوماش و هەندێك پەڕۆی کۆنی دڕاو، درێژ ببوون. وەلێ زۆربەیان لەسەر زەویەکی ڕەق و تەق ڕاکشابوون.

نیوەی شەو، سێ پۆلیس هاتنە ئەو شوێنەی لێی پاڵ کەوتبووم و لەسەر سەرم وەستان. منیش لەسەرمان خۆم گرمۆڵە کردبۆوە و چووبوومەوە ناو یەك. جا ئەگەر زەویەکە تەزیش نەبا، لەبەر قەرەباڵخی ئەوێ و بچووکی شوێنەکە، دەرفەتی قاچ ڕاکێشان و درێژبوونێکی ڕاحەت نەبوو. یەکێك لەو پۆلیسانەی لە بان سەرمەوە وەستابوون، یەك دوو پێلەقەی لە قاچمدا و بە هێما بۆ کردنم گوتی "لەبەر ئەو ئەنارشیستە، نەمتوانی بەشداری ئاهەنگەکە بکەم، چونکە مفەوەزەکەمان، فەرمانی کردووە تا بیگرم و بۆ لای ببەم. هەرلەبەر ئەوەش بوو نەمتوانی بچمە شاییەکە". جا لەگەڵ ئەوەی ئەو قسانەی دەکرد، بە پۆستاڵەکەی پێشی، قاچی دەخستە سەر سك و لاق و لەتەرم. لەناو ٧٠-٨٠ کەسدا منی زۆر ئاسان بینیەوە. لە هەمبەر ئەو ئەشکەنجە و ئاخافتنەیان هیچم نەگوت. تەنیا هەوڵی پاراستی سەروسەکوتی خۆم دەدا و بەس.

چەند ڕۆژێك بەو شێوەیە لە بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسی ئەنقەرە هێڵدرامەوە. پاشان چەند ڕۆژێك دوای دەستگیرکردنم، دەمەو نیوەڕۆ، هاتن و پێیان گوتم "خۆت ئامادەکە دەچینە ناوچەی ئاداپازاڕ".

دەمژمێر هەشتی ئێوارە گەیشتینە ئاداپازاڕ، لەوێ منیان بردە پۆلیسخانەیەك و لە ژێر پەیژەی ئەوێ، لە محەجەرە ئاسنینەکەیان بەستامەوە. هەردوو دەستمیشیان بە کەلەپچەیەك بە ئاسنەکەوە گرێدا. تا بەیانی ڕۆژی دواتر، ئاوا لەسەر لینگان بە کەلەپچەکراوی مامەوە.

ڕۆژی دواتر، سپێدە زوو، لەگەڵ سۆری سبیانێ منیان بە چەند بنکەیەکی دیکەی پۆلیسی ئاداپازاڕدا گێڕا و دواتر هێنامیانەوە هەمان شوێن، پاشان منیان خستە شوێنی چاوەڕوانی. ئەوێ ژوورێکی تاریکی ساردی ڕەق و تەق بوو. شوێنێك نەبوو بۆ دانیشتن، یان پاڵکەوتن. جا شوێنەکە تەزی بوو، لە کاتێکدا لە کۆتاییەکانی مانگی شەشیش دابووین. لە قوژبنێکی ژوورەکە، لە چەند شەپڵە گوێك و ساردێکی وشك و تاریکیەکی بەسام زیاتر، هیچی دیکە نەبوو. بە هۆی ئەو تەجرەبانەی پێشتر هەمبوو، هۆکاری ئەوەم دەزانی کە بۆچی شوێنەکە ئاوایە. تومەزە ئەو کەسانەی بەر لە من لێرەبوونە، داوای ئەوەیان لە پاسەوانەکان کردووە تا بیانبەنە ئەدەبخانە، بەڵام کەس بە دەم داواکەیان نەچووە، بۆیە کابراش پێویستی خۆی لەوێ کردووە.

حوجرەکە بە ڕۆژ سارد بوو، لێ کە شەو دادەهات، ئیدی دەبووە یەك پارچە شەختە. لەبەر ئەوەی دەترسام لەسەر ئەو

زەویـیە سـاردە دانیشـم، نەوەکـا تووشـی زگ هێشـە و سـك چـوون ببـم، بـۆیە هەر بە پێوەبـووم. جـار نـا جـارێکیش بە هـۆی ئەوەی ئەوەنـدە بە پێـوە وەسـتابووم، لەتـاو ئـازاری قاچەکـانم دەمویسـت تۆزێـك پشـتم بـدەمە دیـوارەکە، بەڵام دیـوارەکەش وەك کێڵـی سەهۆڵ سـارد و تەزی بوو، بەشێوەیەك لە سـاردیان تەنگە نەفەس دەبـووم. لە بەدبەختـی خـۆم، کاتێـك لە مـاڵ دەسـتگیریان کـردم، جگە لە کراسێك، چاکەتێك یان پاڵتۆیەکی ئەستورم لەگەڵ خۆم نەبرد.

لەنـاو تاریکـایی و سـاردی ژوورەکەم، خەریـك بـوو بە هـۆی ئـازاری جەسـتەم لە هـۆش خـۆم دەچـووم، لە پـڕ تیشـکی زەردی هەتـــاوم، لە ڕێـــڕەوی دەرەوەی حـــوجرەکەم بینـــی. ئەمە واتـــای هەڵاتنـی خـۆرێکی تـازە و دەسـتپێکی ڕۆژێکـی نـوێی دەگەیانـد و تێگەیشـتم کـات بـووەتە بەیـانی. بەم شـێوەیە چەنـد ڕۆژێـك لە حوجرەکە مامەوە. ڕۆژانە تەنیا یەك کەرەت دەیانبردمە ئەدەبخانە. لە بەدبەختـی مـن، هەرچی پاسەوانی بێ ئەدەب و نا موحتەرەم و بـێ پەروا هەیە، لەوێ کۆبـــوونەوە. لەو شـــەوانەی لەوێ بـــووم، نیوەی شـەوێك، پۆلیسێك لە حوجرەکەم نزیك بۆوە و دەوی هێنا لای ئاسـنی بەر دەرگـاکە و پرسـی "تـۆ چ تاوانێکـت کـردووە؟" پاشـان دایە قاقـای پێکەنـین. ئەوان ئەو پرسـیارانەی دەیـانکرد، بـۆ ئەوە نەبوو تا وەڵامێکیان دەستبکەوێت، بەڵکوو بۆ ئەوەبوو حەنەك و گاڵتە و گەپی خۆیان بە من بکەن.

بە ڕۆژ زۆر لەوە دەترسـام شـەو دابـێ، چـونکە شـەو مانـای هاتنی ساردی و لەسەرمان هەڵلەرزین بوو. شەویش لەتاو ساردی شوێنەکە خواخوای هەڵاتنی ڕۆژ بووم. چەند ڕۆژێك دواتر سێ

چوار كەسێكی دیكەشیان هێنا هەمان حوجرە. ئەوان چەند كەسێك بوون لە ئەندامانی پارتی كۆمۆنیستی توركیا. پێم وابێ، ئەوانیان لە پۆلیسخانەیەكی دیكەوە هێنابوونە لای من. ئەوان چەند بەندێك ڕۆژنامەیان پێبوو. ئیدی كە هاتن، چەند ڕۆژنامەیەكم لێوەرگرتن و لە عەرزەكە دامخست و لەسەری ڕۆنیشتم. چەند دانەیەكیشم خستە بەر پشتم و هەندێكیشیانم لە بن قاچم دانا و لاقم درێژكرد. كە وامكرد، هەستم بە پشوویەكی چاك كرد. چونكە ڕۆژنامەكان بەشێكی چاكی ساردییەكەیان دەگەڕاندەوە.

ئەو برادەرە تازانەی هاتبوون، زۆر لەوێ نەمانەوە، پێم وابێ ڕۆژێك دواتر بوو، كە ئەوانیان بردە بەندیخانەی دۆخی لەناكاو. هەمان ڕۆژ منیشیان بردە ژووری لێپێچینەوەی بەڕێوەبەرایەتی پۆلیس. ئەو شوێنەی بۆیان بردم، نهۆمی سەرەوەی باڵەخانەیەك بوو. لەو شوێنەی دایان نیشاندم، دوو سێ مەتر هێوەتر دیوارێكی لێبوو. لێ دیوارێكی ڕووخاو بوو. لە ڕاست و چەپی منیش چەند كەسێكی دیكەیان دانیشاندبوون.

ئەو كاتەی خەریك بووم بیر لەوە بكەمەوە بۆچی ئەو دیوارەی بەرامبەرم ڕووخاوە، چەند دەنگێك هاتنە بەر گوێم، بۆیە زانیم خەریكی لێپێچینەوەن لەگەڵ چەند كەسێكی دیكەش. چونكە گوێم لێبوو دەیانگوت "هەتیووی هیچوپوچ قسەبكە... چونكە ئەگەر نەدوێی لێرەوە فڕێتدەدەینە خوارەوە..." تا دەهات دەنگیان بەرزتر دەبۆوە. ئیدی تێگەیشتم بۆچی دیوارەكەی بەرامبەرم ڕووخاوە. چونكە هەموو ئەوانەی لێپێچینەوەیان لەگەڵ دەكرا، بە خستنە خوارەوەیان لە نهۆمی سەرەوە لە ژێر هەڕەشەدابوون.

ماوەیەك دواتر منیشیان بردە هەمان شوێن. ئەو ئەفسەرەی

لێپێچینەوەی لەگەڵ کردم گوتی "ئەو مەکتووبە تۆ نووسیوتە؟" کە وای گوت نامەیەکی لەناو دۆسیەیێکی ئەوێ دەرهێناو پیشانی دام. کە بینیم هاتەوە یادم کە نووسینەکە، هەمان مەکتووبە کە مانگی هەشتی ساڵی ١٩٨٠ لە زیندانی تۆپتاشی بۆ سەندیکای نووسەرانی سویسرام ناردبوو. لەوێ باسم لەوەکردبوو پێویستە نووسەرانی سویسرا دژی قەدەغەکردنی زمانی کوردی و گەلەکەی هەڵوێست و بۆچوونیان هەبێ دژی دەوڵەتی تورکیا. منیش ئەوەم بۆ گوتن کە بەڵێ نامەکە من نووسیوومە. خودی مەکتووبەکەش لە سەردەمی ڕژێمی ١٢ ئەیلوول، لە یەکێك لە ئۆپەراسیۆنەکانی سەر بەندیخانەی ساکارییە دەستی بەسەردا گیرابوو.

ئەو دەمای من لە زیندانی کاینارجەی بووم، کاتێك لە بەندیخانەی ساکارییاوە منیان گواستەوە گرتووخانەی کاینارجە، تێگەیشتم کە بەندکراوێکی زۆریان گواستۆتەوە. بۆیە ئەو نووسراوانەم لەوێ لای برادەران جێهێشت. دوای ئەوەی لە زیندانی کاینارجە ئازادکرام، گوتم ڕۆژێك دەچم ئەو نووسراو و نامانە وەردەگرمەوە. ئیدی نەمزانی لەوێ هەمووی دەستی بەسەردا گیرابوو.

دوای ئەوەی دانم بەوەدا نا، نامەکە هی منە، هەندێك قسەمان لەسەر کورد و زمانەکەی کرد. پێم وابێ ئاخافتنەکە خۆی لە خۆیدا سەرنج ڕاکێش بوو. چونکە زۆر ئاشکرابوو کە لەگەڵ ئەفسەرەکە لەسەر هەمان باوەڕ نین. لێ بۆچی دەبێ لێرەوە سزا بدرێم؟ کاتێك لەگەڵ کەسی خاوەن دەسەڵات و حوکم لەسەر

بۆچوونێك هاوڕا نابین؟ ئیدی ئەوە هی ئەوەیە سزا بدرێم؟ جا ناوەڕۆکی هەموو ئەوانەی لەسەر ئازادی گیرابوون، هەر ئەوەبوو. ئەمە نەك تەنیا لای پۆلیس، بەڵکوو هەمان شت لە داواکاری گشتی و دادگاش دووبارە دەبۆوە.

دوای ئەوەی لێپێچینەوەکە تەواو بوو، هەمدیسان، منیان بردەوە قەرەقۆڵ و خستمیانەوە ژووری چاوەڕوانی. شەو ڕۆژێکی دیکەش هەر لەوێ هێڵدرامەوە. ڕۆژێك پاشترێ، دیسان منیان بردەوە بەڕێوەبەرایەتی پۆلیس. جاری دووەم لە ئەنقەرەوە پسپۆرێك هاتبوو و ئەو لێپێچینەوەی لەگەڵ دەکردم. چونکە لە جاری یەکەمدا باسم لە هەندێك شوێن کردبوو لە ناوچەی ئیسکلیپ، لە پاڵ ئەو بوویەرانەی لەوێ ڕوویاندابوو.

لە گوندێکی زۆر نزیکی ئیسکلیپ، شوێنێك هەبوو بە ناوی چەمی گاور. چەمەکە زستان و هاوین بێ ئاو و وشك، تژی دار و بەرچیغ بوو. بە منداڵی بۆیان باسدەکردین، لە چەمەکە سەری گاوران بڕدراوە و نابێ بچینە ئەوێ. جا ئاوا هەڕەشەیان لێدەکردین "ئەگەر بچنە ئەو چەمە، سەری ئێوەش دەبڕن". ئیدی بەو شێوەیە دەیانترساندین.

لە دەڤەری کۆچ کایا، شوێنێك هەیە پێی دەڵێن کایارد. هەروەها پێشیان دەگوت گۆڕستانی گاوران. چونکە شوێنی ناشتنی ئەو گاورانەی ئەوێ بوو، لە پاڵ کۆتاییەکانی گۆڕستانی ئیسکلیپ. جا تەمبێیان دەکردین تا نەچینە ئەوێندەریش، چونکە قەبری گاورانی لێیە.

ئەو پسپۆرە پۆلیسەی لە ئەنقەرەوە هاتبوو، تا لێپێچینەوەم لەگەڵ

بکات، نکۆڵی لەوە کرد لە سەردەمی یەکەمین جەنگی جیهان، لەوێنــدە وەهــا بوویەرێــك ڕوویــدابێ و گــاوڕ ســەربڕدرابن. بەسەرهاتەکەشی بە قسەی ناڕاستی سەر زاری گوندەواریەکانی نــاوچەکە زانــی. جــا باســی لەوە کــرد، باســکردنی ئەو جــۆرە بیرکـردنەوە ناڕاستانە، کـارێکی بـاش نیـیە. هەروەهـا باسـکردن و دوان لەبـارەی پرســی کــورد و زمــانی کــوردیش، دەبێـتە هـۆی بەلاڕێدان بردن و سەرلێشێوان، ئەمەش کارێکی هەڵەیە. سەرەڕای ئاخافتنە نەرێنیەکانی، وەلێ هەندێك لەسەر ئەو مژارانە دواین، لێ بەشێکی زۆری قسەکانی نێوان من و پۆلیسە پسپۆرەکە، لە یاداشتی لێپێچینەوەدا تۆمار نەکران و نەنووسرانەوە.

جـا دەمەوێ ئەوەتـان پـێ بێـژم، ئەو شـوێنەی نـاوی چەمـی گـاوڕان بـوو لە ئیسـکلیپ، دواتـر کـرا بە شـوێنی نیشـتەجێبوون و خانوو و باڵەخانەی لەسـەر چێکـرا و ناویان لێنا (گەڕەکی چەمی گولآن).

دوای تەواو بوونی لێپێچینەوەکە، دووبارە منیان بردەوە بنکەی پۆلیس و لە شوێنی خۆمیان ئاخنیمەوە. ڕۆژی دواتر، بە چاودێری دوو سـێ پـۆلیس، منیـان بـردە قەرەقـۆلی سـەربازی سـاکاریا. لە ڕێگا، یەکێك لە پۆلیسـەکان ئاوا سەری قسانی کردەوە "پیاوێکی گەورە و پێگەیشـتووی وەك تۆ، شەرم لە خۆی ناکاتەوە دیوار و زەوی حوجرەکەی خۆی پیس بکات؟". ئەمەی بە دەنگێکی گڕ و تۆنێکی بەرز هێنا زمان و هاواری کرد. وام بیرکردەوە کە یەکێکی دیکەشــیان لە تـرومبێلەکە سـوار کـردوە و لەگەڵ ئەویەتـی، تـا ئەویش ببەنە هەمان ئەو شوێنەی بۆی دەچووین. کاتێ پۆلیسەکە

ئاوا دەیقیڕاند، منیش بیر و هۆشم لای ئەوە بوو، بۆچی هەستم بەوە نەکردوە کەی و چۆن کەسێکی دیکەشیان سواری هەمان ترۆمبێلەکەمان کردووە. لەپڕ، هەمان پۆلیس شانی گرتم و بە هەموو هێزی خۆی ڕایتەکەنادم و گوتی "من لەگەڵ تۆمە تۆ، گوێت لێ نییە چی دەڵێم؟ یان خۆتی لێ کەڕ دەکەی؟" جا دەستی بە جنێودان کرد.

ویستم بڵێم "یانی چی دیوار و زەویی پیسکردن؟" هەمان پۆلیس بەرسڤی داوە "ئەوەتە لەناو دۆسیەکەتدا ئاماژەی پێکراوە، جا بە پێنووسی سۆریش نووسراوە. ئەوجا بۆ ناچی دەستکەیە پەقرەجێك بۆیە و بە فڵچە لەسەر دیواری کۆڵانان بنووسی؟ واتە چی پیسکردن و نووسینی دار و دیوار؟" منیش هەوڵمدا ئەوەی تێبگەیەنم، ئەوەی تۆ دەیڵێی، نووسینی سەر دار و دیوار نین، بەڵکوو نووسراوی سەر پەڕا و دەفتەر و پەرتووکن. بەڵام ئەو تێنەدەگەیشت و دەیگوت "هەتیوو پەرتووکی چی! ئەوەتا نووسراوە (نووسین)". بەڵام هەر دەمویست ئەوەی بۆ ڕوون بکەمەوە، من بە هۆی نووسینی پەرتووکەوە لێپێچینەوەم لەگەڵ دەکرێ و دۆسیەکەشم هەر لەسەر ئەوەیە. کاتێك دەمویست ئەو قسەیەم تەواو بکەم، یەکێکی دیکە لە پۆلیسەکانی ناو ترۆمبێلەکە بە دەنگێك، کە دەیویست من بە کەم و خراپ نیشان بدا، وەك سووکایەتیەك، ئەو چەند دێڕەی گوت "تۆ پەرتووکت نووسیوە؟" بە بەڵێ وەڵامم داوە. ئەوەیش بە شێوەیەکی گاڵتەجاڕانەوە گوتی "تۆ؟ تۆ؟" منیش بە بەڵێ بەڵێ بەرسڤم داوە.

دوای ئەوە، یەکێکی دیکە لە پۆلیسەکان تاوی دا قسەکردن

"یەعنی پەرتووکێکیان دا دەست تۆ و گوتیان بیخەوە سەر دەفتەر؟ ئایا ئاوا پەرتووکت نووسیوە؟" بەڵام دیار بوو پۆلیسەکان باوەڕیان بەوە نەدەهێنا کە کتێبم نووسیوە.

بەدەم ئەو پرسیارە جرِنـا و فرِنایـانە، گەیشـتینە قەرەقـۆلی سەربازی ساکاریا. دوای گەیشتنمان، پۆلیسەکان لە ژوورەوە منیان ڕادەسـتی عەریفێکـی ئەوێ کـرد. لەکـاتی ڕادەسـتکردنەکەش پۆلیسـەکان گوتیـانە عەریـفەکە "هـی ئەوە نووسـینە". لە وەڵامـدا عەریـفەکە "ئەگەر نووسـین بـێ، لە مـاوەی چـوار پێـنج ڕۆژ دەردەچێ". پۆلیسەکان وەڵامیان داوە "نا نا ئاوا نییە، چونکە ئەو پیاوە دەڵێ پەرتووکم نووسیوە". عەریفەکە بەرسڤی دانەوە "ئەگەر وا بێت نازانم کەی دەردەچێت. چونکە ئەوە لە دەسەڵاتی مـن زیـاترە. بەو پێـیەی مژارێکـی دیـکەیە". دوای تۆمـارکردنی نـاوم، عەریفەکە منی ناردە یەکێك لە قاوشەکانی ئەوێ.

لە بارەگـا سـەربازیەکەی سـاکاریا، بەشـێکی زۆری برادەرانـی پـارتی کۆمۆنیسـتی تورکیـا و ئەنـدامانی سـەندیکاکانی لێبـوو. ئەو قاوشـەی تێـی خـرام، نـزیکەی ٦٠ هەڤـاڵی لـێ بـوو. عابـدین گونەشیش هەر لەوێ بوو. عابدین گونەش برای حەسەن فەهمی گونەشی وەزیری ناوخۆی حکوومەتی بوڵەنت ئەجەڤیت[1] بوو لە

---

[1] بوڵەنـت ئەجەڤیـد (١٩٢٥-٢٠٠٦) بە بـنەچە کـوردە و نەوەی مسـتەفا شـوکرو ئەفەندییە. ئەجەڤید لە چوار کابینەی جیاواز سەرۆك وەزیرانی تورکیا بووە، دوایین جاریش لە نێوان ساڵانی (١٩٩٩-٢٠٠٢) ئەو پۆستەی وەرگرتووە. جگە لە پۆستی حکومی، لە نێوان ساڵانی (١٩٧٢-١٩٨٠) سەرۆکی گشتی جەهەپە بووە. لە نێوان سـاڵانی (١٩٨٩-٢٠٠٤) سـەرۆکی گشـتی پـارتی پـارتی چەپـی دیمـوکرات بـووە. (وەرگێڕ).

کۆتایەکانی ساڵانی حەفتای سەدەی بووری. حەسەن فەهمی گونەش، چەند جارێك لەوێ هاتە سەردانی براکەیی و چەند گیراوێکی دیکەی ئەوێ.

بەندیخانەکە لە کەنار ڕووباری ساکاریا بوو. ناوچەیەك بوو تژی دار و سەوزایی. لە چوار دەورەی قاوشەکانیش چەندان باخچەی گەورە و فراوان هەبوو. بۆشمان هەبوو ڕۆژانە لەناو باخەکە پیاسە و وەرزش بکەین.

ڕۆژێك پارێزەرەکەم هاتە قشڵەی ساکاریا. هاتبوو تا ناسنامەکەم بداتێ، چونکە لە کاتی لێدان خواردن لە بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسی ئەنقەرە، لێم کەوتبوو و لەوێ جێمابوو. دوای من هەواڵیان دابووە لەمانی خێزانم و پێیان گوتبوو "وەرە و ناسنامەی هاوسەرەکەت ببەوە، چونکە لای ئێمە جێماوە". لەمانی خێزانم لەگەڵ مامۆستایەکی هاوڕێی لە قوتابخانەوە چووبوون تا ناسنامەکە وەربگرنەوە. دواتر بۆی باسکردم کە چەند بە زەحمەت شوێنەکەیان دۆزیوەتەوە. دوای وەرگرتنەوەی ناسنامەکەی منیش، بۆ ئەوەی بگەیەنێتە دەستم، بە پارێزەرەکەمدا بۆی ناردبووم. ئەویش ڕۆژێك هات و بۆی هێنام، لە کاتێکدا دەبوو دوای گواستنەوەم بۆ ساکاریا، ناسنامەکەشم بخەنە ناو دۆسیەی دەستگیرکردنەکەم.

ئەو کاتەی لە ساکاریا گیرابووین، جارێك ئێمەیان بردە حەمام. بۆ ئەوەی خۆمان بشۆین، بەڵام بۆ ئەو کارە تەنیا ماوەی ١٢ خولەکیان پێدابین. بیرمە ئێمەیان بردە گەرماوی ساهرا. دەبوو دوای ئەو ماوەی پێمان دراوە، لە حەمامەکە دەرچین. لە ژوورەوە ئێمەش لە دەورەی دەفرە بەردینەکە، بەپەلە پڕوزێ خەریکی خۆ شۆرین بووین. بەس باش بوو دەرگاوانەکان، هەوڵی ئەوەیان دەدا

نەیەنە ژوورەوە. لێ چاوپۆشیان لە چاودێری کردنمان نەدەبڕی.

چەند ڕۆژێك دوای گەیشتنم، جارێکی دیکە لە قشڵەی ساکاریا منیان بانگهێشی لێپێچینەوە کردەوە. جارێکی دیکە ئەو نامەیەی بۆ سەندیکای نووسەرانی سویسڕام ناردبوو، هاتەوە بەر باس و خواسی لێکۆڵینەوە. منیش لە بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسی ئەنقەرە چیم گوتبوو، لەوێش هەمان ئیفادەم بۆ دووبارە کردنەوە.

لەوێ نزیکەی دوو مانگ مامەوە، لە مانگی تەباخ، لە زیندانی بارەگای سەربازی ساکاریا دەرچووم.

بەیانییەکی زووی، یەکێك لە کۆتا ڕۆژەکانی مانگی هەشت، منیان لە قاوش دەرهێنا و سواری ترومبێلێکیان کردم. پێم وابوو دەمبەنە بەندیخانەی دۆخی لەناکاو؛ بەڵام وەها دەرنەچوو. بەڵکوو منیان دەبردە زیندانی بارەگایەکی دیکەی سەربازی. ئەو شوێنەی بۆی بردرام، پێم وابێ سەربازگەی هێزی زەمینی بوو. لەوێ خستمیانە قاوشێك. کە منیان خستە ژوورەوە، لە دەرگای قاوشەکەوە بینیم، لەسەر مێزی ژوورێکی ئەوێ، نەقیبێکی هێزە دەریاییەکان خەریکی نان خواردنە. کە ئەوم بینی ئاوا بەشەوق و زەوقەوە نان دەخوا، منیش ئیشتیهام بۆوە، لە دڵی خۆم گوتم، داخۆ دەبێ چەند مڵاکێك خواردن بدەنە منیش؟ لێ ئەو ئەفەسەرەی دەموچاوی زۆر ترشاو و مڕومۆچ بوو، هەر سڵاویشی لێ نەکردم. هەوڵیشی دەدا چاومان نەکەوێتە سەر یەك. کابرا هەوڵی دا بلەز ئەو چەند مڵاکە شۆربایەی لەبەردەمی ماوە، تەواو بکات و لەوێ دەرچێ.

ئەو قاوشەی تێی خرام، چارپاکانی دوو قاتی بوون. بە سەیرکردنی کەلوپەل و ناوەوەی ژوورەکە، هەستمکرد زۆر کەسی

دیکە پێش من لێرە گیراون. چونکە بالینگانەکان زۆر شپڕزە و پیس و بڵتۆخ بوون. باش ئەوەبوو تەنیا دوو شەو لەوێ مامەوە.

بەیانی یەکەم، ئەفسەرێکی ئێشکگر، بە پلەی نەقیب، چاوێکی بە قاوشەکان خشاندەوە و هەژماری گیراوانی وەردەگرت و دواتر هاتە قاوشەکەی منیش. لەبەر دەرگا پرسیاری ئەوەی لێکردم کەی هاتووم و بە چ تۆمەتێك دەستگیرکراوم و چ کارەم؟ لە وەڵامدا گوتم "بە نووسینی نامە..." کاتێك پرسیاری ناوی پەرتووکەکانی کردم، منیش ئاوام بۆ ڕیز کرد "بە زۆر نیشتەجێکردنی کورد، تیۆری مێژووی تورك و تاد..." وەڵامی دامەوە "تۆ شێتی، دێوانەی،...؟". ئەوەی گوت و لە قاوشەکە دوور کەوتەوە. لەگەڵ دوورکەوتنەوەشی ئەو قسەیەی بە دەنگێکی گڕ دووبارە دەکردەوە.

سپێدەی ڕۆژی دواتر، لەبەردەم دەرگای قاوشەکە، لەگەڵ گەنجێکی سەرباز هەڤدوومان ناسی. گیانبازەکە گوتی "کاك ئیسماعیل، من لە نزیکەوە تۆ دەناسم، کیتابەکانیشتم خوێندۆتەوە. خۆشم خەڵکی سیوێرەگم. جا با پێت بڵێم، ئەمڕۆ تۆ دەبەنە بەندیخانەی گۆلوجوك. ئەو زانیارییەشم لەزاری ئەفسەری ئێشکگر و ئەفسەری دادگا بەیەکەوە بیست، کاتێك لەبارەی تۆوە دەدوان".

لەوێ ڕۆژێ تەنیا جارێك، ڕێگایان دەدا بچینە ئەدەبخانە. ئەوەی باشبوو، سەرئاوەکە لەپاڵ قاوشەکەی من بوو. لەوێ ئاوێکی بە خوڕیش لە کانییەکەوە، لە ڕێگای بەلوعەوە هێندرابووە ئەوێ و ئاوێکی سازگاری لێ دەهات. نازانم ئەوانەی لەناو قاوشەکان بوون تەنیا دەستبەسەر بوون یان بەندکراویشی لێبوو،

چونکه کەسم نەناسی لەوێ. وەك چۆن لەگەڵ ئەو ئەفسەرە دەریاییەی باسیشمکرد یەکدیمان نەبینیەوە. چونکە دڵنیام لە ڕژێمی دوازدەی ئەیلوول، ئەفسەر و سەربازی گیراو و بەندکراو هەبوو.

دوای نیوەڕۆ، منیان بردە دادگای سەربازی گۆلوجوکی فەرماندەیی لەناکاو. بڕیاری دەستگیرکردنی غیابیم گۆڕا و بڕیاری تۆمەتبارکردنەکەم بە ڕوودا خوێندراوە. دوای تۆمارکردنی ڕێکارە یاسایی و فەرمییەکان، بڕیار لەسەر ئەوەدرا، تا بمنێرنە بەندیخانەی سەیمەن. لە ناوچەی ژێر دەستی فەرماندەیی لەناکاوی گۆلوجوك سێ بەندیخانە هەبوو. بۆ نموونە بەندیخانەی (گوللوباهچە) لەو شوێنە بوو کە بارەگای سەربازی و دادگا سەربازیەکەی لێبوو. لێ زیندانی (سەیمەن) زۆر لە بنکەی سەربازیەکە دوور بوو. گرتووخانەی (کۆنجا)ش لەسەر ڕێگای یالۆڤا بوو.

لە زیندانی سەیمەن منیان خستە ناو قاوشێکی زۆر قەرەباڵغ. هەر کە منیان بردە ژوورەوە، چارپایەکی نزیك دەرگاکەیان پیشان دام، وەك شوێنی نووستنم. یاتاغەکەم ژمارە ٧٢ بوو، ئەوەش دواین چارپای نوستن بوو، بەو پێیەش قاوشەکە ٧٢ کەسی دەگرت، بۆیە لەگەڵ من ژمارەی قاوشەکە تەواو دەبوو.

ئەوسا، پیلانی تێکی بەردە و ئاشتیان بکەوە جێبەجێ دەکرا، منیش لە سەردەمێکی وەهادا کەوتمە ئەو قاوشەوە، شۆڕشگێڕەکان لە کەنار پەنجەرەکان دەمانەوە و (ئولکوجیەکان)یش لای دەرگاکە. منیش کەوتبوومە لای ئولکوجیەکان. بەڵام ئەو یاتاغەی بە منیان پیشان دا، زۆر خراپ و کۆن و شڕ و شیتاڵ بوو. بە شێوەیەك کاتێك لەسەری دادەنیشتی، لە کۆنیان بەرەو ژێر دادەکەوت. لە قاتی دووەمی تەختەی خەوتنەکەم، گەنجێکی

ئولکوجوو دەماوە. لە گفتوگۆیەکی ڕۆژانەماندا ئەوەی زانی کە من نووسەرم و لەسەر نووسینی چەند نامەیەك و بڵاوکردنەوەی پەرتووك لە زیندانم. بۆیە داوای لێکردم چەند مەکتوبێك بۆ خۆشەویستەکەی بنووسم. لێ ئەوەم تێگەیاند کە کارێکی نەکردەیە و ناتوانم بیکەم.

ڕۆژێك، دەمەو نیوەڕۆ، دوای فراڤین، نەقیبێکی هێزەکانی دەریایی سوپای تورکیا هاتە قاوشەکەمان، نزیکەی پەنجا خولەك دەرس و وانەی ئەتاتورکیزمی بۆ باسکردین. دوای تەواو کردنی قسەکانی، یەکێك لە برادەرەکانی ئەوێ، کە خۆی دەیگوت مامۆستام، دەستی هەڵبڕی و ویستی سەبارەت بە وانەکە پرسیارێك بکات، بەڵام نەقیبەکە ئاوا وەڵامی داوە "پرسیار نییە و تەنیا گوێ دەگرن و تەواو". جا پشتی لە ئێمە کرد و لە قاوشەکە دەرچوو. بیرمە ئەوکات داوایان دەکرد لەکاتی نانخواردن بڵێین "سوپاس بۆ دەوڵەتمان و گەلی تورك هەر هەبێ".

کاتێك دەچووینە هەواگۆڕکێ، بەبەردەم چەند قاوشێکدا تێپەڕ دەبووین. یەکەم ڕۆژ بوو چووبوومە شوێنی هەواگۆڕکێ و لەوێوە دەگەڕامەوە قاوشەکەم. کاتێك بەبەردەم یەکێك لە قاوشەکان تێپەڕ بووم، یەکێك بانگی کرد "کاك ئیسماعیل... کاك ئیسماعیل". ئەوسا دیداری نێوان قاوشەکان قەدەغە بوو. یەکێك لە دەرگەوانەکانیش گوێی لە دەنگەکە بوو، بۆیە هەر زوو ویستی من بخاتە ژوورەوە و بچێ ئەو کەسەش بێ دەنگ بکات؛ لێ دەنگەکە نەدەبڕاوە و هەر بانگی دەکرد، منیش نەمکردە نا مەردی و ئاوڕێکم داوە تا ببینیم ، ئەوەی بانگی دەکردم کەسێکی زۆر گەنج بوو. گەنجەکە لەوسەرەوە ئاوا بەردەوام بە قسەکانیدا "زۆر

باش ئاگاتان له کاك ئیسماعیل بێ، کاك ئیسماعیل نووسەره ها!" ئەوەی بۆ هەڤاڵانی دیکەی قاوشەکەمان گوت تا ئاگایان لێمبێ.

بانگردنی ئەو برادەره لاوه، وایکرد له قاوشەکەمان، زیاتر له جاران خاترم بگرن. پاشان کەوتنه کەڵکەڵەی دۆزینەوەی وەڵامی ئەو پرسیارەی ئاخۆ من کێم و چیم نووسیوه؟ ئەو هەڤاڵانەی لەلای پەنجەرەی قاوشەکە دەمانەوه، ڕاستەپێ منیان برده چارپایەکی لای خۆیان. ماوەیەکی کەم دوای ئەوەی چوومه لایان، زانیم ئەوان زۆربەیان قوتابی و مامۆستای ئامادەیی شاری باڵکەسیرن. ئەو خورتەی بانگیشی کردم، قوتابی هەمان ناوچه و ئامادەیی بوو. لێ خۆی خەڵکی دیاربەکر بوو و بۆ ئامادەیی باڵکەسیر دوورخرابۆوه.

ئەو لاوەم جارێکی دیکه نەبینیەوه، چونکه بەرپرسانی زیندان به هۆی ئەو بانگکردنەی منەوه سزایان بەسەر سەپاندبوو و خرابووه حوجرەی ئینفرادی.

یەکێك لەو خوێندکاره بەندکراوانه، زۆر خۆی بۆ من ماندوو دەکرد و لێم نزیك دەبۆوه. ئەوسا، ڕۆژەڤی گەرمی تورکیا سەبارەت به پێدان یان پێنەدانی خەڵاتی نۆبڵی ئەدەبی بوو به یاشار کەمال. ئەمەش مژارێکی گرنگی ناو میدیاکانی تورکیا بوو. ئێمەش لەسەر ئەو مژاره دەمەتەقێمان دەکرد. ئەو گەنجه ڕۆژێك له ڕێگای گەڕانەوەمان بۆ زیندان گوتی "کاك ئیسماعیل تەنیا بۆ ئەوەی به شۆڕشگێڕیەوه مژوول نەبم، باپیرەم دەیەوێ ژنم بۆ بهێنێ. به بۆچوونی تۆ چیبکەم؟". له وەڵامدا گوتم "هیچ کات دژی داخوازیەکانی ماڵەوەتان مەوەستەوه. لێ تا پێتدەکرێ، هەوڵی پاراستنی بۆچوون و هەستەکانی خۆت بده".

ڕۆژانی دواتر، چەند جارێك وانەی ئەتاتورکایەتیمان بۆ گوتراوە. جا ئەو مامۆستایەی باسم کرد، هەموو جارێك لە کۆتاییدا دەیویست پرسیار بکات. بەڵام هەموو جار نەقیبەکە وەڵامی دەداوە، کە دەبێ تەنیا گوێ بگرن و تەواو.

لەناو ئەو پیلانەی هەبوو بۆ بەگژیەکداخستن و دواتر مەسرەتی کردن لە نێوان هەردوو لایەنی بەشەڕهاتوو، لەسەر وانەکانی ئەتاتورکیزم و نزاکانی نان خوارد، لە نێوان کارگێڕی بەندیخانەکە و گیراوەکان، ئاڵۆزی دروست دەبوو. باسی ئەوەم بۆکردن، ئەوساتەی بۆیەکەمجار منیان بردە قاوشەکە و چارپاکەیان پێ پیشان دام، حاڵی شوێن و جێگاکەم چۆن بوو. باسی ئەوەم کردبوو قەرویڵەکەیان لەتەنەکە دروست کردبوو و تێلەکانیشی هەموو کۆن و بەشێکی پچڕاو و خێچ و خوار ببوون. کاتێك لەگەڵ برادەران گفتوگۆمان دەکرد، هۆکاری خراپی ئەو چارپایەشم زانی. چونکە برادەرە شۆڕشگێڕ و ئولکوجیەکان، هەریەکە و بەشێك لە تێلەکانیان لێکردبۆوە و وەك چەکێك بۆ خۆپاراستن بەکاریان دەهێنا.

نێوانی شۆڕشگێڕ و ئولکوجیەکان خۆش نەبوو، بەتایبەتیش ئەو گرژی و ئاڵۆزییە لە شوێنی هەواگۆڕکێ بەتەواوەتی دەردەکەوت. لێ هیچ شەڕێك لە نێوانیان ڕووی نەدا. بە هۆی ئەو ئاڵۆزیانەی نێوانیشیانەوە، لەسەرەتای مانگی نۆ، قاوشەکانیان لێك جیا کرانەوە و شۆڕشگێڕەکانیان بردنە قاوشەکانی نهۆمی سەرەوە و ئولکوجیەکانیش لەقاوشەکەی زەمین مانەوە. ئیدی لەوێ ڕۆژێ بەدواوە وانەکانی ئەتاتورکیزم کۆتاییان پێهات، لەگەڵ ئەو نزاکانی پێش نانخواردنیش هەڵگیرا.

## دادگای سەربازی گۆلجوك و
## گرتن بە تۆمەتی پێدانی بەرتیل

لە نێوان ساڵانی ۱۹۸۱-۱۹۸۲ سەرۆکی دۆخی لەناکاوی دادگای سەربازی گۆلوجوك، فەرماندەیەکی باڵای هێزی ئاسمانی تورکیا بوو. بەڵام ئەو دادوەرەی دانیشتنی دادگاکانی بەڕێوەدەبرد، کەسێکی سڤیل بوو. لێ سێیەمین دادمەند نەقیبێکی سەربازیی هێزیی دەریایی بوو. دادوەرێکی دیکەش هەبوو هەر وەك ئەو دادوەرە سەربازیە. ئەو دادوەرەی دوایی جگە لە دانیشتنی خوێندنەوەی فەرمانی دادگا، لە دانیشتنەکانی دیکە وەکوو دادوەری سێیەمی دانیشتنەکان بەشداری دەکرد. هەموو دادگاییکردنەکە لە چوار دانیشتندا کۆتایی هات.

هەر لەو پەرتووکەدا، لە بەشێکی دیکە باس لە دزینی ١٤ ملیۆن لیرە دەکرێ، کە دواتر خرانەوە سەر خەزێنەی دەوڵەت. جا زۆر دواتر بەشێك لەو کەسانە دەستگیرکران، کە دەستیان لە کارەکە هەبوو. ئەوانیش هەر لەدادگای سەربازی گۆلوجوکی فەرماندەیی دۆخی لەناکاو دادگایی دەکران. جا دەستەی دادوەرانی دادگای دۆسیەکەی من و ئەوان هەمان کەس بوون. واتە دوو دۆسیە لەلایەن هەمان دادگا و هەمان دەستەی دادوەران و هەمان داواکاری گشتی بەڕێوەدەچوو.

دوان لەو سێ دادوەرە سەربازییەی لە سەرەوە باسم کردن، دوای ئەوەی هەستیان بەوەکردبوو کە ئەو گەنجانەی دادگاییان

دەکەن دۆخی مادیان باشە، بۆیە پەیوەندیان لەگەڵ ماڵباتی ئەو تۆمەتبارانە دروست کردبوو. بۆ ئەمەش لە چەند شوێنێکی وەکوو کافتریا و چایخانە و بەنزینخانە و مارکێتان دەهاتنە با هەڤ و مامەڵەیان لەسەر دەکردن. بەو شێوەیە کارەکەیان گەورە کردبوو.

دۆسیەکەی من لە بەرواری بیستوسێیەمین ڕۆژی مانگی سێی ساڵی ١٩٨٢ لەلایەن دادگاوە بڕیاری لێدرا. سزاکەم ١٠ ساڵ زیندانی گران و ٥ ساڵیش ڕاگواستن بوو... بیرمە لە دانیشتنی ئەوێ ڕۆژێی دادگا، پارێزەر سەرحەد بوجاك لەوێ بوو. ئەو هەمان ڕۆژ بەرگرینامەیەکی ٢٣٩ لاپەڕەیی دایە سەرۆکایەتی دادگا.

نامەی داواکاری پێداچوونەوەی بڕیارەکەی دادگا، لە بیست و چوارەمین ڕۆژی مانگی پێنجی ساڵی ١٩٨٢ بوو. دادگای باڵای سەربازی لە مانگی تەباخی ١٩٨٢ بڕیاری لەسەر ئەنجامی دادگایەکە کرد، بەڵام بڕیارەکەیان بە من نەدا.

***

لەبەر ئەوەی بڕیار لەسەر جێبەجێکردنی سزاکەم درا، لە کۆتاییەکانی مانگی دەی ١٩٨٢ بۆ زیندانی کۆجائەلی گواسترامەوە. ئەوکاتەی لە بەندیخانەی کۆجائەلی بووم، لە سێیەمین ڕۆژی مانگی یازدەی هەمان ساڵ، کەناڵی BBCی ئینگلیزی، هەواڵێکی سەبارەت بە تورکیا بڵاوکردەوە، گوایە دوو لەو دادوەرە سەربازیانەی دادگای سەربازی گۆلوجوکی فەرماندەیی دۆخی لەناکاو، لەکاتی وەرگرتنی بەرتیل لە ماڵباتی ئەو تۆمەتبارانەی دادگایی کراون، بەسەر تاوانەکەوە

دەستگیرکراون. لە نوچەکەدا ناوی دادوەر و پلە سەربازیەکانیشیان بـڵاو کرابـۆوە. هەروەهـا بـاس لەوە کرابـوو، هەمـان ئەو دوو دادوەرە، ئیسماعیل بێشکچیشیان دادگایی کردوە.

ئەوان بەو تـاوانەی بەسـەریدا گیرابـوون، دادگـایی کـران. لە کۆتـا مـانگی سـاڵی ١٩٨٢، دۆسـیەکەیان بڕیـاری لەسـەر درا و هەردووکیشیان سزادران. جا ئەو پێشهاتانەم بە درێژی و بە وردی لە پەرتـووکی (داڕوخـانی قەرەقۆڵەکـانی نـاو هۆشـم) دا بـاس کردووە.

دوای ئاشـکرابوونی ڕووداوی بەرتیـل وەرگـرتنەکە و بـڕینەوەی سـزاکەم، دووبـارە سـەرمان لە دادگـای بـاڵای سـەربازی دایەوە، بـۆئەوەی پێـداچوونەوەیەك بە بڕیـاری سـزادانەکەم بکـرێ. لە حەڤدەهەمین ڕۆژی یەکەم مانگی سـاڵی ١٩٨٣، نامەکەم ناردرایە زیندانی چەنەقەلە.

لە نامەکەمـدا بە کـورتی ئـاوام گوتبـوو "دەبـێ بڕیـاری ئەو دادوەرانە هەژمار نەکرێ، کە بە تاوانی شەرمەندە تاوانبار کراون، بۆیە پێویستە سەرلەنوێ دۆسیەکەم دادگایی بکرێتەوە".

داواکارییەکەم لە ماوەیەکی کورتدا ڕەتکرایەوە، چونکە وەك ئەوەی بـویەری بەرتیـل وەرگـرتنەکە هـیچ نەبـووبێ، نامەکەیـان ڕەتکردبـوومەوە "تۆمەتبـار جـارێکی دیـکە داوای تێهەڵچـوونەوەی بڕیـاری دادگـای لە دادگـای بـاڵای سـەربازی کـردووە، بەڵام پێویسـت بەوە ناکـات جـارێکی دیـکەش داوای دادگـایی کـردن بکاتەوە". ئەوە وەڵامی دادگای باڵای سەربازی بوو بۆمن.

پێم وایە گرنگی ئەو نامەیە ئەوەیە "بەلای ئەوانەوە من هەوڵی

دارزینی ناو و ئیعتیباری دەوڵەتی تورکیام لای وڵاتانی بێگانە داوە، هەر بەو تۆمەتەش دادگایی کراوم".

"کوردەکانی تورکیا نکوڵی لە بونیان دەکرێ، وەك چۆن ئاوا بەسەر زمانەکەشیان دەهێنن. هەروەها سیاسەتی لەناوبردن و توانەوەشیان جێبەجێ دەکرێ... " دیارە ئەوە وەك ڕاستییەك هەژمار دەکرێ، کە دەبێتە هۆی لەکەدار بوونی ئیعتیباری تورکیا لە دەرەوە. وەلێ ئەو تاوانانەی ئەو دادوەرانە کردوویانە و بڕیاریان لەسەر دەکردنی سزاکانی من کردووە، هێشتا بڕیارەکانیان جێبەجێ دەکرێ، ئەوەش وەکوو پێشهاتێك لێك دەدەنەوە کە ناوی تورکیا لە دەرەوە بەرز دەکاتەوە. ئەو جۆرە مژارانە، لەناو ئەو پەرتووکەدا بە ورد و درشتی هەیە کە لە سەرەوە ناوم هێنا. بە خستنەڕووی چەندان بەڵگەش.

## بەندیخانەی جۆری تایبەتی عەنتاب

لە مانگی یازدەی ساڵی ١٩٨٢، لەگەڵ مووسا ئۆزتوفان گواسترایینەوە بەندیخانەی چەنەقەلە. لەگەڵ گەیشتنمان بۆ ئەوێ، هێشتا قاچێکمان لە ژوورەوە و ئەوەی دیکەمان لە دەرەوە بوو، بەرپرسی بەندیخانەکە پێی گوتین "ئەگەر هات و پابەندی ڕێنمایی و ڕێساکانی زیندان نەبن، ڕاستەوخۆ دەتانگوازمەوە ئەو زیندانە تازەیەیی لە عەنتاب دروست دەکرێ، کە حەفت قات لەژێر زەوییە و سەرجەم لادەرەکانی تورکیای لێ کۆکراوەتەوە". من چەند جارێکی دیکە و لە چەند شوێنێکی دیکەش گوێم لە

وشەی لادەر ببوو. بۆیە بە هیچ شێوەیەك بەكارهێنانی ئەو چەمكەم بەرامبەر بە خۆم هەستپێنەدەكرد و شكم لە خۆم نەبوو لەو بارەوە.

كاتێك ژیانی ناو زیندان لە كۆتاییەكانی ١٩٨٤ تۆزێك كەوتە سەر ڕێ و شوێنی خۆی. ئاڵۆزی نێوان بەندكراوان و بەڕێوەبەرایەتی زیندانیش كۆتایی هاتبوو. ڕۆژێك لە قاوشی C13، سەرەی چوونە گەرماو بوو و تازە لە خۆ شۆرین گەڕابووینەوە. لەپڕ لە بڵندگۆكانی زیندانەوە گوێمان لێبوو گوتیان "ناوی ئەو كەسانەی بەیانی بڕیارە بگوازرێتەوە بۆ زیندانی تایبەتی عەنتاب" ئیدی دواتر دەست بە خوێندنەوەی لیستەكە كرا، كە زیاتر لە ٨٠ كەس دەبوو. ناوی من هەر زوو، لەسەرەتای لیستەكە خوێندراوە.

زیاتر لە هەشتا هەڤاڵ دوای ئاگادارییەكە، دەستیان بە ئامادەكاری و خۆ كۆكردنەوە كرد. ئەو كارانەش تا ئێوارەی ڕۆژی دواتر درێژەی كێشا. ترومبێلی گواستنەوەمان، یان باشترە بڵێم ترومبێلی بە زۆر ڕاگواستنمان، دەمەو زەردەپەڕ، لەگەڵ كەوتنی خۆر بە ڕێ كەوت. ڕۆژی دواتر، دەمەو نیوەڕۆ گەیشتینە شوێنی دیاری كراو. دوای ئەوەی ناومان تۆمار كراو و پشكنینیان بۆ كردین، ئێمەیان خستە چەند ئینفرادییەكی جیا جیا. حوجرەكان تاكەكەسی بوون، لێ شوێنی هەواگۆڕكێ زۆرگەورە و فراوان بوو. بەڵام تەنها ڕێگا بەوە دەدرا بۆ ماوەی دە خولەك، یەك یەك بچینە ئەوێ و هەندێك هەوای پاك وەرگرین.

بەندیخانەی تایبەتی عەنتاب تازە كرابۆوە، بۆیەش چەندان گیراوی جیاجیا بە شێوەی كۆمەڵ لە زۆر زیندانی جیای توركیاوە

دەهێنــدرانە ئەوێ. بەر لە ئــێمە بە هەفــتەیەك کۆمەڵەیەکیــان لە بەندیخانەی بارتنەوە بردبووە ئەوێ. لە کۆتایی باڵەخانەی زیندانی تایبەتی عەنتاب، گرتووخانەیەکی دیکەش هەبوو. ئەو تاوانبارانەی بە هۆی تاوانی کۆمەڵایەتییەوە سزادرابوون، لەوێ ئاخنرابوون.

سێ چوار ڕۆژ دوایی گواستنەوەمان، ڕۆژێك سێ سێ و چوار چوار، ئێمەیان بردەوە یەکەم شوێنی هاتنە ناو زیندان. لەوێ چەند وێنەیەکی مامەڵەیان گرتین. دوای ئەوەی وێنەی منیان گرت، یەکێك لە دەرکەوانەکان بە پلەی نەقیب، بە هێما بۆکردن بە گەنجێك گوتی "باشە ئەوە زانیمان ئەوانە لاون و هەندێك کار دەکەن، بەڵام ئەی تۆ چی؟ ئەرز و ئاسمان لەیەك بدا ٥-١٠ ساڵێکت لە تەمەن ماوە". ئەوسا تەمەنم ٤٥ ساڵان بوو.

دەرگای حوجرەکان داخراو بوون و کەس نەیدەتوانی سەردانی کەسی دیکە بکا. وەلێ ئەو حوجرانەی لەتەك یەك بوون، گیراوەکانی ناویان دەیانتوانی بە ئاسانی لەگەڵ یەك بدوێن. بەڵام ئەوانی دیکە، لەکاتی هێنانی ئاوی خواردنەوە لە بەلوعەکان، بە ئاسانی دەیانتوانی قسەبکەن. ئەدەبخانەکانیش لەناو حوجرەکان بوون.

نزیکەی ٤٥ ڕۆژ لەناو ئەو حوجرە تاکەکەسیانە ماینەوە. دواتر سێ سێ، ئێمەیان خستە چەند قاوشێکی جیا جیا. لەوێ ڕۆژێ بەدواوە، سێ سێ بەیەکەوە دەچووینە ناو هەواگۆڕکێ. لەوێش دەمانتوانی نزیکەی ٤٥ خولەك بمێنینەوە و هاموشۆ بکەین.

ڕۆژانە لە بەندیخانەی تایبەتی عەنتاب، ڕۆژنامەمان بۆ دەهات، بەڵام ڕێگایان بە هاتنی پەرتووك و گۆڤار نەدەدا. ئەمەش ببووە

هـۆی دروسـتبوونی نیقـاش لەنێـوان بەنـدكراوان و بەرپرسـانی گرتووخانە. وەلێ نەگەیشتینە ئەنجامێكی ئەرێنی. لە كاتێكدا ئەو پەرتووكـانەی لە گرتووخـانەی چەنەقەلەوەش لەگەڵ خۆمـان هێنابوومان، هەموویان لێوەرگرتبووین و خستیانە كۆگای زیندان. لە كاتێكدا لەوێ پەرتووكخانەیەك هەبوو، وەلێ زۆربەی كیتابەكـان تـایبەت بـوون بە ئەسپسـواری و زینـدەوەرزانی و هەنگەوانـی و كاروباری ڕستن و چنین؛ لە پاڵ ئەوان چەند ڕۆمانێكیش هەبوو. لەگەڵ چەند پەرتووكێكی لێكۆڵینەوە و توێژینەوە.

دەركەوانەكان هەندێك جار، چەند پەرتووك و كەتەلۆكیان لەناو سەبەتەیەك دادەنـا و، ئەو قـاوش و ئەم قـاوش دەگەڕان و بەسـەر گیراوەكانیـان دابەش دەكـرد. ڕۆژێـك لە كەتەلۆكێكیـان، وێـنەی پەرتــووكی (مێــژووی شارســتانی ئیســلامی)م بینــی، كە فوئــاد كۆپرولوو و ویلهێلم بارتۆلت بەیەكەوە ئامادەیان كردبوو. بۆیە بۆ ڕۆژی دواتـر داوای پەرتـووكەكەم كـرد، دوو ڕۆژ دواتـر بۆیـان هێنام.

هەڤاڵانی زیندان زۆر پەیوەست نەدەبوون بە خوێندنەوەی ئەو پەرتووكـانەی لە كتێبخـانەی ئەوێ هەبـوو. هەر بـۆیەش ئەو پرسـە لەسەر جۆرییەتی پەرتووكەكان بەردەوام وەكوو داوایەك پێشكەشی بەڕێوەبەرایەتی زیندان دەكرا.

ئێمە ئەو پەرتووكانەی وەرماندەگرت، دوای ماوەیەك ڕادەستی پەرتووكخانەمـان دەكــردەوە. بەڵام دوای ڕادەسـتكردنەوەی هەر كتێبێك، كـاتێكی زۆر تێدەپەڕی. ئەو پەرتووكەی لەسەرەوە باسـم كـرد، دوای خوێنـدنەوەی جـاری یەكەم، دیسـان داوام كـردەوە.

یەکێك لە دەرکەوانەکان دیسان بۆی هێنامەوە. چونکە پەرتووکی لە چەشنی ئەو زۆر کەم بوو. جاری دووەمیش لە ماوەیەکی کەم دیسان لە بەرگ بۆ بەرگم خوێندەوە و ڕادەستم کردنەوە.

ڕۆژێك سێ کەسمان لە قاوشەکە بەیەکەوە لە شوێنی هەواگۆڕکێ پیاسەمان دەکرد، لەگەڵ ئەوەی با و باران و بەفریش بوو. لە هەندێك شوێنی ئەوێ بەفر زەوی تەواو داپۆشی بوو و لە هەندێك شوێنیش ئیدی وردە وردە بەفر لەسەر زەویەکە ئەستوورتر دەبوو. لەناکاو دەنگێك "کاك ئیسماعیل .... کاك ئیسماعیل..." بانگی کردم. سەیری پەنجەرەی قاوشەکانم کرد هیچم نەبینی، بەڵام بە دڵنیایەوە هەستم بەوە کرد ئەوەی ناوم دەهێنێ دەبێ بمبینێ، لێ ئێمە نەماندەبینین. کابرا هەر بە دەنگ خۆی ناساند کە ناوی ئەرتوغرول کورکوچووە. پاشان بەو شێوەیە بەردەوامی دایێ "دوێنێ ئێوارە لە مەلادیوە ئێمەیان هێنا. ئێستا هەمووومان لە حوجرەی تاکەکەسین".

ئەوسا، قسەکردن و سەیرکردن لەگەڵ گیراوەکانی دیکەی قاوشەکانی تری ناو زیندان قەدەغەبوو. بۆیە هەر زوو چەند پاسەوانێك هاتن و پێیان ڕاگەیاندین کە لە یاساکانی زیندان دەرچوونە، بۆیە بەر لە تەواو بوونی وادەکەمان، ئێمەیان بردەوە قاوشەکانی خۆمان.

ئەو بەشەی لە قاوشەکە سێ کەسی لێبوو، شوێنەکە دوو نهۆمی بوو. بۆیە لەسەر و تەنیشتیشمانەوە قاوشی دیکە هەبوو. لە نێوان ئەو قاوشانەش ڕێڕەو هەبوو کە دەرگاکانی لێك جیا دەکردەوە. بەڵام برادەران بە بیانووی ئاو هێنان لە بەلوعەی ئاوی

نێوان قاوشەکان، بە ئاسانی دەیانتوانی پەیوەندی لەگەڵ ئەو یەك دوو قاوشەی تەك خۆمان ببەستن. هەروەها هەندێکجار بە مشت لە دیوار دانیش، جۆرێك لە پەیوەندی لەیەك ئاگاداربوونمان چێدەکرد. چونکە نەیاندەهێشت لە شوێنی هەواگۆڕکێ تێکەڵی یەکدی ببین.

ڕۆژێك ئێمەیان بردە حەمام. ئەو قاوشە هەشت نەفەریەی لە خوارەوە بوو، لەگەڵ ئێمە و چەند قاوشێکی دیکە بووینە بیست و چوار کەس. وەلێ نەمانتوانی هەموومان لە دەوری تاسی ئاوی حەمامەکە بە کۆمەڵ گرد بینەوە و خۆمان بشۆرین. بەڵکوو دوو دوو سێ سێ ئێمەیان لەچەند ژوورێکی جیای خۆ شۆرین کرد. هەر کەسێکیش دەبوو بە تەنیا بچێتە ژوورەوە، لە ماوەیەکی کورت خۆی بشوا و پاشان ئەوەی پاشتر بچێ.

بە هۆی کولاّوی ئاوەکەوە، هەرزوو دەنگی هات و هاوار بەرز بۆوە و دەیانگوت "ئاوەکە زۆر کولاّوە و ناتوانین خۆمانی پێ بشۆین، هەندێك ئاوی ساردیش بکەنەوە". دوای ئەو داواکارییە، ئاوی ساردیشیان کردەوە. بەڵام ئەوجارە هەرا و هۆریا لە جاری پێشوو زیاتر بوو، بۆیە دەنگیان بەرزکردەوە "ئاوەکە زۆر ساردە و ئاوی گەرم بکەنەوە". هەرچۆنێك بێ نیوەی کاتەکەمان بەو کێشەیەوە تێپەڕی. چونکە بە ئەنقەست، ئاوێکی شلتێنیان نەدەناردە ناو بەلوعەکان، بەڵکوو دەمێك تەنیا ئاوی گەرمیان دەکردەوە و دەمێکیش تەنیا ئاوی سارد. بۆیە کەسمان نەمانتوانی بەکامی دڵ خۆمان بشۆین.

کارگێڕی زیندان دەیانویست هەندێك مامۆستای چاکسازی بۆ

گیراوە سیاسییەکان بنێرن، بە مەبەستی چاکسازیکردنیان. وەلێ بە هیچ شێوەیەك هیچ کات، قبووڵی هاتنی ئەو مامۆستایانەیان نەکرد. جا کە دەشهاتن، نەیاندەهێشت بێنە ناو قاوشەکانەوە، بەڵکوو هەر لەبەر دەرگا هەندێك دەمەتەقێی سەر پێی دەکرا. ڕۆژێك، کاتێك لە شوێنی هەواگۆڕکێ هاوموشۆم دەکرد، یەکێك لەو مامۆستایانە هاتە تەك من و دەستی بە پیاسەکردن کرد. هەر زوو پێی گوتم "ئەگەر بەڵێنی پاراستنی ئەو نهێنیە بدەی، دەمەوێ شتێکت پێبڵێم و شتێکیشت پێ پیشان بدەم". پاشان بەندێك نامەی پیشان دام. مەکتووبەکان ئەوانەبوون کە بۆ من هاتبوو، بەڵام کارگێڕی زیندان پێی پیشان نەداوم. پاشان مامۆستاکە بەو شێوەیە بەردەوامی بە ئاخافتنەکەیدا "نامەیەکی ئێجاگار زۆرت، لە ئەورووپاوە بۆ دێت. وەلێ هیچیان بە تۆ پیشان نادرێ". ئەوانەی پێی پیشان دام، چەندان نامە بوون کە لەلایەن کەسایەتیی جیاواز و سیاسەتمەدار و دەوڵەتمەداران و چالاکوان و ڕۆژنامەڤان و سەرۆکی ڕێکخراوە ناحکومیەکانی ئەورووپاوە نێردرابوون.

لەناو هەندێك لەنامەکاندا، چەند نموونەیەك لەو نامانەش هەبوو کە سەبارەت بە من بۆ دەوڵەتی تورك و سیاسەتمەدارانی نێردرابوو. پاشان مامۆستاکە گوتی "تکایە داوای ئەو نامانەم لێمەکە، چونکە بە نهێنی هێناومە تا پیشانتی بدەم و پاشان دەیانخەمەوە شوێنی خۆیان" منیش بە خێرایی دوایی ئەوەی سەیری نامەکانم کرد، هەموویم داوە مامۆستاکە. جا ناوەناوەش ئەوانەی سەردانیان دەکردم، باسی هەندێك لەو نامانەیان بۆ دەکردم.

ئەو پەرتووکەی فوئاد کۆپروولوو بەناو (مێژووی شارستانیەتی ئیسلامی) کە لەسەرەوە ناویم هێنا، جارێکی دیکەش داوام کردەوە. بەڵام لە ترسی ئەوەی هەندێك نهێنی و هێمای تایبەتی تێدا جێگریر دەکەم، جاری سێیەم بۆیان نەهێنام. لەکاتێکدا لە بەندیخانەکەماندا جگە لە من کەسی دیکە داوای پەرتووکی نەدەکرد. چونکە برادەران خۆشیان لە کتێبەکانی زیندان نەدەهات.

لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٨٥، ناخۆشیەکانی نێوان بەندکراوان و کارگێڕی بەندیخانە کەمی کرد. ئیدی سەردان و هاموشۆی نێوان قاوشەکانیش ئاسایی کرایەوە و هەڤدوو بینینی کراوەش لەگەڵ میوانان ڕێگای پێدرا. لەگەڵ کاك ئیسماعیل ئۆزکان، لەمانی خێزانم و عومران چەند جارێك سەردانیان کردم و یەکدیمان بینی. لەناو یەکێك لەسەردانە کراوەکاندا، دکتۆر مینو ئینکایاش هاتە لام. جارێکیش کاك موحسین شاڤاتاش هاتە لام، کە یەکێك بوو لە گیراوانی دۆسیەی چل و نۆکان[1]. کاك موحسین ئەو ڕۆژە

---

[1] مووسا عەنتەر لە پەرتووکی (بیرەوەریەکانم) بەم شێوەیە باس لە ڕووداوی چل و نۆکان دەکات: دوای ئەو کودەتایەی دژی پارتی دیموکرات کرا، بەپێی ئەو ڕاپۆرتەی دەستمان کەوت، کە لەلایەن ئاڤجی ئۆغلووەوە لە گۆڤاری (یۆن) بڵاوکراوە، جەلال بەیار و جەودەت سونای تورانجیی جێگری سوپاسالار و تەوفیق ئیلەری وەزیر و عەدنان مەندەرێسی سەرۆکوەزیران و فاتن ڕووشتووی وەزیری دەرەوەی تورکیا، کۆدەبنەوە. ئەرگوون گۆك دەنیزی بەڕێوەبەری بەشی کێشەی کورد لە ئاسایشی نەتەوەیی تورکیا، ڕاپۆرتی ئامادەکراوی خۆی دەخوێنێتەوە، کە بە شێوەیەکی گشتی سەرە قەڵەمەکانی بەو شێوەیە بوو:

١- گەر لە تورکیا هەزار ڕووناکبیری کورد لەناو ببەین، بەلای کەمەوە کێشەی کورد ٣٠ ساڵ دەچێتە دواوە.

٢- لە ئۆپەراسیۆنەکان، کاتێك ڕووناکبیرەکان دەستگیر دەکەین، دەبێ لە ژێر ناوی کۆمۆنیست بوونیان ئەو کارە بکرێ، چونکە کورد حەزیان بە =

کۆمۆنیستەکان نییە و پشتگیریان ناکەن.
٣- نابێ ئەو کەسانەی لە پاڵ پارتێکی سیاسی بەهێز کار دەکەن، بکەونە ناو چوارچێوەی ئۆپەراسیۆنەکە.
دوای خوێندنەوەی ڕاپۆرتەکە، جەلال بەیار و جەوودەت سونای دەڵێن زۆر باشە، جەلال بەیار، بە پشتبەستن بە تەجرووبەکەی دێرسیمی، دەڵێ: "پێویستە لە ڕەگەوە لەناویان ببەین". تەوفیق ئیلەری دەپرسێ: "برادەرینە ئێوە من دەناسن و دەزانن دۆستی کورد نییم، بەڵام ئەگەر ئۆپەراسیۆنێکی ئاوا بکەین، ئامان، کوردستانیش وەك جەزایری لێنەیەت؟" چونکە (ئەوسا لە جەزائیر شەڕ و پێکدادانێکی زۆر بە هێـز لە نێـوان فەڕەنسـا و شۆرشـگێڕە جەزائیرییەکـان هەبـوو بـۆ ڕزگـارکردنی وڵاتەکەیان). لە وەڵامدا فاتین ڕوشتوو زۆرڵوو دەڵێ: "شتی وا چۆن دەبێ؟ من لە ئێستاوە دەست لەکار دەکێشمەوە، خۆمان لە دەرەوە چاو و ڕووی ئەوەمان نییە سەیری کەس بکەین، کۆمەڵکوژیی ئەرمەن و ڕووم و کوردمان بەچاو دادەنەوە، ئێســتا، کە خەریــکە ئەو برینــانە قەتمــاغە دەگــرن، نــاتوانین بەرگــری لە کۆمەڵکوژییەکی دیکەی لەو شێوەیە بکەین". تەنیا عەدنان مەندەرێس دەمێنێتەوە، ئەویش دەڵێ: "باشە برادەرینە بەپێی ڕاپۆرتی ئەمنییەت بێ، ئەو تاوانانەی باسیان کردووە، سزاکانیان لە سێدارە دانە، مادەم وایە با ئێمە سەرەتا ٥٠ کەسیان لێ دەستگیر بکەین و بیاندەینە دادگا و بە بڕیاری دادوەریش لە سێدارەیان بدەین، بەو شـێوەیە ئەگەر هەر جـارە و ٥٠ کەسـیان بگـرین و لە سـێدارەیان بـدەین، لە مـاوەیەکی کەم ئەو هەزار کەسـە کۆتـایی پێـدەهێنین"، هەمـوو بڕیـار لەسـەر ئەو بۆچوونە دەدەن.
بەر لە هەمـوو شـتێك، دادگـای سـەربازیی ئەنـقەرە، بەیـانی دەسـتگیرکردنی ٥٠ کەس دەردەکـا، بەبـێ ناوهێنـانی هـیچ کەسـێك. دواتـر لیسـتەکە دەداتە ئاسایشـی نیشتمانیی تورکیا، تا ئاسایشی نیشتمانی ناوی کێ لەو لیستە ٥٠ کەسیە بنووسێ، سەرەتا ئەوان دەستگیر بکەن. لە ئیستانبوڵ، شوێن بۆ ئەو کەسانە ئامادە کرا کە بڕیـار بـوو دەسـتگیر بکـرێن. لە سـەردەمی عوسـمانییەکاندا لە پشـت باڵەخـانەی "حەربییە"، لە شـوێنی خوێنـدنی زسـتانەی قوتابیـانی قوتابخانەکە، هۆڵێکی داخراو هەبوو، لەوێ بە قەبارەی یەك مەتر و دوو مەتر، نزیکەی ٤٠ ژووری داخراویان دروستکرد. دوای تەواوی بـوونی شـوێنەکە لە ١٧ی مـانگی دوازدەی، ١٩٥٩ کە ئێمە ئەو ڕۆژمان بە (شەبی ئاروز) ناودەهێنا کە ڕۆژی کۆچی دوایی مەولانەیە، لە تەواوی تورکیـا، مـن و برادەرەکـانم دەسـتگیرکراین. سـەیریان کـرد ٥٠ کەسـیان دەسـتگیر کـردووە، بەڵام ژوورەکـان ژمارەیـان ٤٠ دانەیە. دوای چەنـدان سـاڵ، کە چووینە بەردەم دادوەر ٤٩ کەس بووین، بۆیە بەو ڕووداوەیان دەگوت ٤٩یەکان،
=

هاتبووە سەردانی باهۆز شاڤاتای کوڕی.

لەو بەشەی باسی ئیحسان کاچمازم کرد، باسم لەوەش کردبوو بە هۆی زیان گەیاندن بە ماڵ و موڵکی میری، لە زیندانی چەنەقەلە دۆسیەیەکمان لەسەر کرابوووە. ئەوان دۆسیەکەیان ناردبووە غازی عەنتاب، بۆیە ڕۆژێك ئێمەیان بردە دادگای شارەکە. نزیکەی هەشتا نەفەرێك دەبووین. ئەگەر هەڵە نەبم یەکەمین مانگی ساڵی ١٩٨٧ بوو. هەمان ساڵ ڕێکخراوێکی ئوستوراڵی لە وڵاتەکەیان، منیان بەربژێری وەرگرتنی خەڵاتی نۆبڵ کردبوو بۆ ئاشتی. کاتێك لە ترومبێلەکان دابەزین تا بەرەو دادگا بچین، میدیاکارانیش لەوێ بوون. بۆیە لە نێوان دەرگای ترومبێل

---

هۆکارەکەشی ئەوە بوو، ئەمین باتووی هاوشاریم، قوتابی پۆلی سێیەمی کۆلێژی یاسا، لە زیندان کۆچی دوایی کرد. بۆیە، ٤٩ کەس ماینەوە. کە ئازاد کراین چوومە ژوورەکەی ئەمین، بە خوێنی خۆی لەسەر دیوارەکانی ئەمەی نووسیبوو: "گەر سەرپشك بم لەوەی، ئایا دەمەوێ ببمە گوڵی باخچەی کۆیلایەتی، یان دڕکێك لە باخچەی ئازادی؟ بە دڵنیاییەوە ئەوەی دووەمیان هەڵدەبژێرم". ئەوانەی لەو ئۆپەراسیۆنەدا دەستگیرکران هەریەکە لە (مووسا عەنتەر، یاشار کایا، شەوکەت توران، ناجی کوتلای، عەلی کەرەهان، کۆچۆ ئەلیستان، یاڤووز چاملی بەل، محەمەد عەلی دینلەر، یوسف کاچار، نورەدین یلماز، زیا شەرەفخان ئۆغلوو، مەدەت سەرحەد، حەسەن ئاکوش، ئۆرفی ئاککۆینلوو، سەلیم کلچئۆغلوو، شەهابەدین کەپچی ئۆغلوو، سەعید ئەلچی، سەعید قرمزی تۆپراك، فایەق ساڤاش، حەیدەر ئاکسوو، زیا ئاجار، فازیل بوداك، خەلیل دەمیرڵ، فەریت بیلەن، ئەسەد جەمیلئۆغلوو، موستەفا نووری، فەوزی ئاڤشار، نەجاتی سیاکەن، حەسەن ئولووس، نەزمی باڵکاش، حوسێن ئۆغووز، محەمەد نازم، فەوزی کارتاڵ، محەمەد ئایدەمیر، عەبدولڕەحمان ئەفەم دۆلاك، جانب یلدرم، ئەمین کۆتان، ئۆککاش قەرەداغ، موحسین شاڤاتا، تورگوت ئاکن، سدقی ئەلبستان، شەرەفەدین ئەلچی، مستەفا رامانلی، فەیزولا دەمیرتاش، جەزمی باڵکاش، خاڵس یۆکوش، عیسمەت باڵکاش، سەید بینگۆڵ). (وەرگێڕ).

و دەرگـای چـوونە ژوورەوەی دادگـا، ڕۆژنامەڤانەکـان پرسـیاری هەستی منیان کرد سەبارەت بە بەربژێرکردنم بۆ وەرگرتنی خەڵاتی نۆبلی ئاشتی.

دوای وەرگرتنـی ناسـنامەکانمان و پێـداچوونەوە بە ئیفادەکـانی زیندانی چەنەقەلەمان، دووبارە لەوێش هەمان پرسیار و وەڵامیان لەگەڵ کـردینەوە. وەلـێ هـیچ پێشـهاتێك لەسـەر دۆسـیەکە ڕووی نەدا، پێم وابێ دواتر فایلەکەیان داخست.

ساڵی ١٩٨٧، کاتێك ئازادکرام، هەریەکە لە پارێزەر سەرحەد بوجـاك و ئومێـد فـورات و ئایـدن کـۆیمەن و چەنـد برادەرێکـی ڕێکخراوی ڕزگاری، لەبەر دەرگا لە چاوەڕوانی مندا بوون. هەمان ڕۆژ پارێزەر ئالپ ئاسلان یامان کاتێك لە مووشەوە دەیەوێت بێتە عەنتاب، لە ڕێگا تووشی ڕووداوێکی ترومبێل ببوو. لە دەرگای دەرچـوون چەنـد ڕۆژنامەڤـان و میـدیاکارێك لەوێ بـوون، بیـرمە سـەبارەت بە دۆخـی کـورد و حـاڵ و ژیـانی زینـدان، وەڵامـی پرسـیاری میـدیاکارەکانم دەداوە، لـێ سـەرحەد بوجـاك تکـای لە ڕۆژنامەڤانەکـان کـرد تـا لێدوانەکانم تۆمار نەکەن، لـێ پێم گوتن هیچ کێشەیەك لەوەدا نییە ئەگەر بیانەوێت وەڵامەکانم بنووسنەوە و دواتر بلاوی بکەنەوە. چونکە ئەو ئەفسەرەی بەرپرسی پاراستنی زیندانەکە بوو، زۆر قەڵس ببوو بە ئاخافتنەکەم.

لەوێ منیـان بـردە بەڕێـوەبەرایەتی پۆلیسـی عەنتـاب، ئەوسـا پارێزگـاری شـارەکە عەبـدولقادر ئاکسـوو بـوو. لە بەڕێـوەبەرایەتی پۆلیس، لێکۆڵینەوەی ئەوەیان لەگەڵ کردم، ئاخۆ ماوەی سەربازیم کـردووە یـان نـا؟ ئیـدی دوای ئەو پرسـیار و وەڵامـانە ئازادیـان

کردم. بیرمە هەمان ڕۆژ کاتێك لە یەکێك لە باخچەکانی ناو شار لەگەڵ برادەران دانیشتبووین، جەلال دۆغانیشم[1] لەوێ بینی.

چەند مانگێك دوای ئازادکردنم، لە ئەنقەرە هەواڵێك بڵاو بۆوە لەسەر ئەو ئەفسەرەی لەلێدوانەکانی بەردەرگای زیندانم جاڕز ببوو. ئەو لەگەڵ پاسەوانێکی دیکە، کە برای خۆی بوو، لەسەر ئەوە دەستگیرکرابوون کە ماددەی هۆشبەریان بە نهێنی و بۆ فرۆشتن بردۆتە ناو زیندان. دوای ئەو، هەواڵێکی دیکەم خوێندەوە لەسەر ئەوەی ئەو سەرپاسەوانە لە زیندان کۆچی دوایی کردووە. جا ئەو کەسە هەمان ئەو کەسە بوو کە لە کاتی چوونە زیندان، ئەو دەمەی وێنەی مامەڵەکردنیان دەگرتین و پێی گوتم "قەینا ئەوانە گەنجن، بەڵام تۆ چی، ئەو پەڕی ١٠-١٥ ساڵێکت لە تەمەن ماوە" جا ئەو کابرایە هەر لە هەمان زیندان کۆچی دوایی کرد.

---

[1] جەلال دۆغان، لە دایك بووی ساڵی ١٩٤٣ی قەزای بەلقیسە لە باکووری کوردستان. سیاسەتمەدار و پارێزەر و وەرزشڤان، لە نێوان ساڵانی (١٩٨٩-٢٠٠٤) سەرۆکی شارەوانی عەنتاب بوو، جگە لەوەی لە سێ خولی جیاوازیش پەرلەمانتاری تورکیا بووە. جەلال دۆغان بەوە دەناسرێت زوو زوو لەم پارتەوە دەچێتە پارتێکی دیکە، بۆیە تا ئێستا چوار پارتی سیاسی گۆڕیووە. (وەرگێڕ).

## ئیسماعیل ئۆزکان - ئەو دەرگایانەی لە زیندانەوە بە ڕووی دەرەوە دەکرێنەوە

بەندیخانەی تایبەتی عەنتاب تازە کرابۆوە. پێم وابێ یەکەم کۆمەڵە لە زیندانی چەنەقەلەوە چوونە ئەوێ. دواتر دەستەیێك لە شاری بارتنەوە هێندرانە ئەوێ. ئێمەیان خستبووە چەند حوجرەیەکی تاکەکەسی. ئەو ئینفرادییانە لە هەموو ڕوویەکەوە خراپ بوو، بەڵام تاکە شتی باش، بوونی ئەدەبخانە بوو لەناو حوجرەکەدا. شوێنی هەواگۆڕکێ زۆر پان و پۆڕ بوو. وەلێ هەموومانیان بەیەکەوە نەدەنارده ئەوێ. ماوەی مانەوەشمان تەنیا ١٥ خولەك بوو. هەڤاڵان هەر لە ڕۆژی یەکەمەوە، لە ڕێگای هێنانی ئاو لە بەلوعەکانەوە لە ڕێگای بەکارهێنانی بۆڕیەکانی ئەوێ، دەستیان بە هەواڵ گۆڕینەوە کرد.

لەیەکەم ڕۆژەوەش پێیان گوتین بە هیچ شێوەیەك ناتوانن پەرتووك و گۆڤار لەگەڵ خۆتان ببەنە ژوورەوە. برادەران زۆر پێداگریان لەسەر ئەو پرسەکرد، وەلێ بەرسڤێکی ئەرێنیان وەرنەگرت. لە کاتی چوونمان بۆ ئەوێ، کۆمەڵێك پەرتووك و گۆڤارم لەگەڵ خۆم بردبوو، بەڵام ئەوان هەموویان لێوەرگرتم و لەناو گونیەیەکیان نا و تووریان هەڵدا کۆگای بەندیخانەکە. لە ترسی ئەوەی پەرتووکەکان تێك دەچن، بە بەڕێوەبەرایەتی زیندانم گوت دەتوانم پەرتووکەکانم بنێرمەماڵەوە، نەشمدەتوانی چاوەڕوانی هاتنی لەمانی خێزانم بکەم تا لەگەڵ خۆی بیباتە ، چونکە لەمان درەنگ سەردانی دەکردم؛ ئەگەر بشهاتبا

نەیدەتوانی ئەو فەردە کیتابە لە گەڵ خۆی بباتەماڵەوە. لەگەڵ خوالێخۆشبوو جەمال ئۆزکان حوجرەکانمان لەپاڵ یەکدی بوو. ئەو دۆخەم لە جەمال گەیاند، ئەویش لە وەڵامدا گوتی "بە باوکم دەڵێین و ئەویش دەیبا".

ئیسماعیل ئۆزکانی باوکی جەمال ئۆزکان زوو زوو دەهاتە زیندان. هەموو هەفتەیەك لە ڕۆژانی سەردانیکردن لە بەندیخانە بوو. یەکێك لە ڕۆژەکان، جەمال دۆخەکەی بە باوکی گوتبوو. ماوەیەکی کورت دواتر باوکی جەمال فەردە پەرتووکەکەی بردبووە ئەنقەرە و گەیاندبوویە ماڵەوەمان. ئیدی کیتابەکانمی بەو شێوەیە دەرباز کرد، چونکە ئەوە کارێکی مەترسیدار بوو؛ بەوپێیەی ئەوسا، کیتاب لە چەك بە ترستربوو. بۆ من کارێکی زۆر گەورە و شایەنی ستایش بوو. کاك ئیسماعیل هەر بەوە نەوەستابوو، بەڵکوو چەند جارێك لەگەڵ خۆی، لەمانی خێزانیشمی هێنا سەردانم.

***

لە ١٥ تەمموزی ٢٠٢٠، لە ئەنقەرە، دەمەو ئێوارە لە خاڵی وەستانی ساناتۆریۆم، لە چاوەڕوانیدا، کاتێك چاوم لە ڕێگای هاتنی پاس بوو، تەلەفۆنێکم بۆ هات. سەیری تەلەفۆنەکەم کرد، حەسەن حوسێن ئۆزکان بوو، پەنجەم بە دوگمەی مۆبایلەکەمەوە ناو و لەو سەری تەلەفۆنەکەوە، کاك حەسەن بە حوزنەوە هەواڵی کۆچی دوایی کاك ئیسماعیلی پێڕاگەیاندم. دیار بوو دوو هەفتە بوو کۆچی دوایی کردبوو و بەخاك سپێردرابوو. کە مۆبایلەکەم خستەوە باخەڵم، وەك شریتی فیلمێك، چاکە و گیان فیدایی کاك ئیسماعیلم بیرکەوتەوە بەرامبەر بەخۆم.

## "پێڵووەکانم دادەخەم، لێ ناخەوم"

لە نێوان سالآنی ۱۹۸۲-۱۹۸٤ لە گرتووخانەی چەنەقەلە بووم. لەو ماوەیەدا زۆر بوویەر ڕوویانـدا. دوای هەر ڕووداوێکیش، قاوشەکانیان دەگۆڕین. تا ئەو کاتەی دەرچووم لە چەندان قاوشی جیاواز مابنەوە. بۆ نموونە لە D۸D-D۹-۱۳.

چارپاکانی قاوشی ۱۳D سێ قاتی بوون. لەوێ، لە قاتی سێیەمی یەکێك لە قەروێڵەکان، لەکەنار جامی قاوشەکە دەمامەوە. جەلال ئۆزکانیش یاتاغەکەی لە تەك ئەوەی من بوو؛ لە قاتی سێیەمی چارپاکەی تەنیشتم. بیرمە هەوڵی دەدا لە ڕێگای کۆلکە دارێکەوە ئامێرێکی ساز بۆخۆی دروست بکات، بۆیە ڕۆژ تا ئێوارە بەوەوە سەرقاڵ بوو.

برادەرانی دیکەی ناو قاوشەکە، چەند جارێك پێیان گوتم "کاك ئیسماعیل، ناوە ناوە، لەسەر جێگاکەی خۆت هەر لەسەر گازەرەی پشت، سەرە خەوێکی دەشکێنی" منیش لە وەڵامدا دەمگوت "نا برا، تەنیا پێڵوەکانم دادەخەم، ئەگینا ناخەوم".

یەکێك لە ڕۆژەکانی مانگی دەی ساڵی ۱۹۸٤، لە هەواڵەکانی نیوەڕۆی تەلەفزیۆن، باس لە نووچەیەك کرا، گوایە لە دەوروبەری شاری سیرت، پێکدادان لە نێوان گەریلا و هێزەکانی ئاسایش ڕوویداوە. هەروەها باس لەوەش دەکرا، لە گەشتی هەواڵەکانی ئێوارە، وردەکاری زیاتر سەبارەت بە نوچەکە بلاودەکرێتەوە.

هەر لەسەر بالینگانەکەی خۆمەوە، لە قاتی سێیەمی چارپاکەم چاوەڕوانی هاتنی گەشتی هەواڵەکانی ئێوارەم دەکرد. چەند خولەکێك پێڵوەکانم لێکنا. کە چاوم کردەوە بینیم جەمالیش لە شوێنەکەی خۆیەتی و بە چار مشقی لێی دانیشتووە. لێم پرسی "جەمال هەواڵەکان دەستی پێکرد؟" وەڵامی دامەوە "نزیکەی نیو دەمژمێر دەبێت کە هەواڵەکان خوێندرانەوە و تەواو بووە". ئیدی دوای ئەوە زانیم، برادەران ڕاستیان کردووە و منیش جار بە جار سەرەخەوێکی باشم شکاندووە.

## ئیسماعیل بێشکچی ئازاد بکەن

مانگی دووی ساڵی ١٩٨٧ لە بەندیخانەی عەنتابی تایبەت بووم. لەوێ دەمێ، سێ سێ لە حوجرەیەك دەمانەوە. جگە لە من، هاشم کوتلوش لە حوجرە لەگەڵم بوو. کەسی سێیەم، گەنجێکی نزیك لە بۆچوونە سیاسییەکانی هاشم کوتلو بوو. یەکێك لە ڕۆژەکانی ناو حوجرەکەماندا، هەواڵێکی کورتم لە ڕۆژنامەی (حوریەت) بینی، کە باسی لەوە دەکرد، لە دەوروبەری شاری سلێمانی، چوار ئەندازیاری تورك کە لە دروستکردنی بەنداو کاریان دەکرد، لەلایەن پێشمەرگەوە دەستگیرکراون و فەرماندەی پێشمەرگەکانیش جەلال تاڵەبانییە. بەرامبەر بە ئازادکردنی ئەو چوار ئەندازیارە تورکە، چەند داواکاریەك لە حکوومەتی تورکیا کرابوو، یەکێك لە داخوازیەکان بریتی بوو لە ئازادکردنی ئیسماعیل بێشکچی. ئەوسا کۆمپانیایەکی تورك دروستکردنی بەنداوەکەی لە ئەستۆ گرتبوو.

هەواڵەکە بووە هۆی حەپەسانم، لەگەل ئەوە تووشی

دڵەڕاوکێش بووم. بیرم لەوە کردەوە ئەگەر سەبارەت بەو هەواڵە منیان بانگهێشتی بەڕێوەبەرایەتی زیندان کرد، دەبێ چی بڵێم؟ چونکە بە هۆی نووسینی چەند نامەیەك بۆ سەندیکای نووسەرانی سویسرا و هەندێك پەرتووکی نووسراوم، لە ساڵی ١٩٨١ وە لە زیندان بووم. بە هۆی ئەوەی سزای ئەو دادگایی کردنەم لە ساڵی ١٩٨٧ تەواو دەبوو، پاشان ئازاد دەکرام. هەتا ڕۆژی ئازادکردنەکەشم ئاشکرا کرابوو. جا دوای تەواو بوونی ئەو زیندانەش، سزای ڕاگواستنم دەستی پێدەکرد، کە پێیان دەگوت گرتن لە ژێر چاودێری ئاسایشی گشتی. بڕیار بوو دوای ئازادکردنم دوو ساڵ ڕاگوێزرێمە چەنەقەلە. لەگەڵ ئەوەی هەندێك پێشهات هەبوون سەبارەت بە هەڵگیرانی سزای ڕاگواستنەکەم لە ساڵی ١٩٨٧. بۆیە ئەو هەواڵە دەکرا تەواوی ئەو پێشهاتانە سەرەوژوور بکاتەوە.

بیرمە، هاشم کوتلو دوای خوێندنەوەی نووچەکە گوتی "کاك ئیسماعیل، کەمێکی دیکە بانگی بەڕێوەبەرایەتی زیندانت دەکەن. لەوێ هەوڵی ئەوە دەدەن لە ڕێگای دروستکردنی پاڵەپەستۆوە لێت بپرسن، داخۆ ئەو کەسە زیانبەخشانە لە کوێ دەناسی و چۆن چۆنی ئەو پیلانەتان داڕێشتووە؟ هەروەها لە ڕێگای کێ پەیوەندیت لەگەڵ ئەواندا بەستووە؟ بۆیە بۆ وەڵامی ئەو پرسیارانە لە ئێستاوە بیر بکەوە و بەرسڤێکیان بۆ ئامادە بکە".

من لە چاوەڕوانیدا بووم، بەڵام هیچ کەسێك منی بانگهێشتی بەڕێوەبەرایەتی زیندان نەکرد. ڕۆژی دواتریش هەندێك وردەکاری دیکەم لە هەمان ڕۆژنامە سەبارەت بە هەمان ڕووداو کەوتە بەرچاو. پێم وابێ بەبێ ئەوەی بە نوچەکە بزانن ڕووداوەکە لە بیرکرا. بۆیە منیش لە ماوەی دیاری کراوی خۆم ئازاد کرام.

ئەها لەسەرەوە باسم لەوە کرد هیچ پەرتووکێك نەدەهاتە ناو بەندیخانەی عەنتابی تایبەت، بۆیە سوودمان لەو کیتابانە دەبینی کەلەناو پەرتووکخانەی زیندانەکە هەبوو. بەڵام هەموو ڕۆژێك ڕۆژنامەی تازەیان بۆ دەهێناین. بەڵام دوای ئەوەی چەند شوێنێك، یان نوچە و ڕاپۆرتێکیان دەبڕی، پاشان پێیان دەداین. بۆ نموونە هەر هەواڵێك سەبارەت بە شۆڕش و سەرهەڵدانەکانی ناو زیندانەکان و ڕێکخراوە ڕاست و چەپەکان با، دەبڕدرا. جا کاری هەرە لە پێشینەی ژووری خوێندنەوەی نامەکانی زیندان ئەوە بوو. ئەو هەواڵەی لەسەرەوەش باسم کرد، بە هۆی ئەوەی بە چەند دێڕێکی کورت، لە نێوان چەند ستونێکی وتاردا بڵاوکرابۆوە، بۆیە نەیانبینی بوو و هەستیان پێنەکردبوو، هەر بۆیەش نەبڕدرابوو.

***

دوای ئەوەی دەستم بە چەند گەشتێك کرد بۆ دەرەوەی تورکیا، لە یەکێك لە سەردانەکانم بۆ شاری سلێمانی، ئەو بویەرەم لەگەڵ برادەرانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان باسکرد و بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕانەوە. وەلێ وەڵامێکی پێویستم لەو بارەیەوە چنگ نەکەوت.

لە ڕۆژی ٢٢ تا ٢٩ مانگی یازدەی ساڵی ٢٠١٥، بۆ کردنەوەی نوێنەرایەتی وەقفی ئیسماعیل بێشکچی لە هەولێر بووین. دوای کردنەوەی وەقفەکە چووینە لای وەزیری ڕۆشنبیری، لەوێ باسمان لە کردنەوەی وەقفی بێشکچی دەکرد. ئەوسا خالید دۆسکی وەزیری ڕۆشنبیری بوو.

یەکێك لە بەرپرسانی وەزارەت، لەناو کۆمەڵێك لە برادەران، کاتێك مژوولی دەمەتەقێ بووین، گوتی دەمەوێ باسی

ڕووداوێکتان بۆ بکەم، کە دەمێکە ویستی گێڕانەوەیم هەیە، لە کاتێکدا ئەو ڕووداوە دەمێك بوو هۆشی منیشی بە خۆیەوە سەرقاڵ کردبوو. پاشان ئەو برادەرە بەو شێوەیە ڕووداوەکەی گێڕاوە: "ساڵانی هەشتاکانی سەدەی بووری، پێشمەرگە بووم، بە فەرماندەیی جەلال تاڵەبانی لە دەوروبەری سلێمانی خەریکی بەرخودان و شۆڕش بووین. ئەوسا تورکیا لە ناوچەکە خەریکی دروستکردنی بەنداوێك بوو؛ هەموو کرێکار و ئەندازیارانیشی تورك بوون. ڕۆژێك چوار ئەندازیاری تورکی بەنداوەکەمان دەستگیرکرد و هێنانمانە لای خۆمان. دواتر ئاگادارییەکی کراوەمان بۆ حکوومەتی تورکیا بلاوکردەوە؛ لەوێ جەختمان لەوە کردبۆوە، ئەو ئەندازیارانە ئازاد ناکرێن، تا ئیسماعیل بێشکچی لە زیندان سەربەست نەکرێ، لەگەڵ ئەویش دەبێ سەرجەم گیراوە سیاسییەکانی دیکەش بەربدرێن". دوای گێڕانەوەی بەسەرهاتەکە، ئەو برادەرە ڕووی لە من کرد و گوتی "کاك ئیسماعیل هەواڵێکتان لەو ڕووداوە هەیە؟" منیش بە بەڵێ وەڵامم داوە.

کاتی خۆی زۆر حەزم کرد بوویەرەکە لەگەڵ جەلال تاڵەبانی باس بکەم، وەلێ نەبووە دەرفەت ئەو مژارە بەیەکەوە شەن و کەو بکەین. بەڵام ئەوانەی لە ئۆفیسی جەلال تاڵەبانی لە سلێمانی کاریان دەکرد، ئاگاداری مژارەکە بوون.

ئەو بەسەرهاتەی ئەو پێشمەرگەیە بەسەری هاتووە لە ساڵانی هەشتاکان و ئێستاش وەك بەرپرس لە وەزارەتی ڕۆشنبیری کار دەکا، لە میدیاکانی تورکیا وەکوو نوچەیەکی کورت شوێنی پێدرا. بەڵام ئەو ڕووداوەی ماوەیەکی زۆر بوو هۆشی منی بە خۆیەوە مژوول کردبوو، بەو شێوەیە، بە تەواوی ڕاستی و دروستییەکەیم بۆ دەرکەوت.

ئیسماعیل بێشکچی و کۆمەڵێك لە هاوڕێیانی، لە زیندان.

دادگای ئاسایشی دەوڵەتی ئیستانبوڵ. ساڵی ۱۹۹۰، ئەرشیفی ئومێد فورات

# بەشی حەفتەم
# ئەو ئازادییەی کورتی خایەند نەوەدەکان و دووبارە نووسینەوە و دووبارە دادگاییکردن

## پەرتووکەکان و وەشانخانەکان و ڕیزە دۆسیەیەکی دادگا

لە ناوەڕاستی حەفتاکانی سەدەی بووری، وەشانخانەی کۆمەڵ، پەرتووکەکانمی بڵاو دەکردەوە. کتێبی (ڕێکارە زانستییەکان، دۆسیەی ئیسماعیل بێشکشچی لە ڕۆشنایی ئازادی زانکۆ و بنەماکانی کۆمەڵگای دیموکرات، بە زۆر نیشتەجێکردنی کورد، تیۆری مێژووی تورك، تیۆری زمانی ڕۆژ و کێشەی کورد، کارنامەی پارتی گەلی کۆماریی ١٩٢٧ و کێشەی کورد) لەوانە بوون کە لەوێ دەمێدا بڵاوبوونەوە. سەبارەت بە سێ پەرتووکی دوایی، لە دادگا دۆسیەم لەسەر کراوە. لەو دۆسیانەدا، لەگەڵ من، ڕەجەب مارشاڵی بەڕێوەبەری وەشانخانەی کۆمەڵیش دادگایی کرا. لە دانیشتنەکانی دادگادا، بەرگرینامەیەکی سیاسی بۆ دۆسیەکانمان کرا. ساڵی ١٩٧٠ لەسەر نووسینی وتاری (ژێرخانی پشتگوێ خراوی ڕۆژهەڵات) کە لە گۆڤاری (ئانت) بڵاوبۆوە، من و دۆغان ئۆزگودەن بەیەکەوە دادگایی کراین. دۆسیەکە لە ئیستانبووڵ کرایەوە و لە سەردەمی ڕژێمی ١٢ی ئەیلوول، بۆ

دادگای سەربازی دۆخی لەناکاوی دیاربەکر- سیرت گوازرایەوە. دانیشتنەکانی دادگا بە بێ ئامادەبوونی دۆغان ئۆزگودەن بەرێوەچوو. دوای ئەوە دیسان لە ساڵی ۱۹۷۱، لەسەر پەرتووکی (ژێرخانی ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ، ئابووری کۆمەڵایەتی و نەتەوە پێکهێنەرەکان) دادگایی کرام. جا پەرتووکەکەش وەکوو بەڵگەیەکی زۆر بەهێزی ئەنجامدانی تاوان، لەناو دۆسیەکەم داندرابوو.

وەشانخانەی (بەلگە) لە ساڵی ۱۹۹۰، پەرتووکی (کوردستان کۆڵۆنییەکی نێودەوڵەتی) بڵاوکردەوە. لەسەر ئەو پەرتووکە لە دادگای ئاسایشی دەوڵەت لە ئیستانبووڵ، دۆسیەیەکم لەسەر کرایەوە. ئیدی لەسەر ئەو پەرتووکە دەستگیرکرام و خرامە زیندانی بایرام پاشا. لە کاتێکدا دۆسیەی دادگایی کردنم لەسەر بڵاوبوونەوەی ئەو پەرتووکە کۆتایی نەهاتبوو، هەمان وەشانخانە، پەرتووکی (زانست و ئایدۆلۆژیای فەرمی و دیموکراسی دەوڵەت بەرامبەر بە کێشەی کورد)ی بڵاوکردەوە. بۆ نموونە هەمان ساڵ و هەمان وەشانخانە پەرتووکی (ڕووناکبیرێك و ڕێکخراوێك و کێشەی کورد)ی بڵاوکردەوە. جا لەسەر هەر پەرتووکێك دۆسیەی جیاوازم لەهەمبەر دەکراوە و بە جیا جیاش، دادگایی دەکرام. پاشان لەگەڵ بەرێوەچوونی هەر دانیشتنێکی دادگا، لەسەر هەر کتێبێکم، دادگا بڕیاری کۆکردنەوە و قەدەغەکردنی فرۆشتن و بڵاوکردنەوەی پەرتووکەکانمی دەردەکرد.

وەشانخانەی بەلگە، لە نێوان ساڵانی ۱۹۹۰-۱۹۹۱ ڕیزە پەرتووکی (ڕێکارەکانی جێبەجێکردنی میتۆدی زانستی لە تورکیا)ی

بڵاوکردەوە. دواتر پەرتووکی (یاسای دێرسیم ١٩٣٥، کۆمەڵکوژی دێرسیم، فەرماندەی گشتی موستەفا موغلاڵی، ڕووداوی سی و سێ فیشەك، بەرنامەی کاری پارتە گەلی کۆماری لە ١٩٣١ و کێشەی کورد)ی بڵاو کردەوە. دوای وەشاندنیان، لەسەر هەر پەرتووکێك دۆسیەیەکی دادگایی کردنم لەهەمبەر کرایەوە. بەشێکی زۆریشیان دادگایی کردنی ژێر چاودێری بێ دەستگیرکردن بوو.

وەشانخانەی بەلگە، ساڵی ١٩٩١ لەگەڵ دەزگای بڵاوکردنەوەی مەسلا پەرتووکێکی منی بە ناونیشانی (بەرگرینامەکان) بڵاوکردەوە. پەرتووکەکە ئەو دۆسیە و دادگاییکردن و بەرگرینامانەی من بوو سەبارەت بە دادگایی کردنم لەسەر پەرتووکەکانی پێشووتر.

لە بەرواری بیست و یەکەمین ڕۆژی مانگی سێی ساڵی ١٩٩١، بە هۆی نامەیەکەوە، دیسان دەستگیرکرامەوە. ئەوجارە بڕیاری گرتنەکەم لەلایەن دادگای ئاسایشی دەوڵەتی ئەنقەرەوە دەرکرابوو. بۆیە خرامە زیندانی داخراوی ناوەندی ئەنقەرە. کاتێك بڕیاری کۆتایی لەسەر ئەو دۆسیانەم نەدرابوو، لە نیسانی ١٩٩١، ماددەی ٣٧١٣ی یاسای ڕووبەڕووبوونەوەی تیرۆر لە پەرلەمان دەنگی لەسەردرا. ئیدی ئەمە بووە هۆی ئەوەی هەریەکە لە ماددەکانی ١٤٠-١٤١-١٤٢-١٦٣ی یاسای کۆماری تورکیا هەڵبوەشێنێتەوە. بۆیە ئەو دۆسیانەی لە دادگای ئاسایشی دەوڵەتی ئیستانبووڵ و ئەنقەرە لەسەرم کرابۆوە، ڕاستەوخۆ و بە ناچاری داخران.

لە هاوینی ساڵی ١٩٩١، وەشانخانەی (یورت کیتاب) هەردوو پەرتووکی (تیرۆری دەوڵەت لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست - ڕامان

لەسەر ڕووناکبیری کورد)ی بڵاوکردەوە. هەر لەگەڵ بڵاوبوونەوەی پەرتووکەکان دەستیگرکرام و خرامە زیندان. دوو دۆسیەی جیالەسەر هەردوو پەرتووکە کرایەوە.

لە کۆتایەکانی مانگی نۆ و سەرەتای مانگی دەی ساڵی ١٩٩١، پارێزەر عەلی یلْدرم، هاتە لام و پێی ڕاگەیاندم، سەرجەم پەرتووکەکانت لە وەشانخانەی (یورت کیتاب) جارێکی دیکە چاپ و بڵاودەکەینەوە. باسی ئەوەم بۆ کرد، پێویستە پەرتووکی (ڕێکارەکانی زانست) جارێکی دیکە بنووسرێتەوە. بەڵام هەفتەی دواتر، کاك عەلی یلْدرم، دیسان هاتەوە لام و چاپە تازەکەی هەردوو پەرتووکی وەشانخانەی یورت کیتابی بۆ هێنابووم کە هەریەکە لە (ڕێکارەکانی زانست و بە زۆر نیشتەجێکردنی کورد) بوون. کۆتاییەکانی مانگی دەی هەمان ساڵ ئازاد کرام. دوای سەربەست بوونم چاپ بوونی پەرتووکی (ڕووخانی قەرەقۆڵەکانی هۆشم)م بینی.

لەگەڵ چاپکردنەوە و بڵاوکردنەوەی جارێکی دیکەی پەرتووکەکانم، دیسان لە دادگا دۆسیەی جیا جیام لەسەر کرایەوە و دادگایی کردنم دەستی پێکردەوە. ئەو داوایانە بە پشت بەستن بە ماددەی هەشتی یاسای ژمارە ٣٧١٣ی بەرەنگاربوونەوەی تیرۆر لەسەرم کرانەوە. لە کاتێکدا یاسای بەرەنگاربوونەوەی تیرۆری قانونی کۆماری تورکیا ماددەی ١٤٢ لەناو دەستوور ڕابوو، وەلێ فراوانکردنی کردارەکی و پیشان دانی ئەو ماددەیە وەکوو تاوان و قورسکردنی سزاکانی، خرابووە ناو ماددەی هەشتی یاسای ژمارە ٣٧١٣ی ڕووبەڕووبوونەوەی تیرۆر. ئەمە لە کاتێکدا چاپی تازە و

بڵاوبـوونەوەی پەرتووکەکـانم بەردەوام بـوو. بـۆیە لەگەڵ چـاپ و بڵاوبوونەوەی هەر پەرتووکێك، داوایەکی تازەشم لە دادگا لەسەر دەکرایەوە. جا هەر زووش بڕیار لەسەر قەدەغەکردنی بڵاوبوونەوە و فرۆشـتنی دەدرا و هەر زووش بڕیـاری کـۆکردنەوەی پەرتـووکە تازەکان لە دادگاوە دەردەچوو.

لەو سـەروبەندەدا، ڕیزە پەرتـووکی (ڕێکارەکانی جێبەجێکردنی میتۆدی زانستی لە تورکیا، هەوڵی دابەشکاری کوردستان لەلایەن ئیمپریالیستەوە ١٩١٥-١٩٢٥) بڵاوکرایەوە. لەسەر ئەو پەرتووکانەش دۆسیەم لەسـەر کرایەوە. ئیدی یاسا تازەکەی ڕووبەڕووبوونەوەی تیرۆر، بە خەستی لەهەمبەرم دەخرا بواری جێبەجێکردنەوە. ئیدی نووسین و بیرکردنەوە و هەموو دەربڕینێکیان لە چوارچێوەی تیرۆر لێکدەدایەوە.

هەریەکە لە پەرتووکەکـانی (ژێرخـانی ڕۆژهەڵاتـی ئەنـادۆڵوو، ئـابووری کـۆمەڵایەتی و بنەمـای نەتەوەیـی، گۆڕانکاریەکـانی ڕۆژهەڵات و گـرفتە بنچینەییەکـان، عەشـیرەتی ئالیکـانی ڕەوەنـد، عەشـــیرەتە کـــوردە کۆچەرییەکـــانی ڕۆژهەڵات، شـــیکاری میتینگەکـانی ڕۆژهەڵات ١٩٦٧، دەربـارەی کۆمەڵگـای کـوردی و تـاد...) ئەوانەی بەر لە سـاڵی ١٩٧٠ چـاپ و بـڵاو ببـوونەوە، جارێکی دیـکەش چاپکرانەوە. پەرتـووکی (ژێرخـانی ڕۆژهەڵاتـی ئەنـادۆڵوو) کە چـاپی دووەمـی لە کۆتاییەکـانی سـاڵی ١٩٧٠ بڵاوبـۆوە، زۆر هەڵەی زمانەوانی و داڕشتن و ڕێنووسی تێدابوو. ئەو هەڵانە ئەگەر بەشێوەیەکی ڕێژەیـی کەمتـریش بـووبێ بەراورد بەو پەرتـووکە، بەڵام پەرتووکەکـانی دیـکەش لە شاشـی بێـبەری

نەبـوون، بەڵام لە چـاپە تازەکانیانـدا ئەو کێشـانە چارەسـەرکران و هەڵەکان ڕاستکرانەوە. جا لەسەر سێ چوارێك لەو پەرتووکانەش لە دادگا دۆسیەم لە هەمبەر کرایەوە.

هەردوو پەرتووکی (نایاسای دادپەروەری، هەڵکشانی زانست و زانیاری) تایبەت بوو بە دادگایی و دۆسیەکانی دادگای ئاسایشی دەوڵەتــی ئیســتانبول و ئەنــقەرە و ئەو دانیشــتنانەی دادگــا و بەرگرینامەکان و دانیشتنەکانی دادگای تاوانە گرانەکانی ئیستانبووڵ و دادگای سزای ئاسلیە. لەناو پەرتووکی (نایاسایی دادپەروەری) بەرگرینامەی ئونساڵ ئۆزتورکیش دەبینرێت، وەکوو سەرپەرشتیاری ئەو وەشـانخانەی پەرتووکەکـانی بـڵاو کردبـۆوە. سـاڵی ١٩٩١ پەرتووکی (بەرگرینامەکان) بە ناونیشانی (ئەو ڕێگایانەی دادگاکان کردیـانەوە) جـارێکی دیـکە بڵاوبـۆوە. پەرتـووکی (بەرگرینامەکـان) تـژی هەڵە بـوو. لە چاپە تـازەکەی هەموویـان ڕاسـتکرانەوە. ئیـدی لەســەر ئەو پەرتووکـانەش چەنـدان دۆسـیەم لەلایەن دادگـاوە لە هەمبەر کـرایەوە. جا زۆربەی داواکانیش هەم لەسەر من دەکراوە وەکوو نووسەری ئەو پەرتووکانە، هەمیش لەسەر ئونساڵ ئۆزتورك دەکــراوە وەکــوو بەڕێــوەبەری وەشــانخانەی (یــورت کیتــاب). پەرتووکی (قرێژکردنی تێگەیشتن) بریتی بوو لە کۆمەڵێك نووسینی بڵاوکـراوەی خـۆم لە چەنـدان گۆڤـاری و ڕۆژنـامەی وەك (یەنـی ئـولکە، ئۆزگـور گونـدەم، ڕەوشـەن، مرۆڤدۆسـت). دوای وەشـانی، لەسەر ئەویش دادگایی کرام.

سـاڵانی ١٩٩١، ١٩٩٢، ١٩٩٣، چەنـد سـاڵێکی تـژی دۆسـیە و کرانەوەی داوای دادگایی بوون لەسەر نووسینەکانم. لەگەڵ کاك

ئونسالْ دوو سێ ڕۆژ جارێك لەبەردەم دادگای ئاسایشی دەوڵەت ئامادە دەبووین. جا داواکان تەنیا لەو دادگایەش لەسەرمان نەدەکراوە؛ بەڵکو لەسەر هەمان پەرتووك، لە دادگاکانی سزای گران و دادگای سزای ئاسلیەش لە هەمبەرمان دۆسیە دەکراوە. بەڵام لە هەر دادگایە و بە تۆمەتێك دادگایی دەکراین؛ بۆ نموونە لە دادگای ئاسایشی دەوڵەت بە تۆمەتی (جوداخوازیی)، لە دادگای سزا گرانەکان بە تۆمەتی (بە کەم زانینی پەرلەمان و حکوومەت و دامەزراوە دادوەریەکان)، هەرچی لە دادگای سزای ئاسلیەبوو، بە تۆمەتی (دەرچوون لە یاساکانی پاراستنی مستەفا کەمال و میراسی مەعنەوی) دادگایی دەکراین. کاتێکیش لە دادگای ئاسایشی دەوڵەت بڕیاری سزادانم دەردەچوو، دۆسیەی دادگاکانی دیکە دادەخران.

## ئونسالْ ئۆزتورك و یاداشتەکانی ڕۆژانەی

لەسەر بڵاوکردنەوەی نووسینێك، بڕیاری سزادانم بۆ دەرچوو و لە ناوچەی ئیسکلیپ دەستگیرکرام و خرامە زیندان. نووسینەکە بە ناونیشانی (تێگەیشتن لە بەشداری کردنی ئافرەتانی کورد بۆ ڕیزەکانی گەریلا) بوو. وتارەکە لە ڕۆژنامەی (ئۆزگور هاڵك) وەشێندرا. لەو دۆسیەیەدا لەگەڵ ئۆزکان کڵچ بەیەکەوە دادگایی کراین. دوای بڕینەوەی سزاکەشم، خرامە زیندانی ئیسکلیپ. ئەوسا بە هۆی چەند کارێکی تایبەتمەوە لە ناوچەی ئیسکلیپ دادەنیشتم. نزیکەی دوو هەفتە لە زیندانەکەی ئەوێ مامەوە. دواتر

بە هۆی بەڕێوەچوونی چەند دۆسیەیەکی دیکەی دادگاییکردنم لە دادگای ئاسایشی دەوڵەت لە ئەنقەرە، گوازرامەوە گرتووخانەی داخراوی شارەکە. لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٩٤، بە هۆی دەرچوونی سزا بەسەر یەکێك لە پەرتووکەکانم، ئونساڵیش خرایە زیندان.

بە هۆی ئەوەی دادگا هەرزوو بڕیاری قەدەغەکردنی بڵاوکردنەوە و فرۆشتنی پەرتووکەکانمی دەرکرد، بۆیە وەشانخانەی (یورت کیتاب) کە بەشێکی زۆری پەرتووکەکانمی بڵاوکردبۆوە، تووشی دۆخێکی ئابووری ناهەموار و پڕ زەحمەت ببۆوە؛ لەلایەکی دیکەش، لە ئیستانبووڵ چاپخانەی (ئایدنلار) سوتێندرا، کە بەشێکی زۆری پەرتووکەکانم لەوێ چاپدەکران. خاوەنی چاپخانەی ئایدنلار، فەیسەڵ ئایدن بوو؛ ئەو بە هۆی خۆشەویستی بۆ ئەو وەشانخانانەی بەرهەمی شۆڕشگێڕی بڵاودەکەنەوە، زۆربەی گۆڤار و ڕۆژنامە و پەرتووکی ئەو وەشانخانانەی لای خۆی چاپ دەکرد. بۆیە پەیوەندییەکی دۆستانە لە نێوان وەشانخانەکە و چاپخانەکە و خاوەنی هەردوو لادا هەبوو. بەڵام بە هۆی بوونی پرسگرێکێك لە نێوان فەیسەڵ ئایدن و یەکێك لە ڕێکخراوە چەپەکان، لە ساڵی ١٩٩٣، باس لەوە دەکرا بەشێك لەلایەنگرانی ئەو ڕێکخراوە، چاپخانەکەیان سووتاندبێت.

دوای کەوتنە زیندانی کاك ئونساڵ، خۆ کۆکردنەوەی وەشانخانەی یورت کیتاب و هەڵمەتی خستنەوە سەر لینگانی، کەوتە ئەستۆی کاك سوڕەیا، ئەویش بە ئەنجامدانی چەند کارێکی ڕۆژانە دەیویست ئەرکەکە جێبەجێ بکات.

کاك ئونسالٚ لەو ڕۆژەوەی چووە زیندان، دەستی بە نووسین کرد، دوای چەند ڕۆژێك هەستم بەوە کرد کاك ئونسالٚ ڕۆژانەی خۆی بە ورد و ڕێکی دەنووسێتەوە. زۆر بلەز دەینووسی، چونکە زۆر شتی دەنووسی. هەندێکجار لێم دەپرسی "ئونسالٚ ئەوە چی دەنووسی و هەر تەواو نابێ؟ چی دەبینیەوە تا ئەوەندە بنووسی؟" لە وەڵامدا دەیگوت "شتێك هەر دەبێ بینووسم". هەندێك جاریش دەیگوت "ئەگەر دەزانی چی دەنووسم، جا چی نانووسم؟" ئەو ئاوای دەگوت، بەڵام نووسینەکانی پیشان نەدەدام. منیش نەمدەگوت دە بمدێ تا بیخوێنمەوە. بۆیە لەو بارەیەوە داوای خوێندنەوەی نووسین و نووسراوەکانیم لێنەکرد. لەگەڵ ئونسالٚ لە زیندانی داخراوی ئەنقەرە و گرتووخانەی بورسای تایبەت بەیەکەوە ماینەوە. لە جاری یەکەمدا لە مانگی یازدەی ساڵی ١٩٩٤ تا ١٩٩٥ نزیکەی ساڵێك بەیەکەوە بووین. لە بورساش لە نێوان ساڵانی ١٩٩٦-١٩٩٧ بەهەڤڕا بووین. لە هەردوو گرتووخانەکەش یاداشتەکانی ڕۆژانەی خۆی دەنووسیەوە. بەڵام دوای ئازاد بوونمان، ئونسالٚ هیچ یەکێك لە دەفتەری یاداشتەکانی ئەو ماوەیەی لەگەڵ خۆی نەهێنا دەرەوەی زیندان، ئێ هیچی نەدا من و هیچیشی بڵاو نەکردەوە، بۆیە پێم وابێ هەموویانی دڕاند. بۆیە بە بۆچوونی من ئەوە لەدەستدانێکی گەورە بوو، بۆیە پێویستە ئەوانە جارێکی دیکەش بنووسرێتەوە. لەوێوە ئونسالٚ بووە نووسەر. چونکە یەکێك لە خاڵە جەوهەریەکانی بوون بە نووسەر، بریتییە لەوەی نووسینەکانت پیشانی کەس نەدەی. من لەوبارەیەوە بە خۆم نالێم نووسەر، چونکە من چی بنووسم، بەر لە بڵاوکردنەوەی زۆر کەس دەیبینێت و دەیخوێنێتەوە. کاك ئونسالٚ لە زیندانی (ئولۆجانلار)یش یاداشتی ڕۆژانەی خۆی دەنووسیەوە، چونکە لەوێش هەستم پێی کردبوو. وەلێ هەرگیز بیرم لەوە

نەکردبۆوە کە ئەو یاداشتانە سەبارەت بە منن. ساڵی ٢٠٠٠ زۆر برادەر و دۆست دەهاتنە وەشانخانەی (یورت کیتاب) لەناویاندا زۆر هەڤاڵمان دەبینی کە کاتی خۆی لە زیندان بەیەکەوە بووینە. لەوێ ناوە ناوە کاك ئونساڵ چەند بەشێکی کورتی لە یاداشتەکانی بۆ دەخوێندمەوە، بیروبۆچوونی منیشی لەو بارەیەوە دەپرسی، ئەو دەیویست یادەوەرییەکانی جوانتر و تۆکمەتر بکات. زۆرجار لە وەشانخانەکەی تووشی هەمان شت بوومەوە، بەڵام هەر هەستم بەوە نەکرد کە ئەمە لەسەر من نووسرابێت. کاك ئونساڵ لە وەشانخانەکەی خۆی لە هاوینی ساڵی ٢٠٠٦ جارێکیان بە سەیرکردنی یاداشتەکانی گوتی "پێشکچی ڕووداوێکی وەهای بۆ باسکردبووم... " وەلێ زۆر هەڵە لە گواستنەوەی زانیارییەکان و باسکردنیان هەبوو. هەوڵی ئەوەمدا ئەوەی تێبگەیەنم کە زۆر هەڵە و گرفت لەو گێڕانەوانە هەیە. جا بۆیە بەو ڕاڕاییەوە بە ئونساڵم گوت دەشێ هەڵەی دیکە لە گێڕانەوەکانی دیکەمدا هەبێ کە تۆ تۆمارت کردوون؟ بۆیە پێویست بوو تەواوی نووسینەکە سەرلەبەری بخوێنمەوە. بۆ ئەمەش ئونساڵ نووسینەکەی پێدام. جا کە دەستم بە خوێندنەوەی کرد، پاشان بە تەواوی بۆم ڕوون بۆوە کە تەواوی نووسین و یاداشتەکان سەبارەت بە خۆمن. دوای خوێندنەوەشی لە چەند شوێنێك چەند هەڵەیەکی زۆر زەق و دیاری تێدابوو، بەڵام هەموومان چاك کرد. هەندێك لە هەڵەکانیشم دەستکاری نەکرد. نەك لەبەر ئەوەی شتی سادە و زۆر گرنگ نەبوون. بەڵکوو لەبەر ئەوەبووخوازیاری ئەوە نەبووم تەواوی نووسینەکە دەستکاری بکەم...

لە زیندان هەر وشەیەك لە زاری من دەرچووبێ، لە کاتی هاموشۆی هەواگۆڕکێ، یاخود لەکاتی ئاخافتنەکانی ناو قاوش و لە

کاتی نان خواردن و حەمام و لەناو ترومبێلی زیندان و لەکاتی سەردانی قاوشەکانی دیکە و هەموو شوێنەکانی زیندان، ئونسالْ.لای خۆی تۆماری کردبوو. جا چاودێری هەڵس و کەوتی منیشی کردبوو و نووسیبوویەوە. هەموو ئەمانەشی بە نهێنی و بە بێ ئاگاداری من کردبوو. بۆیە کاتێك لەسەرەتای کارەکە بووە، لەو بارەیەوە بۆچوونی دۆستی عەزیزمان یلْماز ئۆزتورکی وەرگرتبوو.

ئایا ئەوەی کاك ئونسالْ کردبووی شتێکی ڕاستە؟ وەك خۆم دڵنیانیم لە وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە، لەبەر ئەوەی ئەگەر خۆم هەڵسم بە نووسینەوەی بیرەوەریەکانی ئەوسا، یان لە ڕێگای دیدارێکی پرسیار و وەڵامەوە، بیرەوەریەکان تۆمار بکەین، ڕەنگە بە جۆرێکی دیکە بێ. جا پێم وایە مرۆڤ لە کاتی چاوپێکەوتندا زیاتر ورد و وریاتر دەبێ، بۆیەش دەبێ باشتر بیر لە وەڵامی پرسیارەکان بکاتەوە. بەڵام مرۆڤ لە کاتی پیاسەکردنی لە هەواگۆڕکێی زیندان، یان لەناو ترومبێلی گواستنەوەی بەندیخانە و سەردانی قاوشە جیاکان و شەوانی سەر چارپاکان، بە وردی و هزرەوە نادوێت. بەڵکوو بە پێچەوانەوە ئەو جۆرە ئاخافتنانە زیاتر لێدوانی پڕ تورەیی و گەورەکراون. جا دەشێ ببێتە هۆی ئەوەی کات و شوێنیش تێکەڵ بکرێ. بۆیە لەو باوەڕەدامە، ئەو خوێنەرانەی پەرتووکەکە دەخوێننەوە، پێویستە ئەو شتانە بە وردی لەبەرچاو بگرن. جا لەگەڵ هەموو ئەمانە، ئەم بیرەوەرییانە بەشێکی زۆر گرنگی ژیانی منن لە چەند کات و ساتێکی دیاریکراوی ناو زیندان.

ئونسالْ ئۆزتورك بووە گەواهیدەری بەشێك لە ژیانی ناو زیندانم. جا ئەوسا دۆخێکی گەورەی گۆڕنکاری ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی بوو بۆ کۆمەڵگای کورد و تورك لە تورکیا. بەشێکی زۆری توێژی ڕەنجبەرانی کورد بەشداری چالاکییە سیاسییەکانیان کرد؛ وەك چۆن ئافرەتانیش لە تەڤلی بوونی گۆڕانکارییە ڕامیارییەکان بەپاش نەکەوتن، وەك چۆن ئەوان لە چالاکییە ئابوورییەکانیش ڕۆڵی گرنگیان بینی. زۆر ئافرەت دەستیاندا کار و خەبات و، خێزان وماڵباتەکانی خۆیان بەو کارانە دەگوزەراند کە خۆیان دایانمەزراند. لە هەمووی گرنگتر، ئەو ئافرەتانەی گوندەکانیان وێران کران و ماڵەکانیان سووتێندرا و هاوسەر و بەشێك لە ڕۆڵەکانیان لەدەستدا، کە بووە هۆی ئەوەی سەرچاوەکانی داهاتی داراییان لێ وێران بکرێ، بە زۆری زۆرداری لە شوێن و مەملەکەتی خۆیان کران و بە بێ چارە خرانە ناو حەشاماتی شارەکانەوە، بەڵام سەرەڕای ئەمانە، دامەزراندنی کاری تازە لەلایەن ئەو ئافرەتە نەبەردانە و بەخێوکردنی بەشێك لە ئەندامانی خێزانەکەیی و تێرکردنیان، گۆڕانکارییەکی زۆر گەورەی ئابووری و کۆمەڵایەتی ستایشکراوە. جا بۆچوون و هزری تورك ئەو گۆڕانکاریانە نابینێ و نازانێ و گوێی لێ نابێ و فێریشی نابێ؛ بۆیە ناشتوانێ شیکاریی ئەو دۆخەش بکات. بەڵام کورد باش باش دەتوانێ ئەو دۆخە هەڵسەنگێنێ و ڕوونی بکاتەوە، جا لە هەمووشی گرنگتر هەر ئەمەیە... لەو ساڵانەی بووری، ڕەجەب تەیب ئەردۆغانی سەرۆکوەزیرانی ئەوسای تورکیا، کاتێك سەردانی ڕووسیا و نەرویجی کرد، لەوێ ڕووبەڕووی هەندێك کێشەی ئەو کوردانە

بۆوه که لەوێ دەژیان. هەروەها لەوێ لێیان پرسی "چۆن کێشەی کورد چارەسەر دەکرێ؟" ئەردۆغانیش لە وەڵامدا گوتبووی "ئێوە بیر لەوانە مەکەنەوە، لای ئێوە ئەو کێشانە ڕوونادەن". ئیدی بۆچوون و هزر و ڕاڤەی تورك بۆ ئەو گۆڕانکاریەی بەسەر کورددا هاتووە وەك ئەو وەڵامەیە. لە هزری تورکیدا هیچ ئافرەتێك لە تورکیا نییە سەرەڕای ئەوەی لادێکەی وێران کرابێ و ماڵی سوتێندرابێ و مێردەکەی فڕێندرابێ و منداڵەکانی بزر کرابێ و سەرچاوەکانی داهاتی وشك کرابێ و بە ناچاری لەناو خاو و خێزانی خۆی دەرکرابێ و بە هەڕەشە لەگەڵ بەشێك لە زارۆکەکانی خرابنە ناو حەشامەتی بێ ڕەحمی شارەکان و پاشانش بتوانێ کار و کاسبیەکی تایبەت بە خۆی دابمەزرێنێت. لە خەیاڵدانی تورکدا، سەرۆکی شارەوانی ئافرەتیش نییە لە شارە کوردییەکاندا، بەڵام کورد بە پێچەوانەی هزری تورکی، توانای ڕاڤەکردنی ئەو دۆخەیان هەیە. جگە لە کورد، توێژەر و لێکۆڵەر و کەسانی بیانیش، کە دێنە تورکیا و لە شارە کوردییەکان کاری زانستی دەکەن، ئەوانیش هەست بە دۆخی ژیان و گوزەرانی گەلی کورد دەکەن و دەزانن چۆنن.

ئەو ناوانەی لە نووسینەکانم دەیانهێنم، وەکوو بریندارەکانی جەنگ و ڕووناکبیرەکان و گەورەکان و وەزیر و شێخەکان، لەلایەك و، گوڵستان و مامز و عایشە چەلەنگەکانیش لەلایەکی دیکە، لەگەڵ خەڵکی توێژە جیاوازەکان، بنەچەی کۆمەڵایەتی هەموویان هەر لە گوند و دووکانداری و کرێکاری و فەرمانبەریەوە هاتوون... ئیدی ئەو پێشهاتانە لە قارس و دیگۆر و شرناخ و جۆلەمێرگ و سەمسور و دێرسیم و دیاربەکر و بەدلیس

و مێردینەوە بووە. ئیدی ئەو کۆمەڵگایە دوای بەشداری کردن لە بزاڤە رامیاریەکان، ڕێگایان بۆ چالاکییە ئابووریەکانیش کردووەتەوە، ئەمەش پێشهاتێکی گرنگە. لەپاڵ ئەمانە هاوکاری هەندێك لە تورکیش ڕۆڵێکی گرنگی لەو گۆڕانکاریانە هەبووە.

دەمەوێ لەوبارەیەوە چیرۆکێکی ڕاستی ئاواتان بۆ بگێڕمەوە: لەیەکێك لەسەردانەکانی زیندان، پیاوێکی ئیختیار لە سەردانی ئەتەلای کوڕی دەڵێ "کوڕم، وا زستان بەر دەرگای لێگرتووین و هاکا لێمان بە ژوور کەوت، کەچی کۆلکە دار و ڕەژوومان نییە بۆ سووتان. ئیدی لێرە دەرکەوە و شتێك بۆ ئەو ماڵە دابین بکە، چونکە من توانای کارکردنم نەماوە". دیارە ئاتالای بەر لەوەی بکەوێتە زیندان، بە کار و شۆلی جیا جیا، هەموو پێویستیەکانی ماڵی دابین دەکرد. ئەو خێزانە خەڵکی ناوچەی دیگۆرلووی قارس دەبن، ئەوان لەگەڵ ئەوەی زۆر نەبوون و نەدار بوونە، سەرەڕای پیاوەکانیان، ئافرەتەکانیشیان بەشداری چالاکیە سیاسییەکانیان دەکرد و سەمپاتیزان بوون. جا ئەتەلای نەك ئازاد نەدەکرا تا ئەو زستانە تەواو دەبوو، بەڵکوو بە ١٥ ساڵ سزای توند سزادرابوو. بەڵام ماڵباتەکە بەردەوام ئاگاداری کوڕەکەیان بوون لە بەندیخانە جیاکان، لە پاڵ ئەوان چاویان لە هاوخەباتەکانی کوڕەکەشیان بوو، هەم بە شێوەیەکی ماددی هاوکاریان دەکردن، هەمیش لە ڕووی مەعنەوەیەوە پاڵپشتیان بوون. لە دیدارەکەدا ئەتەلای بە باوکی دەڵێ "لەگەڵ ئەو ماڵباتانەی دۆخ و حاڵیان وەك ئێمەیە کۆمیتەیەك پێك بهێنن و بڕۆنە وەزارەتی داد و لەگەل وەزیر دانیشن و کێشەکانتان بۆ ئەو باس بکەن...".

ئەو بەسەرهاتە کورتە، دەرخەری چاوەڕوانی و

گۆڕانکاریەکانی ناو کۆمەڵگان. کەچی مێشکی تورکیش پێداگیرە لەسەر ئەوەی ئەو گۆڕان و داوایانە نەبینێ و نەبیستێ و دەست بۆ تێگەیشتنیان نەبا. تورك بەردەوام ئەو ڕستەیە وەکوو بە کەم سەیرکردن و ناشرینکردن دووبارە و هەزار بارە دەکەنەوە "ژمارەی کورد نزیکەی ٢٠ ملیۆنە، کەچی لە دوو ملیۆن دەنگ زیاتر بەدەست ناهێنن". هەروەها باس لەوە دەکەن پارتە کوردییەکانی وەك (هەپ[1]، دەپ[2]، هاداپ[3]، دەهاپ[4]، دەتەپ[1]) لە

---

[1] پارتێکی سیاسی کوردی بوو، لە ساڵی ١٩٩٠ دامەزرێندرا، ساڵی ١٩٩٢، دوای سوێندخواردنی لەیلا زانا بە زمانی کوردی لە پەرلەمانی تورکیا، بە بڕیارێکی دادگا بە تۆمەتی دابەشکردن و دروستکردنی بیرۆکەی جوداخوازی لە تورکیا، داخرا. (وەرگێڕ).

[2] دوای ئەوەی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی لە باکووری کوردستان، هەستیان بە زیاد بوونی ئەگەرەکانی داخستنی (هەپ) کرد لە لایەن دەوڵەتی تورکیاوە، ساڵی ١٩٩١ هەڵستان بە کردنەوەی (دەپ – پارتی دیموکراسی). دوای داخستنی هەپ، هەریەکە لە لەیلا زانا و مەحمود ئالناك و خەتیب دیجلە و ئۆرهان دۆغان و ئەحمەد تورك و سری ساكك و سەلیم ساداك و سەدات یورتداش، لە پەرلەمان چوونە ناو دەپ. ساڵی ١٩٩٤ بە پاڵەپەستۆی تانسو چیلەری سەرۆك وەزیرانی ئەوسای تورکیا، (دەپ) داخرا و پارێزبەندیش لە پەرلەمانتارانی وەرگیردراوە و خرانە زیندان. (وەرگێڕ).

[3] دوای داخستنی (دەپ) لە تورکیا، سیاسەتمەدارانی کورد لە باکوور، (پارتی دیموکراتی خەڵك – هاداپ) یان لە ساڵی ١٩٩٤ دروست کرد. هاداپ لە هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٩٥ توانی ١.١٧١.٦٢٣ دەنگ بەدەست بهێنێت. پارتەکە تا ساڵی ٢٠٠٣ لە چالاکیەکانی خۆی بەردەوام بوو، بەڵام لە سێزدەمین ڕۆژی سێیەمین ساڵی سەدەی تازە، بە بڕیاری دادگای دەستووری کۆماری تورکیا ئەم پارتە کوردییەش داخرا. (وەرگێڕ).

[4] دوای داخستنی هاداپ، بە گروتینێکی تازە و فراوانتر، کورد لە باکووری کوردستان، لە ساڵی ٢٠٠٥ هەڵسان بە دامەزراندنی (دەهاپ). پارتەکە دواتر خۆی هەڵوەشاندەوە و چووە ناو (پارتی دیموکراتی کۆمەڵگا – دەتەهە) (وەرگێڕ).

هەڵبژاردنەکان لە دوو ملیۆن دەنگ زیاتریان نەهێناوە. با دابنێین دوو ملیۆن دەنگ دەهێنن؛ بەڵام هەرگیز شیکردنەوە بۆ ئەوە ناکەن بۆچی تەنیا دوو ملیۆن دەنگ دەهێنن؟ بەڵکوو تەنیا دەیانەوێت بە کەم و هیچیان پیشان بدەن. وا بیربکەنەوە وەك دان پێدانانی باکووری قوبرسی کۆماری تورك، کە ژمارەیان تەنیا نزیکەی ۱۸۰ هەزار کەسێکە و تورکیا وەکو دەوڵەتێکی سەربەخۆ ناساندوویەتی. جا هەموو قوبرسی باشوور و باکوریش ژمارەکەی ۸۰۰ هەزار کەسێکە. ئەگەر وابێت دەبێ ئەو دوو ملیۆنە داوای مافەکانی خۆیان بکەن. بۆیە لەبەرچاو نەگرتنی ماف و داخوازیەکانی دوو ملیۆن دەنگدەر، پێچەوانە و دژی بنەماکانی دیموکراسییە. بەڵام زیهن و کولتووری سیاسی تورك، بۆ ئەوەی ئەو دژبەریە دیموکراسیەی بەرامبەر بەو دوو ملیۆن دەنگدەرە دەکرێ، نەزانرێ و هەستی پێنەکرێ و نەچێتە ناو هۆشیاریمانەوە، دێت و قەشمەری و سووکایەتی بە ڕێژەی ئەو پارتە کوردیانە دەکات کە دوو ملیۆن دەنگیان هێناوە. لەگەڵ ئەوەی دەبێ ڕێژەی ئەو دوو ملیۆنە زیاتر بێت، بە تایبەتیش لە هەڵبژاردنی شارەوانی و خۆجێیەکاندا؛ بەڵام بە بێ شەکەت بوون، پێویستە بەرگری لە داخوازی و ماف و ویستی ئەو دوو ملیۆنەش بکەین. بۆ نموونە ناوی ئەو پارتانەی لەسەرەوە هێنامن، دینەمۆیەکی زیندووی ئەو گۆڕانکاریانەن. جا کاتێك لە دادگای دەستووری بڕیاری داخستنی پارتێك دەدرێ، لە ماوەیەکی کورتدا دامەزراندنی

---

[1] دەتەپە لە ساڵی ۲۰۰۵ لەلایەن هەریەکە لە لەیلا زانا و ئەحمەد تورك و ئۆرهان دۆغان دامەزرێندرا، بەڵام تەنیا چوار ساڵ دوای دامەزراندنی، لە ساڵی ۲۰۰۹ بە بڕیاری دادگای دەستووری تورکیا ئەم پارتە کوردییەش لە تورکیا داخرا. (وەرگێڕ).

پـارتێکی دیـکەی تـازە ڕادەگەیەنـدرێ، ئەمەش دەرخەرێکـی گرنگی ئەو ویست و چاوەڕوانیە کۆمەڵایەتیانەن کە باسمان کرد. جا بەسەرهاتی ئەو داخستنانە بۆ ڕۆژنامەکانی (ئۆزگور گوندەم و ئۆزگور ئولکە و یەنی پۆلەتیکا و دیموکراسیش)[1] هەمان شتە.

بە ڕاستی و بە بێ دوودڵی، زۆر گرانە لەو بارەیەوە ڕەخنە لە کـورد بگـرین، بەڵام بە بۆچـوونی مـن لە هەمـوو گەلێـك زیـاتر کـورد پێویسـتیان بە ڕەخـنە لێگـرتنە. ڕەنـگە لەو پەرتـووکەدا چەنـد سەرەداوێکتان لەو بارەیەوە بکەوێتە بەرچاو.

## چاپخانەی (ئایدنلار) دەسووتێندرێت

لە ساڵانی نەوەتی سەدەی ڕابردوو، ناوەندەکانی بڵاوکردنەوەی ڕێکخراوە چەپەکان، زۆرترین کات بڵاوکراوەکانیان لە چاپخانەی (ئایـدنلار) چـاپ دەکـرد. خـاوەنی ئەو چاپخـانەیە فەیسـەڵ ئایـدنی دیموکراتی، بۆچوون نزیك لە چەپەکان بوو.

لەوێ سـەردەمێدا، جیابوونەوەیەك لە ڕێکخراوی (دەڤ سۆڵ) ڕووی دا. ئەو بەشەی لێی جیا بوونەوە، گۆڤارێکیان بە ناونیشانی (دەڤرمجـی چـۆزم – چارەسـەری شۆڕشـگێڕی) بڵاودەکـردەوە.

[1] ئەم بڵاوکـراوە میـدیاییانەی نووسـەر باسـیان دەکـات، ڕاگەیانـدنی بـزوتنەوەی سیاسـی کـوردن لە بـاکوور. ئەو میـدیایانە، وەك پـارتە سیاسـییەکان، زوو زوو لەلایەن دەوڵەتی تورکیاوە بڕیاری داخستنیان دەدرێ، بەڵام هەر زوو، بە ناوێکی دیـکە، ناوەنـدێکی دیـکەی میـدیایی دەکـرێتەوە و درێـژە بە چـالاکی میـدیایی خۆیان دەدەن. (وەرگێڕ).

خاوەنی گۆڤارەکە پارێزەر فەتحیبە پەکشان بوو. هەمان کەس پارێزەری دۆسیەکانی ڕێکخراوی (دەڤ سۆڵ) بوو.

ڕێکخراوی دەڤ سۆڵ، بۆ ئەوەی گۆڤاری (دەڤرمجی چۆزم) لە چاپخانەکەی چاپ نەکات، لەملا و ئەولا پاڵەپەستۆیان خستبووە سەر فەیسەڵ ئایدن. ئەویش بەردەوام بەو وەڵامە بەرگری لەخۆی دەکرد "چاپخانەیەکی بازرگانی هەموو جۆرە بڵاوکراوەیەك چاپ دەکات". بۆیە بەردەوام بوو لە چاپکردنی گۆڤارەکە.

لە بیست و نۆیەمین ڕۆژی مانگی حەفتی ساڵی ١٩٩٣، لە دەمژمێرە زووەکانی بەرەبەیان، چاپخانەی ئایدنلار سووتێندرا. لە ئەنجامدا زیانێکی گەورەی ماددی بەر چاپخانەکە بکەوێت. بەو هۆیەوە وەشانخانەی یورد کیتابیش زۆر زیانمەند بوو؛ چونکە لە کاتی سووتانی، ئەو وەشانخانەیە نزیکەی هەشت پەرتووکی هەبوو لە چاپخانەکەدا. حەفت لەو پەرتووکانە ئەوانەی من بوون. دانەکەی دیکەش کیتابێکی یاشار کایا[1] بوو بەناوی (کۆجا چنار) سەبارەت بە ژیان و هزر و ڕامانی مووسا عەنتەر. ڕێژەیەکی زۆری پەرتووکەکان شەوتان. ئەوانەی نەشسوتابوون، لەگەڵ ئەو ئاوەی بۆ کوژاندنەوەی ئاگرەکە بەکارهێنرا، هەموو تەڕ بوو و کەڵکی هیچی نەما. دەنگۆی ئەوە هەبوو گوایە ئاگرەکە لەلایەن

---

[1] یاشار کایا (١٩٣٨-٢٠١٦) سیاسەتمەدار و نووسەری کورد، بە کەسایەتیەکی دیاری ناو بزوتنەوەی کوردی باکووری کوردستان دادەنرێت. ئەو سێ ساڵ سەرۆکی گشتی پارتی دیموکرات بوو، کە لە ساڵی ١٩٩١ دامەزرا. لە نێوان ساڵانی ١٩٩٤ تاوەکو ساڵی ٢٠١٤ لە ئەڵمانیا ژیا و هەر لەوێش پەرلەمانی کوردستانی ئەوروپای دامەزراند. دوو ساڵی کۆتایی تەمەنی بە یەکجاری هاتە باشووری کوردستان و لە هەولێر کۆچی دوایی کرد. (وەرگێڕ).

ڕێکخـراوی دەڤ سـۆڵەوە کـرابێتەوە و ئەوان بـکەری ڕووداوەکە بن، وەلێ ڕێکخـراوەکە سەبارەت بە ئەنجامدانی چالاکیەکە هیچ ڕوونکرنەوەیەکـی بـڵاو نەکـردەوە. لە هەمـان مـاوە، نووسـینگەی پارێزەر فەتحییە بەکشانیش لە تەقسیم لە بیست و سێیەمین ڕۆژی مانگی شەش سووتێندرا، بکەری ئەویش خرا سەر ڕێکخراوی دەڤ سـۆڵ. دوای ئەو ڕووداوە بە مـاوەیەکی کـورت، فەیسـەڵ ئایـدن نەخۆشـکەوت، مـاوەیەك دواتـر گیـانی لەدەستا و کـۆچی دوایی کرد.

***

لە نێوان ساڵانی ٢٠٠٦ – ٢٠٠٧ کەسێك تەلەفۆنی بۆ کردم و خۆی وەکوو ئەندامێکی ڕێکخراوی دەڤ سۆل ناساند. لەوسەری تەلەفـۆنەکەوە کـابرا گـوتی "لە نـاوچەیەکی ئیسـتانبووڵ، پەکەکە ڕێگـری لە کـاری ڕێکخـراوی دەڤ سـۆڵ دەکـات، بـۆیە تکـا دەکەین لەو بارەیەوە هاوکارییەکمان بکەی". منیش هەر بە تەلەفۆن ئەوەم بیرهێنانەوە کە ساڵی ١٩٩٣ دەنگۆی سووتاندنی چاپخانەی ئایـدنلار بۆسـەر ئێـوە بـوو، کە بـووە هـۆی ئەوەی چاپخـانەکە و وەشانخانەی یورت کیتاب و فەیسەڵ ئایدن و گۆڤاری دەڤرمجی چۆزوم زیانمەند بن.

لە چەپەوە ئەوانەی بە پێوە وەستاون: سەرحەد بوجاك، ئیبراهیم گوربز، ئیسماعیل بێشکچی، ئەشبەر یاغموردەرەلی.
ئەوانەی دانیشتوون لە چەپەوە: فەقێ حوسێن ساغنچ، مووسا عەنتەر، عەبدولڕەحمان دوڕە.

## دادگاکانی ئاسایشی دەوڵەت

لە نەوەدەکانی سەدەی بووری، دۆسییەی دادگاییکردنەکان لەسەر نووسین و پەرتووکەکانم لە دادگای ئاسایشی دەوڵەت بەڕێوە دەچوو. دانیشتنەکانی دادگا لەژێر کاریگەرییەکی زۆر هەنگاوی دەنا. بۆیە بە پێویستی دەزانم ئەگەر بە کورتیش بێت، باسی هەندێك لە دانیشتنەکانی دادگا بکەم لە دادگای ئاسایشی دەوڵەتی ئەنقەرە.

لە ساڵی ۱۹۹۱ پەرتووکەکانم لەلایەن وەشانخانەی یورت کیتاب بڵاو دەکراوە، بۆیە دوای دەرچوونی هەر پەرتووکێکی تازە، لە دادگا دۆسییەیەکی تازەم لەهەمبەر دەکراوە. پاشان بڕیاری کۆکردنەوە و قەدەغەیی فرۆشتنیشی دەردەکرا. دۆسیەکان لە دادگا یەك بە دوای یەك لەسەر من و ئونساڵ ئۆزتورك دەکرانەوە.

بەشێکی زۆری ئیفادەکانمان لە دادگای ئاسایشی دەوڵەت، لەلایەن داواکاری گشتی، نوح یوکسەل وەردەگیردرا. ئیدی دوای وەرگرتنی هەر ئیفادەیەك، داوای دەستگیرکردنی ئێمەی بۆ دادوەر بەرز دەکردەوە. لەوێ دەمێدا، زۆربەی کات بە ترومبێلی بنکەی پۆلیس، دەبردراینە دادگا. ئەو ڕۆژانەی دانیشتنی دادگاشمان هەبوو، سبەینان زوو، بەر لە دەمژمێر هەشت، دەچووینە بنکەی پۆلیسی گەڕەکەکەی خۆمان و، ئەوانیش دەیانبردینە دادگا. ئەگەرنا دەبوو هەفتەی چەند ڕۆژێك تاکسیەك بە کرێ بگرین. بەڵام ئەوان بە ترومبێلی خۆیان و پاسەوانێك ئەو کارەیان بۆ

دەکردین و دوای ئەوەی ئێمەیان ڕادەستی دادگا دەکرد، خۆیان دەگەڕانەوە. ئەو کارەیان لە کاتێکدا دەکرد کە ئێمە بەردەوام دەمانگوت "ئێمە دەزانین لە چ بەروارێك دانیشتنی دادگامان هەیە، وەك چۆن ڕێگای دادگاش پێدەزانین، بۆیە دوودڵ مەبن و ئێمە لە دەمژمێری دیاری کراوی خۆمان لە دادگا دەبین، بەڵام گوێ‌هەدارمان نەدەبوون". چەند جارێکیش ویستیان لە ئێوارەوە بمانبەنە بنکەی پۆلیس و شەو لەوێ بەسەر ببەین و پاشان بۆ بەیانی ڕۆژی دواتر بمانبەنە دادگا، بەڵام ئێمە هەوڵێکی بێ وچان و لەبن نەهاتوومان دا، تا ڕێگری لەو ویستەی ئەوان بکەین، بەڵام سەرباری هەموو ئەمانە، چەند جارێك هەر ئێمەیان دەستگیرکرد و خستنیانە ژێر چاوی پۆلیس.

هەندێك کات بە هۆی نەبوونی ترومبێلی قەرەقۆڵەکەوە، ئێمەیان بە تاکسی دەبردە دادگا، جا لە هەمووی خۆشتر ئەوەبوو، پۆلیسە چاودێرەکەمان پارەی تاکسیەکەی بە من دەدا. ئەوەش زۆر منی بەخۆیەوە هەراسان کردبوو. بۆیە ڕۆژێك ئاوام بە ئامری بنکەی پۆلیسەکە گوت "من ڕێگای دادگا پێدەزانم، وەك چۆن دەزانم لە چ کات و ساتێك دانیشتنی دادگام هەیە، بۆیە پێویست ناکات پۆلیس بێت و من لەگەڵ خۆی ببات و ڕادەستی دادگام بکات. دڵنیابن من لە دەم و جەمی خۆی لەبەردەم دەرگای هۆڵی دادگایی کردنەکەم دەبم. جگە لەمانە من بە ترومبێلی گواستنەوەی گشتی بە ٥٠ قروش دەگەمە شوێنی مەبەست. بەڵام کاتێك بە تاکسی دەچین دەبێ ٣-٤ لیرە بدەم، ئەوەش لە ڕووی ماددیەوە بارگرانییەکی زۆرە بۆ من".

بەڕێوەبەری بنکەی پۆلیسکە، دوای قسەکانم، مافی پێدام و

جارێکی دیکه له ئێوارەی ڕۆژێك بەر له دادگاییکردن منی نەبردە قەرەقۆل و ڕۆژی دادگایی کردنەکەش هیچ پۆلیسێکی بەدوادا نەناردم. ئونسالْ ئۆزتورك بۆ ئەوەی ئەو دۆخەی پێشوو جارێکی دیکه دووباره نەبێتەوە، چەند جارێك به ترومبێلی خۆی هاته دوام، لەگەڵ ئەوەی دوو پۆلیسیشی لەگەڵ بوو. ئیدی چەند جارێکیش ئاوا چووینه دانیشتنەکانی دادگا.

لەوێ دەمێدا، لەگەڵ ڕێکارێکی توندی لەو شێوەیەی لەسەرەوە باسم کرد، بەڵام دەتوانرا کامێرا ببردرێته ناو دانیشتنەکانی دادگا. وەك چۆن دەتوانرا دەنگیش تۆمار بکرێت. ئەردەم باڵجی کارمەندی وەشانخانەی (یورت کیتاب) چەند جارێك هاتبووە دانیشتنەکانی دادگامان و چەند وێنەیەکی له کاتی بەڕێوەچوونی دادگایی کردنەکەمان گرتبوو. جگه لەمانه، شانده بیانیەکانیش دەیانتوانی بێن و وەك گوێگر بەشداری دانیشتنەکانی دادگا بکەن.

## ئەو یەکگرتنەی نەهاتە بوون

له ناوەڕاستی نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوو، وەشانخانەی (یورت کیتاب) پرسگرێکێکی ماددی زۆری هەبوو، چونکه بەشێکی زۆری پەرتووکەکان دوای چاپکردنیان، بەر لەوەی بکەوێته بازاڕ و بفرۆشرێت، به بڕیاری دادگا کۆدەکراوە، بۆیه ئەو بڕیارانەی دادگا دەبووە لەمپەر لەبەردەم دابەشکردن و فرۆتنی. بەوپێیەی له دادگا دۆسیەیان لەسەر پەرتووکەکان دەکردەوە و ئێمەش لەسەری دەستگیردەکراین.

بەرامبەر بەم پێشهاتە نەخوازراوە، دۆست و هەڤاڵان پێشنیازی

ئەوەیان کرد، با ڕووناکبیران و نووسەرانی تورکیا، دژی دادگایی کردنی من و وەشانخانەکە دەست بە نووسینی بەرگرینامەیەك بکەن و لەو بارەیەوە جۆرێك لە یەکگرتووی بۆچوون دروست بکرێت. دواتریش نووسینەکان کۆبکرێتەوە و لە دوو تویی پەرتووکێکدا چاپ بکرێ. دوای بلاوکردنەوە و فرۆشتنیشی، داهاتی کیتابەکە بدرێت بە وەشانخانەی (یورت کیتاب).

پێشنیازەکە بۆ خوێنەران و ئەهلی کتێب لە تورکیا و دەرەوەی ولاتەکە ئاشکرا کرا، وەلێ هیچ پێشوازیەکی گەرمی لێ نەکرا. جگە لە نووسینی چەند وتارێکی کورت لەلایەن چەند نووسەرێکەوە لەسەر مافی ئازادی ڕا دەربڕین و نووسین، هیچی دیکەی شایەنی گوتنیان بلاو نەکردەوە و هیواکە هیچی لێ سەوز نەبوو.

لە سەردەمێکی وەکوو ئەمڕۆمان لە سالی ٢٠٢٠، نووسەران و ڕۆژنامەنوسان، بە هۆی بوونی هەر لێکۆلینەوەیکی دادگا، یان هەر پالەپەستۆیەکی پۆلیس بۆسەر نووسەر، یان ڕۆژنامەڤانێك، هەر زوو دەستدەکەن بە گوتنەوەی چەند درووشمێکی وەکوو (هەموومان هرانت دینکین[1]) (هەمووومان بەکساڤین) (ئێمەش

---

[1] هرانت دینك (١٩٥٤-٢٠٠٧) ڕۆژنامەنووسێکی بەڕەچەلەک ئەرمەنی بوو، سالی ١٩٥٤ لەشاری مەلاتی لەدایک بووە. دوای لە یەك جیابوونەوەی دایک و باوکی، تا تەمەنی ٧ سالان لەمالی نەنکی بووە، دواتر چۆتە هەتیوخانەیەکی ئەرمەنی لە ئەستەنبول و تاکو قۆناغی ناوەندی لەوێی خوێندووە؛ پاشان بەهۆی ئەوەی چۆتە سەر ڕێبازی بیروباوەڕی کۆمۆنیزمی ماوی، لەهەتیوخانەکە دەرکراوە. هیرانت دینک بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لەبواری ئاژەلداری لە زانکۆی ئیستانبول وەرگرتووە و دواتر خۆیی و ڕایتشلی هاوسەری خەیوەتگایەکیان بۆ پێگەیاندنی لاوە ئەرمەنییەکان کردووەتەوە، کە ١٥٠٠ مندالی لەخۆگرتبوو، بەلام لەسالی ١٩٧٩ دەسەلاتدارانی تورکیا دەستیان بەسەر خەیوەتگاکەدا گرتووە. بەهۆی =

فەڵەستینین). لێ ساڵی ١٩٩٠ بۆ وەشانخانەی یورت کیتاب و من، هیچ هەوڵێکی لەو شێوەیە ڕووی نەدا. لە کاتێکدا من پێم وایە تێگەیشتن و ڕوونکردنەوە لە دۆخەکە کاری نەکردە نییە. هونەرمەند لالە مەنسور و شانار یورداتاپان، لە نزیکەوە ئاگاداری ئەو دۆخەن. جا بەڵگەیەکی دەستپێشخەرییە سەرنەکەوتووەکە لای کاک ئونسال ئۆزتورك هێشتا هەر هەیە.

## وتاری (کوردستان کۆلۆنییەکی نێودەوڵەتی)

پارتی سۆسیالیستی کرێکارانی تورکیا[1]، لە ساڵی ١٩٨٦، بە ناونیشانی (گۆروش-بۆچوون) گۆڤارێکی مانگانەیان بڵاودەکردەوە. چاتای ئەنادۆڵوو بەڕێوەبەری نووسینی گۆڤارەکە بوو. ئۆیا بایداریش لەوێ نووسینی بڵاودەکردەوە. ئۆیا بایدار هاوکات یەکێك بوو لە دامەزرێنەرانی پارتی سۆسیالیستی کرێکارانی تورکیا.

---

هەڵوێستە سیاسییەکانییەوە ٣ جار زیندانی کراوە. هیرانت دینک لەساڵی ١٩٩٦ ڕۆژنامەی ئاغۆسی دامەزراندووە و خۆشی وەکو سەرنوسەر لەوێ کاری کردووە، کە بەهەردوو زمانی تورکی و ئەرمەنی بڵاودەکرایەوە. بەهۆی ئەوەی داکۆکی لە مافەکانی ئەرمەن کردووە و داوای لەحکومەت کردووە دان بە کۆمەڵکوژی ئەرمەنەکاندا بنێت، هیرانت دینک ڕوبەڕوی نارەحەتی و هەڕەشە بۆتەوە. ساڵی ٢٠٠٦ بەتۆمەتی سوکایەتی کردن بە ناسنامەی تورکی بۆ ماوەی ٦ مانگ زیندانی کراوە. ساڵی ٢٠٠٧ هیرانت دینک لەبەردەم بارەگای ڕۆژنامەی ئاغۆس لەلایەن هاوڵاتییەکی بەرەچەڵەک تورک، دراوەتە بەر دەستڕێژی گوللە و دەست بەجێ گیانی لەدەستداوە. (وەرگێڕ).

[1] پارتی سۆسیالیستی کرێکارانی تورکیا، لە ساڵی ١٩٧٤ دامەزرا. پارتەکە بە یەکەم پارتی سۆسیالیست دادەنرێت لە تورکیا. (وەرگێڕ).

ساڵی ١٩٨٨، وتارێکم بۆ گۆڤاری گۆروش نارد. نووسینەکە بە ناوی **(کوردستان کۆلۆنییەکی نێودەوڵەتی)** جا وتارەکە تەواوێك درێژ و فراوان بوو.

سەبارەت بە نووسین و ناردنی ئەو وتارە، لە ئەنقەرە لەگەڵ چاتای ئانادۆڵوو لە یەکێك لە باڵەخانەکانی شەقامی نەجاتی بەی دانیشتین و لەبارەی نێیسەکەوە دواین. ئەو، دوای ئەوەی وتارەکەی بە دەست گەیشت، ئەوەی پێ ڕاگەیاندم کە، نووسینەکەی خوێندۆتەوە و بڵاوی دەکاتەوە. دواتر لەسەر هەمان مژار، بە تەلەفۆنیش قسەمانکرد؛ لەوێ گوتی "هەندێك لەبرادەرانی دیکەش نووسینەکەیان خوێندۆتەوە، سەبارەت بە بڵاوکردنەوەشی ئەوانیش بۆچوونی خۆیانم پێدەڵێن". بۆ جاری سێیەم لە ڕێگای تەلەفۆنەوە لەگەڵ چاتای ئانادۆڵوو، لەسەر هەمان مژار دوام. ئەویش بەوە وەڵامی دامەوە، بە هۆی گفتوگۆی دەستەی نووسەرانەوە تاکوو ئێستا لەسەر بڵاوکردنەوە یان نەکردنەوەی نووسینەکەت، خۆمان یەك لایی نەکردووەتەوە. دوای ئەو تەلەفۆنە، هەستم بەوە کرد، نووسینکە لە گۆڤاری گۆروش بڵاو ناکرێتەوە. دکتۆر زافەر ئوسکوڵ، لە نزیکەوە پەیوەندییەکی توندوتۆڵی لەگەڵ پارتی سۆسیالیتی کرێکارانی تورکیا و گۆڤاری گۆروش هەبوو. هەروەها وەکوو ڕاوێژکارێکیش هاوکاری گۆڤارەکەی دەکرد.

لە هەموو کەس باشتر، ئومێد فرات ئاگاداری ئەو پێشهات و پەیوەندیانە بوو. دواتر بڕیاری بڵاونەکردنەوەی نووسینەکەم درا، ئەمەش کاریگەرییەکی نەرێنی لەسەر هەست و نەست و بیرکردنەوەم دروست کرد، پەرتووکی (کوردستان، کۆڵۆنییەکی

نێودەوڵەتی) بەرهەمی فراوانکردن و دەوڵەمەندکردنی ئەو نووسینە بڵاونەکراوەم بوو.

مەراسیمی کردنەوەی ئینیستیوتی کوردی لە ئیستانبوڵ، لە هەژدەمین ڕۆژی مانگی چواری ساڵی ١٩٩٢. لە چەپەوە: ئیسماعیل بێشکچی و عیسمەت شەریف وانلی و فەقێ حوسێن ساغنج.

## بڵاوکردنەوەی دۆسیەی (کوردستان کۆڵۆنییەکی نێودەوڵەتی) و پێشاژۆی دادگا

لە بەرواری ٢٥ی مایسی ١٩٨٧ لە گرتووخانەی عەنتابی تایبەت ئازادکرام. لەوێ دەمێدا، دۆخی کوردستانی عێراق و سووریا و تورکیا و ئیران، وەك بەشی جیا جیا گەنگەشە و ڕاڤە دەکرا. بەشێك لە توێژەران دەیانگوت قافقاسیش کوردستانە، بۆیە ئەوێشیان وەکوو بەشێك لە کوردستان بۆ توێژینەوەکانیان زیاد دەکرد. لێکۆڵەرەوانی ڕۆژئاوا و کەسانی ئەهلی ئەکادیمیا و زانستی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو، ئاوا توێژینەوەیان دەکرد.

لە کاتێکدا پێویست بوو، وەکو یەك پارچە، لێکۆڵینەوە و شیکردنەوە بۆ کوردستان بکرێت. چونکە ئەو جۆری میتۆدە لە کارککردن لەسەر کوردستان، دەبووە هۆی ئەوەی دابەشکردن و پارچەپارچەکردن و جیاکردنەوەی کورد و کوردستان بێنێتە ڕۆژەڤەوە. من هەوڵی ئەوەمدا ئاوا کار بکەم. لە نێوان ساڵانی ١٩٨٧-١٩٨٨ ئەو جۆرە توێژینەوانە بەردەوام بوون. لە زیندان زۆرم بیر لەو مژارە کردەوە، هەروەها هەوڵی کۆکردنەوەی بەڵگە و زانیاریمدا.

لە بەراییەکانی ساڵی ١٩٨٩ دوای نووسینەوەی بۆچوونەکانم بە ئامێری چاپکردن، ئیدی خەریك بوو کارەکەم تەواو دەکرد. لەوێ دەمێدا زوو زوو هێزەکانی ئاسایش هەڵیاندەکوتا سەر ماڵەکەم. دەستگرتن بەسەر پەرتووك و نووسین و گۆڤار و ئەرشیفەکانم

کــارێکی هەرە لە پێشــینەی ئەو پۆلیســانە بــوون کە بەســەریان دادەدام.

خۆشــبەختانە دەتــوانرا لە ڕێگــای بەکارهێنــانی کــاغەزی کــاربۆنەوە، لە کــاتی نووســینی ئــامێری چــاپکردنەوەکەوە چەنــد وێنەیەکــی لــێ وەربگیــردرێتەوە. بەڵام شــاردنەوەی ئەو دانــانە، لە کاتی ئۆپەراسیۆنەکانی سـەر ماڵەوە، کارێکی ئاسان و بێ کێشە نەبوو. بۆیە دەمویست دانەیەك لەوانەی وێنەم لێی گرتوونەتەوە، بۆ ئەوروپا بنێـرم. بـۆ ئەوە قسـەم لەگەڵ ئەو پەرلەمانتـارانە کـرد، کە هاموشـۆی ئەوروپایـان دەکـرد. ئەوانـیش داواکـارییەکەی منیـان قبـووڵ کـرد، بەڵام سـەرباری هەموو تەشەبوسێکم، بەڵام کـارەکە سەری نەگرت و نەمتوانی دانەیەك بۆ ئەوروپا بنێرم.

## دیداری خاتوو دانیال میتران

لە کۆتـایی مـانگی نیســانی ســاڵی ١٩٨٩، چەنـد نـووچەیەك بڵاوبۆوە، گوایە مەدام میتران (١٩٢٤-٢٠١١)، سەردانی کامپەکانی پێشـمەرگە دەکـات لە شـارەکانی دیـاربەکر و مـوش و مێـردین. هەروەهـا بـاس لەوە دەکـرا، بەر لەوەی دانیـال میتـران سەردانی کامپەکان بکات، لە ئەنقەرە لەگەڵ بەرپرسانی حکوومەتی تورکیا دەجڤێت.

لە کۆتا ڕۆژەکانی مانگی چوار، دانیال میتران گەیشتە ئەنقەرە، دوای هاتنیشـی، ویسـتی دیـداری خـۆی لەگەڵ چەنـد ڕۆشـنبیر و نووسەرێك بەیان کردبوو. لەناو ئەواندا داخوازی بینینی پارێزەر شـەرەفەدین ئەلچـی[1] و پـارێزەر مـحەمەد عەلـی ئاسـڵان و منـی کردبوو.

کۆتـا ڕۆژی مەهـی چـوار، هاوشـانی شـەرەفەدین ئەلچـی و مـحەمەد عەلـی ئاسـلان، چووینە باڵیۆزخـانەی فەرەنسـا لە ئەنـقەرە. ئێمەیـان بـردە یەکێـك لە ژوورەکـانی باڵەخـانەکە. کەمێـك دوای دانیشـــتنمان، ئەریـــك ڕۆولـــووی (١٩٢٦-٢٠١٥) بـــاڵیۆز هـــاتە

[1] شەرەفەدین ئەلچی (١٩٣٨-٢٠١٢) سیاسەتمەدارێکی باکووری کوردستان بوو. ئەو سـەرۆکی پـارتی دیموکراسـی بەشـداربوان بـوو. سـاڵی ١٩٧٧ دەبێتە ئەنـدامی پەرلەمانی تورکیای شاری مێردین. لە ساڵانی (١٩٧٨-١٩٧٩) لە کابینەی بوڵەنت ئەجەڤیـد، وەکـو وەزیـر، پۆسـتی وەزارەتـی کاروبـاری گشـتی بەرێـوەبردووە. (وەرگێڕ).

پێشوازیمان. من باڵیۆزم وەکوو ڕۆژنامەڤانێك دەناسی، ئەوکاتەی پەیامنێری ڕۆژنامەی (لۆمۆند) بوو لە تورکیا و ڕۆژهەڵاتی ناڤین.

ئەوکاتەی لە مانگی چواری ساڵی ١٩٨١، لە زیندان کاینارجە ئازاد کرام، ئەریك ڕۆولوو ئەوسا لەسەر پرسی کورد و بزوتنەوەی کوردی لەگەڵ من دیدارێکی سازکرد. لەوێ باسی دابەشکردن و پارچەکردن و جیاکردنەوەی کوردستانم کردبوو، لە پاڵ ئەوە، ڕەخنەم لە سیاسەتی فەڕەنساش گرتبوو. بۆیە ئەویش بە وردییەوە گوێی بۆ ڕادێرابووم و تێبینیەکانی خۆی دەنووسیەوە.

لە نێوان ساڵی ١٩٨٠-١٩٨٩، بیروبۆچوونم لەسەر ئەو مژارە، زێدە فراوان و پڕزانیاری تر ببوو، بۆیە بە بەڵگە و زانیاری زیاتر، هەوڵی ئەوەم دەدا ئەو پرسە شەن و کەو بکەم. بەشێوەیەك بیرم لەوە دەکردەوە، ئەگەر دەرفەت هەبێ، دەمەوێ ئەو بیرۆکەیەشم بۆ مەدام میتران باس بکەم.

ئەریك ڕۆولووم لەو دەمەوە دەناسی کە وەکوو ڕۆژنامەڤانێك، هەواڵی سەبارەت بە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، ئامادە دەکرد؛ پێدەچوو ئەویش منی بیرهاتبێتەوە. جا تاوی قسانی داو پێی گوتم "بێشکچی لە دیدارەکەت لەگەڵ دانیال میتراندا باسی دابەشکردنی کوردستان مەکە... " لە کاتێکدا من بیرم لەوە دەکردەوە باسی ئەو مژارە بکەم.

کەمێك دواتر دانیال میتران هات، باڵیۆز هەریەك لە ئیمەی جیا جیا پێناساند. سەرەتا شەڕەفەدین ئەلچی بە کوردی دەستی بە قسەکردن کرد؛ وتەکانی ئەلچی وەرگێڕدرایە سەر زمانی فەڕەنسی.

چونکە دانیال میتران هاوشانی خۆی، وەرگێڕێکی کوردیشی لەگەڵ خۆی لە فەڕەنساوە هێنابوو. هەریەك لە کاك شەڕەفەدین و کاك محەمەد عەلی، باسیان لە زمانی کوردی و کولتووری کوردی و ئۆپەراسیۆنی ئاسیمیلەکردنی کورد کرد.

کە من دەستم بە قسانکرد، وتەکانی منیشیان کردە فەڕەنسی. منیش باسم لە دابەشکردن و پارچەپارچەکردنی کورد و کوردستان کرد، لەسەر دەستی وڵاتە ئیمپریالە زلهێزەکانی جیهان لە ساڵانی ١٩٢٠وە. جەنابی باڵیۆز زۆر نارەحەت بوو بە ئاخافتنەکەم و بە هێمای دەست و چاو، داوای بڕینی قسەکانمی دەکرد؛ دەیویست بە بێدەنگی ئەو پێم بڵی، دەبێ چی بڵێم و لە چیش بێدەنگ بم؛ وەلێ، من بەردەوام بووم لەسەر ئاخافتنەکەم. پاشان مەدام میتران هەستی بەوە کرد، کە باڵیۆز دەیەوێت قسەکانم پێ قوت بکا، بۆیە ڕووی لە ئەریك ڕۆولوو کرد و لەو کارەی وەستاند کە بەرامبەر من دەیکرد. پاشان داوای لێکردم کە بەدڵی خۆم و چیم دەوێت ئەوە باس بکەم و هیچ کەسێکیش ڕێگریت لێناکات، بۆیە منیش درێژەم دایێ...

لەگەڵ ئەوەی ماوەی دیدارەکە کورت بوو، بەڵام لەماوەی ١٠-١٢ خولەکێك لەسەر پرسەکە دوام. کە قسەم لەبارەیەوە دەکرد، مەدام میترانیش بە سەرنجەوە گوێی بۆ ئاخافتنەکەم ڕادێرابوو. ئەو گۆهدارییە وردەی خاتوو مەدام میترانم، لە وتارێکی چەند ڕۆژێك دواتری سەرۆککۆمار، فرانسوو میتراندا هەست پێکرد. میترانی سەرۆك کۆماری فەڕەنسا، بەبێ ناوهێنانی کورد، باسی ئەو ناحەقی و زوڵمەی دەکرد، کە لە ڕووی مێژوویەوە بەرامبەر بە گەلی کورد کراوە.

ئەو دۆسیەیەی کارم لەسەری دەکرد، لەگەڵ خۆمم بردبوو، بە مەبەستی ئەوەی ئەگەر دەرفەتێك هەڵکەوت، بیدەمە یەکێك، تا لەگەڵ خۆیان بیبەنەوە ئەورووپا. هاوکار و سەرپەرشتیاری شاندەکەی مەدام میتران لەتەك منەوە دانیشتبوو، بە تیلە چاوێك لە جانتا دیپلۆماسیەکەم ڕووانی، بینیم کراوەیە، منیش ئەوەم بە دەرفەت زانی و وەك ئەوەی جانتاکە هی من بێت، دۆسیە و نووسینەکەم خستە ناوی. دوای تەواو بوونی دیدارەکە، لەکاتی دەرچوون لە باڵیۆزخانە، دۆخەکەم بە مەدام میتران ڕاگەیاند، کە دۆسیەیەکم لەناو جانتای هاوکارەکەتان داناوە و تکا دەکەم لەگەڵ خۆتان بیبەنەوە فەرەنسا و لەوێ ڕادەستی پەیمانگی کوردی لە پاریسی بکەن. چونکە لە نزیکەوە ئاگاداری ئەوەبووم کە، مەدام میتران هەم وەکوو خانمی یەکەمی فەرەنسا و هەمیش وەکوو سەرۆکی وەقفی ئازادی، هاوکاری ئینستیتوی کوردی دەکات لە پاریس، وەك چۆن ساڵی ١٩٨٣ هاوکار بووە لە دامەزراندی پەیمانگاکە. دواتر ئەو کارەی خۆمم، بە هەڤالانی خۆشمان گوت. بەڵام کاك محەمەد عەلی ئاسلان بە تۆمەتی ئەوەی هیچ گوێ بە ئادابە دیپلۆماتییەکان نادەم، زۆر لێم تووڕە بوو.[١]

دوای دیدارەکەی ئێمە، هاوشانی شاندەکەی، مەدام میتران بۆ سەردانی کامپەکان، چوونە دیاربەکر. وەلێ لە فڕۆکەخانە جانتای هاوکارەکەی میتران ون دەبێ. ئیدی دوای ئەو پێشهاتە، هەوڵی

---

[١] مەدام میتران دوای چوونی بۆ دیاربەکر، لەوێ لەگەڵ هەریەکە لە مووسا عەنتەر و لەیلا زانا و دکتۆر ئەکرەمی سەرۆکی شارەوانیی ئەوسای مووش، دیدار و کۆبوونەوەی جیا جیای سازدابوو. (وەرگێڕ).

بڵاوکـردنەوەی ئەو نووسـینەم لە تورکیـا زیـدەترکرد. هەریەکە لە عائیشـە زاڕاکئۆغڵـوو و ڕاغـب زاڕاکئۆغڵـوو بەبـێ ئەوەی کـار لەسەر ئەو پرۆژە نووسینە بکەن، ئاگاداری ناوەڕۆك و مژارەکانی بـوون، بۆیە دەیانویسـت هەرچـی زووە بڵاوبکـرێتەوە. بۆیە دوای ڕووداوی ون بـوونی جانتـاکە، پێڤـاژۆی هەوڵـی بڵاوکردنەوەکەمان بلەزترکرد.

مەدام میتـران دوای سـەردانی کامپەکـان و گەڕانەوەی بـۆ پـاریس، لە ڕێگـای تەلەفـۆنی باڵیۆزخـانەی فەڕەنسـا لە ئەنـقەرەوە پەیوەنـدییان پێـوەکردم. لەوێ باسیان لەوەکرد دەیانەوێت خەڵاتـی ڕێزلێنـانی (لیگیـۆن هۆنیـور)[1]م پێشـکەش بـکەن. منـیش چـوومە باڵیۆزخانە و خەڵاتەکەم ڕەتکردەوە. ئەو ڕووداوە نەگەیشتە دەستی میدیاکاران، منیش بێدەنگیم لێکرد.

لە ڕۆژانـــی ١٤-١٥ی مـانگی دەی سـاڵی ١٩٨٩، بە هەوڵ و تەقەلای مەدام میتـران، کۆڕبەنـدی نێـودەوڵەتی کـورد لە پـاریس بەڕێوەچوو. لە ڕۆژانی ١٥-١٧ی مانگی سێی ١٩٩١ لە ستۆکهۆڵم، کۆڕبەنـدی کـورد بەڕێوەچـوو. ئەو ئەنجـام و پێشـنیازانەی لە هەردوو کۆڕبەنـدەکە پێشـکەش کرابـوو، دواتـر لە مـانگی دەی ساڵی ١٩٩٢، لەلایەن وەشانخانەی (دۆز) چاپ و بڵاوکرایەوە.

---

[1] خەڵاتی ڕێزلێنانی (لیگیۆن هۆنیور) بەرزترین خەڵاتی سڤیلی فەڕەنسایە کە لە ساڵی ١٨٠٢ لەلایەن ناپلیۆن بۆناپارتەوە بۆ ڕێزلێنانی کەسایەتیە هەڵبژێردراوەکان بڕیاری بەخشینی دراوە. (وەرگێڕ).

## زیندانی ساغماجلار

دوای هەوڵ و ماندوو بوونێکی زۆر و، کارێکی تاقەت پڕوکێن، پەرتووکی (کوردستان کۆڵۆنییەکی نێودەوڵەتی) لە مانگی دووی ساڵی ١٩٩٠ لەلایەن هەردوو وەشانخانەی (ئالان – بەلگە) چاپ و بڵاوبۆوە. ماوەیەکی کەم دوای وەشانی، بە بڕیارێك، قەدەغەیی دابەشکردن و فرۆشتنی کەوتەسەر. هەر دوای ئەو بڕیارەش داواکاری گشتی لە دادگای ئاسایشی دەوڵەت، دۆسیەیەکی دادگایی کردنی لەسەر من و عائیشە زاڕاکئۆغلووی سەرپەرشتیاری وەشانخانە کردەوە. دوای پێشکەشکردنی دۆسیەکە بۆ دادگا و یەکەم دانیشتنی دەستەی دادوەران، بڕیار لەسەر ئەوە درا، عائیشە زاڕاکئۆغلوو بە بێ دەستگیرکردن و منیش بە بەندکردن، پێشاژۆی دادگایی کردنمان بەڕێوەبچێ؛ بۆیە عائیشە خان ئازاد کرا و منیش خرامە زیندانی ساغماجلار. جا لەو باوەڕەدام کارێکی چاك دەبێ ئەگەر لێرە هەندێك زانیاری لەسەر دۆسیەکەمان و ئیفادەکانم بنووسمەوە.

ئەوسا دادگای ئاسایشی دەوڵەتی ئیستانبووڵ، ڕێك بەرامبەر پارکی گوڵهانە بوو. داواکاری گشتی بە هۆی پەرتووکەکەوە بانگهێشتی ئیفادە دانی کردبووم. لە نهۆمی دووەمی دادگا، لە هۆڵێکی گەورە و فرەدا، چوار پێنج مێز هەبوو. لە پشت هەر یەکێکیان داواکارێکی گشتی دانیشتبوو. کارمەندانی ئەوێ، منیان بردە لای ئەو مێزەی کە لە کۆتایی ژوورەکەدا بوو. داواکارە

گشتیەکە سەرەتا لە ڕاستی ناسنامەکەمی پرسیەوە. دواتر پرسی "ئایا تۆ ئەو پەرتووکەت نووسیوە؟". بەر لەوەی وەڵامی بدەمەوە هەندێك پرسیاری دیکەی سەبارەت بە کتێبەکە کرد. دوای ئەوەی دەمویست باسی هەندێك لە ناوەڕۆکی ناو پەرتووکە کە بکەم، گوتی "تۆ خۆت ئیفادەکەتیان پێ بنووسەوە... ".

بە کورتی و بە پوختی کیتابەکەم بۆ باسکرد و نووسیمەوە. پاشان باسم لەوەکرد، من بەرگری لەو بۆچوونانە دەکەم کەلەناو پەرتووکەکە نووسراوە. دوای ئەو وتەیەم، داواکارە گشتیەکە بە داخێکەوە گوتی "بە مەبەستی دەستگیرکردنت، دەبێ ئەو نووسراوانە بۆ دادوەر بنێرم..." لەکاتی ناردنمی بۆ لای دادوەر، داواکارە گشتیەکە وشەی (مامۆستام)ی بۆ بەکارهێنام.

کاتێك لەگەڵ ئەو کارمەندەی ئەوێ دەچووینە لای دادوەر، داواکارێکی گشتی بەرامبەرمان هات و بە تووڕەییەوە لێی پرسیم "من دەناسیت؟ منت بیرهاتەوە؟" منیش سەیرێکم کرد، وەلێ یەکسەر بیرم نەکەوتەوە. بەڵام ئەو هەر زوو خۆی پێناساندم (داواکاری گشتی زیندانی کاینارجە). دوای ئەوە من ئیدی هەموو شتێکم هاتەوە یاد. ئەو لە نێوان ساڵانی ١٩٨٠-١٩٨١ داواکاری گشتی بوو. لە سەردەمی ئەو لە زیندانی کاینارجە ئازاد ببووم، ئیدی ڕووداوەکانی دواتریشم بە هێسانی بیرکەوتەوە.

داواکارە گشتیەکە سەری قسانی گرت و گوتی "ساڵی ١٩٨١، من کاروباری ئازادکردنەکەم بۆ کردی. کە سەربەستم کردی بە تایبەت پێم گوتی: ئیدی شتی وا مەنووسە و خۆت تووشی بەڵایەك مەکە. کەمێك بەر لە ئێستا، ئەو ئیفادەیەی داتە داواکارە

گشتیەکەی ژوورەوە، منیش گوێم لێ گرت، تۆ هێشتا باسی کوردستان و موردستان دەکەی و گوێ بۆ کەسێك ڕادێری... من ئەو ڕۆژە چاکەیەکم لەگەڵ تۆ کرد و ئازادم کردی، جا ئەگەر بیرت بێت بەڵگەیەکی فەرمیشم پێدای کە لە زیندان تازە ئازادکراوی، بۆ ئەوەی ئەگەر لە ڕێگا پۆلیس تەشقەڵەیان پێکردی تۆش ئەو نووسراوە منیان پیشان بدەی. بەڵام تۆ لەچاکە و شتی وا تێناگەی". منیش ئەوەم بۆ باسکرد، کە بەرامبەر ئەو ئاخافتنانەت وەڵامی پێویست دەدەمە دادوەر و دەستەی دادوەری دادگا.

دادوەرەکان لە نهۆمی یەکەم بوون. ئەو دادوەرەی چووینە لای، کەسێکی زۆر مڕ و مۆچ و دەم و چاو ترشاو بوو. بە دەنگێکی زۆر جدیەوە پرسی "تۆ نووسیوتە؟" دوای ئەو پرسیارە و گوتنی چەند ڕستەیەك، ڕاستەوخۆ بڕیاری خستنە زیندانمی دەرکرد. دوای بڕیاری دادوەریش، کارمەندەکان منیان بردە بەندیخانەی ساغماجلار.

شەوێك لە شەوەکانی ناو زیندانی ساغماجلار، لای برادەرانی (دەڤ یۆلجوو) مامەوە. سپێدەی ڕۆژی دواتر منیان بردە قاوشی ١٣C، هەڤاڵانی پەکەکەش لەهەمان قاوش دەمانەوە. زۆر دواتر زانیم ئەو داواکارە گشتیەی لە دادگای ئاسایشی دەوڵەت ئیفادەی منی وەرگرت، هاوڕێی پارێزەر مەدەت سەرحەد[1] بوو.

---

[1] مەدەت سەرحەد (١٩٤٣-١٩٩٤) پارێزەر و سیاسەتمەدارێکی باکووری کوردستان بوو. ئەو لەلایەن هێزەکانی دەوڵەت لەبەر دەرگای ماڵەکەی شەهید کرا. (وەرگێڕ).

کاتێك لە زیندانی ساغماجلار دەستگیرکرابووم، وەشانخانەی (ئالان-بەلگە) لە مانگی سێی ساڵی ١٩٩٠ پەرتووکی (زانست و ئایدۆلۆژیای فەرمی دەوڵەت و دیموکراسی و کێشەی کورد)یان بڵاو کردبۆوە. جا بە تایبەت من داوای وەشاندنی ئەو پەرتووکەم کردبوو. وەك ئەوانی دیکە دابەشکردن و فرۆشتنی ئەو پەرتووکەش قەدەغەکرا. دیسان من و عائیشە زاراکئۆغڵوو دۆسییەی دادگایی کردنمان لەهەمبەر کرایەوە. بۆ ئەمەش داواکاری گشتی بە جیا جیا ئێمەی بانگهێشتی وەرگرتنی ئیفادە کرد.

لە بەهاری ١٩٩٠، وەشانخانەی (مەلسا) پەرتووکی (ڕووناکبیرێك و ڕێکخراوێك و کێشەی کورد)ی بڵاوکردەوە. بە هۆی ئەوەی نووسینی ئەو پەرتووکەش وەکوو ئەوەی پێشووتر ئامادەبوو، بۆیە زووتر تەواوی نووسینەکەم پێدابوون، تا لە دەرفەتێکدا چاپ و بڵاوی بکەنەوە. وەکوو ئەوانی پێشوو ئەمەش فرۆشتنی قەدەغەکرا. پاشان دۆسیەیەکی دادگایی کردن لەسەر من و مەتین داغلوومی بەڕێوەبەری وەشانخانەکە کرایەوە. ئیدی من جارێکی دیکەش دەستگیرکرامەوە.

هەر ئەو کاتەی لە زیندان بووم، لەسەر هەردوو پەرتووکی دواییم، دوو کەڕەت بە دەستێکی کەلەپچەکراو و دوو سەرباز کە لە ڕاست و چەپم بوون، منیان برد تا ئیفادە بدەم. جا ئەوە هەر لە چوونە ناو باڵەخانەی دادگاوە بگرە تا سەرکەوتن و هاتنە خوارەوە لە پەیژەکان و چوونە بەردەم داواکاری گشتی و ڕایی کردنی هەمووکارە ڕۆتینیەکان. لەوسەروبەندە هەستم بەوەکرد

کەسێك چاودێریم دەكات، هەرزوو لە چاوەكانییەوە دركم بە ئەڤینێك كرد. لەوێ دەمێدا ئاخافتنی كەسی دەستگیركراو لەگەڵی كەسانی دیكە قەدەغەبوو. دواتر زانیم ئەو كەسە یوجین شۆلگینی ئەندامی یەكێتی نووسەرانی نەرویجە. ئەوەشم لە زاری پارێزەرەكەمەوە زانی، كابرا هاتبوو تا لە دادگا بەشداری هەندێك لە دانیشتنەكانی ئەوێ بكات.

هاوینی ساڵی ١٩٩٠ دادگایی كردنی هەرسێ پەرتووكی دوایم تەواو ببوو. دانیشتنەكانی دادگا، بە ئامادەبوونی چەندان پارێزەر و میوانی دەرەوە بەڕێوەدەچوو. پارێزەرانم بەرگرینامەیەكی پێویستیان بۆ دۆخەكەم و پەرتووكەكانم كرد. ئیدی هەرسێ دۆسیەی دادگایی كردنەكەم كرانە یەك دۆسییە. بۆیە لە مانگی دەی ساڵی ١٩٩٠ لە زیندان ئازادكرام. بەڵام دانیشتنەكانی دادگا بەبێ دەستگیریی كردنم بەردەوام بوون.

## زیندانی ئوڵوجانلار

ساڵی ١٩٩١، لەسەر سێ دۆسیەی جیا، سێ كەڕەت دەستگیركرام و خرامە زیندان. سێ جاریش بڕیاری دەرچوونم لە زیندان بۆ دەرچوو. لە مانگی یازدەی ساڵی ١٩٩٣، تا نۆیەمین مانگی ساڵی ١٩٩٦، لە زیندانی ئوڵوجانلار بووم. دواتر لە زیندانی ئوڵوجانلارەوە گوازرامەوە بۆ گرتووخانەی مەتریس، لە ئیستانبووڵ.

بەهاری ساڵی ١٩٩١، نامەیەكم بۆ بەڕێوەچوونی جەژنی

نەورۆز نارد، کە بڕیار بوو لەلایەن پارتی کرێکارانی کوردستان، لە ئەڵمانیا ساز بکرێت. ئیدی بەو هۆیەوە دەستگیرکرام و خرامە زیندان. ئولکو جۆشکنی داواکاری گشتی، بە مەبەستی خستنە زیندانم، هاوشانی دۆسیەکەم منی ناردە بەردەم دادوەر.

کە بردرامە گرتووخانە، منیان لە قاوشی چوار دانا. لەوێ برادەرانی (دەڤ سۆڵ) دەمانەوە، لەگەڵ دوو هەڤالی پەکەکەیی، منیش لەگەل ئەو دوانەیان مامەوە. لەگەڵ ئەوان دەمانخوارد و دەمانخواردەوە. ئەوان چارپایەکیان پیشان دام بۆ مانەوە و گوتیان "ماوەیەك بەر لە هاتنی تۆ، هەر یەکە لە ویدات ئایدن[1] و ئەحمەد زەکی ئۆکچوئۆغلوو[2] ماوەیەك لەسەر ئەو چارپایە دوو ڤاتییە مانەوە". لە ناوەڕاستی قاوشەکە سۆبەیەکی لێبوو، سەرەڕای تێپەڕینی زستان و هاتنی وەرزی بەهار، بەڵام هێشتا سۆباکەیان بەکار دەهێنا.

ئەوان ڕۆژان، سەردەمانێك بوو کە سەددام حوسێن، وەکوو دەوڵەت دژی کورد تاوانەکانی گەیاندبووە ئاستی تیرۆر. ڕۆژانە لە ڕادیۆوە هەواڵی دۆخی ناهەمواری کوردان و لە

---

[1] ویدات ئایدن (١٩٥٣-١٩٩١) سیاسەتمەدارێکی کوردی باکووری کوردستانە. ویدات ئەوکاتەی سەرۆکی (هەپ)ی دیاربەکر دەبێت، شەوێك لە ماڵەکەی خۆی، بە بیانووی وەرگرتنی ئیفادە دەریدەهێنن و دواتر دەیڕفێنن. دوو ڕۆژ دوای ڕفاندنی، تەرمەکەی لە ژێر پردێکی ناوچەی مادەنی سەر بە شاری ئەلعەزیز بە ئەشکەنجەدراوی دەدۆزرێتەوە. بە پێی زانیارییە نافەرمیەکان بێ، ئەو سیاسەتمەدارە کوردە لەلایەن (ژیتەمەوە) کوژراوە. (وەرگێڕ).

[2] ئەحمەد زەکی ئۆکچوو ئۆغلوو، یەکێك بوو لە پارێزەرانی عەبدوڵا ئۆجەلان. دوای دەستگیرکردنیشی نزیکەی پێنج جار لە ئیمراڵی بۆ بەرگریکردن لە کەیسەکەی، سەردانی ئۆجەلانی کردووە. (وەرگێڕ).

تەلەفزیۆنییشەوە دیمەنی پەرێشانی ژیانی کولەمەرگیان پەخش و بـڵاو دەکـراوە. کـورد بە کـۆمەڵ، بە هەزار دەرد و ڕەزالەت، دەیانویست خۆیـان بگەیەنـنە سـنوورەکانی تورکیـا و ئێـران. لە کاتێکدا سەددام حوسێن و حکوومەتەکەی دەستیان لە ڕاوەدوونان و هێرشی سەر کورد نەدەپاراست.

لە بەرواری دوازدەمـین ڕۆژی مـانگی چـواری سـاڵی ١٩٩١، یاسـای بەرەنگـاربوونەوەی تیـرۆری ژمـارە ٣٧١٣، لە پەرلەمـانی تورکیـا، بە کـۆی دەنگـی پەرلەمانتـاران قبـوولکرا؛ ڕاستەوخۆش یاساکە کەوتە بواری جێبەجێکـردنەوە. ئەو دۆسیانەی لەسەر من دەکـرانەوە، پشـتیان بە مـاددەی ١٤٢ دەبەسـت؛ کە باسـی برینـدار کردنـی هەسـتی نەتەوەیـی تـورکی دەکـرد. ئەمەش بە مانـای ئەوە دەهـات، کە نووسـین و ئاخـافتن لەسـەر کـورد و کـوردایەتی بەو ماددەیە دادگایی دەکرێن، چونکە ئەمانە لە تورکیا دەبوونە هۆی برینـدار کردنـی هەسـتی نەتەوەیـی! جـا مـاددەی حەفتـی یاسـای بەرەنگـاربوونەوەی تیـرۆر ٣٧١٣ مەیـدانی ئەو جـۆرە چالاکیـانەی فراوانتـر دەکـرد. بە پشـت بەسـتنیش بە مـاددەی ١٤٢، سـزای زۆر گرانتر بەسەر کەسی تۆمەتبار دەسەپێندرا.

ئەو ڕۆژەی لە زینـدان دەرچـووم، یـوجەل خاڵسـیان[١] هێنـا

---

[١] یوجەل خاڵیس یان ناوی نهێنی عەلی شێر کۆچگیری (١٩٦٦-٢٠١١) یەکێکە لە سیاسـەتمەدارانی بـاکووری کوردسـتان. یـوجەل خـاڵیس لە سـاڵی ١٩٨٨ پەیوەنـدی بە ریزەکـانی پـارتی کرێکـارانی کوردسـتان کـرد و تـا ڕۆژی شەهیدبوونیشـی لە دەیەمـین ڕۆژی مـانگی دەی سـاڵی ٢٠١١ لە نـاوچەی خواکورك، وەکو گەریلایەك درێژەی بە خەباتی خۆیدا (وەرگێڕ).

قاوشەکەمان. بۆیە نەمتوانی ماوەیەکی زۆر لەگەڵ ئەو بمێنمەوە. من زیا خالسی مامیشم دەناسی.

ئێـــوارەی دوازدەمـــین ڕۆژی مـــانگی چـــوار، لە زینـــدانی ئولوجانلار دەرچووم. کاروباری ئازادکردنیشم لە ڕووی فەرمیەوە زۆری پێ نەچوو. سەیرێکی دەوروبەری خۆم کرد تا بزانم لەگەڵ من کەسی دیکە ئازاد دەکرێ یان نا؟ بەڵام نەفەرێکی ناسیاوم نەبینی. جا لە دەرچوونم کەسێك نەبوو لە چاوەڕوانی مندا بێ و لە دەرەوە پێشوازیم لێبکات. منیش جانتایەکی بچووکم پێبوو، بۆیە هەر بە پێ، لە ناوچەی بەنتدەرەسیەوە تا دشکاپی ـهاتم. دواتریش سواری ترومبێلی گواستنەوەی گشتی بووم و گەڕامەوە ماڵ. کە چوومەوە کەس لە ماڵ نەبوو، لەمانی خێزانم هێشتا لە قوتابخانە نەگەڕابـۆوە. بـۆیە ئـازادکردنەکەم بـۆ ئەویـش بـووە هـاتنەوەیەکی جیاواز.

وەشـــانخانەی (یـــورت کیتـــاب) لە مـــانگی حەفتـــی ١٩٩١، پەرتووکەکـــانی (تیـــرۆری دەوڵەت لە ڕۆژهەڵاتـــی ناوەڕاســـت، بیرکـردنەوە لەبـارەی ڕوونـاکبیری کورد)یـان بڵاوکـردەوە. هەردوو پەرتـــووك لە هەمـــان ڕۆژ بڵاوبـــوویەوە. لەســـەر بەرگـــی هەردوو پەرتووکەکەش پێشکەشییەکی وەها نووسرابوو (پێشکەشە بە ویدات ئایدن و هەموو شەهیدانی کوردستان).

زۆری پێنەچـوو و بڕیـاری کـۆکردنەوە و قەدەغەیـی فرۆشـتنی پەرتـووکەکە لەلایەن دادگـاوە دەرچـوو. لەوێ دەمێـدا لە نـاوچەی ئیسکلیپ بـووم. کـاك ئونسـاڵ ڕاستەوخۆ منـی بانگهێشتی ئەنقەرە کـردەوە. دۆسـیەی دادگـایی کـردن و لێکـۆڵینەوە لەسـەر هەردوو

پەرتـووك کرابـۆوە، بـۆیە چـووین تـا ئیفـادە بـدەین. داواکـاری گشـتی، وەکـوو جارەکـانی پێشـوو بە مەبەسـتی دەسـتگیرکردن و خسـتنمە زینـدانم، دۆسـیە و داواکـاری بـۆ دادوەر بەرزکـردەوە. دادوەریش بڕیاری خستنە زیندانمی دەرکرد. بەڵام کاك ئونساڵ بە بێ دەستگیرکردن دۆسیەی دادگایی کردنەکەی بەردەوام بوو.

پـۆلیس، منیـان بـردە گرتووخـانە. دوای تۆمـارکردنی نـاوم و ڕێکارە ڕۆتینیەکان، بینیم چەند هەڤاڵێکی پەکەکەیش لەوێنـدەرن. ئەوان هـاتن و منیـان بـردە قاوشـی ژمـارە ٥. یـوجەڵ خاڵسـیش لەوێندەر بوو.

لە قاوشی ژمارە چوار، ئەنـدامانی (دەڤ سۆل) دەمانەوە و لە قاوشـی پێنجـیش چەنـد پەکەکەیـیەك و هەنـدێك ئەنـدامانی ڕێکخراوەکـانی دیـکە. قاوشـەکە قەرەبـاڵغ بـوو و ژمـارەی پەکەکەییەکـانیش زۆر ببـوو. شـەڕەف و نـازمیەی بـرای یـوجەل خـاڵس، زوو زوو دەهـاتنە سـەردانی براکەیـان. لەوەنـد کانـاتیش وەکـوو پارێزەری مـن و وەشـانخانەی یـورت کیتـاب زوو زوو لە زیندان سەردانی دەکردم.

یەکێك لەو ڕۆژانەی لەگەڵ پارێزەرەکەم دیدارم هەبوو، لەگەڵ پارێزەران، شەرەفەدین ئەلچیش هاتبووە دیدەنیم. بڕیار بوو مانگی دەی هەمان سـاڵ هەڵبژاردنـی پەرلەمـانی تورکیا بەڕێوەبچێ. بۆیە داوای لە مـن کـرد تـا بـبمە پردێك بـۆ ئەوەی لە ڕێگـای مـنەوە، بەربژێـری پەرلەمانتـارییەکەی لەلایەن پەکەکەوە قبـووڵ بکـرێ و هاوکاری بکەن بۆ دەرچوونی. لە کاتێکدا من لەو مژارانەدا توانا و دانـاییەکی وەهـام نەبـوو، بـۆیە نەمزانـی دەتـوانم چـۆن چـۆنی هاوکاری ببم...

ڕۆژی جەژنـی کۆمـاری تورکیـا، لە زینـدان کەسـێك فیـراری کرد، باس لەوە دەکرا، ئەوەی ڕایکردووە، ئەندامێکی ڕێکخراوی (دەڤ ســـۆڵە). دوای فیـــرارییەکە ڕاســـتەوخۆ، پاڵەپەســـتۆی بەڕێـوەبەرایەتی گرتووخـانە بۆســەر ئـێمە زێـدە بـوو. مـاف و ئازادییەکانیشـمان کەمکـرانەوە. منـیش مـاوەیەك دواتـر، دوای دانیشـتنێکی دادگـا، بەبڕیـاری دادوەر ئـازادکرام. نـوح مەتەی داواکاری گشتی کۆماری تورکیا، لە پەرتووکی (کەشتیەکەی نوح) دەڵێ "هەڵە نەبـم، بەبێ ئەوەی هـیچ پەرتـووکێکی لە بیـر بـکەم، وابزانم دۆسیەم لەسـەر هەمـوو پەرتووکەکانی ئیسـماعیل بێشـکچی کردووەتەوە، بۆ ئەوەی دادگایی بکرێت".

## زیندانی ئیسکلیپ

سـەرەتای مـانگی یـازدەی سـاڵی ١٩٩٣، لە نـاوچەی ئیسـکلیپ بووم. دەمەو ئێوارە، پۆلیسێك هاتە ماڵ و ئەوەی پێڕاگەیانـدم کە لە بـنکەی پۆلیسـەوە داواکـراوم. کە چووم، بەڕێوەبەری بـنکەکە، لەسەر سکاڵایەك بڕیاری دەستگیرکردنەکەمی بۆ خوێندمەوە. لەوان ڕۆژانـدا لە ڕۆژنـامەی (حـورییەت) هەواڵێکـی بچووك لەسـەر من بلاوکرابۆوە. پوختەی نووچەکە بەم شێوەیە بوو "سزای ئیسـماعیل بێشـکچی لەلایەن دادگـای بـالاوە پەسـند کـرا". دوای هەواڵەکە هەندێك لە مەردوومی ناوچی ئیسـکلیپ سکالایەکی لەو شێوەیان دژ بە من لای بنکەی پۆلیس و داواکاری گشتی تۆمار کردبوو "سزای بێشکچی پەسند کراوە، حوکمیشی لە دادگاوە بۆ دەکراوە،

ئەگەر وایە بۆچی هێشتا لە ئیسکلیپ دێت و دەچێ؟ بۆچی دەستگیرناکرێ و ناخرێتە زیندان؟".

ئێوارەی هەمان ڕۆژ لە بنکەی پۆلیسی ئەوێ دەستبەسەرکرام، دواتر منیان ناردە لای داواکاری گشتی. دوای وەرگرتنی ئیفادەیەکی کورت، لەگەڵ داوای خستنە زیندانم، داواکارە گشتییەکە منی بردە لای دادوەر؛ دادوەریش دەلعاز بڕیاری بەندکردنی دەرکردم. بەڵام شەوم لە ژووری چاوەڕوانیکردنی بنکەی پۆلیس کردەوە ڕۆژ. ئەمە لەگەڵ ئەوەی بە داواکارە گشتیەکە و دادوەرەکەم گوت، دانیشتنەکانی دادگام لە دادگای ئاسایشی دەوڵەتی ئەنقەرە بەردەوامە و پۆلیس و داواکاری گشتی و دادگاش لەو دۆخەی من ئاگادارن، بەڵام قسەکانم پارەی نەکرد. چونکە ئەوان لەگەڵ ئەوەی منیان لە نزیکەوە دەناسی، بەڵام بە هۆی ئەوەی سکاڵام لەسەر تۆمار کرابوو، منیان سەربەست نەکرد و لای خۆیان گلیاندامەوە.

ژووری چاوەڕوانی کردنی بنکەکە، زۆر سارد و تاریك بوو، جا کورسیەك نەبوو بۆ دانیشتن. کاتێك خەریکی ئەوەبووم چارەیەك بۆ حاڵی نا حاڵی پۆلیسەکان و پەرێشانی خۆم بدۆزمەوە، پەیامنێری ڕۆژنامەی (دەنگی ئیسکلیپ) هاتە لام. کە هات داوای ئەنجامدانی ڕیپۆرتاژێکی لێکردم. بەڵام من ڕازی نەبووم و قسەم لەگەڵ نەکرد.

ڕۆژی دواتر، چەند پۆلیسێك بە پێ، بە تێپەڕین بەناو کوچە و کۆڵان و گەڕەکەکانی ئیسکلیپ، بە دەستی کەلەپچەکراوم، منیان بردە زیندانی ئیسکلیپ... لە ڕێگا تووشی چەند ناسیاوێکیشمان

بووم، ئەوانیش بە حەپەساوییەوە سەیری من و پۆلیسەکانیان دەکرد. لە مێشکی خۆیان دەیانپرسی، ئاخۆ بێشکچی دەبەنە کوێ؟ ئەی بۆچی ئاوا دەستی کەلەبچەکراوە و هەردوو قۆڵیان لەملا و ئەولا گرتووە؟ یەکێك لە ناسیاوەکان لێم نزیك بۆوە تا بڵێ "بێشکچی بەخێر بێن" بەڵام پۆلیسەکان مۆرەیەکیان لێکرد و کابرا گەڕاوە دواوە.

زیندانی ئیسکلیپ، لە ناوچەی ئاکسووبوو. لە ژوورەوە منیان لەسەر قاتی دووەمی چارپایەکی ناو قاوشێکی زیندانەکە دانا. لە پەنجەرەوە دەمتوانی بە ئاسانی چەند دیمەنێکی جوانی ناوچەکانی دەوروبەر ببینم. جا لەوێوە بە ئاسانی ناو بازاڕیش دەبیندرا، چونکە تا ساڵی ١٩٥٠، زیندانەکە لەناو جەرگەی بازێڕ بوو.

چەند ڕۆژێك دواتر، داواکاری گشتی هاتە گرتووخانە. داوای منی کرد و بەیەکەوە دانیشتین. جا بە حەنەك و سووکایەتی پێکردن بە خەڵکی ئیسکلیپەوە گوتی "هاوشاریەکانت زۆریان خۆشدەوێی! چونکە زۆریان بۆ هێنام تا تۆ بخەمە کونجی زیندانەوە".

لە زیندانی ئیسکلیپ هەفتانە لە ڕۆژێکی دیاری کراو، مامۆستایەکی ئاینی دەهات و وەعزی بۆ دەداین و وانەی ئاینی بۆ باس دەکردین. منیش جارێك چووم و گوێم بۆی گرت. چونکە بەشداری کردن لەو گفتوگۆ و وانە ئاینیانە ناچاری نەبوو.

نزیکەی دوو هەفتە لە بەندیخانەی ئیسکلیپ مامەوە؛ لەو ماوەیەدا، جگە لە ماڵباتەکەم، کەسی دیکە سەردانی نەکردم. چونکە خەڵکی ناسیاوی ئیسکلیپ زۆر لەوە دەترسان بێن و لە

زینـــدان بمبیـــنن، چـــونكه له چـــوونه نـــاو گرتووخـــانه زۆر دەسەڵەمینەوە.

مەهدی زانا و ئونساڵ، لەگەڵ چەند برادەرێك ویستبوویان بۆ سەردانیكردنم بێنه ئیسكلپ. منیش به هۆی ناهەمواری دۆخەكه، داوام لێكـردن نەیەن و سـەردانم نەكەن. چـونكه چەنـد جارێـك لەگەڵ بەڕێوەبەری زیندانەكه دوام تا بمگوازێتەوە بۆ گرتووخانەی ئوڵوجـانلار له ئەنـقەرە. بەڕێـوەبەریش، له مـاوەیەكی كـورت، نووسـراو و كـارە فەرمیەكـانی بـۆ جێبەجێكـردم. له كۆتاییەكـانی مانگی یازدە گوازرامەوە. بەڵام بەر له گواستنەوەم، سەرەتا منیان بردە بنكەیەكی تەندروستی و ڕاپۆرتی تەندروستیان بۆ وەرگرتم. لەوێ ڕێگایـان پێـدام تـا دوو برازاشـم لەگەڵ بێـنه بـنكەكه. بەو بەهـانەوە مـاوەیەكیش لەگەل ئەوان هەڤـدوومان بینـی. یەكێـك له پەرسـتارە كـچه گەنجەكـانی بـنكەكه، زۆر به گەرمـی به دەورو خولمدا هات، دواتر پێی گوتم "تۆ هاوڕێی قوتابخانەی باوكمی". دوای وەرگرتنەوەی ڕاپۆرته پزیشكیەكان، كەوتینه ڕێ و به ڕێگای چانكری، بەرەو زیندانی ئوڵوجانلار بووینەوە له ئەنقەرە. بیرمه له ڕێگا من به شۆفێرەكەم دەگوت چۆن چۆنی به كوێدا بڕوا، بۆ ئەوەی بگەینه زیندانی ئوڵوجانلار، چونكه كابرا شارەزای شوێنی جوگرافی گرتووخانەكه نەبوو. جا له ڕێگا ئەو ئەفسەرەی هاوشانی ئێمه هاتبوو تا من ڕادەستی زیندانی ئوڵوجانلار بكا، به پێویستی نەزانی كەلەپچەم له دەست بكرێ.

له بەنـدیخانەی ئوڵوجـانلار، خرامه قاوشـی ژمـارە ٥. له هەمـان قاوش یاشـار كایاشی لێبوو. جگه لەو دكتۆر عەلی گوڤەنـدیكی پـارتی دیمـوكراتی گەلان (دەهەپ)یشـی لێبـوو. لەگەڵ چەنـدان دۆست و ناسیاوی دیكه. جگه لەمانه چەندان برادەری پەكەكەیش

لەوێبوون. لەوانە، حوسێن ماسدار، شێخۆ کارنجا، زانا مازاك، ئەحمەد مەقەس، سەبری تۆڕ، حاسڵ باڵتا، وەزیر، غازی ئاکسۆ، مونیر سونای، شەریکان کارا، حوسێن ئالاتاش، ئاتالای باریك، ئیمام جان پۆلات، کەمال ئۆکوتان. ئەوان چەند کەسێك بەیەکەوە داوایەکیان لە دادگا لەسەر بوو. بۆیە پەکەکەییەکان و دەهەپیەکان، لەهەمان کۆمەڵە و دەستە دەمانەوە. من و ئونسالیش لە کۆمەڵەکان شوێنێکمان بۆخۆمان کردەوە.

لەوێ وەزیر بەرپرسی جل و بەرگ و پۆشاك بوو، لە ڕووی شاردنەوە و دابەشکردنی. ڕۆژێك، لەناو یەکێك لە جڤینەکانی ئەو کۆمەڵەیە لە زیندان، سەبارەت بە دابەشکردنی پۆشاك، ڕەخنە لە وەزیر دەگیردرا و پێیان گوت "خاوەن هزری بۆرژوازی". لە بەرامبەر ئەو تۆمەتە وەزیر وەڵامی داوە "ئێوە هەڵەن ئەگەر ئاوا بە من بڵێن، بەڵام دەتوانن پێم بڵێن شەیتانی لادێ". وەزیر و ئاتالای لە گوندەوارییەکانی ناچەی قارس بوون. باوك و خوشك و براکانی ئاتالای، بەردەوام لە ئەنقەرە بەشداری چالاکیەکانی دەپ و هاداپیان دەکرد.

لە زیندانی ئولوجانلار، لە زۆر ماوەی جیاواز، لەگەڵ زۆر برادەر بەیەکەوە ماینەوە. لەوانە یلماز ئۆداباشی و ئەدیب پۆلات و شەهابەدین ئۆزئاسلانلاری سەرۆکی پێشووی شارەوانی وان و حیکمەت فیدان و فەرحان تورك و بابور پنار و نەعمان باکتاش و کەنعان کاراکاش... لێرە پێویستە ئەوەش بڵێین حیکمەت فیدان، لە هاوینی ٢٠٠٥، بە گولەیەکی پەکەکە لە دیاربەکر گیانی لەدەستدا.

لە قاوشەکانی دیکە، چەندان هەڤاڵ هەبوون کە بۆ چارەسەری تەندروستی لە زیندانەکانی دیکەوە دەهاتنە گرتووخانەکەی ئێمە.

لەوانە، کاك قادر، ڕەشید کاینار، شەوکەت زەکی، نەسیمی یامان. دەمەوێ ئەوەش بڵێم کە نەسیمی یامان، توێژینەوەکەی خۆی لەبارەی دۆخی ئابووری و کۆمەڵایەتی هەرێمی گاپ لە زیندان، لای ئێمە دەستپێکرد.

لە مانگەکانی هاوینی ساڵی ١٩٩٥، ئایدن دۆغانی خاوەنی بڵاوکراوەکانی (یابا) خرایە قاوشی پێنجەمی زیندانەکەی ئێمە. بەڵام میواندارییەکەی ئەو لە زیندان کورتی خایاند و گواستراوە بۆ گرتووخانەی هایمانا.

لەگەڵ ئەو ناوانەی لەسەرەوە هێنام، هەریەك لە فیکرەت باشکایا و هالۆك گەرگەر و چەند نووسەرێکی دیکەش بۆ ماوەیەکی کەم هێندرانە زیندانەکەی ئێمە و دواتر بۆ شوێنێکی دیکە گواسترانەوە. بەڵام لە کۆتایی ماوەی دانیشتنەکانی دادگایی کردنی برادەرانی پەکەکە و دەهاپ، دادوەر سزای زۆر گرانی بەسەردا سەپاندن. لەوانە هەندێکیان ٥٢ ساڵ و هەندێکیان ٤٠ ساڵ و هەندێکی دیکەشیان بە ٣٥ ساڵ زیندانی کردن سزادرابوون...

لە بەرواری دووەمین ڕۆژی مانگی سێی ساڵی ١٩٩٤، پەرلەمانی تورکیا، پارێزبەندی لەسەر پەرلەمانتارانی دەپ هەڵگرت. دوای ئەوە ئیدی ئەو پەرلەمانتارانەی پارێزبەندیان لەسەر هەڵگیرا، ڕاستەوخۆ خرانە زیندانی ئولوجانلار. بەڵام ئەوانیان لە قاوشێکی تایبەت و تەنیا دانا. بەڵام ئێمە دەمانتوانی سەردانی پەرلەمانتارەکان بکەین. لێ ئەوان نەیاندەتوانی بێنە ئەو قاوشانەی ئێمەی لێبوو. لەناو ئەو پەرلەمانتارانەی لامان بوون

هەریەکە لە لەیلا زانا[١] و خەتیب دیجلە[١] و ئەحمەد تورك[٢] و

---

[١] لەیلا زانا لە دایکبووی ساڵی ١٩٦١ی شاری ئامەدی باکووری کوردستانە. لەیلا لەگەڵ مەهدی ئامۆزای، ساڵی ١٩٧٥ ژیانی هاوسەرگیری پێکهێناوە. ئەو کچە کوردە تەنیا ١٤ ساڵ بووە و ئامۆزاکەشی ٢١ ساڵ لەو گەورەتر بووە. دوای کودەتا سەربازییەکەی ١٢ی ئەیلولی ساڵی ١٩٨٠ی تورکیا، مەهدی زانا سەرۆکی شارەوانی ئامەد بوو، بۆیە بەر شاڵاوی ئۆپەراسیۆنەکانی سوپای تورکیا کەوت و دەستگیرکرا و دواتر سزای ١٠ ساڵ زیندانی بەسەردا سەپێندرا. لەیلا زانا دوای دەستگیرکردنی هاوسەرەکەی، خۆی فێری خوێندن و نووسین کرد، دواتر قۆناغەکانی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی ئێوارانی تەواوکرد. لەگەڵ دەستپێکردنی خوێندن، دەستی بە ئەنجامدانی چالاکی سیاسیش کرد لە ئامەد، دواتر لە ساڵی ١٩٨٧ ڕێکخراوی مافی مرۆڤیان لە ئامەد دامەزراند و لە هەمان ساڵ لە رۆژنامەی (یەنی ئولکە) دەستی بە کاری رۆژنامەوانی کرد، ٣ ساڵ دوای کارکردنی وەکو رۆژنامەڤان، لەیلا زانا لەسەر لیستی (پارتی سۆشیاڵ دیموکراتی خەڵك-SHP) لە شاری ئامەد بووە پەرلەمانتاری ئەو پارتە و چووە پەرلەمانی تورکیا. لە شەشەمین رۆژی مانگی یازدەی هەمان ساڵ، لە سوێندخواردنی پەرلەمانتاران بۆ خولی تازەی پەرلەمان، لەیلا زانا قردێلەیەکی زەرد و سوور و کەسکی لەسەری بەستبوو، بەمەش هەر زوو تورکە ڕەگەزپەرستە پەرلەمانتارەکان کاردانەوەیان دروستکرد. دوای خوێندنەوەی ناوەکەی، زانا بەرەو ستەیجی سوێندخواردن بە ڕێکەوت، ئەوکات ئەو کچە کوردە پەرلەمانتارە تەمەنی ٣٠ ساڵ بوو. زانا بە زمانی تورکی دەستی بە خوێندنەوەی سوێند خواردنەکە کرد و گوتی "**ئەو سوێندخواردنە بەناوی برایەتی تورك و کورد دەخوێنمەوە**" دوای دەربڕینی ئەو ڕستەیە، لەناو هۆڵی پەرلەمان لەلایەن پەرلەمانتارە تورکەکانەوە هەڵایەکی گەورە و ناڕەزایەتییەکی زۆری لەسەر دروست بوو، کە دواجار بووە هۆی ئەوەی لەیلا زانا بە ١٠ ساڵ زیندانیکردن سزا بدرێت. زیندانیکردنی لەیلا زانا لە کاتێکدا بوو کە مەهدی زانای هاوسەری ماوەیەکی کەم بوو لە گرتووخانە دەرچووبوو. لە نەورۆزی ساڵی ٢٠٠٧ لە ئامەد، لەیلا زانا لەناو وتارە پڕ جۆش و خرۆشەکەیدا، بە زمانی کوردی گوتی "کورد سێ سەرکردەی هەیە و منیش سوپاسگوزاریانم و ڕێزم هەیە بۆیان؛ لە ناو دڵ و مێشکی هەموو کوردێکیشدا بە هەمان شێوەن؛ ئەوانیش مام جەلالی سەرۆککۆماری عیراق و مەسعوود بارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان و ئەوی دیکەش، هەموومان زوو زوو ناوی دەهێنین سەرۆك عەبدوڵلا ئۆجەلانە". دوای =

سرِی ساکك[٣] و مەحمود ئاڵناك و سەدات یورتتاش و ئۆرهان دۆغان[٤] و سەلیم ساداك دەبینـدران، مەهـدی زانـاش لەگەڵ پەرلەمانتارەکان دەماوە. بۆیە هەندێکجار کاتێك ئەوان دەچوونە دانیشتنەکانی دادگا، من هەندێکیانم دەبینی و چاك و چۆنیمان دەکرد. هەندێك لەو پەرلەمانتارانەی پارێزبەندیشیان لەسەر

ئەو وتارەی زانا، داواکاری گشتی تورکیا داوایەکیان پێشکەش بە دادگا کرد بە تۆمەتی ئەوەی بانگەشە بۆ تیرۆر دەکات. (وەرگێڕ).

[١] خەتیپ دیجلە، لە دایك بووی ١٩٥٥ دیاربەکرە. ساڵی ١٩٩١ بووە پەرلەمانتاری تورکیا. وەلێ دوو ساڵ دواتر، لەگەڵ هەریەکە لە لەیلا زانا و سەلیم ساداك و ئۆرهان دۆغان پارێزبەندییان لێ وەرگیراوە. دوای دادگایی کردنیشیان بە دە ساڵ زیندانی سزادران. (وەرگێر)

[٢] ئەحمەد تورك یەکێك لە دێرینترین و سەرسپیترین سیاسییەکانی باکووری کوردستانە. تورك لە ساڵی ١٩٤٢ لە ناوچەی دیرك لە مێردینی باکووری کوردستان لە دایك بووە. سەرەتای کاری سیاسی دوای کوژرانی برا گەورەکەی دەستپێدەکات. ساڵی ١٩٨٨ دوای کیمیابارانکردنی هەڵەبجە، لەسەر بەرگریکردن لە دۆزی کورد لە باشووری کوردستان لە کۆنفرانسێکدا لە پاریس، لەناو پارتی SHP دەردەکرێت، دواتر لەگەڵ چەند کەسێکی دیکە پارتی هەپ دادەمەزرێنن. (وەرگێڕ).

[٣] سرِی ساکك، یەکێکە لە سیاسەتمەدارە دیارەکانی باکووری کوردستان. ئەو لە دایك بووی ساڵی ١٩٥٧ شاری مووشە. یەکێکە لە دامەزرێنەرانی هەردوو پارتی (دەپ و دەتەپ). سرِی ساکك برا گەورەی شەمدین ساککی گەریلایە. (وەرگێڕ).

[٤] ئۆرهان دۆغان (١٩٥٥-٢٠٠٧) سیاسەتمەدارێکی کوردی خەڵکی شرناخە. یەکێکە لە دامەزرێنەرانی (هەپ). دواتر لە ساڵی ١٩٩١ دەبێتە پەرلەمانتاری تورکیا. دوای مەراسیمی سوێندخواردنەکەی لەیلا زانا، لەلایەن دادگای ئاسایشی دەوڵەتەوە بە ١٥ ساڵ زیندانی کردن سزادرا. دوای تانە گرتن لە بڕیارەکەی دادگا، لای دادگای مافی مرۆڤی ئەورووپا، سزای ٢٥ هەزار دۆلار بەسەر تورکیادا سەپێندرا، بەڵام ئۆرهان دۆغان هیچ لەسزای زیندانیکردنەکەی کەم نەکرایەوە. (وەرگێڕ).

هەڵگیرابـــوو، بەر لەوەی دەســـتگیربکرێن، چووبـــوونە دەرەوەی تورکیـا، لەوانە ڕەمـزی کارتـاڵ، زوبەیـر ئایـدار، نـایف گـونەش، نیزامەدین تۆگوچ و عەلی یغیت.

## نەورۆزی ئوڵوجانلار

ڕۆژێـك بەر لە نەورۆزی سـاڵی ١٩٩٥، کـارگێڕی زینـدان پێـی ڕاگەیاندین کە بۆنەی نەورۆز لە قاوشی ژمارە چوار سازدەکرێت. هەمـوو گیراوانـی نـاو زینـدان دەهـاتنە قاوشـی دیـاری کـراو. لە کاتێکدا نەورۆز جەژنی کوردانە و کوردەکانیش لە قاوشی ژمارە پێنج دەمانەوە. بۆیە ئەمە بووە هۆی ئەوەی دەمەقاڵێ و نیقاشێکی زۆر دروست ببێت. لە ئەنجامدا کوردەکان نەچوونە قاوشی ژمارە چوار و نەورۆز لە قاوشی ژمارە پێنج پیرۆز کرا. هەروەها چەندان گیـراوی دیـکەی تـۆمەتی کـۆمەڵایتیش لە قاوشـەکانی دیـکەوە بەشداری بۆنەکەیان کرد.

یڵمـاز ئۆداباشـی، بەردەوام لە قاوشـەکە، باسـی نووسـەر بـوونی خۆی دەکرد. ئەدیب پۆلاتیش، بێ پسانەوە نامەی بۆ نووسەرانی نێـودەوڵەتی و ڕێکخراوەکـان دەنـارد. لەپـاڵ ئەمـانە نـوکتە و بەسەرهاتەکانی حوسێن ماسدار زۆر خۆش و جوان بوون، بۆیە ئەمە زوو زوو دەبـووە ڕۆژەڤـی هەمـوو لایەك. دکتـۆر عەلـی گوڤەنـدیکیش لە نـزیکەوە ئاگـاداری سـەرجەم نەخۆشـەکانی نـاو قاوشەکە دەبوو.

ڕێکخراوەکان، بۆ جێبەجێکردنی بەرنامەیەکی پەروەردەیی بۆ ئەنـدامانی خۆیـان سـەرقاڵی کۆبـوونەوە و دانـانی پلانێـك بـوون.

پەکەکە و داهاپیش جڤینی وەهایان دەکرد. جا خوێندنەوەی ڕۆژنامەش وەکوو بە چالاکیەکی پلان داڕێژراو دەکرا. برادەرانی پەکەکە، تەنیا ئەو نووسین و هەواڵانەیان دەخوێندەوە کە تایبەت بوو بە پارتەکەیان. بۆیە ڕۆژێك لەسەر ئەو بالینگانەی لەسەری پالکەوتبووم، لە قاتی دووەمی قەروێلەکەم، لە قاتی دووەمی چارپاکەی دراوسێمەوە، ئەوان کۆببوونەوە و ڕۆژنامەیان دەخوێندەوە. یەکێك لە برادەران سەردێڕی هەواڵەکانی ناو ڕۆژنامەکەی دەخوێندەوە، بۆ نموونە (کۆبوونەوەی بەیانی لوتکەی یەکێتی ئەورووپا، لە ڤیەننا دەستپێدەکات) ئەو گوتی "ئەوە پەیوەندی بە ئێمەوە نییە تێپەڕە". یان هەواڵی (لافاوێکی گەورە لە ئەمریکای لاتین) دووبارە دەیگوتەوە "ئەوەش پەیوەندی بە ئێمەوە نییە تێپەڕە". یان نووچەی (ئاڵۆزی نێوان موسوڵمانان و هیندۆسیەکان لە هیندستان) هەمان دەربڕینی بۆ ئەو هەواڵەش سێبارە کردەوە. دوای ئەوانە نووچەیەك هات بەو ناونیشانە (گەریلا بە نهێنی شوێنی خۆیان گۆڕی). جا گوتی "ئەها ئەوە پەیوەندی بە ئێمەوە هەیە و بیخوێنەوە".

لە زیندان، کاتێکی سەربەستی خوێندنەوە هەبوو. ئەو ڕۆژانەی چالاکی خوێندنەوەی لێدەکرا، لە چارپاکەی تەکمەوە، غازی ئاکسۆی پەرتووکی دەخوێندەوە. منیش سەیرێکم کرد و بۆ ماوەیەك هەستمکرد ئەو لاپەڕەی لەبەر دەمیەتی ئاودیووی ناکا و هەر سەیری هەمان لاپەڕە دەکات. تۆزێك سەرم بۆی خوار کردەوە و بینیم وێنەیەکی بچووکی کوڕەکەی لەسەرووی لاپەڕەکەوەیە. دیار بوو بە حەسرەتەوە، سەیری ڕۆڵەکەی دەکرد. چەند ڕۆژێك پاشتر، لە یەکێك لە ڕۆژەکانی سەردانیکردندا،

فوراتی کوڕە بچووکی غازی ئاکسۆی، لەگەڵ ماڵەوەیان هاتە سەردانی باوکی. زارۆکێکی زۆر خۆشەویست و دڵگیر بوو. فورات بە دەستێکی شوشەیەکی کۆلا و بە دەستەکەی دیکەشی چوکلێتی دەخوارد و دەم و لووتی خۆی هەموو کردبووە شیرینی و ئاوا لە نێوان مێز و کورسیەکانی شوێنەکە بەناو هەڤاڵاندا هاتوچۆی دەکرد.

غازی ئاکسۆیی و مونیر سونای، خەڵکی ناوچەی ساڤوری مێردین بوون، ئەوان لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٨٠ وەکوو کرێکار چووبوونە لوبنان، لەوێوە پەکەکەیان ناسی بوو و ببوونە سەمپاتیزانی ئەو پارتە.

## "تۆ هاتی تا باوکت ببینی، منیش کوڕەکەم...!"

دەمەوێ بیرئانینێکی کورتی دیکەم لەگەڵ نەسیمی یامان بهێنمە زمان، ڕاستییەکەی بیرەوەریەکە لەگەڵ ڕووکەنی کچی نەسیمە. لە ڕۆژێکی سەردانی باوکاندا، ڕووکەن هاتبووە سەردانی باوکی. ئەوسا ڕووکەن تەمەنی ١٠-١٢ ساڵان دەبوو. دیدارەکە کراوە بوو. ئەو دوای هاتنی، لەسەر کورسیەك دانیشتبوو و چاوەڕوانی کردنەوەی دەرگا بوو تا باوکی بێتە لای. لەو سەروبەندە پیاوێکی بە تەمەن هاتبوو و لە کورسیەکەی بەرامبەر ڕووکەن دانیشتبوو. ڕووکەن کە کابرای ڕیش سپی ئیختیاری بینی بوو، زۆر سەری سووڕمابوو. چونکە ئەو پێی وابوو لە ڕۆژی سەردانی باوکاندا، ئەوانەی دێن، هەمووی کەسی گەنج و

بچووکی تەمەنی خۆین، بۆ ئەوەی باوکیان ببینن. بۆیە بیری لەوە کردبۆوە، ئەو کابرایە ئەگەر خۆی ئاوا بەتەمەن بێت، دەبێ باوکی چەند بێت؟

چەند خولەکێك بەسەر ئەو بیرکردنەوانەی ڕووکەن تێدەپەڕێت و دەرگا دەکرێتەوە و گرتیەکان دێن بۆ دیداری ئازیزانیان. ئەو ڕۆژە بینیم لەگەڵ نەسیمی کەسێکی دیکەی گەنجیش هاتە ئەوێ و بەرەو باوکی ڕایکرد و پرِیدا دەستی و ماچیکرد. ڕووکەن کە ئەو دیمەنەی بینی، زیاتر حەپەسا. کابرای ئیختیاریش هەستی بەو زار بەشییەی ڕووکەن کردوە و ڕووی تێکردوە و پێی گوتووە "ڕۆژی باوکانە... تۆ هاتی تا باوکت ببینی، من هاتووم تا کوڕەکەم ببینم... ".

ماوەیەك بوو لە زیندان مانگرتن لە خواردن و خواردنەوە دەستی پێکردبوو. ماوەیەك دواتر برادەران لە نێوان خۆیاندا باسی ئەوەیان دەکرد لە ژیانیان کێ چەند ساڵ و مانگ و ڕۆژ مانی لە خواردن گرتووە. هەبوو باسی چوار پێنج ساڵی دەکرد، هەبوو باسی هەشت نۆ مانگی دەکرد، هەشبوو دەیگوت بیست سی ڕۆژ. بەڵام نومان باکتاش هاتە دەنگ و گوتی "من نیوەی تەمەنی زیندانم بە مانگرتن لە خواردن تێپەڕاندووە".

## "تا قاوش نەسووتێندری، بۆ کوێ دەربچین مامۆستا ئیسماعیل؟!"

لە ناوەڕاستی مانگی تەباخی ساڵی ١٩٩٦، بەڕێوەبەرایەتی زیندان، گواستنەوەی برادەرێکی پەکەکەییان بۆ گرتووخانەیەکی دیکە ڕاگەیاند. بە هۆی دوودڵی لەوەی لەکاتی گواستنەوەییدا لەژووری لێکۆڵینەوە ئەشکەنجەدەدرێ، سەرەتا پەکەکەییەکان و دواتریش هەموو گیراوانی قاوشەکە کاردانەوەیان بەرامبەر بڕیارەکە دەربڕی. ئاڵۆزیەکان تەشەنەی سەند، بەرامبەر ئەمەش، کارگێڕی زیندان ئەوەی ئاشکراکرد، ئەگەر بە زەبری هێزیش بێت، لە ئۆپەراسیۆنێکدا ئەو کەسە هەر دەگوازنەوە. بۆ ڕێگریکردن لە سازدانی وەها ئۆپەراسیۆنێك، برادەرانی زیندان کەسیان لە قاوش نەمانەوە و هەموویان چوونە شوێنی هەواگۆڕکێ. هەندێکیشیان سەرقاڵی دروستکردنی بەربەست بوون. بە هۆی خراپی باری تەندروستی کاك زەکی و هەڵکشانی تەمەنی من، برادەران پێیان گوتین چاکترە ئێوە لە ژوورەوە بمێننەوە، ئەوسا تەمەنم ٥٧ ساڵان بوو. جگە لەو دووەمان هەڤاڵانی دیکە، خڕ چوونە دەرەوە.

کاتێك ئێمە لە ژوورەوە بووین، هەستمان بە چەند جوڵەیەکی نائاسایی کرد لە ساپیتەی قاوشەکەدا. پاشان بنمیچەکە تۆزوخۆڵی بۆیە و سەبەکەی لێ پەرش و بڵاو بۆوە. برادەران باسیان لەوە دەکرد، لە نهۆمی سەر ئێمە (ئولکوجوەکان) دێن و دەچن. وەلێ بە هۆی ئەو تەپ و تۆزەی لە بنمیچەکەوە دەردەچوو، خەریك بوو ساپیتەکە بەسەرماندا بڕوخێت. چونکە لە چەند شوێنێکی

ئەوێوە بنمیچەکە بە ئامێری تایبەت کوندەکرا. دوای ئەمە، لەگەڵ زەکی سەیرێکی یەکدیمان کرد و هەستمان بە زەرووڕەتی چوونە دەرەوە کرد. بن هەنگڵی زەکیم گرتی و ویستم بیبەمە دەرەوە. چونکە نەخۆش بوو و نەیدەتوانی بە باشی ڕێگابکا. لەو سەروبەندە کاك زەکی وەستا و ڕووی لە من کرد "تا قاوش نەسوتێندرێ، بۆ کوێ دەرچین مامۆستا ئیسماعیل".

ئەو سەردەمەی لە زیندان بووم، زوو زوو، مانگرتن لە خواردن دەستی پێدەکرد، زۆربەی کات لە زیندانی ئولوجانلار زێدەتر ڕووی دەدا. لە کۆتاییەکانی مانگی حەفتی ١٩٩٦، حوسێن دەمیرئۆغلووی سەر بە (پارتی مارکسی کۆمینیستی لینینی – MLKP)[1] لە ٦٩مین ڕۆژی مانگرتنی لە خواردن، کۆچی دوایی کرد. کاك حوسێن کوردێکی خەڵکی شاری چەولیگ بوو. بەڵام ئەو، هەرگیز ئەوەی زەق نەدەکردەوە و بەردەوام بوو لە بەرخودانی بە کۆمەڵ. بەڵکوو بەردەوام دەیگوت "شۆڕشگێڕێکی نێونەتەوەین" بۆیە بە کوردی نەدەپەیڤی. بەڵام ئەو هەڤاڵانەی بەسەریەوە وەستابوون، باسیان لەوەدەکرد، لە کۆتا خولەکەکانی ڕووح کێشاندا بە کوردی دوا و بە کوردی چاوی لێکنا.

یەکێك لە پێشهاتەکانی دیکەی ناو زیندان بریتی بوو لەوەی، ناوە ناوە بەشێك لە شۆڕشگێڕەکان هەندێك لە هەڤاڵانی خۆیان بە

---

[1] (پارتی مارکسی کۆمینیستی لینینی –MLKP) پارتێکی نایاسایە لە تورکیا، چونکە خاوەنی هێزی بزوتنەوەی چەکدارییە. ئەم پارتە تاوەکو ئێستا لەناو لیستی تیرۆری پۆلیسی تورکیایە، کە چالاکی ڕێکخراوەیی دژی تورکیا ئەنجامدەدەن. (وەرگێڕ).

دەست تێكەڵكردن لەگەڵ پۆلیس تۆمەتبار دەكرد، هەندێكجار تۆمەتباركردنەكە دەگەیشتە ئاستی دادگایی كردن و كوشتنیشی. بۆ نموونە لە قاوشی چواری ڕێكخراوی (دەڤ سۆڵ) بوویەرێكی وەها ڕوویدا. جا لە قاوشی ئافرەتانی هەمان ڕێكخراویش پێشهاتێكی وەها ڕوویدابوو. وەك چۆن لە قاوشی پێنجی پارتیزانەكانیش تاوانێكی ئاوا ئەنجامدرابوو.

***

لەوێ سەردەمێدا، زۆر لە ڕێكخراوەكانی نووسەران و سەندیكاكانی ئەوروپا دەهاتنە زیندان بۆ سەردانیكردنمان. جارێكیان یەكێتی نووسەرانی نەرویج هاتنە دیدەنیمان. ئەو شاندانە لەلایەن محەمەد ئوزونەوە هاوشانی دەكران. ئەوان چەند جارێك بەشداری دانیشتنەكانی دادگایی كردنیشمانیان كرد. بۆیە دواتر دادگا چەند ڕێوشوێنێكی تازەی گرتەبەر، بۆ ڕێگریكردن لە بەشداری ئەو شاندانە.

لە ناوەڕاستی مانگی نۆی ساڵی ١٩٩٦، لە گرتووخانەی ئوڵوجانلارەوە گواسترامەوە زیندانی مەترەس لە ئیستانبووڵ. لەناو ئۆتۆمبێلەكە، جگە لە من و چەند گیراوێكی سیاسی، هیچ كەسێكی دیكەی لێنەبوو. جگە لە پیاوێكی ئیختیاری سزادراو بە تاوانێكی كۆمەڵایەتی.

## "هزرە بۆگەنەکان"ی بێشکچی

ساڵی ١٩٩٤، لە گرتووخانەی ئولۆجانلار بووم لە ئەنقەرە. یەکێك لە ڕۆژەکانی سەردانیکردنی ناوەڕاستی مانگی هاوین، برادەران بانگیان کردم و هاتنی میوانێکیان پێ ڕاگەیاندم. کە چوومە شوێنی دیدار، بەشێکی زۆری هەڤاڵان لەگەڵ خزم و کەس و ناسیاوەکانیان دیداریان هەبوو. میوانەکانی منیش چەند خوێندکارێکی زانکۆ بوون.

یەکێك لە خوێندکارەکان باسی لەوە کرد، لە گۆڤاری (ئۆگنی) کار دەکات، کە بە زمانی کوردی زاراوەی زازایی چاپ و بڵاو دەبێتەوە. لەگەڵ ئەو هەندێك باسی شارەکانی هۆپای سەر دەریای ڕەش و هەرێمی ئاجارا و جۆرجیا و نەتەوەی لاز و[1] و چەرکەسەکان کرد. لەکاتی دەمەتەقێکەماندا زانیم ئەو لە کۆلێژی پەروەردە دەخوێنێت. منیش پرسیاری ئەوەم لێکرد، داخۆ پرۆفیسۆر دکتۆر مەحمود تەزجان مامۆستایەتی؟ جا پێم گوت کاك مەحمود هاوڕێ و هاوپۆلی کۆلێژی زانستە سیاسییەکانمە. وەك چۆن پرۆفیسۆر دکتۆر یەحیا ئایکوز هاوڕێی هەمان سەردەممە. کە وام گوت، ئەو قوتابییە شتێکی زۆر سەرنج

---

[1] لاز نەتەوەیەکن لە تورکیا بە درێژایی کەنارە ئاویەکانی دەریای ڕەش لە باکووری ئەو وڵاتە دەژین، زمانێکی تایبەت بەخۆیان هەیە. ئەو نەتەوەیە بەهۆی نزیکی داب و نەریتیان لە کوردەوە پێیان دەڵێن (کوردی دەریا دیتوو). (وەرگێڕ).

ڕاکێشی پێگوتم "مامۆستا مەحمود چەند جارێك لەناو پۆل باسی جەنابتی کرد و گوتی "ئیسماعیل بێشکچی بەشی کۆمەڵناسی و ڕامیاری بۆ بیرۆکە بۆگەن و ئایدۆلۆژییە سیاسییەکانی بەکار دەهێنان".

من زۆرم سەیر بەوەهات ئاخۆ کاك مەحمود چۆن لێکۆڵینەوە لەسەر کورد و تویژینەوەی زانستی و ڕەخنەگرتن لە بۆچوونی فەرمی و بەرگریکردن لە بۆچوونی ئازاد و پاڵپشتیکردن لە زانست و زانیاری, بە بیرکردنەوەی بۆگەن لە پێنووس دەدات و ئاوا گەنگەشەی دەکات! کەچی بیری چووە کە نووسین و تویژینەوەکانم لەسەر کورد و زمانی کوردی و کوردستان بووە هۆی ئەوەی سزای کارگێڕی بدرێم و لە زانکۆ دوور بخرێمەوە و لە زیندان توند بکرێم.

## زیندانی مەتریس

دوای ئەوەی کاروباری ناو تۆمارکردنم تەواو بوو و تەواوی دەفتەر و کاغەز و کەلوپەلەکانم پشکێندرا. سەربازەکان داوایان لێکردم خۆم ڕووت بکەمەوە تا بمپشکنن، بە شێوەیەك دەبێ تەنیا دەرپێ قووتەم لەبەر بمێنێتەوە. من داواکەیانم ڕەتکردەوە، بەڵام ئەوان، بە چوار پێنج سەربازان، بە زۆر، جلەکانی بەریان دڕاندم و ڕووتیان کردمەوە. لەگەڵ ئەوەی ئەوەم بۆ باسکردن کاتێك لە زیندانی ئولۆجانلار دەرچوومە، بە وردی منیان پشکنیوە. جا دڵنیاشم سەربازەکان ئەوەیان دەزانی، بەڵام ئەو جۆرە مامەڵانەیان

تەنیا بۆ سووکایەتیِ پێکردنی کەسی گیراو بوو و هیچی دیکە.

دوای ئەو توندوتیژیەی بەرامبەرم کردیان، پەرتووك و دەفتەر و پەڕاوەکـــان و بەنـــدی ڕۆژنامەکـــانم بەو نـــاوەدا پەرش و بڵاوبـــوونەوە. پاشـــان بە پۆســـتاڵەکانی قاچیـــانەوە، پێیـــان بەســـەر ڕۆژنامەکانەوە دەنا و هەنجن هەنجنیان کرد. بە بەهانەی پشکنینی ناوەڕۆکی پەرتووکەکانیش، کیتابەکانیان پەڕ پەڕ کردم. کاتێك من لەژێـر ڕەحمـی پـێلەقەی پۆستاڵ و شـەق و بۆکسـی سـەربازەکان بـووم، عەسـکەرێکی حیزفرسـەتی چـاوچنۆك، مووسـەکانی ڕدێـن تراشـینمی لە زەویەکە هەڵـدەگرتەوە و وەك ئەوەی مـاڵی بـاوکی بێت، دەیخستە بەر باخەڵی.

دوای ئەو لێـدان و کوتـانە، منیـان بـردەوە هونـدوری زینـدان. بـۆیە لە چـوونە ژوورەوە جـارێکی دیـکە لەلایەن دەرگەوانەکـانەوە نەپشـــکێندرام، بەڵام داوایـنکـــرد، بە خێرایـــی کەلوپەلەکـــانم کۆبکەمەوە. دوای چوونە ژوورەوە و تێپەڕین بە چەند ڕێڕەوێکی تـاریکی بـۆن نـاخۆش، منیان خستە قاوشـێك. نزیـك دەمژمێر دەی شـەو ببـووینەوە. قاوشـێکی نە بچـووك و نە گەورە، چارپاکـانی لە دوو قـات پێکهـاتبوون. شـوێنەکە دەتـوانرا شـوێنی ٤٠ کەسـی لـێ بکرێتەوە، بەڵام جگە لە من، کەسێکی دیکەی لێ نەبوو.

لەسـەر یەکێـك لە چارپاکـان، دوو پـانتۆڵی تـازە و نـوێی لەبەر نەکـراو دانـدرابوو. دیـار بـوو بەر لە مـن گیراوانـی قاوشـەکەیان گواسـتبۆوە زینـدانێکی دیـکە، جـا ئەوان لەکـاتی خـۆ کـۆکردنەوە، ئەو پانتۆڵانەیان لەبیر کردبوو. یانیش ئەوەیە بۆ کەسێکیان دانابوو و ئەو لەبیری چووبوو هەڵیگرێتەوە، یانیش ئەوەتە دوای ڕۆیشتنی

ئەوان، کەسێك هاتووە و لەوێی داناوە. ئیدی بە تاقی تەنیا لە قاوشەکە مامەوە.

ئەوسا کوتڵوو ئاکتاش پارێزگاری ئیستانبووڵ بوو. من لە ڕێگای میدیاوە زانیبووم دوای وەرگرتنی پۆستی پارێزگاری ئاگری و ئیزمیر، ببووە پارێزگاری ئیستانبول. بۆیە بێ ویستی خۆم، بیرم بەرەو دواوە گەڕاوە و وەکوو شریتی فیلمێك، هەموو ڕووداو و بەسەرهاتەکانی ژیانم هاتەوە بەرچاو. چونکە لە نێوان ساڵانی ١٩٥٨-١٩٦٢ لەگەڵ کوتڵوو ئاکتاش بەیەکەوە بووین. بیرمە بەشداری تاقیکردنەوەیەکمان کرد و ئەو ٤٠ کەسەی لە ڕیزی پێشەوە هاتبان، لە زانکۆی باش وەردەگیران و دەرفەتی خوێندنیان زیاتر بۆ فەراهەم دەکرا. ئێمە دوای وەرگرتنمان، چوار ساڵی زانکۆ و ژیانی بەشە ناوخۆییمان بەیەکەوە بوو. ئەی چۆن دەبێ ئێستا دوو دۆست و برادەری سەردەمی زانکۆ، یەکێکیان لە ترۆپکی دەسەڵات بێت و منیش لە ژێرزەمینێکی چۆڵی ساردی ڕەق و تەق، لە ژێر گوشار و ئەشکەنجەدا هەموو گیانم لەتاو ئازار بتلێتەوە؟

ساڵی ١٩٦٨، حوسێن ئۆغوتچەنی پارێزگاری جۆلەمێرگ، ڕێگری کردبوو لەوەی بچمە شەمزینان. دواتر لە ڕۆژنامەکانەوە زانیم، لە ساڵی ١٩٧٨ ئاڵتای ئوتکان بوەتە پارێزگاری جۆلەمێرگ. لەگەڵ ئاڵتایش بەیەکەوە ماوەیەکی زۆر مابووینەوە. لە هەمان پۆلیش بەیەکەوە دەمانخوێند. وەك چۆن هەمان ساڵیش بەیەکەوە لە زانکۆ دەرچووین.

ساڵی ١٩٨٠ کۆمەڵکوژی چۆرم ڕوویدا، لەوێ ٥٧ عەلەوی

لەلایەن (ئولکوجوکانەوە) کوژران و بۆ هەتا هەتایە گیانیان سپارد. ئەوکات لە زیندانی تۆپتاشی ئیستانبوولْ بووم. ئەوسا لە ڕێگای ڕادیۆوە زانیم، یوکسەر چافوشئۆغلوو پارێزگاری چۆرروومە. لەگەڵ ئەویش ٤ساڵی زانکۆ بەیەکەوە بووین. ئیدی تەواوی ئەو ماوەیەی بەیەکەوە بەسەرمان بردوو، لەگەڵ ئەو پەیوەندییە گەرمەی لە نێوانمان هەبوو، بە خێرایی بەربەرچاومدا گوزەری دەکرد.

دەتوانم بڵێم دوای ئەوەی زانکۆم تەواو کرد، بەشێك لە برادەرانم تا ئێستاش نەبینیوە. تا ساڵی ١٩٧٠ هەندێك لە برادەرانم ناوە ناوە لە هەندێك شوێن دەبینی و لەسەر لینگان هەندێك دەمەتەقێمان دەکرد. دوای ئەوەی لە سەردەمی ڕژێمی ١٢ ئەیلوول دۆسیەم لەسەر کراوە و سزادرام و خرامە زیندانەوە، پەیوەندیم بە هیچ یەکێك لە برادەرەکانم نەکردەوە. وەك چۆن هیچ کەسێکیش بە دوای مندا نەگەڕا و لێی نەپرسیمەوە. لەمانی خێزانیشم پەیوەندی بە هیچ یەکێك لەو برادەرانەمەوە نەکرد.

ساڵی ١٩٨٧، ئەو برادەرانەی بەیەکەوە زانکۆمان تەواو کردبوو، بۆ پیرۆزبایی کردن لە ٢٥ ساڵ تێپەڕین بەسەر دەرچوونمان، لەسەر چیای ئولودا‌غ لە بورسا، کۆبوونەوەیەکیان ڕێکخست. پێداگیریشیان لەسەر ئەوەکرد تا منیش بەشداری کۆبوونەوەکەیان بکەم. بیرمە تازە لە زیندانی عەنتابی تایبەت ئازاد کرابووم.

هەرچۆنێك بێ، منیش بەشداری ئەو بۆنەیەم کرد و چوومە کۆبوونەوەکە. یەکێك لەو برادەرانە بە ترومبێلی خۆی، من و

لەمـانی خێزانمـی تـا بورسـا بـرد. لەوێ نـزیکەی دوو ڕۆژ لە میوانخـانەیەك مـاینەوە. لەو مـاوەیەدا بـرادەران حەسـرەتی بیسـت و پێنج ساڵەیان لەگەڵ یەك دەڕەواندەوە. منیش لەوێ لەگەڵ چەند دۆستێك هەڤدوومان بینی.

"تۆ بێدەنگترینی پۆل بووی، وەلێ ئێستا لە هەموو کەس زیاتر، دەوڵەتت بەخۆتەوە شەکەت کردووە، ئەوە چۆن کارێکە؟" یەکێك لە بـرادەران لـێم نزیـك بـۆوە و بە ئەسـپایی ئەوەی بە گوێـدا چرپانـدم. لە وەڵامـدا گـوتم "مـن ئێسـتاش هەر بە هێمنـی هەوڵـی ئەوە دەدەم بۆچوونەکـانی خـۆم دەربـبڕم". دواتـر بـرادەران باسـیان لەوەکردبـوو ئەو بـرادەرەی ئەوەی پێگـوتم، لە دەزگـای هەواڵگـری کاردەکات.

ساڵی ٢٠١٢ بەشداری بۆنەی ٥٠ ساڵەی دەرچوونم کرد. ئەو ڕۆژەش چەنـد بـرادەرێکم لەوێ بینـیەوە. کۆبـوونەوەکە لە هـۆڵی کۆڕبەنـدەکانی عەزیـز کۆکلـوو بەڕێوەچـوو. بیـرمە لەوێ مەدالیـای ٥٠ سـاڵەیان پێشـکەش کـردم. بۆیە دەمەوێ بڵێم کە شـانازی بەو دیاریەوە دەکەم.

چەند ڕۆژێك دوای ئەوەی بە تەنیا لە قاوشی زینداني مەترەس مـامەوە، ئیـدی دوو گەنجـی کوردیـان هێنـا لام، کە بەنیـاز بـوونە بەشێوەیەکی نایاسایی بەرەو یۆنان بپەڕنەوە.

لە بیست و چوارەمین ڕۆژی مانگی نۆی ساڵی ١٩٩٦، چەندان ژەندرمە و دەرگەوان و هێزی تایبەت، لە بەندیخانەی دیاربەکر، بە ئاسـن هێرشـیان کردبـووە سـەر چەنـد بەنـدکراوێکی چـالاکوانی کـورد و نـزیکەی ١٠ کەسـیان لـێ کوشـتبوون. منـیش لە زینـدانی

مەترەس بووم، سەرۆکوەزیرانش نەجمەدین ئەربەکان[1] بوو. ئەو هەواڵەشم لە ڕێگای ڕادیۆوە گوێ لێبوو.

## زیندانی بورسای تایبەت

لە کۆتایی مانگی نۆی ساڵی ١٩٩٦، لە بەندیخانەی مەترەسەوە، گوازرامەوە بۆ بەندیخانەی بورسای تایبەت. لەناو ترومبێلی گواستنەوە، دوو کەس بووین. برادەرەکەی دیکە کوردێکی کارسازی گیراو بوو. لە تەك گرتووخانەی بورسا، زیندانێکی دیکەش هەبوو، ئەویان لەوێ دانا.

دەمویست لەو قاوشەم دابنێن، کە برادەرانی پەکەکەی لێبوو. هەر واشیان کرد، چونکە دوای جێبەجێکردنی ڕێکارە ڕۆتینییەکانی گواستنەوە، برادەرانی پەکەکە هاتن و منیان بردە قاوشەکەی خۆیان. بەبێ ئەوەی کارگێڕی بەندیخانە هیچ ئاریشەیەکمان بۆ چێ کات.

مانگی سێی ساڵی ١٩٩٠، کاتێك دەستگیرکرام و خرامە زیندانی بایرام پاشا لە ئیستانبوڵ. ئەوساش لە قاوشی هەڤاڵانی پەکەکە مامەوە. وەك چۆن لە نێوان ساڵانی ١٩٩١-١٩٩٣ لە گرتووخانەی ئوڵجانلاریش لە قاوشی برادەرانی پەکەکە مامەوە.

---

[1] نەجمەدین ئەربەکان (١٩٢٦–٢٠١١) سیاسەتمەداری تورك، لە نێوان ساڵانی (١٩٩٦ – ١٩٩٧) سەرۆکوەزیرانی تورکیا بووە. ئەربەکان ساڵی ١٩٨٧ بە سکرتێری گشتی پارتی ڕەفا هەڵبژێردرا و لەوێشەوە پەرەی بە بیرۆکەی میللی دا بۆ بەڕێوەبردنی دەسەڵات لە تورکیا. (وەرگێڕ).

لە زینـدانی بورسـای تـایبەت، پەکەکەییەکـان لە قاوشـی ژمـارە چوار دەمانەوە. لەگەڵ هەندێك لە برادەرانی ڕێکخراوی ڕزگاریی و هەنـدێك لە ئەنـدامانی ڕێکخراوەکـانی دیـکە. لە بەشـەکانی دیـکەش هەنـدێك لە ئەنـدامانی (دەڤ سـۆڵ و دەڤ یـۆڵ) و هەنـدێك چـالاکوانی ڕێکخـراوی پـارتیزانی وەکـوو (هـاڵکن کورتوڵووشو – هاڵکن بیرلیی) دەمانەوە.

لەپاڵ ئەمانە، لە بەشێکی دیکەی زیندانەکەدا، چەند گیراوێکی جیا بووەوە لە پەکەکە و ڕێکخراوەکانی دیکە دەمانەوە. بە ئەوێیان دەگـوت بەشـی بـێ لایەنەکـان. ئەوان لەنـاو چەنـد ژوورێکـی تاکەکەسی بوون، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی دەرگای ژوورەکانیـان بەردەوام والابـوو. وەك چـۆن دەرگـای هەواگۆڕکێشـیان بەردەوام لەسەر گازەرەی پشت کرابۆوە.

ئەو بەشەی من لێی دەمامەوە، لە دوو نهۆم پێکهاتبوو. لە هەر نهـۆمێکیش چـوار قاوشـی لێبـوو. قاوشـەکانیش دەرگایـان بەردەوام کراوەبـوو، لەگەڵ دەرگـای هەواگـۆڕکێ. بەڵام بـۆ ئەوەی بچیـنە بەشـەکانی دیـکە، دەبـوو دەرگەوانەکـان دەرگاکـان بـکەنەوە. بەشێوەیەکی گشتیش ئەوە هیچ پرسگرێکێك نەبوو.

کـاك سـەبری ئـۆك لە بەشـەکەی ئـێمە دەمـاوە، لە بەشـەکەی دیکەش، مزەفەر ئایاتا دەماوە. بۆیە لەگەڵ ئەو دوو کەسایەتییە لە ناو قاوش، یاخود لەکاتی هاموشۆمان لە شوێنی هەواگۆڕکێ، زۆر بـاس و خواسـی جیاوازمـان دەهێنـا زمـان و لێیـانەوە دەدوایـن. جارێکیـان سـەبری ئـۆك باسـی لەوە کـرد، چـۆن لە دەوروبەری ناوچەی دیهی، لەگەڵ سەدڕەدین ئایدنلك دەستگیرکراون. ئەوسا

سـەدرەدین ئایـدنلك لە نێـوان سـاڵانی ١٩٩٦-١٩٩٩ لە زینـدانی بـایرام پاشـا بـوون. سـەبری ئۆم بە مۆبـایلی خـۆی، قسـەی لەگەڵ عەبـدوڵڵا ئـۆجەلان دەكـرد. دوای ئـازادكردنی لە زینـدان، كـاك سەبری خۆی ئەو نهێنیەی ئاشكراكرد.

پەكەكەییەكـان هەمـوو ڕۆژێ چەنـد دەمژمێرێـك، چـالاكی پەروەردەیی ئەندامانیان بەڕێوەدەبرد. ئێوارانیش زۆر بە سەرنجەوە لە (مەد تیڤـی و ڕۆژ تیڤی)یـان دەڕوانـی. لە كاتێكـدا سـەیركردنی ئەو كەناڵانە قەدەغەبوو. بەڵام چەند برادەرێك زۆر باش سەریان لە تەكنەلۆژیـا دەردەچـوو؛ بـۆیە ئەوان دوای خـۆ مانـدووكردن، دەیانتوانی ئەو كەناڵانە بخەنەوە سەر تەلەفزیۆنەكانی زیندان.

بە شێوەیەكی فەرمی سەردانیكردنی زیندانیان، هەفتەی ڕۆژێك بـوو. بەڵام بە كردەیـی هەمـوو ڕۆژێـك میـوان هەبـوو. برادەرانـی پەكەكەیـی میـوانێكی زۆر دەهـاتنە لایـان. چـونكە پێویسـت نەبـوو سەردانیكەران تەنیا خزمی پلە یەكی گیراوان بن. جا هەموو كەس دەیتوانی لەگەڵ میوانی هەموو زیندانیەكانیش دیدار ساز بكـات، منـیش هەر ئـاوام دەكـرد. بەڵام ڕێگریەكـی زۆریـان لەو میوانـانە دەكـرد، كە بە تـایبەت دەهـاتنە لای مـن. بـۆ نمـوونە، بیـرمە ڕۆژێكیان، حەسەن خەیری ئالكان لە ناوچەی كایدەرەوە هاتبووە لام، بەڵام دوای دەمەقـاڵێیەكی زۆر لەگەڵ نەقیبـی زینـدانەكە، ڕێگایـان نەدابـوو بێـتە ژوورەوە و هەڤـدوو ببینـین. ڕۆژێكیشـیان مـحەمەد ئەرگـون، لەگەڵ خێـزان و منـداڵەكانی هـاتبوونە سـەردانیكردنم. بە بەهـانەی ئەوەی پاشـناومان یەكـدی نـاگرێتەوە ڕێگایـان نەدابـوو بێـتە ژوورەوە. كـاك مـحەمەد دواتـر پێـی گـوتم

"لەگەڵ نەقیبەکە زۆرم دەمەقاڵی و موناقەشەکرد، بەڵام ئەوان دەستیان بە بەکارهێنانی هێز کرد لە دژمان، بۆیە بەناچاری لەوێ دوور کەوتینەوە".

لەبەشەکەی ئێمە، برادەرێك هەبوو بە نازناوی ئۆزتورك، خوالێخۆشبوو، یڵماز ئۆزتورك بۆ هاتنە ژوورەوە پاشناوی ئەو کوڕەی دابوو سەربازەکانی بەر دەرگا و ئاوا توانیبووی بێتە ژوورەوە و من ببینێت. جگە لەمانە زوو زووش، دیداری نێوان زیندانیان و پارێزەران سازدەکرا.

خالید یالّچن لە پەکەکە جیا ببۆوە، بۆیە چووبووە بەشی بێلایەنەکان و لە حوجرەیەك، بە تەنیا دەماوە. لەبەر ئەوەی دەرگای ئینفرادیەکانیش کراوە بوون و لە نێوان بەشەکەی ئێمە و ئەواندا دەرگا والابوو، بۆیە خالید یالّچن زوو زوو دەهاتە لام و بەیەکەوە دادەنیشتین. لەگەڵ خۆشی چەندان گۆڤار و پەرتووك و ڕۆژنامەی دەهێنا. بیرمە پەرتووکێکی بچووکی لەسەر ئیران بۆ هێنام، دوای خوێندنەوەی ڕادەستم کردەوە، بەڵام پەرتووکەکە بووە جێگای سەرنج ڕاکێشانی من. پەرتووکێك بوو لە ١٠٠ لاپەڕەیەکدا باسی سەردەمی مۆدێرنیتەی ئیران و پەیوەندییەکانی لەگەڵ ڕووسیا دەکرد. پێم وابێ ئەگەر ئێستاش ئەو پەرتووکە بخوێنمەوە، دیسان سەرنجم بۆلای خۆی ڕابکێشێت.

خالید یالّچن، لێکۆڵینەوەی لەسەر زمان و وێژەی کوردی دەکرد. بۆیە بەردەوام باسی ئەو مژارەی لەسەر زاران بوو. بەردەوامیش ئەوەی دووبارە دەکردەوە، کە پێویستە خولێکی فێربوونی زمانی کوردی لە بەندیخانە بکرێتەوە. جگە لەمانە باسی

مەلا عزەدینی باوکی دەکرد. پاشان باسی ئەو نامانەی نێوان خۆیی و مەلا عزەدینی باوکی دەکرد. نامەکان زۆر نووسینی جوان و تایبەت بوون. چەند دانەیەکی لە ناوەڕۆکی نامەکان بە منیش پیشان دا.

لە زیندان هەریەکە لە عەدنان ئالپ و سالح دوندار، بە کوردی دەیان نووسی، ئایتەکین یلبەرووش بەردەوام باسی ئەو نووسینانەی دەکرد، کە ڕەخنەی لە کەمالیزم دەگرت.

بەهاری سالی ١٩٩٧، ئونسال ئۆزتورکی خاوەنی وەشانخانەی (یورت کیتاب) هێنرایە زیندانی بورسای تایبەت. لەوێش هێنایانە قاوشەکەی من. بەلام ماوەیەکی کورت دوای هێنانی، لە زیندان دەرچوو.

ئەو ماوەیەی لە زیندانی بورسا مامەوە لە نێوان سالانی (١٩٩٦-١٩٩٩) پەرتووك و ڕۆژنامە و گۆڤار دەهێندرا ژوورەوە< بۆیە لەوبارەیەوە چ کێشەیەکمان نەبوو. جگە لەمە (ئۆزگور هالك)ی بلاوکراوەی مانگانەی پەکەکە، هەموو مەهێك بە ڕێکو پێکی و بێ پچڕان دەهێندرا زیندان.

## عەلەویێتی - موسولمانێتی

برادەرێکی عەلەوی لە زیندانی بورسای تایبەت، ڕووداوێکی گرتووخانەی ساغماجلاری بۆ گێڕامەوە. خۆی لە ناوچەی غازی ئیستانبوول دادەنیشت. هاوڕێیەکی خەلکی سیلڤانی موسولمانی سوونە مەزهەبی هەبوو. بوویەرەکە لە سالی ١٩٩٠ لە ئیستانبوول

ڕوویدابوو. جا هەردووکیشیان بە تۆمەتی هاوکاری کردنی پارتی کرێکـــارانی کوردســـتان دەســـتگیرکرابوون، بەڵام ئەو دووە، لە زیندان یەکتر دەناسن.

دایکـی دەسـتگیرکراوە سـیلڤانییەکە، دێتە ئیسـتانبووڵ تـا بچێتە زینـدان و چاوی بە ڕۆڵەکەی بکەوێـت. ئەو برادەرەی لە ناوچەی غـازی دادەنیشـت، بە هـاوڕێکەی دەڵـی "دەشـێ دایکـت لە مـاڵی ئـێمە بمێنێـتەوە و دواتـر لەگەڵ ماڵبـاتی ئـێمە بێـنە سـەردانمان لە زیندان". کابرای سیلڤانیش دوای ئەو پێشنیازە، داوا لە برادەرەکەی دەکـات، هەواڵێـك بـۆ ماڵەوەتـان بنێـرە بچـنە پێشـوازی دایکـم و لەگەڵ خۆیان بیبەنە ماڵەوە.

دایکـــی کـــوڕە ســـیلڤانییەکە دێـــتە ئیســـتانبووڵ، ماڵبـــاتی ئەو بـــرادەرەی لەگەڕەکـــی غـــازی دادەنیشـــت، دەچـــن و ئـــافرەتەکە هەڵـــدەگرن و دەیـــبەنەوە مـــاڵی خۆیـــان. پاشـــان لەبەر ئەوەی ئەو ئافرەتە دایکـی هـاوڕێیەکی کوڕەکەیـانە، زۆری بەدەمەوە دەچـن و خزمەتێکـی چـاکی دەکەن. بە شـێوەیەك خـواردنی چـاك و خۆشـی بۆ ئامادەدەکەن و بالینگـانێکی خاوێن و نەرمی بۆ دادەخەن و بۆ خزمەتکردنی هەرچییەکیان لە دەست بێ، بۆی دەکەن.

لەوێ ســـەروبەندێدا مەلای مـــزگەوت بانـــگ دەدا، ئـــافرەتە ســـیلڤانییەکە هەڵدەســـتێ تـــا بچـــێ دەســـتونوێژ هەڵگرێـــت. مـــاڵی خـــانەخوێش، قیـــبلەی پـــێ پیشـــان دەدەن و بەرمـــاڵی بـــۆ ڕادەخەن. ژنەی ســـــیلڤانی دوای ئەوەی دەســـــتونوێژ هەڵـــــدەگرێ، ڕوو لە ئـــافرەتی خـــاوەن مـــاڵ دەکـــا و دەپرســـێ "ئەی ئێـــوە دەســـتونوێژ هەڵنـــاگرن؟" ئەویـــش لە وەڵامـــدا دەڵـــێ "ئـــێمە عەلەویـــن و نـــوێژ

ناکەین". بۆیە دەیانەوێت ئافرەتەکە ببەنە ئەو هۆدەیەی کە دوگردەکەی لێ ڕاخراوە. بەڵام دایکە سیلڤانییەکە، دوای ئەوەی گوێی لەوە دەبێت کە دەڵێن "ئێمە عەلەوین و نوێژ ناکەین" بێ ئەوەی بە کەس بڵێت، بار و بارگەی تێک دەنێ و لەوێ دەردەچێ.

ماڵباتە عەلەوییەکە، دەزانن ئەو ئافرەتە یەکەم کەرەتیەتی بێتە ئیستانبووڵ، دەشزانن هیچ شارەزای شارەکە نییە، جا لەگەڵ ئەوەی هیچ واتایەك بۆ هەڵسوکەوتی ژنەکە نادۆزنەوە، لێ بەدوای دەکەون و دەیانەوێت هاوکاری بکەن و ڕێگا و بانی پیشان بدەن. کاتێکیش کوڕەی سیلڤانی زیندان، ئەو هەڵسوکەوتەی دایکی دەبیستێتەوە، داوای لێبووردن لە بڕادەرە عەلەوییەکەی و خێزانەکەیان دەکات. بۆیە کاتێك دایکی دێتە دیدەنی، بە هۆی ئەو کارەی کردوویەتی زۆر ڕەخنەی لێدەگرێت.

## ئازادی دێت

نووسەر و توێژەر، محەمەد بایراك، لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٨٨، باسی لەوە دەکرد، ویستی ئەوەی هەیە، لە ژێر ناونیشانی (ئازادی دێت) گۆڤارێك بڵاوبکاتەوە. پاشان بەردەوام باسی خەسڵەت و تایبەتمەندی ئەو نووسینانەی دەکرد، کە خواستی بوو لە گۆڤارەکە بڵاویان بکاتەوە. بۆیە، لەسەر ئەو پرسە بۆچوونی لە چەند کەسێك وەردەگرت و داوای نووسینیشی لێدەکردن. چونکە ئەو بەدوای وەڵامی ئەو پرسیارە دەگەڕا ئاخۆ، دەبێ گۆڤاری (ئازادی دێت) چۆن چۆنی بێ؟ منیش یەکێك بووم لەو کەسانەی

داوای بۆچوونم لێکرا لەسەر پرسەکە. بۆیە لە ماوەی دیاری کراو بۆچوونی خۆم لە ڕێگای نووسینێکەوە گەیاندە دەستیان، کە بەم شێوەیە بوو:

"پێویستە گۆڤارەکەتان بەو ئاڕاستەیە کار بکات، تا دۆخێکی وەها بێنێتە کایەوە کە ڕێگا خۆشکەر بێت بۆ ئەوەی تاکی کوردی بتوانێ لە ناسنامەی خۆی بپێچێتەوە. هەروەها پێویستە تاکی کورد و کۆمەڵگای کوردی، پێگەی خۆی بە پێگەی کۆمەڵگاکانی دیکەی تورکیا و ڕۆژهەڵاتی ناڤین و جیهان بەراورد بکات. هەروەها دەبێ لێکۆڵینەوە لەسەر پەیوەندییە ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگی و سەربازییەکانی کۆمەڵگای کوردی بکرێت لەگەڵ کۆمەڵگای تورکی و عەرەبی و فارسی. جا ئەگەر ئەو توێژینەوانە بەشێوەیەکی وردیش نەبێت، بەڵام هەر زەرووڕە هەبێت. بۆیە تاك و کۆمەڵگای کوردی دەبێ لەسەر دابەشکردن و لێك جیاکردنەوەی کۆمەڵگاکەیان بفکرن و لێی ورد ببنەوە. بۆیە پێویستە گۆڤاری ئازادی دێت، ڕێگا خۆشکەر بێت بۆ ئەوەی لە هزری هەر تاکێکی کوردیدا هۆشیاری مێژووی و کۆمەڵایەتی گەشەی زیاتر بکات ".

دوای ماوەیەکی کەم، گۆڤارەکە دەستی بە وەشانی یەکەم ژمارەی خۆی کرد. نووسینەکەی منیش لە ژمارەی یەکەمی مانگی دوازدەی ساڵی ١٩٨٨ بڵاوکرایەوە.

لەسەر ئەو نووسینەم، ڕۆژێك بەر لە کۆتایی هاتنی ساڵی ١٩٨٨، دەستگیرکرام. شەوێك دوای دەستبەسەرکردنم، لە شەوی سەری ساڵ بەردرام. ئەوسا محەمەد ئاغر، بەڕێوەبەری پۆلیسی

ئەنقەرە بوو. دواتر لەسەر ئەو لێکۆڵینەوەیەی پۆلیس، لە بەرواری سێیەمین ڕۆژی مانگی دووی ساڵی ١٩٨٩، لە دادگای ئاسایشی دەوڵەتی ئەنقەرە داوایەکم لەسەر کرایەوە. یەکەم دانیشتنی دادگا، بیست ڕۆژ دوای کرانەوەی دۆسیەکەم بەڕێوەچوو.

ئەوسا دادگای ئاسایشی دەوڵەت، لە شەقامی فاڕابی ناوچەی کاڤاکلیدەرە بوو. لە ڕاستیدا باڵەخانەکە بارەگای گشتی پارتی گەلی کۆماری جەهەپە[1] بوو. بەڵام لە سەردەمی فەرمانڕەوایی دوازدەی ئەیلوول، پارتە سیاسییەکان داخرابوون و دەسەڵات دەستی بەسەر سەرجەم بارەگاکانیاندا گرتبوو.

دانیشتنی دووەمی دادگا لە بیست و حەفتەمین ڕۆژی مانگی نیسانی هەمان ساڵ بەڕێوەچوو. لە هەردوو دانیشتنەکەی دادگاشدا، پەڕاوێکی دوو سێ لاپەڕەیی بەرگرینامەم پێبوو. ناوەڕۆکی بەرگرینامەکەم بە زمان بە دەستەی دادوەران گوت. بەرگرینامە نووسراوەکەشم پێشکەشی سەرۆکایەتی دادگا کرد. دواتر سەرهات بوجاکی پارێزەر، بەرگرینامەیەکی فراوانتری نووسی. بۆیە لە دوای دانیشتنی دووەمی دادگا، بڕیاری پاکیم بۆ دەرچوو.

جگە لە محەمەد بایراك و گولای بایراك، بەشێك لە نوێنەرانی دەزگاکانی ڕاگەیاندنیش تەڤلی دواین دانیشتنی دادگا بوون. من لەوێندەرەوە ئونساڵ ئۆزتورکم ناسی. چونکە ئەویش لەسەر

---

[1] CHP پارتی گەلی کۆماری، یەکەمین پارتی کۆماری تورکیایە، ساڵی ١٩٢٣ لەلایەن مستەفا کەمال ئەتاتورکەوە دامەزرێندرا. (وەرگێڕ).

بڵاوکردنەوەی هەندێك پەرتووك دانیشتنی دادگای هەبوو. محەمەد بایراك دۆسیەی (ئازادی دێت)ی، لەگەڵ (ناسنامەی بەرخودانی کورد و ڕەتکردنەوە و نکۆڵی لێکردنی ) وەکوو کتێب چاپ و بڵاوکردەوە. لەناو پەرتووکەکان، بەرگرینامەی من و محەمەد بایراکیش شوێنی بۆ کراوەتەوە. لەگەڵ بەرگرینامەکانی هەریەك لە پارێزەران خالید چەلەنك و یوسف ئالآتاش و سەرحەد بوجاك.

***

ئەو ڕۆژانەی دۆسیەی (ئازادی دێت) بەردەوامی هەبوو، بەیانییەك، پۆلیس هەڵیانکوتایە سەرماڵەکەم، منیان دەستگیرکرد و بردمیانە دادگای ئاسایشی دەوڵەت و لەوێ تەوقیفیان کردم. ئەو کاتەی منیان خستە ژوورەوە، هیچ کەسێکی لێنەبوو. ماوەیەك دواتر، کچێکی گەنجیان هێنا لام و ئەویشیان لەوێ ئاخنی. تێگەیشتم کچەکە پەکەکەیی بووە و پاشگەز بۆتەوە. بۆیە لە میداکانەوە لەوبارەیەوە چەندان هەواڵ بڵاوکرایەوە.

ئەو بەیانییە، پارچە سمیدێکم لەدەست بوو بۆ خواردن، دوای هاتنی کچەکە و سڵاو لێکردنی، پارچەیەك لە سمیدەکەی دەستم پێشکەش کرد، بەڵام لێی وەرنەگرتم و زاری لێك نەکردەوە. دواتر نزیکەی ١٠-١٢ گەنجی دیکەیان هێنا لامان. هەوڵمدا سڵاو لەو لاوانە بکەم، وەلێ ئەوانیش وەڵامیان نەدامەوە و لە نێوان خۆیاندا دەدوان. ئەوان خەریکی دەستگەمە بوون لە نێوان خۆیاندا، بەڵام لەگەڵ من قسەیان نەدەکرد.

تۆزێکی دیکەی بەسەر چوو و پۆلیسێك هاتە بەردەمی ئەو دەرگاییەی لێی دەستگیر کرابووم و بە هاوار کردن ناوی منی

خوێندەوە و گوتی "ئامادەبە و دەتبەینە هۆڵی دادگایی کردن". پاشان دەرگاکەی کردەوە و منی دەرهێنا و قۆڵی گرتم. بە تێپەڕین لەناو ڕێڕەوەکانی دادگا، بەسەر پێبلقەیەك کەوتین و چووینە نهۆمی سەرەوە، هێشتا زۆر دوور نەکەوتبووینەوە، گوێم لە دەنگی گەنجەکانی ژوورەوە بوو دەیانگوت "کوڕە خۆ ئەوە ئیسماعیل بێشکچی بوو و ئێمە نەمانزانی...!!!".

***

مادەم هەر باسی گۆڤاری (ئازادی دێت)مان کرد، دەمەوێ بیرەوەریەکی دیکەشم بگێڕمەوە.

ئەوساماڵباتی محەمەد بایراك، لە ناوچەی عابدین پاشا دەمانەوە. من زوو زوو دەچوومە ماڵیان، لەوێ لەگەڵ کۆمەڵێك میوانی ئەورووپا و پارێزەرانی مافەکانی مرۆڤ لەوێ هەڤدوومان دەبینی و قسە و دەمەتەقێی بە سوودمان دەکرد. دەڤرمی کوڕی کاك محەمەد، ئەوسا لە زانکۆی حاجەتەپە دەیخوێند. ئۆزگور هێشتا قوتابی ئامادەیی بوو. بیرمە ڕۆژێك لەگەڵ چەند دۆستێك دانیشتبووین کە لە ئەورووپاوە هاتبوون. دوای دەرچوونم، ئۆزگور گوتی "کاك ئیسماعیل دەتوانم بە ترومبێلی خۆمان بتگەیەنم" منیش سوار بووم و ئۆزگوریش ترومبێلی لێخوڕی. نزیکی ڕێگای نێوان ماماك ببووینەوە، لەسەر ڕێگاش هەندێك باڵەخانەی کۆلێژی پزیشکی هەبوون. لەسەر شەقامە بەرینەکە کاتێك لەو باڵەخانانە نزیك بووینەوە بە ئۆزگورم گوت "ماشەڵڵات لێبێ، زۆر بە جوانی شۆفێری دەکەی، هەر بژی". هێشتا ئاخافتنەکەم تەواو نەکردبوو، بینیم ئۆزگور خۆی بە شۆستەی لای ڕاستی شەقامەکە کێشا.

ئۆزگور ئەوسا زۆر گەنج بوو، هێشتا مۆڵەتی شۆفێریشی نەبوو. خۆشبەختانە هیچمان لێنەهات. بەڵام هەندێك زیان بەر ترومبێلەکە گەیشت. بۆیە هێنامانەوە سەر شەقامەکە و خۆمان ڕزگار کرد. پاشان منی لە نزیك خاڵێکی وەستانی پاس دانا و گەڕاوە ماڵەوە تا هەواڵی کارەکەیان پێ بڵێ. چونکە پێویست بوو بەشێکی لای ڕاستی ترومبێلەکە چاك بکرێتەوە.

## لەگەڵ لەیلا زانا و مەهدی زانا
## لە ناوەندی فەرهەنگیی میزۆپۆتامیا

یەکێـك لە ڕۆژەکـانی دەسـتپێکی سـاڵی ١٩٩٢، لەیـلا زانـا و مەهدی زانا، سەردانی ناوەندی فەرهەنگی میزۆپۆتامیایان کرد، لە نـاوچەی تاڕلەباشـی ئیسـتانبووڵ. ئونسـاڵ ئۆزتـورکیش لەوێ بـوو، چونکە وەکوو وەشانخانەی (یورت کیتاب) بەشداری پێشانگای پەرتووکمـان کردبـوو. بڕیـاریش بـوو، ئێـوارە بگەڕێـنەوە ئەنـقەرە، بـۆیە مەهـدی گـوتی "لەیـلاش دەیەوێ لەگەڵ ئێـوە بگەڕێـتەوە ئەنقەرە".

باسمان لەوە کرد، ئەگەر سەردانێکی خوالێخۆشبوو، بەهجەت جـان تـورك بکەیـن، کـارێکی بـاش دەبـێ. بـۆیە بڕیارمانـدا سەردانێکی کاك بەهجەت بکەین، کە ماڵیان لە شەقامی بەغدای بەری ئاسـیای ئیسـتانبووڵ بـوو. پاشـان لەوێـوە لەگەڵ لەیـلا بە ترۆمبێلی ئونساڵ بگەڕێینەوە ئەنقەرە.

ئێوارە بەیەکەوە لە ناوەندی فەرهەنگی میزۆپۆتامیا دەرچووین. لەناو ترۆمێلەکە چوار کەس بووین. من و ئونساڵ و مەهدی زانا و لەیـلا زانـا. لەگەڵ دەرچوونمـان، هەستمان بەوەکـرد، کەسانێك بەدوامانەوەن و چاودێریمـان دەکەن. پێم وابێ ئەو کارە بە هۆی بـوونی لەیـلا زانـاوەوە بـوو. لەوێ دەمێـدا، لەیـلا زانـا، ئەنـدامی پەرلەمـانی تورکیـا بـوو لە پارتی (هەپ)ی شـاری دیـاربەکر. لەیـلا زانا و هەڤـاڵانی، لە ناوەڕاسـتی زسـتان، تەرمـی ئەو گەریلایانەیـان هەڵـدەگرتەوە، کە لە چیاکـان، بە هـۆی بەرخـودان و پێکـدادانەوە

شەهید بوون. دوای هەڵگرتنەوەی تەرمەکانیش، بە ئوسوڵ و شێوەیەکی ڕێك، لە گۆڕیان دەنان و دەیانشاردنەوە. بۆیە ئەمە ببووە هۆی ئەوەی فەرماندەی ژەندرمەی دیاربەکر، زۆر پەست و توڕە بێت لە لەیلا و هاوڕێکانی.

ئێمە بەردەوام بووین لە ڕێکردنی خۆمان و بەرەو ناوچەی ئۆق مەیدان دەچووین، چونکە ئەمە ڕێگای ئاسایی و گشتی بوو بۆ چوونە بەری ئاسیای ئیستانبوولٚ. لە دواوەش چاودێریکردنمان بەردەوام بوو. کاتێك نزیکەی ناوچەی دۆڵاپدەرە بووینەوە، ئەوەم بۆ باس کردن کە من ئەو ڕێگایە زۆر باش دەزانم، بۆیە گوتمە ئونساڵ بەپەلە پێچی لای ڕاست بکەوە و لەوێشەوە بەرەو حەربییە سەردەکەوتین و لەوێشەوە دەچووینەوە سەر پردی (بۆغاز). من ئەو ڕێگایەم لەوەوە دەزانی، کاتێك کاك ئومێد فراتی لە فەریکۆی دادەنیشت. چەندان جار بەیەکەوە بەوێدا هاتوو چوومان کردبوو.

لە ڕووی ڕێساکانی هاتوچۆوە، لە دۆڵاپدەرەوە قەدەغە بوو بۆ لای ڕاست پێچ بکەیەوە، بەڵام یاساکانی هاتوچۆمان شکاند، وەلێ تووشی هیچ سزایەك نەبووینەوە، لێ توانیمان خۆمان لە ترومبێلەکەی دواوەمان ڕزگار بکەین، کە چاودێری دەکردین. پێم وابێ هەستیان بەوە نەکرد ئێمە بۆ لای ڕاست سووڕاینەوە.

پردی هەڵواسراوی (بۆغاز)مان تێپەڕاند و بەرەو شەقامی بەغدا دەڕۆیشتین. ئەمجارە مەهدی زانا باسی لەوە کرد، ئەو ڕێگایانە باش دەناسێت و ئیدی من دەتوانم بە ئاسانترین ڕێگا بتانبەمە شوێنی مەبەست.

له جادەی بەغدا لامانـدا کۆڵانێـك، لەوێ چـووینە چەنـد کـوچەیەکی دیـکە و گەڕایـن و سـووڕاین، بەڵام ماڵەکەمـان نەدۆزیەوە. چەند کۆڵانێکی دیکەی ڕاست و چەپمان کرد، بەڵام هێندەمان زانـی گەڕاوینەتەوە شـوێنی خۆمـان. بـۆیە وەسـتاین و مەهدی هاتە خوارەوە و چووە لای دووکانداریك و پرسـی "لێرە لقێکی بانکی زیراعە هەیە و دەچینە ماڵێك کە کۆڵانەکە بە تەك بانقەکەوەیە، ئایا بانقەکە لێرە دوورە؟" کابرا لە وەڵامدا گوتی "ئەو بانقەی ئێوە باسی دەکەن ئەها لێرەبوو، بەڵام گواستراوەتەوە و لە شوێنێکی دیکە لقی خۆی کردووەتەوە". بۆیە کە گوتی بانقەکە لەو کۆشـەیە بـوو، ئیـدی ئەو مـاڵەی بـۆی دەچـووین، بە ئاسـانی دۆزراوە.

مـاڵی بەهـجەت جـان تـورك، لە نهـۆمی کۆتـایی یەکێـك لە باڵەخانەکـانی ئەو کۆڵانەبـوو. مـاڵی مەدەت سـەرحەدیش (١٩٤٣-١٩٩٤) بەرامبەر مالی کاك بەهجەت بوو. لە ژوور ماڵێکی گەورە و فراوان و ڕێك و پێکی ڕازاوەمـان بینـی. کە چووینە ژوورەوە، گـوێم لێبـوو منـداڵەکان بە کـوردی لەگەڵ دایکیـان دەپەیڤـین. بەهـجەت جـان تـورکیش لە مـاڵەوە نەبـوو، بەڵام مـاوەیەك دواتـر گەڕایەوە. ئـێمەش دەمێـك لەوێ مـاینەوە و قسـە و دەمەتەقێـی خۆشمان کرد. پاشان من و ئونساڵ و لەیلا زانا هەڵستاین و بەرەو ئەنقەرە ملی ڕێگامان گرت؛ مەهدییش ئەو شەوە لەوێ ماوە.

## لە بێشکتاش، مان لە خواردن دەگیردرێ

لە ناوەڕاستی مانگی تەباخی ساڵی ١٩٩٢، دەوڵەت، هێرشێکی زۆر فراوانی کردبووە سەر شاری شرناخ. دەتوانین بڵێین لەدوای هێرشەکە، شرناخ ڕووخێندرا و لەگەڵ زەوی یەکسان کرا. بۆیە ئەمە بووە هۆی ئەوەی لەوێ سەردەمێدا، خەڵکی شارەکە، بەرەو شار و شارۆچکەکانی ناوچەکە کۆچ بکەن. وەلێ هەڵکشانی تیرۆری دەوڵەت لە شرناخ، لە میدیا تورکییەکان هیچ باسی لێوە نەدەکرا. جا بە تاقە هەواڵێکیش باس لە ڕووخاندن و سووتاندنی شرناخ نەدەکرا. وەك ئەوەی نەبا بێت و نە بۆران. ئەمە وایکرد، بۆ پرۆتێستۆکردنی ئەو هەڵوێستەی ڕاگەیاندنی تورکی، بەشێك لەلایەنگران و ئەندامانی پارتی دیموکراس (دەپ) لە ناوچەی بێشکتاشی پارتەکە سێ ڕۆژ مان لە خواردن بگرن.

لە پاڵ ئەوانەی مانیان لە خواردن گرتبوو، لەگەڵ من، هەریەکە لە مووسا عەنتەر و فەقێ حوسێن و عەبدولڕەحمان دووڕە و ئیبراهیم گوربز و بیلگەسوو ئەرەنوس و ئەشبار یاغمور دەرەلی و پارێزەر سەرحەد بوجاك و ڕەمەزان ئولەك و ڕەمزی چاکن و ڕەجەب مارشاڵی و سڕی ئۆزتورکیش بەشدار بوون.

لە ماوەی ئەو سێ ڕۆژەدا، ژمارەیەکی ئێجگار زۆری ئافرەت و گەنج و بەتەمەن و خەڵکی جیا جیا و دەزگا میدیا جیهانییەکان سەردانیان کردین. ئەوانەی دەهاتن بۆ ماوەیەك لەگەڵمان دەبوون و لەسەر پرس و هەڵوێستمان لەو بارەیەوە گفتوگۆیان دەکرد.

دوای کۆتـایی هـاتنی مـانگرتن لە خـواردن، چـووینە بەردەم ئەنجومەنی میدیاکاران لە ناوچەی چاغائۆغلّوو و دەسکە گوڵێکی ڕەشـمان لەبەر دەرگـا بـۆ دانـان. پاشـان لەسـەر بـارودۆخەکەش وتارێکمان خوێندەوە. لەکاتی ڕۆیشتن، هەڤاڵێك سەر و گوڵی دا ئەو کەسـانەی بەشـداری مانگرتنەکەیـان کردبـوو. بیلگەسـوو ئەرەنووس دەیگوت بەو گوڵانە دەڵێن (گوڵی باکارا) بۆیە نرخیان زۆر گرانبەهـایە. لە هەورازی چاغـائۆغلّوو بەرەو نووسـینگەی ڕۆژنامەوانی دەچووین. لە پڕ گوێمان لە دەنگی بڵندگۆی پۆلیس بوو لە دوای خۆمان "هەموو ئەوانەی گوڵیان لە دەستە بووەستن".

هەورازەکە زۆر قەرەباڵخ بوو، ئێمەش لەناو حەشامەتی ئەوانەی دەهاتنە خوارەوە و ئەوانەی دەچوونە سەرەوە، بە پەرت و بڵاوی ڕێمـان دەکـرد. منیش گـوڵێکم لەدەسـت بـوو. وەلـێ بەبـێ ئەوەی تووشی هیچ ببم، بە نێوان پۆلیسـان تێپەڕ ببووم. لە پڕ زانیم بووە پـاڵ پـاڵانێ، کە ئـاوڕم داوە، بینـیم پۆلیسـەکان، ئیبـراهیم گـوربز دەخەنە نـاو ترومبێلەکەیـان. ئەویش لە هەوڵ و تەقەلای ئەوەدابوو لەگەڵیـان نەچێـت و سـواری ترومبێلەکەیـان نەبـێ. بەپەلە خـۆم گەیانـدە ئیبـراهیم، لەپاڵ ئیبـراهیم منیشیان ئـاخنییە نـاو ترومبێلەکە. کە سـوار بـووم، بینـیم چەنـد برادەرێکـی دیکەشـیان دەسـتگیر کردووە.

پۆلیسەکان ئێمەیان بردە بنکەی پۆلیسی ئیمۆنونو. کە گەیشتینە ئەوێ، ئێمەیـان لە ترومبێـل هێنـا خـوارەوە. فەرمانـدەی بـنکەکەش لەبەر دەرگـا، لە چـاوەڕوانی ئـێمەدا بـوو. بەڕێـوەبەری بـنکەکە کە مووسـا عەنـتەر و فەقـی حوسـێن و عەبـدولڕەحمان دووڕە و منـی

بینی، ڕووی لە پۆلیسەکان کرد و گوتی "ئەوانەی پێتان دەگوتن تیرۆریست، ئەو کەترە و دەڵەقۆڕانەن؟".

کە بردراینە ژوورەوە، پۆلیسێکی زۆر گەنج، ناوەکانی تۆمار کردین. پۆلیسەکە گوتی منیش خەڵکی سیوێرەگم. بیرمە ئەوێ ڕۆژێ، قردێلەیەکی زەرد و سۆر و کەسکمان لە یەخەی خۆمان دابوو. بۆیە کە پۆلیسە گەنجەکە ئەو قردێلانەی بینی، زۆر بە شێوەیەکی جوان و بە ڕێزەوە گوتی "پێم وابێ ئەگەر ئەو قردێلانە تۆزێك بشارنەوە و ئەوەندە زەقی نەکەنەوە باشە... ".

ماوەیەك دوای مانەوەمان لە بنکەی پۆلیسی ئیمۆنونو ، دیسان ئێمەیان سواری ترومبێل کردەوە و بردراینە بەڕێوەبەرایەتی پۆلیس، لە شەقامی وەتەن. لەوێندەر ئێمەیان لەبەر دەرگا هێشتەوە. ماوەیەك دواتر دیسان سواری ترومبێلیان کردینەوە و ئێمەیان هێناوە بنکەی پۆلیسی ئیمۆنونو. شەوێك لەوێ دەستبەسەر بووین. بەیانی ڕۆژی دواتر، پۆلیسێك بە پێ و بێ ئەوەی کەلەپچەمان لەدەست ببەستێ، ئێمەی بردە دادگای سوڵتان ئەحمەد. دادوەر لەوێ، بێ ئەوەی ئێمە ببینێ و دۆسیەکانمان بکاتەوە و هیچ ئیفادەیەکمان لێ وەربگرێ، بڕیاری ئازادکردنی داین.

## دامەزراندنی ئینستیتوی کوردی لە ئیستانبووڵ

ناوەندی فەرهەنگی میزۆپۆتامیا، لە ساڵانی نەودەکانی سەدەی بووری، لە گەڕەکی تاڕلەباشی ناوچەی تەقسیمی ئیستانبوولْ بوو. ئەو شوێنەی ناوەندەکەی لێبوو، باڵەخانەیەکی باریك و بەرز بوو.

ناوەندی کولتووری میزۆپۆتامیا، لە ساڵی ١٩٩١ دامەزرا. لە ڕۆژی دامەزراندنیشیەوە، هەموو چالاکیەکانی لەو باڵەخانەیە دەبرد بەڕێوە. لەوێ دەمێدا، ئیبراهیم گوربوز، سەرۆکی ناوەندی فەرهەنگی میزۆپۆتامیا بوو.

لە ناوەندی فەرهەنگی میزۆپۆتامیا، زوو زوو، مژاری ئەوە دەهاتە بەرباس، تا (ئینستیتوی کوردی لە ئیستانبووڵ دامەزرێنین). ئەو مژارە زۆر کەڕەت، لە خواردنگەی ڕۆژدای ساڤاش بولدانیش[1] باسی لێوە دەکرا. بیرمە چەند جارێك هەر لەو خواردنگەیە، بە ئامادەبوونی چەندان کەسایەتی و قەرەباڵخییەکی زۆر، باس لە کرانەوەی کرا. ئیدی دامەزراندنی ئینیستیتوتی کوردی لە ئیستانبووڵ، لە بەرواری پێنجەمین ڕۆژی مانگی سێی ساڵی ١٩٩٢ بڕیاری لێوە درا. ئەوانەی بەشداری کۆبوونەوەکەیان کرد، چەندان کەسایەتی جیاواز بوون کە لە چەندان شارەوە هاتبوون بۆ بەشداری کردن لەو جڤینە کە زیاتر لە ٤٠ کەس دەبوون.

لەوێ سەردەمێدا، زۆر بە خەستی پێکدادانەکان بەردەوامیان هەبوو. ڕۆژانەی ٨-١٠ تاوانی بکەر نادیار (فایلی مەجهول) ڕووی دەدا. چۆڵکردنی گوند بە زۆرە ملێ و پیاو ڕفاندن و کوشتن،

---

[1] ساڤاش بولدان (١٩٦٤-١٩٩٤) بازرگان و رووناکبیرێکی کورد بوو. هاوسەری پەروین بولدانی سیاسەتمەدار بوو. ساڤاش بولدان لەلایەن هێزێکی شاراوە و نهێنی دەوڵەت دەرفێندرێ و چەند رۆژێك پاشتر، دوای ئەشکەنجە و لێدانێکی زۆر، تەرمەکەی لە ناوچەی بۆلوو لە نێوان ئەنقەرە و ئیستانبوڵ دەدۆزرێتەوە (وەرگێڕ).

زۆر بە خەستی و ئاشکرایی دژ بە گەلی کورد جێبەجێ دەکرا. ئیدی ئەو سەردەمەی ئینستیتوی کوردی لێ دامەزرا، سەردەمێکی وەها بوو.

لە کۆبوونەوەی پێنجەمین ڕۆژی مانگی سێ، بڕیار لەسەر دامەزراندنی ئینستیتوی کوردی درا. پاشان هەشت کەس وەکوو دەستەی دامەزرێنەرانی هەڵبژێردرا، لەوانە: مووسا عەنتەر، فەقێ حوسێن ساغنچ، جەمشید بەندەر، عەبدولڕەحمان دوڕە، یاشار کایا، سلێمان ئیمام ئۆغلوو، ئیسماعیل بێشکچی، ئیبراهیم گوربوز.

بە شێوەیەکی کاتیش، تاوەکوو بەستنی یەکەمین کۆنگرە، ئەنجومەنێکی بەڕێوەبردن لە هەریەکە: مووسا عەنتەر، عەبدولڕەحمان دوڕە، ئیبراهیم گوربز دامەزرێندرا و مووسا عەنتەریش وەکوو سەرۆکی ئەنجومەنەکە هەڵبژێردرا.

وەکوو دەبینین، ئێستا، پێنج لەو ئەندامانەی بەشداری دەستی دامەزرێنەرانیان کرد، ئیدی لە ژیان نەماون. لە ڕاستیشدا لە کۆبوونەوەکە منیان وەکوو سەرۆکی ئەنجومەنەکە هەڵبژارد، نەك تەنیا ئەو هەشت کەسەی لە دەستەی دامەزراندن بوون، بەڵکوو ئەو پەنجا کەسەی لە کۆبوونەوەی خواردنگەی ڕۆژدا بەشدار بوون. بەڵام من لەو باوەڕەدا بووم، ئەو کەسەی بە سەرۆکی ئینیستیتوی کوردی هەڵدەبژێردرێ، دەبێ کورد بێ و نووسین و خوێندنەوە و قسەکردن بە زمانی کوردی زۆر باش بزانێت. لە کاتی دامەزراندنیشی ئەوەم بە ئاشکرا دەهێنا زمان. لەبەر ئەوەی هەڵبژاردنی سەرۆکی ئەنجومەنەکە تۆزێك لە پڕ هەڵبژێردرا و بووە چەپڵەڕێزان، بۆیە دەرفەتی ئەوەم نەبوو ئەو بیرۆکەیەم بخەمە ڕوو.

بۆیە بیرم لەوە کردەوە لەیەکەم کۆبوونەوەی ئەنجومەنەکە باس لەو هـزرەی خـۆم دەکەم. دواتـر زۆر کۆبـوونەوە ڕێکخـرا. منـیش بەشـداری جڤینەکـانم کـرد. بەڵام بە هـۆی ئەوەی لەوێ دەمێـدا تـاوانی بـکەر نادیـار و پیـاو فڕانـدن و سـووتان و خـاپوورکردنی لادێکـان ئەوەنـدە بە زۆری و بە خێرایـی ڕووی دەدا، ئیـدی ئەو مـژارانە خۆیـانە دەکـردە ڕۆژەڤـی کۆبوونەوەکانمـان و پرسـی سەرۆکایەتی دەبووە شتێکی لاوەکی. بە شێوەیەك دەرفەتی ئەوەم نەدەبوو ئەو مژارە ڕووناك بکەمەوە.

دوای کۆبوونەوەکەی خواردنگەی ڕۆژدا، لە شەقامی ڕومەلی لە ناوچەی نیشانتاشی، کۆبوونەوەیەکی دیکە ڕێکخرا. لەوێ جگە لە ئەنـدامانی دەسـتەی دامەزرێـنەر، هەریەکە لە ئەحـمەد تـورك و تەڵعەت ئینانج و خەتیب دیجلە و عەبدولمەلیك فورات و چەندان دۆستی دیکەش بەشدار بوون.

یەکەمـین کۆبـوونەوەی ئینسـتیتوی کـوردی لە ئۆفیسـێك، لە هەژدەمین ڕۆژی مانگی چواری ساڵی ١٩٩٢، لە شەقامی ڕوولی ناوچەی نیشانتاشی، لەبەشی ئەورووپای ئیستانبووڵ بەڕێوەچوو. لە جڤیـنەکە هەریەکە لە مووسـا عەنـتەر و فەقـی حوسـێن سـاغنچ و جەمشـید بەنـدەر و عەبـدولڕەحمان دوڕە و یاشـار کایـا و سـلێمان ئیمام ئۆغڵوو و ئیسماعیل بێشکچی و ئیبراهیم گوربز و چەندان دۆست و عەزیز لەگەڵمان بەشدار بوون.

لە کۆبوونەوەی یەکەمدا، پرۆفیسۆر دکتۆر عیسمەت شەریف

وانلی [1] و پرۆفیسۆر دکتۆرئۆردیخانێ جەلیل و پرۆفیسۆر دکتۆر جەلیلێ جەلیل و مستەفا ڕەشیدی پەرلەمانتاری سووریاش بەشدار بوون، هەروەها فەرەیدوون یازاری سەرۆکی گشتی پارتی (هەپ) و خەتیب دیجلەی پەرلەمانتار و ئەحمەد تورك و عەلی یغیتیش لەناو کۆبوونەوەکە بوون. هەروەها عەبدولمەلیك فراتیش بەشداری جڤینەکەی کردبوو.

هەریەکە لە ئەندامانی دەستەی دامەزرێنەران و میوانەکان یەکە یەکە لە کۆبوونەوەکە ئاخڤین. عەبدولڕەحمان دوڕە، وتارێکی بە کەلەجان و پڕ لە وزەی پێشکەش کرد.

لە بەری دەرەوەی، سەر شەقامی ئەو شوێنەی بۆ ئینستیتوی کوردی گیرابوو، هەڵسابن بە هەڵواسینی تابلۆی (ئینیستیتووی کوردی - Enstîtuya Kurdî ) بە پیتی لاتینی. تابلۆکە پێشتر ئامادەکرابوو. دوای هەڵواسینی پۆلیس هات و بە زەبری هێز، هەوڵی هێنانە خوارەوەی تابلۆکەی دەدا. بەڵام ئێمە بەرامبەریان وەستاینەوە و لە هەوڵی بەرپەچدانەوەیان بووین. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی دەماقاڵێیەکی زۆر و توند لە نێوانمان دروست ببێ. تا گەیشتە ئاستی ئاڵۆز بوون. دواجار پۆلیس دوای بەکارهێنانی هێز، تابلۆکەی لێکردەوە و هێنایانە خوارەوە. پاشان گوتیان "دەتوانن

---

[1] عیسمەت شەریف وانلی (١٩٢٤-٢٠١١) پرۆفیسۆر و سیاسەتمەداری کورد. یەکێکە لە ئەندامانی کۆمەڵەی خۆیبوون. هاوڕێی کۆنی جەلادەت عالی بەدرخان و قەدری جەمیل پاشا و ئەکرەم جەمیل پاشا و نورەدین زازا و قەدریجان بوو. لە بەیروتیش ناسیاوەتی لەگەڵ کامەران بەدرخان پەیداکرد. لە نەوەدەکانی سەدەی بووری رۆڵێکی گرنگی بینیوە لە ئەوروپا، بۆ ناساندنی دۆزی کورد بە جیهان. دواتر دەبێتە ئەندامی پەرلەمانی کوردستان لە دەرەوەی وڵات. لە ساڵی ١٩٩٩ دەبێتە سەرۆکی کۆنگرەی نەتەوەیی کورد. (وەرگێر).

تـابلۆیەکی بچکـۆلانە، لەبەر دەرگـای ئۆفیسـەکەتان لە ژوورەوە هەڵبواسـن و بەس". هەر بەوەش نەوەسـتان، بەڵکـو، داواکـاری گشتی کۆماری شیشلی، هەڵسا بە کردنەوەی دۆسیەیەکی دادگایی کـردن لەسـەر ئەنجومەنی بەڕێوەبردن و دەستەی دامەزرێنەرانـی ئینستیتوتەکە. بۆیە یەکێك لە بویەرە هەرە گرنگەکانی دامەزراندنی ئینسـتیتوی کـوردی، بریتـی بـوو لە هێنـانە خـوارەوەی تـابلۆ گەورەکەی دەرەوە، لەلایەن پۆلیسەوە، لە هەژدەمین ڕۆژی مانگی چواری ساڵی ١٩٩٢.

## کایدەر

لە سـەرەتای نەوەدەکـانی سـەدەی ڕابـردوو، ڕێکخـراوی کولتـووری و هاوکـاری کـۆمەڵایەتی (کایـدەر) بـۆ بوژانـدنەوەی ناوچەکـانی (کیغـی، دەپ، ئـاداکلی، یـایلادەرە، یەدی سـوو) دامەزرێنـدرا. حەسـەن خەیـری ئالکـان، سـەرۆکی دامەزرێنەرانـی ڕێکخـراوەکە بـوو. شـوێنی جـوگرافی ڕێکخـراوەکە لە گەڕەکـی دواتەپەی نـاوچەی کایـدکۆی ئیسـتانبووڵ بـوو. ڕێکخـراوەکە گۆڤارێکیشـی هەبـوو بە نـاوی، ( کایـدرەر) کە لەلایەن مەدحەت ئۆزجانەوە بەڕێوەدبردرا.

لە گۆڤارەکە چەندان وتار و دیمانە و وێنە و شیعر و نووچەی جوان لەسەر ئەو ناوچانە بلاو دەکراوە، کە لەسەرەوە ناومان هێنان. لە بەشێك لەو دیدارانەی بۆ گۆڤارەکە دەکرا، ئیختیار و پیرەژن، زۆر ڕووداوی جێگـای سـەنجیان لە کۆمەڵکـوژی ئەرمەنیەکـانی سـاڵی ١٩١٥ بـاس دەکـرد. جا ئەو پیـاو و ئافرەتە بە تەمەنانە، کە

ئەوسا زارۆك بوونە، زۆر چیرۆکی سەرنج ڕاکێشیان دەگێڕاوە، کە لە زاری باب و باپیرانیانەوە گوێبیستی ببوون.

زۆربەی ئەو دیمانانە مامۆستا مەدحەت ئۆجان سازی دەکرد. ئەو هاوکـات، مامۆسـتای وێـژەی قۆنـاغی ئامـادەیی بـوو. دوای ئەوەی خانەنشـین بـوو، بەشـی یاسـای زانکـۆی ئیسـتانبوولی تەواو کـرد. ئێسـتاش وەکـوو پارێزەرێـك لە ئیسـتانبووڵ کاردەکـات. مـاوەیەك دواتـر، کـاك مەدحەت، ئەو دیمانـانەی لە گۆڤـاری (کایدەر)ی بڵاوی دەکردەوە، بە ناونیشانی ( دۆڵی پیری لە زاری گەواهیـدەرانەوە) لە دوو تـوێی پەرتووکێکـدا چـاپی کـردن. لە پەرتووکەکە لە بڕی پێشەکی، چەند نووسینێکی منی دانا، کە کاتی خۆی وەکوو هەڵسەنگاندنێکی گۆڤارەکەیان بۆم ناردبوون. کاك مەدحەت پەرتووکێکی دیکەشی هەیە بە ناوی (ئۆخچیان).

لە بەرواری پـازدەمین ڕۆژی مـانگی دوازدەی سـاڵی ٢٠١٩، (کایـدەر) مەراسـیمێکی بە بـۆنەی ٣٠ سـاڵ بەسـەر تێپەڕینـی دامەزراندنی ڕێکخراوەکە سازکرد. ژمارە ٥٠ گۆڤارەکەش هەر ئەو ڕۆژە بڵاوکـرایەوە. بە بۆچـوونی مـن گۆڤـارەکە، سـەرچاوەیەکی گرنگە لە ڕووی مێژووی و کۆمەڵایەتیەوە.

## ئەنترۆپۆلۆگێکی ئەمریکی

لە سـاڵانی نەوەدی سـەدەی ڕابـردوو، لە نـاوچەی سـوڵتان ئەحمەدی ئیستانبووڵ، لە شەقامی دیڤان، وەشانخانەی (فورات) هەبوو. وەشانخانەکە هاوکات، کتێب فرۆشیەکیشی لە پاڵ بوو. شوێنەکەیان لە نهۆمی ژێرەوەی باڵەخانەیەك بوو. لە تەك ئەوانیش،

دەزگای بڵاوکردنەوەی نێودەوڵەتی (بەلگە) هەبوو. سلێمان یاشار، وەشانخانەی فورات و کتێب فرۆشیەکەی دەبرد بەڕێوە. کاك سلێمان خەڵکی ناوچەی ئاگری بوو.

سەرەتای ساڵی ۱۹۹۱، لەگەڵ پارێزەر سەرحەد بوجاك، چووینە کتێب فرۆشیەکەی فورات. لەوێ لەگەڵ ئەنترۆپۆلۆگێکی ئەمریکی هەڤدوومان ناسی. کابرا لە ئەفریقیا و کینیا و کوردستان، چەند لێکۆڵینەوەیەکی کردبوو. لە ئاخافتنەکانیدا دیار بوو، دۆستی کوردانە.

بیرمە نووسینگەی پارێزەر مەدحەت سەرحەدیش لە ناوچەی سوڵتان ئەحمەد بوو. لەوێ چووینە لای مەدحەتیش و کابرای ئەمریکی و مەدحەتم بەیەك ناساندن.

ئێوارەی هەمان ڕۆژ، هەموومان بەیەکەوە چووینە چێشتخانەیەکی ناوچەی فەریکۆی. ئەنترۆپۆلۆگە ئەمریکیەکە لەسەر نان خواردن، زۆر وتە و ئاخافتنی گرنگ و سەنگینی کرد. ئەو باسی لەوە دەکرد، زۆر نابێت کە کوردی ناسیووە. لە نزیکەوەش چاودێری خەباتی بەرخودانی گەریلا دەکات و زۆر سەرسامە بە گەلی کورد. پاشان بەم شێوەیە لەسەری بەردەوام بوو "دۆخی ئابووریم باشە. دوو کوڕم هەیە، ئەوانیش خاوەن و ماڵ و حاڵ و کار و منداڵی خۆیانن. هیچ چاوەڕوانیەکیان لە من نییە. هاوسەرەکەم کۆچی دوایی کردووە. سەر لە نوێش هاوسەرگیریم نەکردەوە. بۆیە دەمەوێت هەبوونیەکەم بۆ خزمەتی کورد بەکار بهێنم". پاشان ئەو هەست و بیرۆکانەی خۆی بە درێژی بۆ باس کردین.

ئەو ئەنترۆپۆلۆگە دەیگوت، زۆر نابێت کورد دەناسم، کەچی باسی کەموکوڕیەکانی گەلی کوردی دەکرد. بۆ ئەمەش هەوڵی بەراوردکردنی هۆزێکی کینیای لەگەڵ گەلی کورد دەدا. پاشان لەسەر پرسەکە ئاوا بەردەوام بوو "ڕۆژێك لە کینیا، لەگەڵ سەرۆکی هۆزێك، لەبەردەم چادرەکەی دانیشتبووین و دەمەتەقێمان دەکرد. چوار پێنج مەتر لە دووری چادرەکە، داری زل زلی لێبوو. لق و پۆپە پێچاوپێچەکانی دارەکە زۆر سەرنجیان ڕاکێشام. جا لە هەر چوار دەوری دارەکەش، لە ڕەنگ و شێوە و گەورەیی جیا، بەرد داندرابوو. ئەوانیش ببوونە جێگای سەرنجم. بۆیە هەڵستام و چووم، چەند لقێکم لە دارەکان لێ کردەوە و چەند بەردێکیشم هێنا و هەموویانم خستە ناو کۆڵە پشتەکەمەوە. بەڵام سەرۆکی عەشیرەتەکە بەو کارەی من زۆر تووڕە بوو و گوتی: "بۆت نییە لق و پۆپی ئەو دارە بشکێنیت و لقە شکاوەکانیش بخەیە ناو کۆڵەپشتەکەتەوە". ویستم وەڵامی سەرۆك هۆزەکە بدەمەوە بەوەی، هەندێك یادگارییە لە کینیاوە و هیچی دیکە. سەرۆك هۆزەکە وەڵامی دامەوە "زۆر شتی دیکەمان هەیە، دەتوانی چەندی بتەوێ بیبەی، بەڵام نابێ دەستکاری سروشتمان بکرێ. چونکە ئەو سروشتە بۆ منداڵەکانمان دەمێنێتەوە". ئەم هەڵوێستە وایکرد زۆر سەرسام بم. وەك چۆن بووە هۆی ئەوەی بکەومە ناو بیرکردنەوەیەکی قوڵەوە. بۆیە زۆر کاریگەر بووم بەوەی خەڵکی ناوچەکە ئاوا سروشتی دەڤەرەکەیان دەپارێزن و ئاوا خاوەنداریەتی لە داهاتووی زارۆکەکانیان دەکەن.

دوای باسکردنی ئەو ڕووداوە، ئەنترۆپۆلۆگەکە باسی لە جیاوازی هەڵوێستی کورد کرد و بەم چیرۆکە درێژەی بە

بەراوردکــاریکە دا "ڕۆژێــك، لە دەوروبەری شــاری ســیرت، خەریکی لێکۆڵینەوە بووم. شتێکم دۆزیەوە زۆر بە سکە دەچوو. منیش بە گوندییەکانی دەوروبەری خۆم گوت: ئایا دەتوانم ئەوە بۆخــۆم هەڵگــرم؟ ئەوانــیش بە ئەرێ ئەرێ بۆخــۆتی هەڵبگــرە، وەڵامیان دامەوە. پاشان پێیان گوتم، ئەوە لای ئێمە گەلێك زۆرە، ئەگەر دەتەوێت هەندێکی دیکەشت دەدەینێ. پاشان زۆر سککە و پارچەی گرنگی ئارکیۆلۆژیان بۆ هێنام".

دوای گێڕانەوەی ئەو چیرۆکە، ئەنترۆپۆلۆگەکە لێکدانەوەیەکی وەهای بۆ ئەو دوو چیرۆکە کرد "کورد بە خەڵکی ناوچەکانی ئەفریقیا ناچن. هەستی نیشتیمانی و سروشتیان زۆر کەمە. ئەمەش پەیوەندییەکی توندوتۆڵی بە ناهۆشیاری مێژووییەوە هەیە".

دوای نانخواردن، تا درەنگانێکی شەو، قسە و گفتوگۆی زۆر گرنگ و بە سوودمان کرد. پاشان بە هیوای دیداری بەیانی لە وەشــانخانەی فــورات، جــارێکی دیــکە لەیەك جیــا بــووینەوە. برادەرانیش ئەویان تا شوێنی مانەوەی خۆی گەیاند.

ڕۆژی دواتــر، چــووینە وەشــانخانەی فــورات، سلێمان پاشــار شپرزە دیار بوو. برادەرە ئەنترۆپۆلۆگەکەش لەوێ نەبوو. پاشان سلێمان گــوتی "ئەو ئەنترۆپۆلۆگە ئەمــریکییە، لە کــاتی دیــاری کراوی خۆی نەهاتە ئێرە. بۆیە تەلەفۆنم بۆ میوانخانەکەی کرد، ئەوانیش گوتیــان کــابرای ئەنترۆپۆلۆگ ئەوشــەو کــۆچی دوایــی کــردووە. شــەو بە تەنیــا تووشــی جەڵــتەی دڵ بــووە و گیــانی لە دەستداوە. بۆیە هەڵستام و چوومە میوانخانەکە، بەڵام بینیم هەموو هــۆتێلەکە لەلایەن پۆلیســەوە دەورە دراوە. بــۆیە نەیانهێشــت بچــمە

ژوورەوە. ناچار بە پۆلیسەکانم گوت، ئەو ئەنترۆپۆلۆگە هاوڕێمە و دەمەوێ جارێکی دیکە بیبینمەوە؛ بەڵام ڕێگایان پێنەدام. جا پۆلیس دەستی گرتبوو بەسەر سەرجەم کەلوپەلەکانی کابرا و هەواڵی مردنەکەیان بە ماڵباتەکەی دابوو. بۆیە چاوەڕوانی گەیشتنی منداڵەکانی کابرایان دەکرد".

ئیدی زۆر دواتریش هیچ زانیارییەکەمان لەسەر چۆنیەتی جەڵتەی دڵی ئەو کابرای ئەمریکیە نەزانی. کابرا ناوی خۆی بە ئێمە گوت، بەڵام لەبەر ئەوەی ڕۆژی دواتر دیسان هەڤدوومان دەبینی، بۆیە لە هیچ شوێنێك ناوەکەیم نەنووسی. ڕەنگە ئەگەر مابێ، ناوی لای سلێمان یاشار تۆمار کرابێت.

## زانکۆی ئۆزگور

زانکۆی ئۆزگور، بەشێوەیەکی فەرمی لە مانگی دەی ساڵی ١٩٩٣ دامەزرا. فیکرەت باش کایا و یاڵچن کوچوك و عەلائەدین شەنەل، چەند ناوێکی ناو لیستی دامەزرێنەرانی زانکۆکە بوون. زانکۆکە بەر لە دامەزراندنیشی، چەند توێژینەوە و کارێکی لەبارەوە کرابوو. بۆ نموونە، لە پێنجەمین ڕۆژی کۆتا مانگی ساڵی ١٩٩٢، لە ناوەندی فەرهەنگی شارەوانی (کەچی ئۆرەن) وانەی کردنەوەی زانکۆکە بەڕێوەچووبوو. لەوێ منیش وەکوو کەسێکی نووسیاری بواری زانست، بابەتێکم پێشکەش کرد. هۆڵەکە ئەوەندە گەورە بوو نزیکەی هەزار کەسی لێبوو. بیرمە ئەوێ ڕۆژێ، یاڵچن کوچوك منی پێشکەشی ئامادەبوان کرد.

لە سێزدەمین ڕۆژی مانگی چواری ساڵی ١٩٩٣، لە ئەنقەرە، کۆڕبەندێك لەبارەی پەروەردەی مێژوو بەڕێوەچوو. قسەکەری کۆڕبەندەکە پڕۆفیسۆر دکتۆر محەمەد عەلی کڵچبای بوو. لەوێ دکتۆر محەمەد باسی لەوە کرد، کە کورد نەبووەتە نەتەوە و لە چوارچێوەی چەند ئەتنیکێکی جیا جیا ماونەتەوە. نیرمە لە بەشی کۆتایی کۆڕبەندەکە، پرسیار و وەڵامێکی باش و بەسوود لە نێوان دکتۆر محەمەد و خوێندکارانی زانکۆی ئۆزگوور چێبوو. چەقی گفتوگۆ و نیقاشەکانیش زۆربەیان پەیوەندیان بە خودی زانستەوە هەبوو، چونکە پڕۆفیسۆر دکتۆر محەمەد عەلی کڵچبای، پارێزەری بۆچوونی فەرمی بوو. هەرچی خوێندکارانی زانکۆی ئۆزگوور بوو، ڕەخنەیان لە بۆچوون و ئایدۆلۆژیای فەرمی دەگرت.

عیسمەت ئەردۆغان سکرتێری زانکۆی ئۆزگور بوو لە ئەنقەرە، یڵدز ئویگونیش سکرتێری ئیستانبوولی هەمان زانکۆ بوو. زانکۆی ئۆزگور لە چوارچێوەی وەقفی تورکیا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دامەزرێندرا، کە لەلایەن فیکرەت باشکایاوە بەڕێوەدەبردرا. (ئۆزگور یونیڤەرسیتە فۆرموو) ناوی ئەو گۆڤارە بوو، کە زانکۆی ئۆزگوور بڵاوی دەکردەوە. یەکەمین ژمارەی گۆڤارەکە لە ساڵی ١٩٩٧ وەشێندرا. کۆتا ژمارەشی لە ساڵی ٢٠٠٦ بڵاو بووەوە.

بەشداری بەشێکی زۆری کۆڕبەند و پانێلەکانی زانکۆی ئۆزگورم کرد، لە هەردوو شاری ئەنقەرە و ئیستانبول. بە تایبەتی کارەکانی بەڕێوەچوونی ئەو چالاکیانە بەشێوەیەکی ئەکادیمی سەرکەوتوو لە ئەنجامی ڕەنج و ماندوو بوونی یڵدز ئویگون بوو.

تــا ئێستاشـــی لەگەڵـــدا بـــێ، وانە و کۆڕبەنـــد و چالاکیەکـــانی ئیستانبوولیان بەردەوامە.

## پایە گرنگەکانی ڕووناکبیری کورد (نوبهار و ئاڤێستا)

نـزیکەی دە، پـازدە سـاڵێك دەبـێ، لە کوردسـتان، خەبـاتێکی باشی ڕووناکبیری دەستی پێکردووە. چونکە وەشانخانە و گۆڤار و ڕێکخـــراوە نـــا حکومیەکـــان، پـــایەی گرنگـــی هەنگـــاوی ڕووناکبیرین.

ڕوونـاکبیری چییە؟ بـۆ کـورد، ڕۆشـنفکریی بـریتیە لە دەربـاز بـوون لە بەرتەسـکردنەوەی هـزری لەژێـر هەژمـوونی بۆچـوونی فەرمـــیەوە، لە ڕێگـــای تێگەیشـــتن لە پەیوەنـــدی مێژوویـــی و کۆمەڵایەتیی و سیاسی و فەرهەنگی.

لە ناوەڕاسـتی حەفتاکـانی سـەدەی ڕابـردوو، وەشـانخانەی (کۆمەڵ) ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو. وەك چۆن گۆڤاری (رزگاری و ئۆزگورلـوك یۆلـوو) لە پـاڵ دەزگـای بلاوکـردنەوەی دەنـگ و گۆڤاری دەنگیش هەمان ڕۆڵیان گێڕاوە. لەوێ دەمێدا وەشانخانەی (ڤـاتە) و لێکـۆڵینەوی (مـالیم سـانیج)ی مـحەمەد ئەمـین بۆزئارسلانیش لەو بارەوە پڕ گرنگن.

لە نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوو وەشانخانەکانی (بەلگە، یورت کیتاب، پەری) زۆر گرنگ و پڕ بایەخ بوون. لە سەرەتای ساڵی دوو هەزاری سـەدەی تـازەش، (وەشـانخانەی وەقفـی ئیسـماعیل بێشـکچی و دارا و سـیتاف) لەلایەك و گۆڤارەکـانی (کـۆپروو،

مزگین) لەلایەکی دیکە، ڕۆڵێکی بەرچاویان هەبووە. لە پاڵ ئەمانەش، ئەمڕۆ وەشانخانەی (رووپەڵ و بیتلیسنامە و ئارام) لەناو ئەو چوارچێوەیە گرنگە هەژمار دەکرێن، وەك چۆن دەشێ چەندانی دیکەش هەبن کە من لە بیرم کردبن. لە پاڵ ئەمانەش چەندان سایتی ئەلیکترۆنی وەك ( zazaki.net, nerinaazad, kürdistan-post.com, Kovara Bîr, Pirtûka Kurdi) ڕۆڵێکی بەرچاویان هەبووە، لە ڕۆشنکردنەوەی زیاتری ئەو ڕێگایە.

وەلێ لەناو هەموو ئەو ناوانەی لەسەرەوە هێنام، دوو وەشانخانە جێگای سەرنج و لەسەر وەستانن؛ ئەوانیش نوبهار و ئاڤێستان. هەردوو دەزگای بڵاوکردنەوە، لە نەوەدەکانی سەدەی ڕابردووە وە دامەزراون و تا ئەمڕۆ بەردوامن لەسەر بڵاوکردنەوە و وەشانی کتێب.

## وەشانخانەی نوبهار

دەزگای بڵاوکردنەوەی نوبهار، لە مانگی سێی ساڵی ١٩٩٢ لە ئیستانبووڵ دامەزرێنرا. کاتێك باسی نوبهار دەکەین، دەبێ یادی ناوێکی گرنگی وەك سلێمان چەڤیکیش بکەین. ئەو لە مانگی دەی ساڵی ١٩٩٢، گۆڤاری نوبهاری بڵاوکردەوە. نوبهار ماوەی دوو مانگ وەکوو گۆڤارێکی کوردی بڵاوبۆوە، دواتر دەزگای بڵاوکردنەوەشی بۆ زیاد کرا. گۆڤارەکە تا مانگی سێی ساڵی ٢٠٢١ بە دیاری کراوی ١٥٤ ژمارەی لێ دەرچووە. جگە لەمانە لە ژێر ناونیشانی (ئەکادیمیای نوبهار) گۆڤارێکی دیکەشیان بڵاو کردەوە.

ئەویش لە ساڵی ٢٠١٤ دەستی بە وەشانی کراوە. ئەو گۆڤارە بە زمانی کوردی و ئینگلیزی، ساڵانە دوو ژمارەی لێ بڵاو دەکرێتەوە. تا ئێستا ١٣ ژمارەیان لێ بڵاو کردووەتەوە.

وەشانخانەی نوبهار، زۆر خزمەتی وێژە و زمانی کوردی کردووە. جگە لەوەی چەندان دیوانی شیعری شاعیرانی کوردی ناودار نەبووی بڵاو کردووەتەوە، لە پاڵ ئەمانە، چەندان پەرتووکی دیرۆکی و فەرهەنگی و کۆمەڵایەتیشی وەشاندووە. بۆیە بەبێ هیچ گومانێك لە ڕێگای ئەو پەرتووك و بڵاوکراوانەی لەلایەن نوبهارەوە چاپ و بڵاو دەکرێنەوە، زمانی کوردی خزمەتێکی گەورەی دامەزراوەیی و زمانەوانی پێگەیشتووە.

## وەشانخانەی ئاڤێستا

یەکێکی دیکە لەو دامەزراوانەی خزمەتێکی زۆری ڕووناکبیری کوردی کردووە، وەشانخانەی ئاڤێستایە. ئاڤێستا لە ساڵی ١٩٩٥، لە ئیستانبووڵ، لەلایەن عەبدوڵڵا کەسکین و سۆنگول دوڕاکەر و ڕووکەن باگدووەوە دامەزرێنرا.

من عەبدوڵڵا کەسکین لە کۆتایی هەشتاکان و سەرەتاکانی نەوەدی سەدەی ڕابردووەوە دەناسم، ئەوکاتەی لە کۆلێژی زمان و مێژوو-جوگرافیا قوتابی بوو. ئەوسا لەگەڵ عەبدولڕەحیم ئۆزمەن زۆر بە دیار دەکەوت. ناوە ناوە هەڤدوومان دەبینی. عەبدوڵڵا کەسکین لە کۆتایی هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو، ماوەیەك لە گۆڤاری (تۆپلومساڵ کورتولوش)ی یاڵچن کوچوکیش کاری

کرد. وەشانخانەی ئاڤێستا دوای هاتنی عەبدوڵڵا بۆ ئیستانبووڵ دامەزرێندرا.

ئاڤێستا لە بابەتی مێژووی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی، وەشانی زۆر چاکی کرد. لە ساڵانی بیستی سەدەی ڕابردوو، ئینگلیز لە عێراق دەسەڵاتدار بوون. لەوێ دەمێوە تاوەکو، کۆتایەکانی دووەمین جەنگی جیهانی، لەوێشەوە تاوەکوو کودەتای چواردەی تەمموزی ١٩٥٨، فەرمانڕەواییان بەردەوام بوو. لە دوای ئەو سەردەمە، فەرماندە و سیاسەتمەدارە ئینگلیزەکانی ئەوێ سەردەمێ، دەستیان بە نووسینەوەی بیرەوەریەکانیان کردەوە. لەناو ئەو یادەوەرییانە، بە فراوانی باس لە جەنگی نێوان کورد و ئینگلیز دەکرێ. من پێم وایە ئەو بڵاوکراوانە، بۆ کورد زۆر گرنگن، لە کاتێکدا کورد لە بڕی خۆی، مێژووی لەلایەن گەل و نەتەوەی دیکەوە نووسراوەتەوە. بەو پێودانگە، ئەو نووسینە ئینگلیزیانە، بە بەراورد بە پەرتووکە مێژوویەکانی تورك و عەرەب و فارس لەسەر کورد و سەردەمەکە زۆر ڕاستتر و ڕاستگۆیانەترە.

کاتێك پرس دێتە سەر ئەرشیف، بۆ کورد ئەرشیفی ڕووس و فەرەنسی و ئەڵمانی و ئیتاڵی و ئەمریکی زۆر گرنگن. لەپاڵ ئەمە دەبێ کورد بە بەردەوامی و بە گومانەوە لە ئەرشیفی تورك و عەرەب و فارس بڕوانێ. وەك چۆن لەو باوەڕەدام بۆ کورد، ئەرشیفی ئەرمەنیش زۆر جێگای باوەڕ نەبێ. بۆیە ئاڤێستا ڕۆڵێکی گرنگی هەبووە لە بڵاوکردنەوەی، ئەرشیف و بەڵگەنامە و گەشتنامە و لێکۆڵینەوەی مەیدانی جوگرافی و نووسراوە کلاسیکیەکانی کورد. وەك چۆن ئاڤێستا خاوەن ڕێبازێکی تایبەت

بە خۆیەتی لە بڵاوکردنەوەی نووسین و پەرتووکی نووسەرە کوردە گەنجەکـان و نووسـەرە ئافرەتەکـان و ناسـاندنی بەرهەمەکانیـان بە خوێنەران.

چەنـدین جـار سـەردانی وەشـانخانەی ئاڤێسـتام کـردووە، وەك چۆن زۆرجار لە پێشانگاکانی پەرتووکیش سەرم لێ نەبڕیوون. جا لەوێ عەبـدوڵڵا کەسـکین و ڕووکەن باگـدوو و تەواوی ئەوانەی لەوێ کاریـان دەکـرد، بە گـڕوتین و کەلەجـان و هۆشـیاریەوە خەباتی خۆیان درێژە پێدەدا.

ئیسماعیل بیشکچی و لەمەنی هاوسەری، بیست و شەشەمین رۆژی مانگی حەفتی ساڵی ۱۹۹۰.

له وەشانخانەی (یورت کیتاب) ساڵی ١٩٩٢. ئونساڵ ئۆزتورك و سورەیا
ئۆزتورك و ئەردەم باڵجی و ئیسماعیل بێشکچی و نەناسراو.

ئیسماعیل بێشکچی، لەو کۆگایەی ناوچەی **ئیسکلیپ، کە بە**شێکی
زۆری ئەرشیفی خۆی لێ پاراستبوو. کۆ**تاییەکانی سالآنی ٢٠٠٠،**
ئەرشیفی شەوقی بوڵوت

# بەشی هەشتەم
# ساڵانی ۲۰۰۰ لە ئەنقەرە

## ڕۆژانەی لاپتۆپ

۲-۳-۲۰۰٤

ئەمڕۆ بۆ یەکەمجار بە لاپتۆپ دەستم بەکار کرد. بەو کۆمپیوتەرە دەڵێن لاپتۆپ. شێوازە تازەکەی نووسین لە لاپتۆپ بۆ من زۆر گرانە، چونکە کیبۆردی لەگەڵ کۆمپیوتەری ئاسایی جیایە. ئەو کۆمپیوتەرەی پێشتر بەکارم دەهێنا، شێواز و بەرنامەی نووسینەکەی جیا بوو. بۆیە کارکردن بە کۆمپیوتەر زۆر ئاسانتر بوو. لەگەڵ ئەوەش ڕاهاتبووم لە نووسین. پێم وابێ بە پێی کات لەگەڵ ئەوەش ڕادێم. جا کارکردن بە لاپتۆپ ئەوەی خۆشە دەتوانی بە ئاسانی لەگەڵ خۆت بۆ زۆر شوێنی ببەی.

نازانم ئەو شتانەی لێرە دەیان نووسم، دواتر چۆن دەتوانم بیانخەمە ناو کۆمپیوتەرەکەی دیکە. پێم وابێ بەو زووانە لەسەر ئەو بابەتانەش زانیاری بڵاو دەکرێتەوە. ئێستاش لە هەوڵی ئەوەدام خۆم لەگەڵ ئەو کۆمپیوتەرە تازەیە ڕابهێنم.

۲٤-۰۹-۲۰۰٤

دەمێکە دەستم بەوە کردووە بە لاپتۆپ بنووسم. باران و زەری

زۆر هاوکارییان کردم و ناویان لەلاپتۆپەکەم نا (ئیسماعیل بێشکچی ٢) بەڵام بە هۆی گۆڕانی شێوازی کیبۆردەکەی، تووشی زەحمەتی زۆر بوومە. بۆیە پێم وابێ پێویستم بە کاتێکی زۆر زیاتر دەبێ تا لەگەڵی ڕادێم. لاپتۆمەکەمیان بە ئینتەرنێتیشەوە بەستەوە. ئەوەش بۆ من کارئاسانییەکی زۆر چاکە.

٢٥-٠٩-٢٠٠٤

بەردەوامم لە کارکردن لەسەر لاپتۆپ، زۆر بەباشی فێری کردنەوە و داخستنی بوومە. لاپتۆپ بە پاتری کاردەکات. کاتێك وزەی تەواو دەبێت، دەبێ لە ڕێگای کارەباوە جارێکی دیکە بارگاوی بکرێتەوە. بۆ ئەوەی لاپتۆپەکە لەگەڵ خۆم بگێڕم، پێویستم بە کڕینی جانتایەکە.

٢٨-٠٩-٢٠٠٤

لەسەر کارکردنی لاپتۆپ بەردەوامم. هێشتا بەربەستەکانی بەردەمم لەگەڵ ئەو کیبۆردە تازەیە تەواو نەبووە. بۆیە ناتوانم بە خێرایی بنووسم. نووسین بە شێوازی کیبۆردە کۆنەکە ئاسانتر بوو. بەڵام گواستنەوەی لاپتۆپ ئاسانە. چەند ڕۆژێکە لە ماڵەوە بۆ سەر شوێنی کارەکەم و لەوێشەوە بۆ ماڵەوە بە لاپتۆپەوە دێم و دەچم، چونکە کێشی سووکە و هەڵگرتنی ماندووم ناکا. بەڵام دەبێ زوو زوو ئاگاداری شارژی پاتریەکەی بم. بەڵام دەتوانم بێ ئەوەی وایەری شەحنەکە لە کارەبا بخەم، نزیکەی دوو دەمژمێر کاری پێبکەم. کاتێکیش پڕ شەحن بوو، دەبێ وایەری شەحنەکە لە کارەبا بکەمەوە.

ئەمڕۆ بە دوور و درێژی کارم لەسەر لاپتۆپ کرد. بۆ ئەوەی

فێری هەندێك شتی وردیش بم، ڕۆژانە زۆر مژوولی ئەو وردەکاریانە دەبم. بۆ نموونە ئەگەر بتەوێ لەسەرەتای نووسینەوە تا کۆتایی، یان لە کۆتاییەوە بێیە سەرەتا؛ بەکارهێنەر پێویستی بە فێربوونی ئەو وردەکاریانەیە. هەروەها ڕاهێنانم لەسەر ئەوە کردووە، ڕستەیەك هەڵدەبژێرین و ڕەنگی دەکەم، یانیش هێڵی بە ژێردا دەهێنم. ئەو وردەکاریانە زۆر بە سوودن.

هەفتەی ڕابردوو لە ناوچەی ئیسکلیپ بووم. بۆ فرۆشتنی هەندێك لە زەوی و زار. میوەی بەهێ زەرد ببوو. تریش ڕەش هەڵگەڕا بوو. بەڵام ئەمساڵ بەرهەمی گویز کەمە. بە تایبەتی لە گوندەواریەکان بە هۆی ساردیەوە گویز پێنەگەیشتووە. بەڵام دارگوێزی ناو شارەکان، خۆیان لە سەرما پاراستووە. بۆیە تاق و تۆق گویز بە دارەوە دەبیندرێت. هەروەها بە هۆی سەرماوە، دار سێو و هەرمێش بەرهەمیان نییە. لە ئیسکلیپ پایز هاتووە. ئیدی دۆڵ و چیاکان ڕەنگیان گۆڕاوە. باخ و باخچە و بیستانەکانیش ڕەنگیان زەرد هەڵگەڕاوە. دارەکان تەواو وشك بوونە. دارەکان وردە وردە گەڵاکانیان هەڵدەوەرێ و بەشێك لە دارە بەرهەمدارەکانیش میوەکانیان بە هۆی نەڕنینەوە دەکەونە سەر زەوی. ئەوساڵ لەو شوێنانەی سەردانم کردن، هیچ گوڵێکم لە زۆزانەکان نەبینی. بۆ نموونە لە زۆزانی کادیکۆیی و کیریچ دەرە و ئەرەنلەر هیچ گوڵێکم نەکەوتە بەرچاو.

٢٠٠٤-١٠-٠٢

چەند ڕۆژێکە بە دوای ئەوەم خانوویێك بدۆزمەوە. دەمەوێ

ماڵێك لە ناوچەی کەچی ئۆرەن بکڕم. ئەوێ شوێنی دەرچوونی ئۆتۆپاسەکانی شارەوانییە لە ناوچەی کزڵای. مامۆستا سەعدوڵا لە کڕینی خانووەکە زۆر هاوکاری کردین و لەگەڵ کاك شیرینی بەڵێندەر ئێمەی بە یەك ناساند. ئەو خانووەی کڕیومە دوو نهۆمییە و بەرامبەر باخچەیە.

٢٠٠٤-١٠-٠٤

ئێستا زۆر باش لەگەڵ لاپتۆپ ڕاهاتووم. وەلێ هەندێکجار شاشەکەی ڕەش دەبێت. نازانم چۆن دەتوانم ڕێگری لەبەردەم دروستبوونی ئەو کێشەیە بکەم. جارێکیان بە هۆی ئەوەی ماوەیەکی زۆر دەستم لە نووسین بەردا، شاشەکە ئاوا ڕەش ببوو. بۆیە سەرلەنوێ لاپتۆپەکەم پێکردەوە، وات دەستم نا بە دوگمی پێکردنەوە. جارێکی دیکەش چەند خولەکێك لە نووسین وەستام بۆیە شاشەکە ڕەش بوو. وەلێ دەتوانم بە ئاسانی ئینتەرنێتی لەگەڵ گرێبدەم، بەڵام بە شێوەیەکی خێرا ئینتەرنێتەکە نایەتە ناو لاپتۆپەکەمەوە، چونکە هێشتا فێری ئەو هەنگاوە نەبوویمە. پێم وابێ دەبێ بۆ ئەو پرسە لەگەڵ ئەو برادەرانە بدوێم، کە لاپتۆپ بەکار دەهێنن. چونکە ڕەنگە ئەوان کێشەکەیان چارەسەر کردبێ.

بۆ ئەوەی لاپتۆپەکەم لە کاتی گواستنەوەدا بپارێزم، جانتایەکم بۆ کڕیووە. لەناو جانتاکەش وایەر و هەندێك لە کەلوپەلەکانی دیکەشی تێدا دەپارێزم. بۆیە تۆزێك کێشی زیاد دەبێ. هەندێکجاریش دوو جانتا لەگەڵ خۆم دەگێڕم.

٢٠٠٤-١٠-٠٦

لەسەر چەند کێشەیەکی لاپتۆپ، لەگەڵ چەند برادەرێك دوام. ئەوان باسیان لەوە کرد، نابێ شاشەکە ڕەش بێت. چونکە ئەوە نیشانەیەکی چاك نییە. بۆیە پێم وابێ دەبێ ئەو پرسە لەگەڵ ئەو کۆمپانیایە بکەمەوە، کە لاپتۆپەکەم لێی کڕیووە. دەشبێ ئەو پرسە بە زووترین کات چارە بکەم. چونکە چەند جارێکیشە بە گرانی دەتوانم لاپتۆپەکەم داخەم. لە کاتێکدا هەمان شتی چەند جارە دەکەم، بەڵام لاپتۆپەکە ناکوژێتەوە.

ئەمڕۆ چەند جارێك ئینتەرنێتم بە لاپتۆپەکەوە گرێدا، لەوێشەوە بە ئاسانی سەردانی چەندان لاپەڕەی ئینتەرنێتم کرد.

ئەمڕۆ لە کاتی کارکردن، شاشەکەم ڕەش نەبوو، هیچ نەبێ تاوەکوو ئێستا تووشی ئەو کێشەیە نەبوومە. وەلێ تووشی زەحمەتییەکی زۆر بووم، لە کردنەوە و داخستنی لاپتۆپەکە. بە تایبەتی لە کاتی کوژاندنەوەی تووشی زۆر ئاریشە دەبم. دواجار لەپاش ئەوەی چەند دوگمەیەکم داگرت، پاشان کوژاوە. ئەوەش بووە پاشخانێکی زانین، پێم وابێ ئاوا وردە وردە فێری دەبم. بۆ فێربوونیشی دەبێ زوو زوو ئەو ڕاهێنانە بکەم.

هەفتەی ڕابردوو، لە ئیستانبووڵەوە ئافی و شوکران و حیکمەت هاتنە لام. دوو ڕۆژ پێشتریش، ڕاپۆرتێکیان بۆ ئافی وەرگرت. ئەمڕۆ چووین تا ماڵە تازەکەمان ببینین. ئەحمەد بە ترومبێلەکەی خۆی ئێمەی برد. بە ئەحمەدەوە شەش کەس بووین. لەبەر ئەوەی لەناو ترومبێلەکە شوێن نەمابوو، بۆیە فاتیمەمان لەگەڵ خۆمان نەبرد. مامۆستا سەعدوڵا لە ماڵەوە چاوەڕوانی ئێمەی دەکرد.

دەمژمێر ١٠ی بەیانی بوو کە گەیشتینە ئەوێ. جارێکی دیکەش بە وردی سەیری ماڵەکەمان کرد. کاك شیرینی بەڵێندەر نەهاتبوو، چونکە تەندروستی باوکی تێکچووبوو. بۆ ئەمەش ناچار بوو، بچێتەوە دیاربەکر. لە بەرواری ٣٠-٠٩-٢٠٠٤ نزیکەی ٣٢ ملیار لیرەمان بۆ کڕینی ئەو خانووە دا. پارەکەم لە بانق، لەگەڵ کاك شیرین بەیەکەوە ڕاکێشا. لەبەر ئەوەی لە وادەی خۆی زووتر پارەکەمان وەرگرت، بۆیە بەشێکیان لە پارەکە شکاند. بۆیە من هەندێك زیانم کرد. لە بەرواری ٢١-١٠-٢٠٠٤، قستی دووەمی خانووەکە دەدەم. ئەویش نزیکەی ٣٨ ملیار لیرەیە. بەڵام بەر لەوەی قۆناغی دووەمی پارەدانەکە تەواو بێت، تاپۆی خانووەکەم پێدەدەن. ئەو پارەیەی دەشمێنێتەوە، لە دوای قستی دووەم، تا فرۆشتنی خانووی ژمارە ٣٣ دەمێنێتەوە. هەر بۆیە کاك شیرینمان بردە خانووی ژمارە ٣٣. سەڤینج خان ماوەیەکی زۆرە هەوڵێکی زۆر دەدات، بۆ کڕینی ئەو خانووە. کاك شیرین گوتی نرخی خانووەکە ٥٠ ملیارە. دیلەك خانیش پیاسەیەکی بەناو خانووەکە کرد. سەڤینج و دیلەك نرخەکەیان پێ زۆر بوو.

بەو پارەیەی لە ڕێگای فرۆشتنی زەوی و زارەکانەوە دەستم کەوت، خانووم کڕی، ئەوەشم بە ئونساڵ و لەوەند گوتبوو. ئونساڵ پێی وابوو خانووی نهۆمی سەرەوە، باش نییە. کاك لەوەندیش گوتبووی ناوچەی (کەچیئۆرەن) شوێنێکی خرپە. بەڵام لەگەڵ کاك سەعدوڵا، دوای گەڕان و ماندوو بوونێکی زۆر، هەر توانیمان ئەوە بدۆزینەوە. با بڵێین خێری تێدایە.

***

٢٠٠٤-١٠-٠٧

بۆ چارەسەری کردنی هەندێك لە کێشەکانی لاپتۆپەکە، لەگەڵ باران دوام. بە تایبەتی هەندێك لەوانەی بەلای منەوە پرسگرێکێکی گەورە بوون. ئەویش بۆی ڕوون کردمەوە کە ئەوانە چۆن دەکرێ، لە ڕاستیشدا هیچ کێشەیەك لە لاپتۆپەکە نییە. بۆ نموونە ئیدی شاشەی لاپتۆپەکەم ڕەش نەدەبوو. وەك چۆن داخستنی لاپتۆپەکەش بە ئاسانی دەکرا.

دوێنێ، یەکێتی ئەورووپا، ڕاپۆرتی وەرزی خۆ بڵاوکردەوە، پێم وابێ ڕاپۆرتەکە بە دڵی تورکیا نییە. بە تایبەت ویست و داواکارییە ئاشکراکانی یەکێتی ئەورووپا لە تورکیا، بۆ دیاری کردنی کورد وەك کەمینە نەتەوەیەك لە تورکیا و دانپێدانان بە کەمینەیی عەلەویەکان. ئەمەش دوو بابەتی وەهان کە تورکیا خۆشی لێیان نایەت و خوازیاری کردنەوە و ڕووبەڕووبوونەوەیان نییە. نەکردنیشی ڕەنگە ببێتە هۆکارێك بۆ ئەوەی پێڤاژۆی ئەندام بوونی تورکیا لە یەکێتی ئەورووپا بە هەڵواسراوی بهێڵێتەوە. جا دیاری نەکردنی مێژوویەك بۆ دەستپێکردنەوەی گفتوگۆکانیش هیچ لە بەرژەوەندی ئەنقەرە نەبوو. تورکیا بۆ ڕووبەڕوو نەبوونەوەی وەها دۆخێك، هەوڵێکی زۆری دیپلۆماسی دا.،ئەو هەوڵە دیبلۆماسییەش ڕاستەوخۆ لەلایەن ڕەجەب تەیب ئەردۆغانی سەرۆك وەزیرانی تورکیا و عەبدوڵڵا گولی[1] وەزیری دەرەوە دەدرا. ئەو ڕۆژەی

---

[1] عەبدوڵڵا گول، سەرۆککۆماری پێشووی تورکیا و یەکێك لە دامەزرێنەرانی پارتی داد و گەشەپێدان AKP. ئەو پیاوەی زیاتر لە ٢٠ ساڵ لەگەڵ ڕەجەب تەیب ئەردۆگان و هاوڕێکانی بەر لە دامەزراندنی ئاك پارتی بەیەکەوە لەناو پارتی =

ڕاپۆرتی یەکێتی ئەورووپا بڵاوکراوە، هەردووکیان لە برۆکسل بوون. لەوێ لەگەڵ چەندان ڕێکخراوی نا حکومی و دیپلۆماتکاران و بەرپرسانی وڵاتان دیدار و گفتوگۆیان کرد. لەوێ پێداگیریان لەسەر داواکانی تورکیا دەکرد. بەڵام سەرەڕای ئەو هەوڵ و ماندووبوونەیان، بەڵام سەرکەوتوو نەبوون. بۆیە دەبینین، ئەو هەنگاوە دیبلۆماسیانەی کورد دەیانگرێتەبەر، زۆر گرنگتر و سەرکەوتووترە.

ئەمڕۆ چەند تاقیکردنەوە و ڕاهێنانێکم، لەسەر ناردن و وەرگرتنی (ئیمێڵ) کرد. لە ناو کۆمپیوتەری وەشانخانە زۆر بەڵگە هەیە، پێم وابێ شتێکی چاك دەبێ ئەگەر ئەو بەڵگانە بخەمە سەر

---

ڕەفا و جوڵانەوە ئیسلامییەکان کاریان دەکرد. عەبدوڵڵا گول بەرلەوەی ببێتە سەرۆك کۆماری تورکیا لە ساڵی ۱۹۹۱ەوە تا ساڵی ۲۰۰۷ لە ٥ خولی جیاواز ئەندامی پەرلەمانی تورکیا بووە، دوای دامەزراندنی ئاك پارتی لە ساڵی ۲۰۰۲ تا ۲۰۰۳ دەبێتە سەرۆك وەزیرانی تورکیا، دوای ئازادکردنی ئەردۆگانیش دەست لە پۆستی سەرۆك وەزیرانی دەکێشتەوە. لە ساڵی ۲۰۰۳وە تا ۲۰۰۷ پۆستی وەزیری دەرەوەی تورکیا و جێگری سەرۆك وەزیران وەردەگرێت. دوای ئەوەی ماوەی سەرۆکایەتی ئەحمەد نەجدەت وەك سەرۆك کۆمار کۆتایی دێت، گول دەبێتە پاڵێوراوی ئاك پارتی بۆ وەرگرتنی پۆستی سەرۆك کۆمار، بەو شێوەیەش لە ساڵی ۲۰۰۷ تا ۲۰۱٤ وەك یەکەم سەرۆك کۆماری تورکیا لە پارتی داد و گەشەپێدان هەڵدەبژێردرێ. عەبدوڵڵا گول لە دایکبووی ساڵی ۱۹٥۰ی شاری قەیسەری تورکیایە، لەسەرەتای ژیانی سیاسییەوە لەگەڵ لایەنە سیاسییە ئیسلامییەکانی کاری کردووە و تا ساڵی ۱۹۹۸ لە پارتی ئیسلامی ڕەفا بووە. دوای داخستنی پارتە کەش، گول دەچێتە پارتی فەزیلەت و لەوێ درێژە بە کاری سیاسی خۆی دەدات، دواتر لەگەڵ ڕەجەب تەیب ئەردۆگان و چەندین هاوڕێی دێرینی ناو پارتی ڕەفا پارتی داد و گەشەپێدان دادەمەزرێنن و لە یەکەم هەڵبژاردندا دەتوانن بە تەنیا ڕێژەی یاسایی دەنگی دەنگدەران بەدەست بهێنن بۆ دروستکردنی حکومەت. (وەرگێڕ).

لاپتۆپەکەم. هیچ نەبێ دەتوانم هەندێکیان بۆ ئەوێ بگوازمەوە. لەوانە دەمەوێ هەردوو نووسینی (ئالۆزبوونی مێشکی عەلەوییەکان) و (دەربارەی زیا گۆك ئاڵپ) بخەمە سەر لاپتۆپەکەم. پێم وابێ لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا ئەو کارە بکەم زۆر چاك دەبێت. جا لەو سەروبەندە دەبێ نووسینی دووەمیش لەسەر زیا گۆك ئاڵپ ئامادە بکەم. چونکە زۆر گرنگە ئەگەر ئەو نووسینە بە زوویی ئامادە بێ.

٢٠٠٤-١٠-٠٨

لەماڵەوە کار لەسەر لاپتۆپەکەم دەکەم. پێکردنی هەندێك کاتی دەوێ. لە کاتێکدا کۆمپیوتەری وەشانخانە زۆر خێراتر کار دەکات. ئەمڕۆ چەندجارێك خۆم فێری گرێدانی ئینتەرنێت کرد بە لاپتۆپەکەمەوە. زۆر بە سەرکەوتوویی توانیم کارەکە بکەم. بەڵام تووشی هەندێك کێشە بووم لە کردنەوە و داخستنەوەی ئەو نووسینانەی کاریان لەسەر دەکەم. چونکە کاتێك کلیکیان لەسەر دەکەم، بە ئاسانی نابنەوە و داناخرێن.

نیقاشی لایەنەکان لەسەر ڕاپۆرتە تازەکەی یەکێتی ئەورووپا بەردەوامە. عەبدوڵڵا گولی وەزیری دەرەوەی تورکیا ئاماژەی بەوە کردووە، یەکێتی ئەورووپا پێدانی مافی کەمینەکانیان لە ڕاپۆرتەکە دەرهێناوە.

دەمەوێت، هەفتەی داهاتوو بچمە ئیسکلیپ. بە نیازی ئەوەم مامۆستا سەعدوڵاش لەگەڵ خۆم ببەم. بۆ ئەوەی یەك دوو ڕۆژ بمێنینەوە و دواتر بگەڕێینەوە. چونکە دەمەوێ پەرتووکخانەکەمی پیشان بدەم.

۱۲-۱۰-۲۰۰٤

بەراورد بە ڕۆژانی پێشوو، لاپتۆپەکەم زۆر بە ئاسانی بۆوە. وەلێ بە خێرایی کارەکە ناکات.

۱۸-۱۰-۲۰۰٤

ئەمڕۆ زۆر بە گرانی لاپتۆپەکەم خستەکار، هەرچی دەکەم ناتوانم نووسینەکانم بدۆزمەوە. ئەمەش کاتێکی زۆرم لێ دەبا. لە کاتێکدا دەبێ ڕێگایەك هەبێ تا بە ئاسانی لاپتۆپەکەم بکەمەوە و بە ئاسانیش نووسینەکانم دەستەبەر بکەم. بۆیە پێویستە سەبارەت بەو مژارە لەگەڵ باران بدوێم.

۲۹-۱۰-۲۰۰٤

بیر لەوە دەکەمەوە، تا بەیانی بەرەو ئیسکلیپ بکەومە ڕێ. مامۆستا سەعدوڵاش لەگەڵ من دێت. ئێوارەی ڕۆژی یەکشەمەش دەگەڕێینەوە. محێدینی برا گەورەم لەوێ سەرقاڵی خانوو دروستکردنە. بناغەکەی تەواو کردووە. بۆیە دەمەوێ ئەو خانووە تازەش ببینم. ڕەنگە تا هاتنی زستان نهۆمی خوارەوەی تەواو بکەن. جا سەری ئەو خانووەی لێشی دەمینێینەوە هێشتا دامان نەخستووە.

ئەمجارەیان سەمت لە نەخۆشخانەی ئیبن سینا نەشتەرگەری بۆ کرا. پێم وابێ ئەو کەڕەتە، نەشتەرگەرییەکی سەرکەوتووی بۆ کراوە.

لە ڕێگای ئۆنلاینەوە پەرتووکی (ئازنلك - کەمینەکان)ی نووسەر باسکن ئۆرانم کڕی بوو، بەڵام هێشتا بۆم نەهاتووەتەوە.

هێشتا به تەواوی لەگەڵ لاپتۆپ ڕانەهاتووم و سوودێکی باشم پێناگەیەنێ.

٢٠٠٤-١٢-١٠

ڕۆژی مافی مرۆڤە لە نەتەوە یەکگرتووەکان

٢٠٠٥-٠١-١٤

ئیدی بە ئاسانی دەتوانم کار لەسەر لاپتۆپەکەم بکەم و ئەوڕۆ بەرهەمێکی چاکی هەبوو. جا توانیم لەناو چەند لاپەڕەیەکی ئینتەرنێت چەند شتێك بخوێنمەوە و ئیمێڵیش بۆ چەند برادەرێك بنێرم. پێم وابێ ئێستا دەتوانم بە باشی ئەو کارە بکەم. هەر کێشەیەکیشم هەبێ بە باران دەڵێم، پێم وابێ گەنجەکان زۆر زیاتر مژوولی بەکارهێنانی تەکنەلۆژیان.

٢٠٠٥-٠٢-٠٨

ئێستا کارێکی زۆر لەسەر لاپتۆپ دەکەم. چەند ڕۆژێك پێش ئێستا، قادر هاتبوو. ئەمرە یاری بە کۆنتڕۆڵی تەلەفزیۆنەکە کردبوو، بۆیە هەندێك لە کەناڵەکان ون ببون و ئەو ئێوارەیە نەمتوانی سەیری (ڕۆژ تی ڤی و کوردستان تی ڤی ) بکەم. ڕۆژی دواتر کاك ئیحسان دوو دەمژمێر پێیەوە سەرقاڵ بوو تا دۆزیەوە. ئیدی دەتوانم سەیری کەناڵی (کوردسات و ئێن تی ڤی)ش بکەم. ئەوان دەمێك بوو ون ببون و نەمدەدۆزینەوە.

٢٠٠٥-٠٢-١٥

کارکردن بە لاپتۆپ شتێکی زۆر چاك و بە سوودە.

## هەژمارە ساختەکانی ئینتەرنێت

لە ساڵانی ٢٠٠٠، بەناوی منەوە زۆر هەژماری ساختە دروست کران. لەوان هەژمارانـــدا، بەشـــێك لە بۆچوونەکـــانی مـــن، بە شـــێوازێکی تونـــدتر و وشـــکتر بەیـــان و بـــڵاو دەکـــرانەوە. ئەو ساختەکارییە زیاتر لەناو فەیس بووك و تویتەر ڕوویدا.

من هیچ هەژمارێکم لە فەیس بووك و تویتەر نییە. سەرباری ئەوە دەیانگوت، ئیسماعیل بێشکچی هەموو ڕۆژێك لە هەژماری خۆیەوە لێدوان دەدات.

لەگەڵ برادەرانـــی وەقفـــی ئیســـماعیل بێشـــکچی، هەوڵێکـــی زۆرمانـــدا، تـــا ئەو هەژمـــارە ســـاختانە بوەســـتێنین. تـــا ئەو ئاســـتەی ســـەرمان لە داواکـــاری گشـــتی کۆمـــاریش دا. وەلـــێ نەمـــانتوانی ڕێگریان لێبکەین.

لە بیست و شەشەمین ڕۆژی کۆتا مانگی ساڵی ٢٠١٧، دوای نیوەڕۆ، کاتێك من لەماڵەوە نەبووم، پۆلیس هەڵیانکوتابووە سەر مـــاڵەکەم. دوای گەڕان و پشـــکنینێکی زۆر، لاپتۆپەکەیـــان لەگەڵ خۆیان بردبوو. ڕۆژی دواتر پێیان گوتم، پێویستە سەردانی بنکەی پۆلیس بکەم.

ڕۆژی دواتـر، پـارێزەر لەوەنـد کانـات، سـەرەتا پەیوەنـدی بە داواکـاری گشـتیەوە کردبوو، ئەوانـیش پێیـان گوتبـوو، بـا سـەرەتا ئیسماعیل بێشکچی بچێتە بنکەی پۆلیس و دواتر با بێتە لای ئێمە.

فەتین کانات، من و پاریزەر لەوەند کاناتی بردە بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسی ئەنقەرە، لەسەر ڕێگای ئەسکی شەهیر.

لە کاتی پێدانی ئیفادە، تێگەیشتین لێکۆڵینەوەکە لەسەر ئەو هەژمارە ساختانە لەسەرم کراوەتەوە. بۆیە منیش لەوێ ئاماژەم بەوەدا، کەهیچ هەژمارێکی تایبەت بەخۆم لە تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان نییە. دوای دەرچوونمان لە بەڕێوەبەرایەتی پۆلیس، ڕاپۆرتێکمان لە نەخۆشخانەی غازی وەرگرت. لەوێشەوە پۆلیس منی بردە داواکاری گشتی.

تۆزێك لەبەر دەرگا وەستاین، دوای ماوەیەك پۆلیسەکە هاتەوە و گوتی "داواکاری گشتی دەڵێ پێویست ناکات ئیفادەی وەرگرم، بۆیە ئازادە و با بڕوا".

## سەعدوڵا باهادر

مامۆستا سەعدوڵا باهادر، لە نزیکەوە مژوولی دۆخی تەندروستی من بوو. ماوە ماوەش بەیەکەوە دەچووینە نەخۆشخانە و پشکنینێکی گشتیمی دەکرد. بۆچوونێك هەبوو پێی وابوو لە دوای تەمەنی ٥٠ ساڵیەوە، پێویستە هەموو کوڕێك، پیاوێك، بەردەوام پشکنینی پرۆستات بکات. لەسەر ئەو ڕێنماییە، ساڵی ٢٠٠٥ لەگەڵ مامۆستا، چووینە نەخۆشخانەی حاجەتەپە. بۆ پشکنینی پرۆستات خوێنمان دا. لە ئەنجامی پشکنینەکان، مامۆستا سەعدوڵا هیچ نەخۆشیەکی لێ بە دیار نەکەوت. وەلێ بە منیان گوت، شتێکی گوماندارمان بینیوە، بۆیە دەبێ نموونەیەك لە

شـوێنی گومانەکـە بنێـرینە تـاقیگە. دوای وەرگرتنـی نمـوونەکە و دەرچـوونی ئەنجامەکـان، دەرکەوت لەو نمـوونەیەی بـۆ پشـکنین بردراوە، خانەی شێر پەنجە هەیە. پاشان دکتۆر باسی لەوە کرد، دەبێ ئەوە بە نەشتەرگەرییەك دەربهێنین.

لە دوای ئەو ڕۆژە، لەگەڵ زۆر دکتـۆری دیـکە لەو بـارەیەوە دواین. منیش بڕیارمدا بچمە ژووری نەشـتەرگەری. باسـم لەوەش کرد، پێویست ناکات لە دکتۆر و نەخۆشخانەی دیکە بدوێن.

دوای بڕیـارەکەی مـن، لەگەڵ مامۆستا سـەعدوڵا چـووینە لای دکتـۆر هـالوك ئـۆزەن. دوای پشـکنینێکی ورد، دکتـۆر هـالوك ئامـاژەی بە زەڕووڕەتـی ئەنجامـدانی نەشـتەرگەرییەکە کـرد. دوای بۆچوونەکەی دکتۆر لەسەر دۆخی تەندروستیم، مامۆستا سەعدوڵا بە دکتۆر هالوکی گوت "مادەم وایە جەنابت نەشتەرگەرییەکە بکە". دوای ئەو داواکـــارییە، جەنـــابی دکتـــۆر گـــوتی "ئەگەر مـــن نەشتەرگەرییەکە بکەم، تێچووەکەی دەگاتە نزیکەی ٢٠ هەزار لیرە. وەلـێ ئەگەر مامۆسـتا ئیسـماعیل بەو ڕاپـۆرتەی وەری گرتـووە، سـەردانی نەخۆشـخانەی گشـتی بکـات و فـۆرمی ئەنجامـدانی نەشتەرگەری پڕبکاتەوە، ئەوسا بیمارستان ڕۆژێکی بۆ دادەنێن تا نەشـتەرگەری بـۆ بکـرێ. ئەوسـا بە بـێ ئەوەی هـیچ تێچـوویەکی زیادی توش بێت، نەشتەرگەرییەکەی بۆ دەکرێ؛ چونکە لای ئێمە نەشتەرگەرییەکان لە بەرواری جیا و بە ستافی جیا دەکرێت. ڕەنگە نەشـتەرگەرییەکە خۆشـمان بـیکەین، بەڵام ئەمـڕۆ نـاتوانم بڵـێم سەداسەد ئێمە دەیکەین یان نا".

لە کۆتاییەکـانی سـاڵی ٢٠٠٥ ئەوەنـدە پـارەیەم پـێ نەدەدۆزراوە.

بۆیە بڕیارم دا تا سەردانی نەخۆشخانەی گشتی بکەم و فۆرمی داواکردنی نەشتەرگەری پڕ بکەمەوە. لەوێ بەرواری پێنجەمین ڕۆژی مانگی یازدەی ساڵی ٢٠٠٥ دیاری کرا بۆ ئەنجامدانی نەشتەرگەرییەکەم و لە ڕۆژی دیاری کراو نەشتەرگەریان بۆ کردم. نازانم کامە ستاف بەشداری نەشتەرگەرییەکەیان کردم. بەڵام هیچ تێچوویەکی نەبوو. چونکە ئەوسا مافی پاراستنی کۆمەڵایەتیم هەبوو.

چەند ڕۆژێك دوای نەشتەرگەرییەکە، لە نەخۆشخانە دەرچووم. لێرەشەوە دەمەوێ زانیارییەکی کورتتان سەبارەت بە دەرچوونم لە بیمارستان بۆ باس بکەم.

لە ڕاستیدا دەبوو بەلای کەمەوە ڕۆژێکی دیکەش لە نەخۆشخانە بخەوم. وەلێ خەڵکێکی زۆر هاتنە سەردانیم. دوای نەشتەرگەرییەکە منیان بردە ژوورێکی دوو نەفەری. وەلێ یاتاغی دووەم کەسی لێنەبوو. میوانەکانم گەلێك زۆربوون، بۆیە ڕۆژی دووەمیش هەر ئاوا تێپەڕی. بەشێك لەوانەی سەردانیان دەکردین، لەسەر بالینگانەکەی من دادەنیشتن. هەندێکیش لەسەر چارپایە بۆشەکەی ژوورەکە و هەندێکیشیان بەسەر لینگانەوە وەستابوون. دوای نەشتەرگەرییەکە ئەو دکتۆرانەی دەهاتن پشکنینم بۆ بکەن، یان ئەو پەرستارانەی شوێنی نەشتەرگەرییەکەیان خاوێن دەکردمەوە، بە هۆی زۆری میوانەکانەوە تووشی کێشە ببوون. هەندێك لە برادەرانیش لە بری ئەوەی بهێڵن پشوویەك بدەم، بە هۆی ئازاری نەشتەرگەرییەکەوە، کەچی دەیانپرسی "مامۆستا ئیسماعیل لەسەر دواین بویەرەکان بۆچوونت چییە؟". وەك ئەوەی

لە چایخانە دانیشتبین، پرسیاری عەلەق و پەلەقیان دەکرد. پێم وابێ دکتۆرەکان بەو قەرەباڵخیە نارەحەت بوون و بڕیاری دەرچوونیان دام لە نەخۆشخانە.

دوای ئەوە پشکنینەکان دەستیان پێکرد. لەماوەی ساڵی یەکەم هەر سێ مانگ جارێك دەچوومە پشکنین و لە ساڵی دووەمیش شەش مانگ جارێك. پشکنینی ساڵانەشم تا ئێستا بەردەوامە و هیچ کێشەیەکم نییە.

لە سەروبەندی نەشتەرگەرییەکە، لە پاڵ مامۆستا سەعدوڵا، ئونساڵ ئۆزتورکیش زۆر هاوکاری کردین. وەك چۆن لە ماوەی پشکنینەکان لەگەڵ مامۆستا سەعدوڵا، شەوقی بوڵوت و شەنگوڵ بوڵوتیش زۆر هاوکاریان کردم.

دواتر تووشی هەندێك کێشەی ئینزیلاقی پشت بووم. بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشەیەشم هەر سەرم لە نەخۆشخانەی حاجی تەپە دا. دوای پشکنینی، دکتۆر بڕیاری ئەنجامدانی نەشتەرگەری دا. بۆیە لەساڵانی ٢٠٠٦ و ٢٠٠٧ دووجار نەشتەرگەریم بۆ کرا. تا ئێستاش نازانم کامە دکتۆر نەشتەرگەرییەکەی بۆ کردم. لە ماوەی ئەنجامدانی ئەو نەشتەرگەریانە، دکتۆر سەباحەدین چەلیك زۆر هاوکاری کردم. وەك چۆن لە هەردوو نەشتەرگەرییەکەدا مامۆستا سەعدوڵا و ئونساڵ ئۆزتورك و شەوقی و شەنگوڵ زۆر پێمەوە ماندوو بوون.

ئیدی دەتوانم بڵێم بە هەرسێ نەشتەرگەرییەکەوە هیچ تێچوویەکی شایەنی باسم نەدا. تەنیا ئەوە نەبێ لە نەشتەرگەری دوایی پێنج لیرەمان دا، ئەوەش بۆ وەستانی ئۆتۆمبێلەکەمان بوو.

چـونکە بەیـانی ئەو ڕۆژەی نەشـتەرگەریم بـۆ کـرا، بە ترومبێلـی شەوقی بولۆت چووینە نەخۆشخانە.

لە نێوان سالانی ٢٠٠٣-٢٠٠٤ بە هۆی ناڕەحەتی لە گەدەیەوە، لەمان خانی خێزانم بردە لای پرۆفیسۆر دکتۆر عوسمان ئیلهان. پرۆفیسـۆر دکتـۆر سـەلیم کـارا یـالچنی دکتـۆری نەخۆشـیەکانی هەناویش هەر لەوێ بوو. هەردوو دکتۆریش، مامۆستای کۆلێژی پزیشکی زانکۆی ئەنقەرە بوون. دوای پشکنینی دکتۆر بۆ لەمانی خێـزانم، ئیـدی بڕیـاری چارەسـەری بـۆ نووسـی و لە مـاوەیەکی نزیکدا چابۆوە.

ئەوسا هۆشیار و بەرکان و ژیانی منداڵەکانی مامۆستا سەعدولا، لە قۆنـاغە جیاوازەکـان دەیانخوێنـد. خێزانـی بەڕێزیشـیان هەنـدێك كێشـــەی تەندروســـتی هەبـــوو. کـــاك ســـەعدولا خۆشـــی، لە قوتابخـانەیەکی ناوەنـدی مامۆسـتا بـوو. ئەمـڕۆ کە سـالی ٢٠٢٠، هۆشیار لە کۆلێژی پزیشکی زانکۆی حاجەتەپە دکتۆرە و بەرکان وەکـوو ئەنـدازیار لە شـارەوانی مـوش کاردەکـات و ژیـانیش خوێنـدکاری کۆلێژی ئابووری و کارگێڕی زانکۆی ئۆرتادۆغوو تەکنیکە. مامۆستا سەعدولاش ئیدی خانەنشینە.

## کۆمپانیایەکی بیناسازی

تەڵـعەت ئینـانچی دۆسـتمان کۆمپانیـایەکی هەبـوو و، پـلان و پرۆژەی بۆ کۆمپانیاکانی بیناسازی چێدەکرد. شەریف چەلیك و تەڵــعەت ئینــانچ بەیەکەوە هاوبەشــی کــاربوون. نووســـینگەی کۆمپانیاکەی لە شەقامی ئالاچامە، لە نهۆمی پێنجەمی باڵەخانەیەك

بوو. لە نێوان ساڵانی ۲۰۰۰-۲۰۱۰ زوو زوو سەردانیم دەکرد. باران ئینانچ و فەلات ئینانچ و زەری ئینانچ، بەردەوام لەوێ بوون. هەروەها محەمەد ئەرگونیش زوو زوو سەردانی ئۆفیسەکەی دەکرد، وەك چۆن ئیبراهیم کورەکەن و مەلا محەمەد و شاکر ئەپۆزدەمیر و ئەردۆغان گولیش زوو زوو لەوێ دەبینران. وەلێ لە هەموویان زیاتر من دەچوومە لایان. زۆر نووسینم لەوێ لەگەڵ زەری بەیەکەوە نووسیوە.

ئەوسا کۆمپانیاکەیان لە شاری دهۆکی باشووری کوردستان سەرپەرشتی پرۆژەیەکی دەکرد. ئەوان بەشێك لە ڕێگای نێوان هەولێر و دهۆکیان دروست دەکرد. ئەوان لەوێش نووسینگەیەکیان هەبوو، بۆیە کاك تەڵعەت و باران، زوو زوو دەچوونە دهۆك و ماوەیەکی زۆر لەوێ دەمانەوە.

لە مانگەکانی سەرەتای ساڵی ۲۰۱٤، حکوومەتی هەرێمی کوردستان، ڕووبەڕووی کێشەیەکی ئابووری بوەوە. حکوومەتی عێراق، بودجەی حکوومەتی هەرێمی کوردستانی بڕیبوو. بە هۆی هاتنی داعشەوەش، تێچووی جەنگ بەرز ببۆوە. لەپاڵ ئەمانە حکوومەتی هەرێمی کوردستان ڕووبەڕووی هاتنی ژمارەیەکی زۆری کۆچبەران بۆوە کە ئاوارەی کوردستان ببوون. لەبەر ئەم هۆکارانە، حکوومەت نەیدەتوانی پارەی پێویستی بەڵێندەرەکان بدات، بۆیە پرۆژەکان وەستێندرابوون. بۆیە ئەو برادەرانەش کارەکانی ناوچەی دهۆکیان وەستاندبوو.

## کتێبفرۆشیی چوارچرا

لە ساڵی ٢٠١٠، یەکێک لەو شوێنانەی زوو زوو سەردانمان دەکرد، کتێب فرۆشی چوارچرا بوو لە شەقامی سەلانیك. شوێنەکە لەلایەن فەتاح قەرەگۆز و فەجیدە قەرەگۆز بەڕێوەدەبردرا. ڕۆزانی کچیان لە پاریس قوتابی بوو. ئەداریش قوتابی قۆناغی ئامادەیی بوو. بە هۆی بێ بازاڕییەوە، کاك فەتاح سێ ساڵ بەر لە ئێستا شوێنەکەی بەیەکجاری داخست.

## ئینجەك - ئەنقەرە

ئینجەك یەکێك بوو لەو شوێنانەی زوو زوو سەردانمان دەکرد. عەبدولڕەحمان ئانك، لەوێ نووسینگەیەکی بیناسازی هەبوو، لەناو باخچەیەکی گەورە. لەولاتری باخچەکە، شەوقی بوڵوت زەویەکی فراوانی هەبوو. لە سووچێکی زەویەکە خانوێکی دروستکردبوو. زوو زوو دەچوومە ئەوێش. ئەوسا کاك شەوقی لەگەڵ براکەی کەلوپەلی تەندروستیان دەفرۆشت.

ساڵی ٢٠١٢ ئیسماعیل بێشکچی دوای ٣٨ ساڵ دابڕان، سەردانی ئامەدی کرد و لەلایەن سەرۆکی شارەوانی ئەوسای شارەکە، عوسمان بایدەمیر پێشوازی لێکرا.

# بەشی نۆیەم
# وەقفی ئیسماعیل بێشکچی، پێشانگای کتێب، گەشتەکانی دەرەوەی تورکیا، ڕێزلێنان

## بەرەو کوردستان

دوای دامەزراندنی وەقفی ئیسماعیل بێشكچی، گۆڕانكاریەكی گەورە لە ژیانم ڕوویدا. بۆ نموونە هەڵوێستێكم هەبوو سەبارەت بە دەرنەچوونم لە توركیا، ئیدی كەوتمە ئەو باوەڕەی چیدی ناتوانم بەردەوامی بەو هەڵوێستەم بدەم. بۆیەكەمجار لە مانگی نۆی ساڵی ٢٠١٢، لەگەڵ ئیبراهیم گوربزی دامەزرێنەری وەقفەكە، چووینە دیاربەكر. لەوێ چووینە سەرۆكایەتی شارەوانی گەورەی شارەكە و سەردانی عوسمان بایدەمیری[1] سەرۆكی شارەوانیمان

---

[1] عوسمان بایدەمیر لەدایك بووی ١٩٧١ ئامەدی باكووری كوردستانە، دەرچووی بەشی مافە لە زانكۆی دیجلە و ٧ زمان دەزانێت. یەكێكە لەو سیاسەتمەدارە كوردانەی زوو زوو جلی كوردی لەبەر دەكات. خاوەنی دوو منداڵە و لەگەڵ ڕەیحان یالچنداغ ژیانی هاوسەرگیری پێكهێناوە. بایدەمیر تا سەرەتای ساڵی ٢٠١٤ سەرۆكی شارەوانی ئامەد بوو، لە هەڵبژاردنی شارەوانییەكانی توركیای هەمان ساڵ وەكو بەربژێری هەدەپە بۆ سەرۆكایەتی شارەوانی ڕوها هەڵبژێردرا، بەڵام بەهۆی ڕێككەوتنی مەهەپە، جەهەپە و ئەكەپە لەو شارە بۆ سەرنەكەوتنی بەربژێرە كوردەكە، عوسمان بایدەمیر نەیتوانی ئەو پۆستە بۆ پارتەكەی بباتەوە، بەڵام دواتر لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی توركیا، لەسەر شاری ڕوها بووە پەرلەمانتار. دوای چوونە پەرلەمان و دووبارەكردنەوەی
=

کرد. لەو سەردانە شێخ مووس دیکەنیش هاوشانی کردین.

لە کۆتاییەکانی مانگی چواری ساڵی ٢٠١٣، لەسەر داوەتنامەی وەقفی بارزانی، سەردانی هەرێمی کوردستانمان کرد. لە سەردانەکە هەریەکە لە ئیبراهیم گوربز و ئیسحاق تەپەش لەگەڵم بوون. جگە لەمانە، فەتین کانات و وێنەگرێکیش هاوشانی سەردانەکەیان کردین، کە بە نیازی دروستکردنی دیکۆمێنتارییەك بوون لەسەر من. لەو سەردانە، سەرۆك مەسعود بارزانی، مەدالیای بارزانی لە سینگدام. ڕۆژی دواتر لە بارزانێ چووینە سەر گۆڕی مەلا مستەفا بارزانی. لە دەفتەرەکەی ئەوێ هەست و بۆچوونی خۆم نووسی. دواتر سەردانی گۆڕی شەهیدانی ئەنفالیشمان کرد.

لەو سەردانەدا لە زانکۆی سەلاحەدین، لە هەولێر، کۆڕبەندێك ڕێکخرا. لە کۆڕبەندەکە دکتۆر ئەحمەد ئەنوەر و چەند مامۆستایەکی دیکەش بەشدار بوون. هەروەها خەڵکێکی زۆر هاتبوون بۆ گوێگرتن. دوای کۆڕبەندەکە، فەرهاد پیربالی مامۆستای مێژووی هونەر لە زانکۆی سەلاحەدین، بە چەند هەنگاوێکی خێرا لێم نزیك بۆوە؛ کە هاتە بەردەمم، خۆی بۆ قاچەکانم نووشتاندەوە و تاکێك لە پێڵاوەکانی لە پێم داکەند. جا پێڵاوەکەی ماچ کردم و ڕووی لە گوێگران کرد و گوتی "ئەو تاکە پێڵاوە، لە مۆزەخانەی زانکۆی سەلاحەدین دادەنێم". پاشان

---

هەڵبژاردنیش لە ١-١١-٢٠١٥ جارێکی دیکە هەڵبژێردرایەوە. دوای کودەتا سەربازییەکەی تورکیا و ئۆپەراسیۆنی دەستگیرکردنی بەشێکی زۆر لە پەرلەمانتاران و سیاسەتمەداران و سەرۆك شارەوانییەکانی هەدەپە لە تورکیا لەلایەن حکومەتەوە، عوسمان بایدەمیر چەندین جار چووە بەردەم دادوەر و بڕیاری دەستگیرکردنی بۆ درا و چەندان جاریش بۆ ماوەی جیاجیا دەستگیرکرا. دواجار بە ناچاری تورکیا جێدەهێڵێت و ڕوو لە ئەورووپا دەکات. (وەرگێڕ).

مامۆستا فەرهاد بەم شێوەیە بەردەوام بوو لە ئاخافتنەکەی "نزیکەی ٤٠٠ ساڵ بەر لە ئێستا، عوسمانیەکان هاتنە ئێرە و ئێرەیان خستە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە. ئەوان هاتن تا خاك و خۆڵی ئێرە بکەنە هی خۆیان. لە کۆتایدا ئیسماعیل بێشکچیش هاتە ئێرە و پێی نا سەر هەمان خاك، بەڵام جیاوازیەکە ئەوەیە بێشکچی بە کورد دەڵێ: خاوەنداریيەتی لە خاك و نیشتیمانتان بکەن، وەك چۆن دەبێ هەوڵی پاراستنی زمان و فەرهەنگتان بدەن. بۆیە پێنانە سەر خاکی کوردستان بەو شێوەیە، زۆر گرنگە. لەو ڕووەوە ئەو تاکە پێڵاوە زۆر زۆر بەهادارە. بەشێوەیەك لەسەرجەم ماڵ و موڵکی عوسمانیان پیرۆزترە". دوای ئەم وتارە کورتە، گوێگران بە شەوق و زەوقێکی زۆر و خوێنێکی گەرمەوە قسەکانی فەرهاد پیرباڵیان چەپڵەڕێزان کرد. جا هۆڵەکە زۆر قەرەباڵغ بوو، بەشێوەیەك بەشێکی زۆری ئامادەبووان بە هۆی نەمانی شوێنەوە، لەسەر پێ وەستابوون. لە کۆڕبەندەکەدا سینەمخان جەلادەت عالی بەدرخانیش بەشداربوو. نەوالْ چەلیکم بۆ یەکەمجار لەو کۆڕبەندە ناسی. هەر لەو سەردانە، یاشار کایا و یوردا کایای خێزانی، لەگەڵ دارای کوڕیان لە هوتێل سەردانیان کردین.

ئەوکاتەی چووینە بارزان، فەلەکەدین کاکەیی لەگەڵمان بوو. لە گەڕانەوە، کاتێك لە بارزانەوە بەرەو مێرگەسۆر دەبووینەوە، لە ڕێگا سەردانی ئەشکەوتی شانەدەرمان کرد. دواتر سەرێکمان لە لالەشیش دا. لەوێ نەجدەت بوڵدانمان بینی، ئەوەش بۆ ئێمە بووە ڕێککەوتێکی خۆش و چاوەڕوان نەکراو. جا لەو سەردانەماندا، لە ڕۆژی یەکەمەوە تا کۆتا ڕۆژ، مووسا ئەحمەد و میرحاج، لە وەقفی بارزانی لەگەڵمان بوون. وەك چۆن کاتێك چووینە بارزان شێخ عەزیزی سەرۆکی وەقفی بارزانیش هاوڕێیەتی کردین.

لە هەمان سەردانمان بۆ باشووری کوردستان، چووینە شاری سلێمانی. لە ڕێگا، لە چەمچەماڵ لاماندا و سەردانی مۆنۆمێنتی شەهیدانمان کرد. دواتر بەر لەوەی بگەینە سلێمانی، بە نزیکەی ٢٢ کیلۆمەتر، لە ناوچەی بازیان، پەیکەری عەبدولڕەحمان پاشای بابان و شێخ مەحمود بەرزنجیمان بینی. هاتینە خوارەوە و بە وردی سەیری ئەو پەیکەرانەشم کرد و لەوێوە یادی شێخ مەحمود و عەبدولڕەحمان پاشامان کردەوە. لە ساڵی ١٩١٩ سوپای ئینگلیز دژی کورد، لەو ناوچەیە، گازی ژەهراوی و فڕۆکەی جەنگیان دژ بە شۆڕشگێرانی کورد بەکارهێنابوو. لەوێ باسی ڕووداوەکانی ئەوێ ڕۆژێی سەدەی بووریشمان کرد.

لە سلێمانی، سەردانی هێرۆ خانمان کرد. ئەوسا سەرۆك کۆماری عێراق، سەرۆك جەلال تاڵەبانی، لە ئەڵمانیا چارەسەری تەندروستی وەردەگرت.

فەرهاد پیرباڵ، تاکێك پێلاوی ئیسماعیل بێشکچی بە دەستەوەیە، هەولێر، زانکۆی سەلاحەدین.

## دوو وەزیری کورد و دیپلۆماتکارێکی تورك

لە کۆتاییەکانی مانگی سێی ساڵی ٢٠١٣ و سەرەتای مانگی چوار، وەکوو شاندی وەقفی ئیسماعیل بێشکچی لە هۆتێل دیوانی شاری هەولێر دەمباینەوە. بەیانییەك لەکاتی تاشتی خواردن، کەسێکی دەم بەخەندە، لە مێزی نانخواردنمان نزیك بۆوە. ئەو ئاوا خۆی ناساند "من ئایدن سەلجانی قونسوڵی تورکیام لە هەولێر". پاشان بەخێرهاتنی کردم. دواتر دەستمان بە گفتوگۆ کرد و ئێمەی داوەتی قونسوڵخانە کرد، بەڵام من بەو داوەتییە زۆر حەپەسام. چونکە من زۆر هاوڕێی سەردەمی خوێندکاری زانکۆم، ببوونە دیپلۆماتکاری وەزارەتی دەرەوەی تورکیا و هەندێکیشیان ببوونە قونسوڵ و باڵیۆز، وەلێ هیچ کەسێکیان داوەتێکی ئاوایان نەکردبووم. بۆیە ئەمە بۆ من ڕووداوێکی سەرسوڕهێنەر بوو. جا گوندوز ئاکتانی باڵیۆزی خانەنشین، لە ڕۆژنامەی ڕادیکاڵ، دژی گەلی کورد نووسینی بڵاودەکردەوە.

نزیکەی مانگ و نیوێك دوای ئەو پێشنیازی داوەتکردنەی ئایدن سەلجان، لە ڕێگای میدیاوە بیست کە، ئەو قونسوڵەی تورکیا لە هەولێر دەستی لە پۆستەکەی وەزارەتی دەرەوەی تورکیا کشاندۆتەوە.

چەند مانگێك دواتر، لەهەمان میوانخانە، هەمدیسان لەسەر

تاشتی، حوسێن چەلیکم[١] بینی. ئەوسا حوسێن چەلیك وتەبێژی حکـوومەتی تورکیـا بـوو. ئەوجـارە مـن چـوومە سـەر ئەومێـزەی لەسەری دانیشتبوو و پێم گوت "کاك حوسێن بەخێربێن". ئەویش زۆر بە نـابەدەڵی، بەبـێ ئەوەی سـەر هەڵبـڕێ، بە ئـاودیوکردنی دۆسـیەکانی سـەر مێـزەکەی بەردەمـی، وەڵامـی دامەوە "خۆشـبی سوپاس".

دیســان هەر لەو ڕۆژانەی لە میوانخــانەی دیڤــان بــووین، لە پێشـوازی میوانخـانەکە هۆشـیار زێبـاریم بینـی چـووە یەکێـك لە ژوورەکانی ئەوێ. منیش چووم و لە پاسەوانی بەردەرگاکە نزیك بـومەوە و خـۆم پێناسـاند و گـوتم "دەمەوێ سـڵاوێك لە کـاك هۆشیار بکەم". هۆشیار زێباری ئەوسا وەزیری دارایی عێراق بوو. پاســـەوانەکەش ئـــاوا وەڵامـــی دامەوە "وەزیـــر لە ژوورەوە کۆبوونەوەیەکی زۆر گرنگی هەیە. بە هیچ کلۆجێك ناتوانم بچمە لای".

ئەو ڕووداوەم دواتـر لە دەمەتەقێیەکـی هاوڕێیـانەدا بـۆ بـرادەران گێڕاوە. یەکێك لەوان پێی گوتم دوو کورد و تورکێك، هیچ نەبێ تورکەکە زۆر گەرموگوڕتر بووە لەگەڵت.

---

[١] حوسێن چەلیك، کوردی باکووری کوردستانە. یەکێك بووە لە دامەزرێنەرانی ئـاك پـارتی. چەلیـك لە دایـك بـووی ١٩٥٩ی شـاری وانە. هەریەکە لە پۆسـتی وەزیری کولتوور و گەشت و گوزار و دواتر وەزیری پەروەردەی لە کابینەکانی ڕەجەب تەیب ئەردۆگان وەرگرتووە، لە هەمان کات جێگری سەرۆکی ئاك پارتی بووە. (وەرگێڕ).

پێشوازی خاتوو هێرۆ ئیبراهیم ئەحمەد، لە ئیسماعیل بێشکچی لە سلێمانی، ساڵی ٢٠١٣.

## گەشتی فەڕەنسا و ئینگلتەرا

دوای سەردانەکەمان بۆ باشووری کوردستان، یەکەم گەشتمان بۆ سوید بوو. دواتریش چووینە فەڕەنسا و ئینگلتەرە. لێرەوە دەمەوێ باسی هەندێك لە قۆناغەکانی گەشتی فەڕەنسا و ئینگلتەرەم بکەم.

لە چواردەمین ڕۆژی کۆتا مانگی ساڵی ٢٠١٣، سی ساڵ تێدەپەڕی بەسەر دامەزراندنی ئینیستیتوتی کوردی لە پاریس. وەکوو وەقفی ئیسماعیل بێشکچی، ئێمەش داوەتی ڕێورەسمی ساڵیادەکە کرابووین. لەگەڵ ئیبراهیم گوربوزی سەرۆکی وەقف و پاریزەر ڕوشەن ئارسلانی جێگری سەرۆکی وەقف، لە

بەرواریسـێزدەمین ڕۆژی کۆتـا مـانگی سـاڵی ٢٠١٣ گەیشـتینە پاریس.

کۆڕبەنـدەکە لە یەکێـك لە ژوورەکـانی پەرلەمـانی فەڕەنسـا بەڕێوەدەچـوو. لەسـەر دەرگـای ئـۆدەکە نووسـرابوو (هـۆڵی کلێمێنسوو). ئینیستیتوتی کوردی لە پاریس، لە ڕۆژی چواردەی مـانگی دوازدە، بە ناونیشـانی (جەنگـی سـیڤیلی سـووریا و کاریگەرییە هەرێمیەکان) کۆڕبەندێکی بەڕێوەدەبرد. کۆڕبەندەکە بە دووبەش، لە دانـی بەیـانی و دوای نیـوەڕۆ پێشـکەش دەکـرا. دوای کۆبـوونەوەی دوای نیـوەڕۆ، بۆداخسـتنی پانێلەکـانی کۆڕبەنـدەکە بە وتـارێکی کۆتـاییش مـن بەشـدار دەبـووم. پێشکەشـکاری دانیشـتنی پانێلەکـانی دوای نیـوەڕۆ کەنـداڵ نەزان بوو. بەر لە من هەریەکە لە جۆزیف باهۆت و جیرارد چالیاند و پیتەر گالبرەیت و فوئاد حوسێن و بێرنارد کۆچنەر[١] دەدوان.

من لە وتارەکەمدا، دەمویست باسی ئەوە بکەم، کە لە ساڵی ١٩٢٠، ڕۆڵی ئینگلتەرا و فەڕەنسا زۆر بووە لە پارچە پارچەکردن و دابەشـکردن و جیـاکردنەوەی کـورد و کوردسـتان. نووسـراوی سەر دەرگاکەش ئەو ویستەمی زیاتر کرد.

---

[١] بێرنـار کـۆچنەر لەدایکبـووی سـاڵی ١٩٣٩یە. کـۆچنەر لەبـاوکێکی جـوو و دایکێکـی پرۆتێسـتانت لەدایکبـووە. کـۆچنەر کەسـایەتی پزیشـک و سیاسـی فەڕەنسـییە، لەسـەردەمی سـەرۆککۆماری فرانسـوا فیـون دا وەزیـری دەرەوەی فەڕەنسا بوو. کۆچنەر لایەنگری حیزبی کۆمۆنیستی فەڕەنسا بوو پاشان ڕووی لە حیزبی سۆسیالیستی فەڕەنسا کرد، دواتریش ڕووی لە حیزبی چەپی ڕادیکـال کـرد، بەڵام دواتـرگەڕایەوە حیزبـی سۆسیالیسـتی فەڕەنسـی. ئەو لەگەڵ دانـیەل میـتەران ژنـی سـەرۆککۆماری پێشـووی فەڕەنسـە سەردانی کوردستانی کردووە. (وەرگێڕ).

جـــۆرج کلێمێنســـوو لە نێـــوان ســـاڵانی ١٩١٩-١٩٢٠، سەرۆکوەزیرانی فەڕەنسا بوو. هەروەها سەرۆکی کۆڕبەندی پاریس بـوو لە کۆتـایی یەکەمـین جەنگـی جیهـانی، کە لە مـانگی یەکـی سـاڵی ١٩١٩ بەسـترا. دامەزرانـدنی کـۆمەڵەی گەلان، هەوڵێکـی گرنگی کۆڕبەندی پاریس[1] و ئەنجامەکانی کۆڕبەندەکە بوو. کە دواتـر بـووە هـۆی ئەوەی لە ئەنجـامی شکسـتی ئیمپراتـۆریەتی عوسـمانی، خـاکی ڕۆژهەڵاتـی نزیـك و ڕۆژهەڵاتـی ناوەڕاسـت بەسەر بەریتانیـای گەورە و فەڕەنسـا و ئیتاڵیا دابەش بکرێ. لەوێ عێـراق و ئـوردن و فەڵەسـتین بەر بەریتانیـای گەورە کەوتـن و سووریا و لوبنانیش بەر فەڕەنسا. ئەوسا شێخ مەحمود لە باشووری کوردسـتان دەیگـوت "مـن مەلیکـی کوردسـتانم" بـۆیە داوای لە بەریتانیا دەکرد، وەکوو مەلیکی کوردستان بیناسێنن. جا هەردوو وڵاتی فەڕەنسا و بەریتانیای ئیمپریالیستی ئەوسا، نەك نەیاندەویست کوردسـتانێکی سـەربەخۆ دانەمەزرێ، بەڵکـوو ڕێگـر بـوون لە دامەزراندنی کوردستانێکی ژێر هەژموون و دەسەڵاتی خۆشیان. هەربۆیەش هەرچی لە دەستیان هات، کردیان تا ڕێگری بکەن، لەبەشداری کردنی نوێنەری شێخ مەحمود لە کۆڕبەندی پاریس. دواجار کورد و کوردستان دابەشکران و پارچە پارچە کران. بۆیە ئەوسا ئەو دوو دەوڵەتە ئیمپریالیستە خاوەن مێژووە دوور و درێژە، لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەست لەناو دەست دژی کورد لەوێ دەمێوە سەری کورد و کوردستانیان ئاوا لە قوڕێ ڕاکرد. پاشان لەناو قسەکانم لە کۆنفرانسەکە گوتم "ڕەنگبێ هەر لەو هۆڵەش کە

---

[1] ئەو کۆڕبەندە نێودەوڵەتیە بوو کە ئامادەکاری ڕێککەوتنی کۆتایی پێهێنانی یەکەمین جەنگی جیهانی لێ سازدرا. کۆڕبەندەکە بە بەشداری ٣٢ وڵات لە بەرواری ١٨ مانگی یەکی ساڵی ١٩١٩ بەسترا. (وەرگێڕ).

ئێستا ئێمەی تێدانە، سەری کوردیش هەر لێرە لە قوڕ نرابێ".

لەناو وتارەکەم هەوڵمدا باسی ئەوەش بکەم، ئەمڕۆ لێرە باس لە چۆنیەتی سەرکوتکردنی کورد ناکرێ، بەڵکوو قسە لەسەر تێگەیشتن لە کێشەی کورد و کوردستان و ناسنامەی ئەو گەلە و بەرەو پێشچوونە ئازادیخوازەکان دەکرێ. بە بێ هیچ گومانێك، پێشکەوتنێکی گرنگ هەیە لە نێوان ساڵی ١٩٢١ تاوەکوو ٢٠١٠. وەك چۆن هەوڵ و تەقەلاکانی مەدام میتران لەوبارەیەوە لەبیر ناکرێ. لەگەڵ ئەوە کار و چالاکیەکانی بەرنارد کۆچنەریش لەبەرچاوانن.

دواتر بە بۆچوونی هولیا یەتیشەن و هەندێك لە برادەران، بەرنارد کۆچنەر، ڕستەی (سەر لە قوڕنانی کورد) و پرسی (هۆڵی کلێمێنسوو)ی زۆر پێناخۆش بوو. دواتر گوتیان دەمژمێر پێنجی ئێوارە کارەبای ژوورەکە دەکوژێندرێتەوە و شوێنەکە دادەخرێ. بە پێی پرۆگرامیش دەمژمێر چوار و نیوو من دەستم بە وتارەکەم دەکرد. وەلێ بەشێك لەوانەی بەر لە من دوان، زیاتر لە کاتی دیاری کراوی خۆیان قسەیان کرد. بۆیە نزیکەی ١٢ خولەك بەر لە دەمژمێر پێنج دەستم بە قسەکردن کرد. بۆیە لەو ماوە کورتە هەر توانیم ئەوەندە بڵێم.

## لە پەرلەمانی ئینگلیزدا

لە سێزدەمی ڕۆژی مانگی چواری ساڵی ٢٠١٤، لە هۆڵێکی پەرلەمانی ئینگلیز لە بەریتانیا، کۆڕبەندێکی نزیك لە کۆڕبەندەکەی پاریس هەبوو. ئیبراهیم دۆغوش داوەتی کۆڕبەندەکەی کردبووین. بۆ ئەو کۆڕبەندە لەگەڵ کاك ئیسحاق تەپە بەیەکەوە چووبوین.

لە فڕۆکەخانە لەلایەن ئیبراهیم دۆغوش و عەلی مانـاز و منداڵەکانی و یاشار کارادۆغان و منداڵەکانی پێشوازیمان لێکرا. کاك ئیبراهیم ئێمەی لە میوانخانەیەك دانا. بەرامبەر هۆتێلەکەش دووکانی شیرنەمەنی خۆی لێبوو. کۆڕبەندەکەی ناو پەرلەمانی ئینگلیز، بە ئامادەبوونی چەندان دەزگای میدیایی و چەند دۆستێکی کورد بەڕێوەدەچوو.

لەوێش هەوڵی ئەوەمدا، باس لە ڕۆڵی گەورەی بەریتانیا بکەم، لە دابەشکردنی خاکی کوردستان و پارچەپارچە کردنی گەلی کورد. لەناو کۆڕبەندەکە پەرلەمانتارێکی بەریتانیاش ئامادەبوو. پێم وابێ پەرلەمانتارەکە جێرمی جۆربینی بوو، کە دواتر بووە سەرۆکی پارتی کرێکاران. جا لە کۆتایدا باسی ئەوەی کرد، کە زۆر سوودی لە کۆڕبەندەکە بینیووە.

ئیسحاق تەپە و ئیسماعیل بێشکچی، لەندەن ٢٠١٣.

## گەشتی ئەمریکا

لەسەر داوەتنامەی زانکۆی واشنتۆن و وەقفی بارزانی سەر بە زانکۆکـە، داوەتـی ئەمریکـا کـراین. لەگەڵ ئیبـراهیم گـوربزی سەرۆکی وەقفی بێشکچی، خۆمان ئامادەکرد و ڤیزەمان وەرگرت. لە مانگی پێنجی ساڵی ٢٠١٤، بە مەبەستی فڕین بەرەو ئەمریکا، چووینە فڕۆکەخانەی نێودەوڵەتی ئەتاتورك لە ئیستانبووڵ. کاتێك لە نـۆرەی وەرگرتنـی بلیتـی سـەرکەوتن بـووین لە بۆردینـگ، فەرمانبەرێك لە ئێمە نزیك بۆوە و ئەوەی پێ ڕاگەیانـدین، کە نووسـراوێکی لایە و فەرمـانی ئەوەی پێـیە کە ڕێگـا نەدا ئـێمە سواری فڕۆکە بین. نووسراوەکە لە بەرپرسانی سنووری ئەمریکاوە هاتبوو، تا ڕێگر بن لەوەی ئێمە بەرەو ئەمریکا گەشت بکەین. بۆیە بە ناچاری لە باڵەفڕگە دەرچووین.

دوای ئەو ڕووداوە، سـەرمان لە قونسـوڵخانەی ئەمریکـا دا لە ئیسـتانبووڵ. دوای چەنـد دیـدارێك، دۆخەکەیـان سـەر ڕاسـت کـردەوە. ئەوەیـان لەسـەر پاسەپۆرتەکانیشـمان ئامـاژە پێکـرد. بەڵام گەشتەکەمان نەکرد.

لە سـاڵانی دواتـر، لەلایەن چەنـد ناوەنـد و ڕێکخراوێکـی دیـکەش، داوەتـی ئەمریکـا کـراین. دواجـار لەسـەر داوەتنـامەی دامەزراوەی (کـوردیش پۆلیسـی ڕیسـێرچ سـێنتەر – ناوەنـدی توێژینەوەی سیاسیی کوردی) خۆمان ئامادەکرد تا بەرەو ئەمریکا بڕۆین.

بە دوودڵـــی و ترســـی هەڵتـــۆقینی کێشـــەیەکەوە، چـــووینە فڕۆکەخانەی ئەتاتورك. وەلێ ئەمجارە ڕووبەڕووی هیچ ئاریشەیەك نەبـــووینەوە. ســـەردانەکە لە ٢٤-١١-٢٠١٨ تـــاوەکو٠٩-١٢-٢٠١٨ دەخایاند. ئەوسا لەگەڵ ڕوشەن ئارسلان و جەلال تەمەل و نەجلە تەمەلی خێزانی کاك جەلال بەیەکەوە چووین.

ڕێگـای ئاسـمانی نێـوان ئیسـتانبووڵ و واشـنتۆن نـزیکەی ١١ دەمژمێـرە. بیسـت و پێنجەمـین ڕۆژی مـانگی یـازدە لە واشـنتۆن بـووین. لە وردبینـی پاسەپۆرتی فڕۆکەخـانەی واشـنتۆنیش تووشـی هـیچ کێشـەیەك نەبـووین. لە دەرگـای فـڕگە، هەریەکە لە سـەرتاج تەمەل و سـەرووەت تۆسـۆن و دەنیـز ئەکیجـی و شـێخ مـووس یوکسـەك کایـا و نوسـرەت ئـۆنەر و کـامەران یـاکوت پێشـوازیان لێکـردین. نـزیکەی هەشـت دەمژمێـر جیـاوازی کـات لە نێـوان ئیستانبووڵ و واشنتۆن هەبوو.

سـەرتاج تەمەل، کوڕی جەلال تەمەلە و یەکێکە لە بەرپرسـانی (کـوردیش پۆلیسـی ڕیسـێرچ سـێنتەر – ناوەنـدی تـوێژینەوەی سیاسـیی کـوردی). ڤیلـدانی کچـی جەلال تەمەلـیش لە شـاری واشـــنتۆنی ئەمریکـــا دەژی. دامەزراوەی (ناوەنـــدی تـــوێژینەوەی سیاسـیی کـوردی) بـۆ داوتکردنـی ئـێمە، هەوڵ و مانـدووبونێکی زۆریان داوبوو و ئامادەکاریەکی پێپایانیان کردبوو.

یەکەم کۆڕبەنـدمان لە (ناشـناڵ پریێس)ی واشـنتۆن بەڕێوەچوو. ژمارەیەکی ئێجگار زۆری خەڵك ئامادەبوون. لە کۆڕبەندەکە بەیان سـامی عەبـدولڕەحمان و دیپلۆماتکـارێکی باڵیۆزخـانەی عێـراق و ڕۆژنامەڤان موتلوو جیڤری ئۆغلووش بەشداریان کـرد. لە بەشی پرسیار و وەڵامەکاندا، گفتوگۆی زۆر چاك و بەسوود کرا. دواتر لە شیکاگۆ، لە پەیمانگای تەکنەلۆژی ماساچیتسی زانکۆی نۆرت

ویسترن و لە زانکۆی نیوۆرکیش چەند کۆنفرانسێکمان سازکرد.

دوای گەیشتنمان بە ئەمریکا، لە فڕۆکەخانەوە ڕاستەوخۆ چووینە ماڵی سەروەت تۆسون. سەروەت خێزانەکەی یابانییە. لە ماڵەوەش بە زمانی ئینگلیزی و یابانی و کوردی قسەدەکەن. وەك چۆن ناکاسیمای خێزانی و کچە چوار ساڵانەکەشیان بە هەرسێ زمان توانای ئاخافتنیان هەیە. لە پاڵ ئەو کچەیان، منداڵێکی ساوای سێ چوار مانگانەشیان هەبوو.

ساڵی ١٩٩٠، پەرتووکی (کوردستان کۆلۆنییەکی نێودەوڵەتی)م وەرگێڕدرابووە سەر زمانی ژاپۆنی. پەرتووکەکە لە یابان چاپ و بلاو کرابۆوە. کیتابەکە ئێستا لە پەرتووکخانەی وەقفی ئیسماعیل بێشکچییە لە ئیستانبووڵ. بۆیە پرسیاری ئەوەم لە ناکاسیما کرد، ئاخۆ ئەو پەرتووکەی بینیوە یان نا؟ وەلێ ئەو سەرەڕای ئەوەی بەشی سیاسەتی خوێندبوو لە زانکۆ، بەلام پەرتووکەکەی نەکەوتبووە بەرچاو. بەلام گوتی لە ئینتەرنێت بە دوایدا دەگەڕێم. دە خولەك دواتر وێنەی (کییوشیلارن) پێ پیشان دام و گوتی "ئایا ئەوە پەرتووکەکەی وەرگێڕاوە؟".

(کاری کۆکا کییوشیلارنم)، لە ساڵی ١٩٩٠ لە ئەنقەرە، لە نووسینگەی ڕۆژنامەی (یەنی ئولکە) ناسی بوو. ئەو وەك ڕۆژنامەڤانێك، چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ سازکردبووم. ئەوسا دەیگوت، دوای ئەنقەرە دەچمە باشووری کوردستان و لەوێشەوە دەچمە دۆڵی بەکا. چاوپێکەوتنەکەی منیشی لە گۆڤارێکی یابان بلاوکردبۆوە.

***

دوای گەڕان و سووڕانێکی زۆر و بینینی چوار شاری

گەورەی ئەمریکا و چەندان کۆبوونەوە و دیداری جیا جیا، توانیمان چوار کۆڕبەندی گەورە لەو گەشتەی ئەمریکا ساز بکەین.

١- کۆڕبەندی واشنتۆن، لە بەرواری بیست و شەشەمین ڕۆژی مانگی یازدەی ساڵی ٢٠١٨. لە هۆڵی یانەی (ناشناڵ پریس) نزیك لە کۆشکی سپی بەڕێوەچوو. لەوێ هەریەکە لە دەنیز ئەکیجی و سەروەت تۆسون و سەرتاج تەمەل و ئەسەم چۆبان بەرپرسانی دامەزراوەی (ناوەندی توێژینەوەی سیاسیی کوردی) تێدا بەشدار بوون.

٢- کۆڕبەندی شیکاگۆ، لەبیست و هەشتەمین ڕۆژی مانگی یازدەی ساڵی ٢٠١٨ لە زانکۆی نۆرت ویسترن بەڕێوەچوو. لەوێ هەریەکە لە پاریزەر مەتین سەربەست و دەنیز دورویزی قوتابی دکتۆرا هاوکاریيان کردین.

٣- کۆڕبەندی بۆستۆن، لە بەرواری دووەمین ڕۆژی کۆتا مانگی ساڵی ٢٠١٨ لە پەیمانگای تەکنیك بەڕێوەچوو. لەوێ هەریەکە لە شێخ مووس یوکسەك کایا و نوسرەت ئۆنەر و هارری سارکیسیان هاوکارمان بوون.

٤- کۆڕبەندی نیۆرك لە بەرواری شەشەمین ڕۆژی کۆتا مانگی ساڵی ٢٠١٨ لە زانکۆی نیۆرك بە ڕێوەچوو. لەوێش هەریەکە لە عومەر کاچماز و سەرتاج تەمەل هاوکاریيان کردین.

## ئیبراهیم گوربز - ئەندازیاری سەرەکی وەقفی ئیسماعیل بێشکچی

لە کۆتایەکانی سەدەی ڕابردوو و سەرەتای نەوەدەکان، بە بۆنەی چاپکردنی هەندێك پەرتووکەوە، زوو زوو دەهاتمە ئیستانبووڵ. ئەوسا ڕۆژنامەی (یەنی ئولکە) هەفتانە دەردەچوو. ئیبراهیم گوربزم لەوێ سەروبەندێدا ناسی. بیرمە ئەوسا ئامادەکاری دەکرا، بۆ دامەزراندنی ناوەندی فەرهەنگی میزۆپۆتامیا. بۆیە داوایان لێکردم منیش لەگەڵیان بەشدار بم. منیش بیرۆکەکەم پێ باش بوو و بەڵێنی ئەوەشم پێدان زوو زوو بچمە لایان و سەریان لێ نەبڕم.

ناوەندی کولتووری میزۆپۆتامیا لە ماوەیەکی کورتدا دامەزرا. ڕۆڵی ئیبراهیم گوربز، لە ڕووی هزری و جەستەییەوە بەسەر ئەو ناوەندە ڕۆشنبیرییە زۆرە. ئەوان باڵەخانەیەکی باریك و بەرزیان لە تەقسیم، لەسەر ڕێگای پردی (هالیچ) بە کرێ گرتبوو. ئەوسا خەڵکێکی زۆر ڕۆژانە سەردانی ناوەندی فەرهەنگی میزۆپۆتامیایان دەکرد. لاوانی کورد بە شەوق و زەوقەوە خویان دابووە ئەو ناوەندە تازەیە. چەندان بەشی چالاکی وەکوو شانۆ و میوزیك و نیگارکێشانی هەبوو. هەموو ئەوانە لە باڵەخانەی ناوەندەکە بە پلیکانەکانەوە دەچوونە سەرەوە، یاخود لەسەرەوە دەهاتنە خوارەوە، تژی کەلەجان و بیرۆکەی نوێ بوون. ئەو کوردانەی هاتبوونە ئیستانبووڵ و تا لەوێوە وەکوو پەناهەندە بچنە ئەورووپا، ڕۆژانە

دەهاتنە ناوەندی فەرهەنگی میزۆپۆتامیا. چەندان نیگارکێش و هونەرمەندیش لەوێ پێشانگایان کردەوە.

ئیبراهیم گل، ئەوسا لەسەر ڕێگای ئیستانبووڵ و ئەنقەرە، لە ناوچەی ئەرەنکۆی دادەنیشت. ئەوسا ئیبراهیم کاری دابەشکردنی ڕەژووی دەکرد. جا ئەو سەردەمە هەرەیەکە لە ئاینوڕ و فیلیز و زەینەب و ئەرداڵ و عەلی ئەکبەڕ و عەبدولڕەحمانی برا گەورەی ئیبراهیمم ناسی.

هەریەکە لە ئاینوڕ و فیلیز و زەینەب، لە پارتی (هەپ) کاریان دەکرد. عەلی ئەکبەڕیش بەرپرسی لقی (هەپی) ناوچەی کادیکۆی بوو. ئاینوورڕیش پێشوازی لەو میوانانە دەکرد، کە لە دەرەوەی ئیستانبووڵەوە دەهاتنە شارەکە. ئەو سەرجەم میوانەکانی بە گەرمی لەماڵەوە میوانداریی دەکرد.

لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٩٠ و ساڵی ١٩٩١، بە بێ پسانەوە، سەردان ناوەندی فەرهەنگی میزۆپۆتامیام دەکرد. وەك لەسەرەوەش باسم کرد، لە کۆتایی ساڵی ١٩٩١، مژاری کردنەوەی ئینیستیتوتی کوردی هاتە بەرباس. ئەو ڕۆژانەی باسی ئەو مژارە دەکرا، ئیبراهیم گیل، لە قایشداغ دادەنیشت. ماڵی مامۆستا عەبدولڕەحمان دوڕە و مامۆستا مووسا عەنتەریش هەر نزیکی ئەوێ بوو. بیرمە بەیانییەك سەرەتا مامۆستا عەبدولڕەحمان و دواتریش مامۆستا مووسا عەنتەرمان هەڵگرت و هاتینە ناوەندی فەرهەنگی میزۆپۆتامیا. ئێوارە لە کاتی گەڕانەوە، مووسا عەنتەرمان لە ماڵەکەی خۆی لە ناوچەی گولسوو دادەنا. ڕێگاکانی ئیستانبووڵ بەلای منەوە زۆر جەنجاڵ و پێچ و تێکەڵ و ئاڵۆز بوون، بە

تایبەتی دوای تێپەڕینی پردی بۆغاز؟ منیش لەو بارەیەوە لە کاك مووسام پرسی "کاکۆ چۆن فێری جیاکردنەوەی ئەو ڕێگایانە بووی؟ ئاخر کاك مووسا کەی دەچینە ناو تونێل و لە کوێ دەبێ بەسەر ئەو پردە بکەوینەوە و کە دەبێ لەو یوتێرنە پێچ بکەینەوە؟ تۆ چۆن فێری ئەو ڕێگا و بانە بووی؟" مووسا عەنتەریش لە وەڵامدا گوتی "من هیچ شتێك فێر نەبوومە، شۆفێری کەنعان ئەڤەرەن[1]، سەربازێکی ئاسایی بوو، بەڵام شۆفێرەکەی من ئەندازیاری کیمیایە. بۆیە دەرگای ئۆتۆمبێلەکەم دەکەمەوە و لە کوشینی دواوە دادەنیشم و بەسەیرکردنی ڕێگا دەگەینەوە ماڵ".

پێنجەمین ڕۆژی مانگی پێنجی ساڵی ٢٠١٢، لە چەپەوە: جەلیلی جەلیل، ئیسماعیل بێشکچی، لەمان بێشکچی، عومەر میرانی، تارق زیا ئەکنجی، ئیبراهیم گوربز.

## دامەزراندنی وەقفی ئیسماعیل بێشکچی

سالانی ٢٠٠٠، ماوە ماوە، باسی پەرتووکەکانم و پەرتووکخانەکەم دەکرد. چونکە ژمارەیەکی لە بن نەهاتووی پەرتووك و ئەرشیفم هەبوو. داهاتووی ئەوانیش بۆ من، مژارێکی هەستیار و گرنگ بوو. هەستم بەوە کرد، ئیبراهیم گوربز، زۆر بەو پرسەوە مژوولە. باسی لەوەدەکرد، با کتێبخانەیەك بکەینەوە، یان ڕێکخراوێك، هەرنا دەتوانین وەقفێك دابمەزرێنین. سالانی ٢٠٠٩-٢٠١٠-٢٠١١ ئەو مژارە بە چڕی قسەی لەبارەوە دەکرا. من وەکوو خۆم لەو باوەڕەدابووم، کردنەوەی پەرتووکخانەیەك لە ئیستانبووڵ بەسە. بەڵام ئیبراهیم و برادەرانی دیکە، دامەزراندنی وەقفێکیان پێ باشتر بوو.

هەریەکە لە تەڵعەت ئینانچ و عەبدوڵڵا باران و ئیسحاق تەپە و ئەحمەد ئونالْ و باهۆز شاڤاتا و چەندان برادەری دیکە، ڕۆڵێکی بەرچاویان هەبوو لە دامەزراندنی وەقفەکە. وەلێ ڕۆڵی ئیبراهیم گوربوز بۆ کاتێکی زۆر لە پێشتر دەگەڕێتەوە؛ بەشێوەیەك تا دامەزراندنیشی ئەو هەست و پەیوەستیەی بۆ ئەو بابەتە هەر بەردەوام بوو. وەك چۆن، پارێزەر ڕووشەن ئاسلان، ڕۆڵێکی گرنگی لە جێبەجێکردنی کار و ئەرکە یاساییەکانی وەقفەکەدا هەیە.

ئیبراهیم و ئایونر گوربوز، دوو نهۆمی باڵەخانەیەکی پێنج نهۆمی شەقامی ئیشکی ناوچەی بەیئۆغلوویان پێشکەشی وەقفی

بێشکچی کرد، هەروەها سێ نهۆمەکەی دیکەشیان بە وەرگرتنی کرێ و هیچ شتێکی دیکە دایە وەقفەکە، بۆ ئەوەی بۆ کار و چالاکیەکانی بەکاری بهێنێت.

دوای وەرگرتنی شوێنەکە، دوو نهۆمی یەکەم نۆژەن کرایەوە. لەوێ هەریەکە لە مەحمـود یەشـیل و نەجیـب یەشـیل زۆر ئالیکاریـان کـردین. پاشـان دەسـتمان کـرد بە گواسـتنەوەی پەرتووکەکانی ئەنقەرە بۆ ئیستانبوول. لە ماوەی سێ مانگدا بە ٧ بارهەڵگری گەورە، پەرتووکان گواستراوە شوێنە تازەکە. جا منیش لەگەڵ لۆریەکە دەهاتم و لە ڕێگا لە تەك شۆفێرەکە دادەنیشتم.

دوای گەیشتنی لۆری پەرتووکەکان، کاك ئیبراهیم و برادەران، دەستیان بە بەتاڵ کردنەوەی دەکرد. کاك شەرەفەدین و ئیبراهیم گـوربز، لەسـەر وادە و شـوێنی کـردنەوەی وەقفەکـە بۆچـوونی جیاوازییان هەبوو.

مـن و ئیبـراهیم گوربـوز و تەڵعەت ئینـانچ و ئیسـحاق تەپە و عەبدوڵڵا باران، وەکوو ئەندامانی ئەنجومەنەکە هەڵبژێردراین. دواتر هەنـدێك گۆڕانکـاری لە هەیکەلـی ئیـداری کـرا. دوای نـزیکەی چوار ساڵ، پارێزەر نایل ئەرتوغرول هاتە شوێنەکەی من.

دوای دامەزراندنی وەقفەکە، هونەرمەندی نیگارکێش، ئەحمەد گونەش تەکین[1]، لەگەڵ یاقوب سوتی بازرگان، سەردانیان کردین

---

[1] ئەحمەد گونەشتەکین، هونەرمەندێکی نیگارکێش و پەیکەرسازی باکووری کوردستانە. ئەو لە دایك بووی ساڵی ١٩٦٦ شاری باتمانە. ئەحمەد گونەشتەکین یەکێك بووە لە هاوڕی نزیکەکانی یاشار کەمال. (وەرگێر).

و کردنەوەی وەها وەقفێکیان بە کارێکی گرنگ و پیرۆز دانا. دوای چەند مانگێك، ئەحمەد گونەش تەکین، تابلۆیەکی خۆی پێشکەشی وەقفەکەمان کرد. لە دانیشتنێکی کراوەشدا، بە ئامادەبوونی چەندان کارساز و بازرگان، تابلۆکە خرا مەزادەوە، هەر لەوێش چەندان لایەن وەك هاوکاری، پارە و دیارییان پێشکەشی وەقفەکە کرد. چونکە مەزادەکە بۆ فرۆشتنی تابلۆکە نەبوو، بەڵکوو بۆ هاوکاری وەقفەکە بوو. دواتر یەعقوب سوت، شوقەیەکی خۆی بەخشییە لقی هەولێری وەقفی ئیسماعیل بێشکچی. ئەو هاوکاریانە، لەگەڵ ئەوەی دەستگرتنێکی گەورەی مەعنەوی بوو، هاوکاتدا، هاوکاریەکی چاکی ماددیش بوو.

دوای دامەزراندنی وەقفەکە، چەندان سەردانی دەرەوەی تورکیا و کۆربەند و پانێلی گرنگمان سازکرد. لەناو سەردانەکانماندا، گەشتەکانی باشووری کوردستانمان زۆر گرنگ بوون. بە تایبەتی لە سەردانەکانم لەگەڵ ئیبراهیم گوربز، لە هەولێر لقی وەقفی ئیسماعیل بێشکچیمان کردەوە و لە زانکۆی دهۆکیش هۆڵێکمان بە ناوی ئیسماعیل بێشکچی ئاواکرد. کردنەوەی ئەمانەش بە هەوڵ و بیرۆکەی گوربز بوو. وەك چۆن هەر ئەو ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لە گەشەپێدانی پەیوەندییەکانمان لەگەڵ وەقفی بارزانی و مووسا ئەحمەد.

جگە لەمانە، بەهێزکردنی پەیوەندییەکانمان لەگەڵ پارێزگاری هەولێر و دهۆك و بەدواداچوونی پرۆژەکان لەلایەن ئیبراهیم گوربوزەوە کراوە. وەك چۆن ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لە سازدانی دیدارەکانمان لەگەڵ مەسعود بارزانی، سەرۆکی ئەوسای هەرێمی

کوردستان و نێچیرڤان بارزانی وەك سەرۆکوەزیرانی ئەوسای کوردستان و مەسرور بارزانی بەرپرسی ئەنجومەنی ئاسایش و دیدارەکانی بەرپرسانی حکوومەت.

دەمەوێ لێرە ئەو ڕاستییەش بڵێم، لەگەڵ ئەوەی لە ساڵانی نەوەدەکانی سەدەی بووریەوە ئیبراهیم گوربز، بە کوردی دەدوا، بەڵام دوای ئەو سەردانانە و ئاخافتنی بە کوردی، زمانی کوردییەکەی باشتر بووە.

سیاسەتمەداری بەڕێز دکتۆر تارق زیا ئەکینجی[1] و پەریهان ئەکینجی خێزانی، زەویەکی ٦١٤ دۆنمی خۆیان لە دیاربەکر، پێشکەشی وەقفی ئیسماعیل بێشکچی کرد. ئەمەش شانازییەکی گەورەیە بۆ ئێمە.

## پەرتووکخانەی جانیب یڵدرم

دوای کۆچی دوایی جانیب یڵدرم، شەهاب یڵدرمی کوڕی، پەرتووکەکانی باوکی بەخشییە وەقفی ئیسماعیل بێشکچی. سەرجەم پەرتووکەکان نزیکەی ٤٠٠٠ ناونیشان دەبوون. جگە لە ژمارەیەکی زۆری ئەرشیڤی گۆڤار و ڕۆژنامەکان.

سەرەتا پەرتووکەکانمان لە ماڵی کاك جانیبەوە هێنا ماڵی ئێمە،

---

[1] تارق زیا ئەکینجی لە دایك بووی ساڵی ١٩٢٥. سیاسەتمەدار و دکتۆر و نووسەرێکی کوردە و لە نێوان ساڵانی (١٩٦٥-١٩٦٩) پەرلەمانتاری پارتی کرێکارانی تورکیا بووە. (وەرگێڕ).

دواتر لەوێوە بردمانە لقی دیاربەکری وەقفی ئیسماعیل بێشکچی. دواتریش لەوێ بە هەوڵ و ماندووبوونی هەموو لایەك، لەناو ڕەفەکان داندرا و لەسەر دەرگای پەرتووکخانەکەش نووسرا (پەرتووکخانەی جانیب یڵدرم لە وەقفی ئیسماعیل بێشکچی).

دوای تەواو بوونی کارەکانی دامەزراندنی پەرتووکخانەکە، لە ڕێورەسمێکدا لە بیست و شەشەمین ڕۆژی مانگی پێنجی ساڵی ٢٠١٨، پەرتووکخانەکەمان بە ڕووی خوێنەراندا کردەوە. لە کردنەوەی کتێبخانەکەدا، پارێزەر ڕوشەن ئاسلانی سەرۆکی وەقفی بێشکچی وتارێکی پێشکەش کرد، دواتر شەهاب یڵدرم باسی لە چۆنیەتی گواستنەوە و دانانی پەرتووکەکان کرد. دوای ئەویش من وتارێکی کورتم دا.

کاك جانیب، بەردەوام لەگەڵ وەقفی ئیسماعیل بێشکچی بە زیندویی دەمێنێتەوە.

## باوکەکان، خەرجیی دەدەنە منداڵەکانیان

لە دوای کردنەوەی کتێبخانەکەی جانیب یڵدرم، لەگەڵ بەهمەن دۆغوو و مامۆستا ئایدن، بەیەکەوە چووینە باتمان. لە ناوچەی کۆزلوك، لە ماڵەکەی خۆی سەردانی عەبدوڵڵا کایای نووسەری ڕۆمانی (قەومێ چیا)مان کرد. دواتر سەردانی ئەو شوێنەوارانەمان کرد، کە شۆڕشی ساسۆنی لێ هەڵگیرسابوو. دواتر گەڕاینەوە نووسینگەکەی کاك بەهمەن دۆغوو. لەوێ برادەران باسی زۆر مژاریان کرد، لەناویاندا باسی ئەو کەسانەیان دەکرد کە هاوسەرگیریان کردووە، بەڵام منداڵییان نییە. یەکێك لە

برادەران گوتی "کاك ئیسماعیلیش منداڵی نییە...". لەسەر ئەو قسەیە یەکێك لە هەڤالانی دیکە بەرسڤی داوە "نەخێر، کاك ئیسماعیل منداڵی زۆرە، چونکە هەموو کورد منداڵی کاك ئیسماعیلن...". دوای ئەو وەڵامەش، کاك بەهمەن ڕووی لە من کرد و گوتی "باوکەکان خەرجی دەدەنە منداڵەکانیان"، ئەی کوانێ پارەی من؟ ئەی کوانێ خەرجی منداڵەکانی دیکە؟ بۆ خەرجی نادەیتە هیچ کەسێك؟ بۆیە بەو پێیە بێت تۆ زۆر قەرزداری ئێمەی. هەروەها، تا دێ، قەرزەکان کەڵەکە دەبن".

دوای ئەو حەنەکە، منیش ئاوا وەڵامم دانەوە "چەند ڕۆژێك پێش ئێستا، لە لقی وەقفی ئیسماعیل بێشکچی دیاربەکر، کتێبخانەی جانیب یلدرممان کردەوە. لەوێ چەند دووکانداریکیش لە کردنەوەی پەرتووکاخانەکە لەگەڵمان بەشداربوون. یەکێك لەوان، دوای ئەوەی لەوێ خۆی ناساند، ڕووی لە من کرد و گوتی: ئێمە زۆر قەرزداری جەنابتین مامۆستا، کورد زۆر دیهنداری تۆیە. دوای ئەم قسەیە، لەبەردەم کابرا نا، بەڵام بە تەنیا کاك ئیبراهیم گوربز هاتە لام و پێی گوتم: بەردەوام دەڵێن ئێمە زۆر قەرزداری تۆین و کورد زۆر قەرزدارتە، لێ قەت هەوڵی ئەوە نادەن قەرزەکانیان بدەنەوە، یان نایەن و پەرتووکێکی تۆ، یان پەرتووکێکی چاپکراوی وەقفەکە ناکڕن. پاشان ئیبراهیم گوربوز بەو شێوەیە بەردەوامی دایێ : لە هەر شوێنێك، کورد تۆ دەبینن، دەڵێن ئێمە زۆر قەرزداری جەنابتانین. ئێ برا مادەم زۆر قەرزداری، بەشێك لە قەرزەکەت بدەوە".

پاشان تەواوی ئەو مژارەم بۆ کاك محەمەد گۆزتورکی دۆستمان دەگێڕاوە لە ئەنقەرە، ئەویش سەبارەت بەو بابەتە گوتی

"باتمـــان شـــوێنێکه، که سیســـتەمی ســـەرمایەداری زۆر تێیـــدا پێشـــکەوتووە. کەرتـــی بـــانق و بازرگـــانی و دراو زۆر بە خێرایـــی دەچـــنە پـــێش. هەمـــوو شـــتێك بە پـــارە دەکـــڕدرێ و بە پـــارە دەفرۆشـــرێ. بـــۆیە لەوێ تۆیـــان قەرزداری خۆیـــان کـــردووەتەوە. بەڵام ئەو دۆخە لە دیاربەکر بە پێچەوانەوەیە، چوونکە بەراورد بە باتمان، ئەو کەرتانە زۆر پێشکەوتوو نین. بەو پێیەی لەوێ زیاتر پەیوەنـــدییە کۆمەڵایەتیەکـــان و دابونەریتەکـــان تـــا ئێســـتا وەکـــوو پێشـــوون، بـــۆیە دەڵـــێن ئـــێمە زۆر قەرزداری ئێـــوەین، بەڵام هـــیچ هەوڵێکیش نادەن تا قەرزەکانیان بدەنەوە".

## لە دوو زانکۆوە دکتۆرای فەخری

لە دوازدەمـین ڕۆژی، مـانگی دوازدەی سـاڵی ٢٠١٣، زانکـۆی بۆغازیچی، دکتۆرای فەخری بە من بەخشی. دکتۆراکەم لەلایەن پرۆفیسـۆر دکتـۆر ئەنگـین بەرمەك و پرۆفیسـۆر دکتـۆر زەیـنەب چەلیـك پیشـکەش کـرا.[1] هەمـان زانکـۆ لە بەرواری نـۆزدەمین ڕۆژی کۆتا مانگی ساڵی ٢٠١٣، بە هۆی گرنگی پێدان بە ژینگە و کەش و هەوا، دکتـــۆرای فەخـــری بە (ئەکومەنیـــك پاتریـــك بارسۆلۆمۆس) بەخشی.

لە میـدیاکان، نـووچە و ڕاپـۆرت و شـیکردنەوەکانی ئەو دوو دکتۆرا فەخرییە بەو شێوەیەی خوارەوە بوو:

---

[1] ئەوشـەوە، لەو ڕیزلێنـانەدا، منـیش وەکـو کـوردێکی باشـوور، کـە ئەوسـا لە ئیسـتانبوڵ ماسـتەرم دەخوێنـد، بەشـداری پێـدانی ئەو دکتـۆرا فەخـریەم کـرد. (وەرگێڕ).

"لە هەفتەی داهاتوو، زانکۆی بۆغازیچی، دوو دکتۆرای فەخری بە دوو کەسایەتی دەدات. یەکێکیان دکتۆر ئیسماعیل بێشکچییە، کە بە تویژینەوە و نووسین لەسەر پرسی کورد دەناسرێت. ئەوەی دیکەشیان پاتریکی کلێسای فەنەر ڕووم، بارسۆلۆمۆسە".

"ئیسماعیل بێشکچی لەسەر پێشنیازی کۆلێژی ئەدەبیات و، بە کۆی دەنگی ئەنجومەنی زانکۆ، بە هۆی ئەو کار و تویژینەوە و پەرتووکانەی بلاوی کردووەتەوە لە بواری زانستە کۆمەلایەتیەکان لە تورکیا و جیهان، دکتۆرای فەخری پێدەبەخشێت. دکتۆراکەی بارسۆلۆمۆسیش لەسەر پێشنیازی پەیمانگای زانستە ژینگەیەکان بە هۆی ئەو کار و چالاکی و خەبات و هەولانەی کردوویانە بۆ خاوێن ڕاگرتنی ژینگەی جیهان و زیاد کردنی سەوزایی و گرنگیدان بە ئاوی خواردنەوەیە".

پرۆفیسۆر دکتۆر گولای، سەرۆکی زانکۆ لەبارەی دکتۆرا فەخریەکانەوە گوتی:

"زۆر زانکۆی جیا جیا لە جیهان دکتۆرای فەخری بە پاتریك بارسۆلۆمۆس بەخشیووە، بەلام ئەمە یەکەمجارە لە تورکیا زانکۆیەك، دکتۆرایەکی فەخری پێدەبەخشێت. زانکۆی بۆغازیچی، کە بە ئیلهام و هەولێکی زۆری زانستی بنیادنراوە، سالەهای سالە، لە هەولّ و وچانی ئەو دایە، تا بە شێوەیەکی زانستی و ئەکادیمی، خۆی بگەیەنێتە ئاستێکی بالای زانستی. هاوکاتیش، بە زۆر ڕێگای جیاواز و ڕەنگی جیا جیا، پارێزگاری لە باوەڕی دیموکراسی و ئازادی و ئازادی زانست و زانکۆ کردووە".

محەمەد عزەدین و ئیسماعیل بێشکچی، زانکۆی بۆغازیچی، ئیستانبول، ٢٠١٣.

## لە بیست وڵاتەوە دکتۆرا

بەرپرسانی پاتریکخانە، لەگەڵ بڵاوکردنەوەی چەندان زانیاری، کە لە خوارەوە باسی دەکەین، ئەوەیان ئاشکرا کرد، لە مێژووی کۆماری تورکیا، بەکەمجارە زانکۆیەکی تورکی دکتۆرایەکی فەخری دەبەخشێتە پاتریکێکی ڕووم: "بۆ یەکەمجارە پیاوێکی کڵێسا بە مژاری ئاو و هەواوە مژوول بێت. تا ئێستا لە حەفت بەرواری جیاواز، دەربارەی ئیکۆلۆژی و تیۆلۆژی سەمپۆزیۆم ڕێکخراوە و یەکەمجاریشە لە تورکیا پەنجە لەسەر ئەو مژارانە دادەنرێت. هەروەها بارسۆلۆمۆس ڕێژە و ئاستی پیسبوون لە دەریای باڵتك و ئیجە و نیوەگۆی باکوور و ناوچەی ئەمازۆنی دیاری کردووە. جا کاتێك ئەو کارانەی کردووە، هەم کەسانی پسپۆری ئەکۆلۆژی و هەمیش پیاوانی ئاینی لەگەڵ بووە. سەرەتا ڕاهیبەکانی ئۆرتۆدۆکس و دواتریش کەسانی شارەزای ئیلاهیات و کەسانی زانستی. دواتریش لەگەڵ کاتۆلیك و موسوڵمان و مووسەویەکان کاری هاوبەشی کردووە و لە بیست وڵاتی جیاواز، دکتۆرای فەخری وەگرتووە".

## توێژەرێکی داهێنەر

زانکۆ هۆکاری پێدانی دکتۆرا فەخریەکەیان بە من بەو شێوەیە ڕوونکردەوە:

"دکتۆر ئیسماعیل بێشکچی، لە دوای ساڵی ١٩٦٥، بە گرتنە

بەری ڕێبازێکی نوێ، بەو توێژینەوە کۆمەڵایەتی و مێژوویانە دەناسرێت، کە سەبارەت بە کێشەی کورد نووسیویەتی. بێشکچی بە لێکۆڵینەوەکانی، بەشی زانستە مرۆڤایەتیەکانی بردە قۆناغێکی دیکە و، وایکرد ڕێز و پایەی ئەو بەشە زانستیانە لە زانستە مرۆڤایەتیەکان بەرزتر بێتەوە. بێشکچی لەپاڵ کارکردنی لەسەر پرسی کورد، شانی دا بەر نایەکسانی ناوچەیی و کۆمەڵایەتی، لەگەڵ ئەمەش کاری لەسەر جۆرەکانی سەردەستی کولتوور و ئەتنیك کرد لە تورکیا. بێشکچی زیاتر لە ٣٠ پەرتووك و توێژینەوەی نووسیووە لەسەر کێشەی کورد. جا زۆربەی ئەو پەرتووکانەش، لە سەردەمی جیا جیا، لە تورکیا قەدەغەکراون. کە وایکردووە، زیاتر لە ١٧ ساڵ لەسەر ئەو پەرتووکانە بکەوێتە زیندان و لەپاڵ ئەمەش زۆر سزای کارگێڕی و ماددی و مەعنەوی وەرگرێت. بەڵام ئەمە بووە هۆی ئەوەی لەلایەن زۆر نەتەوە و وڵاتانی جیهان و ڕێکخراوە ناحکومیەکانەوە، چەندان خەڵاتی جیاواز وەربگرێت".

***

لە بیستونۆیەمین ڕۆژی مانگی پێنجی ساڵی ٢٠١٤، زانکۆی سەلاحەدین لە هەولێر، دکتۆرای فەخری پێبەخشیم. بڕوانامەکە لەلایەن پرۆفیسۆر دکتۆر ئەحمەد دزەیی سەرۆکی زانکۆوە پێشکەشم کرا. لە بڕوانامەکە ئاماژە بەوە کراوە "بە هۆی ئەو خزمەتانەی کردووتانە بۆ بەشی زانستە کۆمەڵایەتیەکان و پێداگیریتان لەسەر ئازادی ڕا دەربڕین، ئەم خەڵاتەتان پێدەبەخشرێت".

## دیارییە بۆ ئیسماعیل بێشکچی

لە ساڵانی ٢٠٠٨-٢٠٠٩ ناسیاوەتیم لەگەڵ هەریەکە لە دکتۆر بارش ئونلوو و دکتۆر ئۆزان دەیار، ئەندامانی ئەنجومەنی کۆلێژی زانستە سیاسییەکان، پەیدا کرد. لە ساڵی ٢٠٠٩، باسیان لە پەرتووکی (دیارییە بۆ ئیسماعیل بێشکچی)یان دەکرد. جەختیشیان لەوە دەکردەوە، بەو زووانە دەست بە ئامادەکاری نووسینەوەی پەرتووکەکە دەکەن.

لە ماوەیەکی کورت، دوای ئەو ئاخافتنانە، دەست کرا بە نووسینەوەی پرۆژەی پەرتووکەکە. بۆیە لە زۆر شوێن و کاتی جیاواز، لەگەڵ بارش ئونلوو و ئۆزان دەیار ڕۆنیشتین و دیدارمان ساز کرد، چەند جارێکیش چاوپێکەوتنەکانمان لە کۆلێژی زانستە سیاسییەکان سازدا.

ئەو دوو کەسایەتییە بە چڕی کاریان لەسەر پرۆژەکە کرد. زۆر بەوەش ماندوو بوون، تا پەیوەندی لەگەڵ نووسەر و توێژەرانەوە ببەستن و بۆچوون و ڕامانی ئەوان لەسەر من وەرگرن و بینووسنەوە. ئەو پەرتووکەی لەلایەن بارش ئونلوو و ئۆزان دەیارەوە ئامادە و کۆکراوە، بەناوی (ئیسماعیل بێشکچی) ساڵی ٢٠١١ لەلایەن وەشانخانەی (ئیلەتیشم) چاپ و بڵاوکرایەوە.

## تاوانی پیتی Q

ساڵی ٢٠١٠ وتارێکم لەژێر ناونیشانی (مافی چارەی خۆ

نووسینی نەتەوەکان و کورد) لە گۆڤاری (چاغمزدە هکوك ڤە تۆپلوم) بڵاوکردەوە. بە هۆی ئەو وتارەمەوە، لە دادگای یازدەی تاوانە گرانەکانی ئیستانبووڵ، داوایەکم لەسەر کراوە. ئەوسا دادگاکە لە ناوچەی بێشکتاش بوو.

زیاجان باڵجی شمشەك، سەرنووسەری گۆڤارەکە بوو. لەگەڵ من، ئەویش بە هۆی بڵاوکردنەوەی وتارەکەوە دادگایی دەکرا. یەکەمین دانیشتنی دادگا بۆ داواکەمان، لە بیستوهەشتەمین ڕۆژی مانگی حەفتی ساڵی ٢٠١٠ بوو. دۆسیەکە لە دووەم ڕۆژی مانگی سێی ساڵی ٢٠١١، بە تاوانبارکردنم کۆتایی پێهات. بە کۆی دەنگی دەستەی دادوەرانیش، بڕیارەکە دەرچووبوو.

بە شەمەندەفەر، لە ئەنقەرەوە چووینە ئیستانبووڵ، تا بەشداری دوا دانیشتنی دادگا بین. بارش ئونل و ئۆزان دەیاریش هاتبوون. لەگەڵ سۆری سبیانێ، گەیشتینە ئیستانبووڵ و ڕاستەپێ چووینە دادگا.

لەناو ئەو پارێزەرانەی بەرگریان لە دۆسیەکەم دەکرد، هەریەکە لە لەوەند کانات و ڕوشەن ئارسلان و موکریمە تەپە لە دادگا ئامادە بوون. جگە لە پارێزەرەکان، هەریەکە لە شەرەفەدین ئەریلاماز و ئیبراهیم گوربز و ئیسحاق تەپە و نەجیب یەشیل و ئەحمەد ئۆناڵ و بارش ئونلوو و ئۆزان دەیار و ئەدیبە بوڕا و چەندان دۆستی دیکە ئامادەی دانیشتنەکە بوون.

دوو لەو دادوەرانەی لەسەر ئەو دۆسیەیەم، بڕیاری تاوانبارکردنی منیان دەرکرد، دواتر لە سەر دۆسیەی ڕێکخراوی تیرۆرستی فەتحوڵڵا گولەن (فەتۆ) دەستگیر کران و خرانە زیندانەوە.

ئەو داواکارە گشتییەی لە دۆسیەکە داواکەی کردبۆوە، دوای دەرچوونی لە دانیشتنەکە، بەوە تۆمەتباری کردووم، گوایە لە وتارەکەمدا وشەی (قەندیل – Qendil)م بەکارهێناوە. لەناو ئەو وشەیەش نووسینی پیتی (ق-Q) بریتیە لە خزمەتکردن بە ئامانجەکانی ڕێکخراوی تیرۆریستی. بە پشت بەستن بەمە، تاوانی بانگەشەکردنت بۆ تیرۆر و ئامانجەکانی دەخەینە پاڵ و داوای سزادانت دەکەین. جا هەر ئەو داواکارە گشتییە، دواتر بە هۆی تێوەگلانی لە دۆسیەی ڕێکخراوی تیرۆریستی فەتحوڵڵا گولەن (فەتۆ) لەگەڵ زەکەریا ئۆزی داواکاری گشتی ڕایکردە دەرەوەی تورکیا و فیرارییە.

## بەڵگەفیلمی بێشکچی

فاتن کانات پرۆژەیەکی هەبوو بەناوی بەڵگە فیلمی (ئیسماعیل بێشکچی). لە ساڵی ٢٠١٢ وە دەستی بە وێنەگرتنی پرۆژەکەی کرد. سەرەتا لە ئەنقەرە کارەکە چووە بواری جێبەجێکردنەوە. ساڵی ٢٠١٣، ئۆندەر ئینجەش هاتە ناو پرۆژەکەوە.

لە مانگی چواری ٢٠١٣، لەسەر داوەتی وەقفی بارزانی، چووینە باشووری کوردستان. لەوێ سەردانی حکوومەتی هەرێمی کوردستانمان کرد. لەو سەردانەماندا، لە پاڵ وێنەگرێك ئۆندەر ئینجەش لەگەڵمان هات. بە درێژایی پێنج شەش ڕۆژ وێنەگیرا. لە بەرواری دوازدەمین ڕۆژی مانگی دوازدەی ٢٠١٣، کاتێك زانکۆی بۆغازیچی دکتۆرای فەخری پێبەخشیم، ئۆندەر ئینجە، وێنەی ئەو ڕێورەسمەشی گرتبوو.

له چوارەم مانگی ساڵی ٢٠١٥، بۆ درێژەدان بە گرتنی وێنەکان، لەگەڵ فەتین کانات، چووینە بەدلیس. ئێمە ئەو گەشتەمان بە ترومبێل کرد، بۆیە لە ڕێگا بە ناوچەکانی یۆزگارت و سێواز و مەلادی و ئەل عەزیز و چەولیگ و موش و بەدلیس دا ڕۆیشتین. لە زۆر شوێنی ڕێگا وێنەمان گرت و وەستاین. لە چەولیگ لەلایەن دۆستی عەزیزمان ڕوشتوو موتەڤەلی زادە پێشوازیمان لێکرا. لەوێش وێنە گیرا و شەویش هەر لەوێ ماینەوە. ڕۆژی دواتر بەسەر شاری موشەوە تێپەڕین و چووینە بەدلیس.

لە بەدلیس سەردانی ئۆرهان ئۆزتورکی پارێزگاری شارەکەمان کرد. پارێزگار خەڵکی ناوچەی ئیسکلیپە و هاوشاری خۆمە. کاک خەلیلی باوکی کاک ئۆرهان، لە ساڵی ١٩٤٠ مامۆستام بوو.

ئۆرهان ئۆزتورکی پارێزگار، بەشداری (یەکەمین سەمپۆزیۆمی نێودەوڵەتی) بەدلیسی کرد، کە لەبیست و شەشەمین، تا بیست و هەشتەم ڕۆژی مانگی شەشی ٢٠١٤ سازکرا. کۆڕبەندەکە لەلایەن (کۆمەڵەی بیرکردنەوەی ئەکادیمی بەدلیس)وە ڕێکخرابوو.

لە سەردانی مانگی چواری ٢٠١٥مان بۆ بەدلیس، تووشی ئیسحاق تەپە بووین. بۆیە ئەویش لەگەڵمان هاتە لای پارێزگار و تەڤلی دەمەتەقێ و قسەکانمان بوو.

لە بەدلیس لەگەڵ چەند هەڤاڵێك چووینە سەر چیای نەمروود. من دەمویست تا ئەو شوێنە بڕۆم کە کۆچەرە کوردییەکان لە زۆزانەکانەوە چادریان هەڵداوە. وەلێ کەویە بەفر، ڕێگای پێنەدراین. چونکە نەمانتوانی بەسەر ئەو بەفرەوە سەرکەوینە سەر لووتکەی چیاکە.

چەند ڕۆژێك دوای مانەوەمان لە بەدلیس و گەڕانێك بەناو دەشت و دەر و گوندەوارییەکانی ناوچەکە، زڤرینە دیاربەکر و لەوێشەوە بۆ ڕوها و، جا هاتینەوە ئەنقەرە.

## خەڵاتی هرانت دینك

ساڵی ٢٠١٢، خەڵاتی (هرانت دینك) بەخشرایە من و (کۆمەڵەی مەمۆڕیاڵ) لە ڕووسیا. ئەندامانی دەستەی خەڵاتکارانی هرانت دینکی ساڵی ٢٠١٢ لە ئەحمەد ئاڵتان و تیمۆسی گارتۆن و ئەمما بۆنینۆ و لیدیا کاچۆ و ڕاکەل دینك و کۆستا گاڤراس و نیلوفەر گۆلە و ئەلیکساندەر ئیسکەندەریان و ئەتیان مەهجوپیان پێکهاتبوو. سەرۆکی کۆمیتەی پێدانی خەڵاتەکەش عەلی بایرام ئۆغلوو بوو.

ئەحمەد هاکان ئەو ڕۆژنامەنووسە بوو کە خەڵاتی ساڵی ٢٠١١ هرانت دینکی وەرگرتبوو. ئەو کەسایەتیانەی خەڵاتی نێودەوڵەتی هرانت دینك وەردەگرن، تەنیا ساڵی دواتر دەتوانن ببنە ئەندامی ئەو لێژنەیەی کەسێك هەڵدەبژێرن بۆ وەرگرتنی خەڵاتەکە. منیش ساڵی ٢٠١٣ بوومە ئەندامی ئەو دەستەیە.

ئەو ساڵەی خەڵاتەکەم وەرگرت، وەقفی هرانت دینك ئەو چەند ڕستەیەی خوارەوەی سەبارەت بە خەڵاتەکە بڵاوکردەوە:

"خەڵاتی نێودەوڵەتی هرانت دینك، لەلایەن وەقفەکەمانەوە، لە ساڵی ٢٠٠٩وە، لە بەرواری لە دایك بوونی هرانت دینك، هەر ساڵەی بە کەسایەتیەك یان کۆمەڵە و ڕێکخراوێك دەبەخشرێت.

جا خەڵاتەکە هەموو ساڵێك دەدرێتە ئەو کەسایەتی و کۆمەڵە و ڕێکخراوانەی کە، خاڵین لە هزری جیاکاری و نەتەوەپەرستی و توندوتیژی و کار بۆ جیهانێکی دادپەروەرانەتر و ئازادانەتر دەکەن و لە پێناو ئەو ڕێبازەدا هەموو ئەگەرێکی نەخوازراویان بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان لەبەرچاو گرتووە؛ وەك چۆن ئەو کەسایەت و لایەنانە، بۆچوونە سواوەکان ڕەتدەکەنەوە و زمانی ئاشتی بەکاردەهێنن و دەبنە ڕووناکی بۆ هەموو ئەو کەس و لایەن و کۆمەڵانەی لەو ڕێگایەوە کاردەکەن و بەردەوامن لە بەرخودان"."وەقفی هرانت دینك، خەڵاتەکە دەبەخشێتە ئەو لایەنانەی لەو بارەیەوە کاردەکەن، تا ئەوانیش هەست بەوە بکەن، لەو ڕێگایەدا تەنیا نین و دەنگیان دەبیسترێ و کارەکانیان دەبینرێت. بۆ ئەوەی ببینە پاڵپشتێکی مەعنەوی و ڕووناکیەك لەبەردەم ئاسۆی هەموو ئەو لایەنانەی لەو ڕێگایەوە بەرخودان و چالاکی دەکەن".

ئەو شەوەی خەڵاتەکەم وەرگرت، وتارێکم پێشکەشکرد؛ لەناویدا باسی کۆمەڵکوژی ئەرمەنیەکانیشم کردبوو. ڕێورەسمەکە لە هۆڵی جەمال ڕەشید ڕەی بەڕێوەچوو.

وەقفی هرانت دینك، لە ساڵی ٢٠١٨، کۆڕبەندێکی نێودەوڵەتی بە ناونیشانی (بنیاتنانی داهاتوو، بە ڕوانین لە ڕابردوو)ی لەدار خست. لە پێناو مافەکانی مرۆڤ و دادپەروەری و ئازادی زیاتر. لەو کۆڕبەندەش وەکوو قسەکەرێك بەشدار بووم و وتارێکم پێشکەشکرد.

## کۆڕبەندی زانکۆی ئارتوکلوو

لە شازدەمین ڕۆژی مانگی پێنجی ٢٠١٤، بە بۆنەی جەژنی زمانی کوردی، زانکۆی ئارتوکلو لە مێردین، کۆڕبەندێکی ساز دەکرد. لەگەڵ ئیبراهیم گوربز و ئیسحاق تەپە و ئەحمەد ئۆناڵ بەیەکەوە چووینە مێردین. ئەو ڕۆژە فوئاد ئۆنان و فەیسەڵ چامڵی بەلیش لەوێ بوون.

دوای کۆڕبەندەکە و واژووکردنی چەندان پەرتووک، پرۆفیسۆر دکتۆر سەردار بەدی سەرۆکی زانکۆ، بۆ شیڤی داوەتی ئێمەی کرد. لەگەڵ ئێمە هەریەکە لە پرۆفیسۆر دکتۆر قەدری یڵدرمی جێگری سەرۆکی زانکۆ و ئەحمەد تورکی سەرۆکی ئەوسای شارەوانی مێردین و کاك ئیبراهیم چەولیگیش لەسەر سفەری خوانەکە بەیەکەوە بووین. من لە نێوان سەردار بەدیی و کاك قەدری یڵدرم[١] دانیشتبووم.

یەکێك لە برادەران گوتی "ئیسماعیل بێشکچی و ئیبراهیم چەولیگ هەڤاڵی سەردەمی زیندانن و لە گرتووخانەی بورسای تایبەت بەیەکەوە ماونەتەوە". دوای ئەو قسەیە، بە حەنەکەوە کاك سەردار گوتی "کاك ئیبراهیم تێگەیشتین کە کۆمۆنیستی، وەك چۆن تێگەیشتین کە کوردیشی، زانیمان کە زازاشی، ئەمانە هەمووی قبووڵ دەکەین، وەلێ چۆن خۆت گەیاندە بێشکچی؟ ئاخر ئەوەندە گەلێك زۆر نییە؟".

---

[١] قەدری یڵدرم (١٩٥٩-٢٠٢١) نووسەر و ئەکادیمیسیەن و سیاسەتمەدارێکی باکووری کوردستانە. لەهەردوو هەڵبژاردنە پەرلەمانییەکەی ساڵی ٢٠١٥ی پەرلەمانی تورکیا، لەسەر لیستی پارتی دیموکراتی گەلان هەدەپە، بووەتە پەرلەمانتار. یڵدرم خاوەن ٢١ پەرتووکی بڵاوکراوە، کە زۆربەی نووسینەکانی لەسەر چەند لایەنێکی جیاوازی ژیان و مێژووی گەلی کوردە. (وەرگێڕ).

مانگی چواری ساڵی ۲۰۱۳، ئیسماعیل بێشکچی لە مۆنۆمێنتی هەڵەبجە. ئەرشیفی ئیبراهیم گوربز.

ئیسماعیل بێشکچی لە وەقفی ئیسماعیل بێشکچی لە ئیستانبووڵ، ساڵی ٢٠١٣.

# بەشی دەیەم
# پێشوازییەکان و یادەوەرییە خەندەئامێزەکان

## زۆر دڵخۆشم کە، بە تەندروستییەکی باشەوە تۆم بینی

ڕۆژێکی پایزی ساڵی ٢٠١٣، دەمەوئێوارەیەکی زەردەپەڕی ئەنقەرە، لە ناوچەی سیهیاوە، بە پێ بەرەو گەڕەکی کزلای دەمەشیم. بەڵام شەقاوی گەورە و خێرام دەهاوێشت. دەچوومە خاڵێکی وەستانی پاسی، نزیك مۆڵی کزلای. لە هەوڵی ئەوەدا بووم، بە پاس ڕا بگەم. لەپڕ، هەستم بە شتێك کرد، کە بەر پشتم کەوت، ئاوڕم داوە و سەیرێکم کرد، بینم کەسێك بوو دەستی لە پشتم دا، کە کەمێك پێش ئێستا بەرامبەر هات و لێم تێپەڕی، کە وەستام کابرا گوتی: "زۆر دڵخۆشم کە، بە تەندروستییەکی باشەوە تۆم بینی".

کابرا دواتر خۆی ناساند؛ ئەو دادوەری دادگای ئاسایشی دەوڵەت بوو لە ساڵی ١٩٩٠. ئەو زۆر بە ئاسانی منی ناسییەوە، منیش خۆشحاڵیی خۆم دەربڕی بە بینینی ئەو. دووبارە گوتییەوە: "زۆر دڵخۆش بووم، کە ئێوەم بە لەشێکی ساغەوە بینیەوە". باسی لەوەش کرد، بەو نزیکانە خانەنشین دەبێ. کە لەیەك جیا بووینەوە، بۆ جاری سێیەم هەمان هەستی خۆی بۆ باشی

تەندروستیم دووپات کردەوە و ملی ڕێگای خۆی گرتەوە.

بە بۆچـوونی خـۆم، ئەو قسـەیەی لە نـاخی دڵ و کانگـای خۆشەویستیەوە هەڵقولاً، بۆیە منیش زۆر دڵخۆش بووم. چونکە مرۆڤەکان کاتێك لە شوێنێك تووشی یەکدی دەبن، بەشێوەیەکی گشتی دەپرسـن "چـۆنن؟ دۆخـی تەندروسـتیتان کـووە؟". وەلـێ دادوەر، ڕاسـتەوخۆ گـوتی "زۆر دڵخۆشـم کە بە تەندرووسـیەکی چـاکەوە دەردەکەون". پـێم وابـێ ئەوە ڕسـتەیەکی جـوانتر و هەڵسوکەوتێکی ماقوڵترە.

## دادوەرێك...

فیکـرەت ئونلـوی بـاوکی بـارش ئونلـو، لە نـۆزدەهەمین ڕۆژی مـانگی دووی سـاڵی ٢٠١٩ کـۆچی دوایـی کـرد. تـازیەکەی لە ئەنـقەرە دانـدرا. مـن و تەڵـعەت ئینـانج و زەری ئینـانج، بـۆ سەرەخۆشی چووینە پرسەکەی.

لەوێ کاك بارش، ئۆنـدەر ئایـدنی پێ ناسانم، کە ئەویش بۆ تـازییە هـاتبووە ئەوێ. هەر زوو ئەوم بیـرکەوتەوە. کـابرا لە سـەردەمی ڕژێمـی ١٢ی ئـازار، لە دادگـای سـەربازی دۆخـی لەناکاوی دیاربەکر، دادوەر بوو. ئەوسا کابرا دادوەرێکی سەربازی بوو. ئەو برادەری کاك فیکرەت بوو و تێکەڵی خێزانیشیان هەبوو و ئێستاش لە زانکۆ مامۆستای یاسای سزادانە.

ئەوکـاتەی دادوەر بـوو، کەسـێکی وردیـلە بـوو، بەڵام ئێسـتا تۆزێك بەژن و باڵای هەراش و گەورەتر دەهاتە بەرچاو.

ناساندنی من به ئۆندەر ئایهان بەو مانایە بوو کە کاك بارش وەك ئەوەی بیەوێت پێی بڵێ "لە ساڵی ١٩٧٢، لەسەر ئەوەی دەیگوت گەلێك هەیە بەناوی کورد و خاوەن زمانی خۆیانن، تۆ ئیسماعیل بێشکچیت بە ١٣ ساڵ زیندانی کردن سزادا". ئۆندەر ئایهان وەڵامی داوە "لە دانیشتنی بڕیاردانەدا من دادوەر نەبووم". گرنگ ئەوە نییە لە دانیشتنی بڕیاردانەدا، لەوێ بووبێت یان نا، چونکە بوونی دادپەروەری لە دۆسییە سیاسییەکان کارێکی مەحاڵە. بەوپێیەی دادوەرەکان بەردەوام لەو جۆرە دۆسیانەدا، بڕیارەکانیان لە بەرژەوەندی دەسەڵاتی سیاسی و فەرمانڕەوا و ویست و ئارەزووەکانیان دەدەن. چونکە بەو بڕیارانە، دەسەڵاتی فەرمانڕەوا هێزێکی دیکەش زێدە دەکەن. جا لە دانیشتنی بڕیاردانی چواردەی مانگی تەباخی ١٩٧٢، ناوی ئۆندەر ئایهانیش وەکوو یەکێك لە ئەندامانی دەستەی دادوەری نووسراوە لە دەرکردنی بڕیارەکە.

## دیداری یڵماز گونەی

جەلال کەرەهانی جێگری بەڕێوەبەری زیندانی تۆپتاشی، هاوڕێیەکی نزیکمانە. خۆشی کەسێکی دەروونناسە. دوای نیوەڕۆی ڕۆژێك پێی گوتم "کاك ئیسماعیل، سبەی، یڵماز گونەی دێتە سەردانی زیندان، کاتی هاتنەکەشی پشتی نیوەڕۆیە". مانگی حەفتی ساڵی ١٩٨٠ بوو، ئەو هەواڵە دڵخۆشییەکی عەجیبی لا چێکردم. وەکوو هەموو کەسێك، منیش یڵماز گونەیم دەناسی. بەیانیش ڕووبەڕوو دادەنیشتین و دەپەیڤین، ئەمەش کەلەجانێکی لە ناخمدا ورووژاند.

ئەو ڕۆژە زینـدان تـژی سـەبەتەی تـرێ و باینجـان و تەمـاتە و بیبەر ببوو. لە پاڵ ئەمانەش، چەنـدان سـندووقی میوەی جیا جیا. باس لەوە دەکرا، یڵماز گونەی ئەمانەی لە زیندانی نیوە کراوەی ئیمـڕالیەوە بـۆ گرتووخـانەکەی ئـێمە نـاردووە. لەپاڵ ئەو سندوقە ڕسقانە، یڵماز گوونەی چەندان کەلوپەلی پەڕاوگە و جل و بەرگی وەرزشیشی بۆ شاندبووین. لەناویاندا پێنووس و کاغەز و دەفتەر و دۆسـیە و زۆر شـتی دیـکە هەبـوو. هەر کێیەکـیش بیویسـتبا بـای پێویستی خۆی پێ دەدرا.

لەبەر ئەوەی یڵمـاز گـونەی بەر لەوەی بگـوازرێتەوە زینـدانی نیـوە کـراوەی ئیمرالّی، لە گرتووخـانەی تۆپ باشـی مـابۆوە، بۆیە هەموو گرتووەکـان دەیانناسـی. ئەو ژوورەش لای هەموو کەسێك ئاشکرابوو، کە یڵماز گونەیان بە تەنیا تێ ئاخنی بوو.

بە کەلەجـانی هەڤـدوو ناسـین لەگەڵ یڵمـاز گـونەیی و گفتوگۆکردن لەگەڵی، دوای نیوەڕۆ منیش چوومە بەشـی کـارگێڕی زینـدان. لەبەردەم دەرگـای بەڕێـوەبەر، لەسـەر تەختەیەکـی ئەوێ دانیشتم و چاوەڕوانی هاتنی یڵماز گونەیم کرد. لەوێ کاتێك لە چاوەڕوانیـدا بـووم، بینـیم بەشـێك لە زینـدانیەکانی دیـکەش هـاتنە ئەوێ، ئەوانیش هاتبوون تا یڵماز گونەی ببینن.

لە کۆتاییـدا یڵمـاز گـونەی هـات. ئەو لەو دەرگـایەوە هـاتە ژووری، کە کەوتبـوو سـەر کـۆلانەکەی تەکمـانەوە و، بەڕێوەبەرەکان بۆ چوون و هاتن بەکاریان دەهێنا. کاتێك لە ئێمەوە بە دیـار کەوت، هەمـو لایەك بـۆ لای ئەو بازیانـدا و هەر لە دوورەوە دەیانگوت "کاك یڵماز بەخێر بێی، کاکۆ چۆنی؟". منیش

له شوێنه‌که‌ی خۆم ڕابووم و چوومه پێش و ده‌مویست له‌گه‌ڵ یلماز گونه‌ی چاومان بکه‌وێته سه‌ر یه‌ك. قه‌ره‌باڵخیه‌که‌ی ئه‌وێ، تا ده‌هات زێده‌تر ده‌بوو. بۆیه له‌گه‌ڵ ئه‌و چاومان نه‌که‌وته سه‌ر یه‌ك. بۆیه دیسان له شوێنه‌که‌ی خۆم دانیشتمه‌وه. هه‌ندێکی پێچوو و بینیم، یلماز گونه‌ی هات و تۆزێك له‌ولاتری من دانیشت، به‌ڵام به‌بێ ئه‌وه‌ی بمبینێت. به بێ وه‌ستان سه‌یری ئه‌وم ده‌کرد، ده‌مویست چاومان بکه‌وێته سه‌ر یه‌ك. لێ گیراوه‌کان له ده‌وروبه‌ری بوون و شوێنه‌که تژی خه‌ڵك بوو. هه‌رکه‌سه و شتێکی پێده‌گوت. ئه‌ویش وه‌ڵامی یه‌ك به‌یه‌کیانی ده‌دایه‌وه و له دۆخیانی ده‌پرسی و ده‌یگوت "منداڵه‌کانتان چۆنن؟ ته‌ندروستیتان باشه؟ که‌ی لێره ده‌رده‌چن؟"...

به هۆی زۆری ئه‌وانه‌ی له ده‌وروبه‌ری گونه‌ی گرد ببونه‌وه، ئیدی یلمازم نه‌ده‌بینی و له چاوان ون ببوو. چونکه خه‌ڵکێکی زۆر له نێوانمان بوو و، هه‌مووشیان ده‌یانویست لێی نزیك ببنه‌وه. هه‌ندێکیان داوایان لێده‌کرد له‌گه‌ڵیان بچێته قاوشه‌کان و به‌یه‌که‌وه چایه‌ك بخۆنه‌وه، یان نانێك بخۆن. بۆ ئه‌مه‌ش هه‌رکه‌سه و یلماز گونه‌ی داوه‌تی قاوشه‌که‌ی خۆی ده‌کرد. دوای ماوه‌یه‌ك، میوانه‌که‌مان له‌گه‌ڵ ئه‌و حه‌شاماتی خه‌ڵکه به‌یه‌که‌وه، هه‌ڵستاوه سه‌ر پێیان. پێم وابێ، دوای تێپه‌ڕین به‌به‌رده‌م ئه‌و قاوشه‌ی ماوه‌یه‌ك یلماز گونه‌ی لێی مابۆوه، چوونه قاوشی ژماره ٣. منیش به پێویستم نه‌زانی به دوای ئه‌و قه‌ره‌باڵخییه‌وه بکه‌وم.

دوای ڕۆیشتنی یلماز گونه‌ی، به‌رده‌رگای ژووری به‌ڕێوه‌به‌ر چۆڵ بوو، له‌وێ سه‌روبه‌ندێدا، جه‌لال که‌ره‌هانی جێگری

بەڕێوەبەرم بینی؛ کە بینیم بە توندی گوتم "بۆچی بە یلماز گونەیت نەناساندم؟" ئەویش لە وەڵامدا گوتی "من وامزانی ئێوە هەڤدوو دەناسن".

دوای تێپەڕینی چەندین ساڵ بەسەر ئەو ڕووداوە، لە ساڵی ١٩٩٥، فەتۆش گونەی[1] هاتە سەردانی بەندیخانەی ئولوجانلار. لە ڕێگای برادەرانەوە گوێبیستی سەردانەکە بووم. بۆیە منیش چوومە شوێنی دیدارەکەی زیندان، چونکە دەمویست لەگەڵ فەتۆش گونەی یەکدی بناسین و ئەو بویەری بۆ بگێڕمەوە. شوێنی دیدارەکە زۆر قەرەباڵخ بوو، لەگەڵ ئەوە، زۆریش تاریك بوو. لە پاڵ ئەمانەش ژاوەژاوێکی زۆر دەهاتە بەر گوێ. بۆیە گەیشتمە ئەو باوەڕەی ناتوانم شوێنێك بدۆزمەوە بۆ دانیشتن و دەرفەتی چاوپێکەوتنەکە نابێ. بۆیە پێم وابوو باشترین شت ئەوەیە، من ئەو شتانە بنووسم و لەو ڕێگەیەوە بیگەیەنمە فەتۆش گونەی.

لەسەر پەڕاوێك، بە دەست و خەتی خۆم، دەستم بە نووسین کرد. سەرکەوتووش بووم لەوەی نامەکەم بگەیەنمە دەست فەتۆش گونەی. هەندێکجار، ئێستاشی لەگەڵدا بێت، دەڵێم لەگەڵ یلماز گونەی نزیك یەك لەسەر هەمان تەختەش دانیشتین، بەڵام دەرفەت نەبوو یەکدی بناسین.

---

[1] فەتۆش گونەی، لە دایك بووی ساڵی ١٩٥٢ی ئیستانبوڵە. لە تەمەنی ١٧ ساڵی لەگەڵ یلماز گونەی هاوسەرگیریان پێکهێناوە. ساڵی ١٩٧١ منداڵێکی لە یلماز گونەی بوو و ناویان لێنا یلماز. دواتر بە خاو و خێزانی بە ناچاری، بەرەو ئەورپا کۆچ دەکەن. دواتر لە فەڕەنسا دەگیرسێنەوە. دوای کۆچی دوایی یلماز گونەی، بەناوی هاوسەرە کۆچکردووەکەی وەقفێك دەکاتەوە. دواتریش بۆ ماوەی هەشت ساڵ لەگەڵ کەندال نەزان بەیەکەوە دەبن. (وەرگێڕ).

من نازانم، فەتۆش چی لەو نامەیە کرد، کە بۆم نارد. ئاخۆ لە شوێنێك باسی بەسەرهاتەکەی کردووە، یاخود بڵاوی کردووەتەوە یان نا؟ چونکە بە هۆی بێ وەڵامی ئەو، نەمزانی ئاخۆ نامەکەی گەیشتۆتە دەست یان نا؟

ساڵی ۲۰۱۳، ئێمەش وەکوو وەقفی ئیسماعیل بێشکچی، بە بۆنەی ۳۰ ساڵ تێپەڕبوون بەسەر دامەزراندنی ئینیستیتوتی کوردی پاریس، داوەتی مەراسیمی ساڵیادەکە کرابووین. لەوێ فەتۆشم بینی. لە هەمان میوانخانەش دەماینەوە. فەتۆش هەر کە منی بینی، لێم هاتە پێش و گوتی "کاك ئیسماعیل، یلماز چۆن بوو تۆی نەناسی و هەستی بە بوونی تۆ نەکردا". دوای ئەو ئاخافتنە، تێگەیشتم نامەکەم گەیشتۆتە دەستی فەتۆش.

دوای پاریس، چەند ساڵێك پاشتر، لەگەڵ فەتۆش لە ڤیستیڤاڵێکی فیلم، لە هەولێری باشووری کوردستان جارێکی دیکە هەڤدوومان بینیەوە. لەوێ جارێکی دیکە گوتیەوە " کاك ئیسماعیل، یلماز چۆن بوو تۆی نەناسی و هەستی بە بوونی تۆ نەکردا" لە ڤیستیڤاڵەکە هەریەکە لە شڤان پەروەر و گوڵستان پەروەر و سەرخوەبوون و یوکسەل ئاڤشاریش ئامادە بوون.

دوای هەولێر، لە هۆڵی شانۆگەری یلماز گونەی لە ناوچەی دەمیرتەپەی ئەنقەرەش، لەگەڵ فەتۆش چەند جارێکی دیکە هەڤدوومان بینیەوە. هەر جارێکی کە منیشی دەبینی، هەمان هەستی خۆی بۆ من بەیان دەکردەوە.

لە سەرەوە باسم لە سەردانەکەی فەتۆش کردبوو بۆ زیندانی ئولوجانلار، لەوان ڕۆژاندا، فەتۆش، هاوشانی موستەفا ئەکمەکچی

ڕۆژنامەڤـان، لە ماڵەوەمـان سـەردانی لەمـانی خێزانمیـان کردبـوو. لەگەڵ دەسـتی خـۆی چەپـکە گـوڵێکی زیندووشـی بردبـوو؛ ئەو گوڵانە، تا ئێستاش لە ماڵەکەمان دەژین و بە هەدەرمان نەدان.

ڕۆژێك لە هۆڵی یلماز گونەی، فەتۆشـم بینیەوە و باسـی ئەو گـوڵەم بـۆ کـرد و پـێم گـوت "لە مـاڵی ئـێمە گوڵێکـت هەیە و نزیکەی ٢٣ ساڵە دەژی و تا ئێستاش لە جوانی خۆی نەکەوتووە". کە ئەو قسـانەم بـۆ فەتـۆش دەکـرد، ئەویـش باوەشـێك گـوڵی لە هەمبێز گرتبوو. لە پڕ، هەمـوو گوڵەکـانی خسـتە باوەشـی منەوە و گوتی "کاك ئیسماعیل با ئەو گوڵانەش، ٢٣ ساڵی دیکە ماڵەکەتان بڕازێننەوە".

## کوڕم باوکت لە کوێیە؟

مـن، هەرچـوار سـاڵی خوێنـدنی بەشـی سیاسـیی زانکـۆی ئەنـقەرەم، لەسـەر ئەرکـی دەوڵەت خوێنـد. بـۆیە، دەبـوو دوای دەرچوونم، شەش سـاڵ خزمەتـی ناچاری لە وەزارەتـی نـاوەخۆ، یاخود وەزارەتی دارایی بکەم.

لە مـانگی شەشـی سـاڵی ١٩٦٢، زانکـۆم تەواو کـرد. وەکـوو فەرمـانبەر لە چـۆرووم دامەزرێنـدرام و لە بەشـی قەڵەمـی قائیمقامیەت دەستم بەکارکرد. دواتر لە چەند فەرمانگەیەکی وەکوو ناسنامە و تاپۆ و پەروەردە و کارگێڕی پۆلیسیش کارم کرد.

حەسـەن بەسـری کوردئۆغڵووی پارێزگـار، نـاوە نـاوە دەچـووە دەرەوەی چـۆرووم. بـۆیە دوای ئەو، بەنـاوی پارێزگـار، واژووم

لەسەر ئەو کیتابە فەرمیانە دەکرد، کە بۆ قائیمقامیەت دەچوو.

ڕۆژێـك، لەسـەر کورسـی بەردەم مێـزی، ژووری پارێزگـار دانیشتبووم و سەیری کیتابە دەرچوو و هاتووەکانم دەکرد؛ بینیم، هـاوڵاتیەك بە داواکـاریەکەوە بە ژوور کەوت. کـابرا سـەیرێکی دەوروبەری خـۆی کـرد و دوای ئەوەی زانـی جـگە لە مـن، ژوورەکە کەسێکی دیکەی لێ نییە، پاشان ڕووی تێکردم و گوتی "کوڕم، باوکت لەکوێیە؟".

لە مـانگی نـۆی سـاڵی ١٩٦٢، بـۆ جێبەجێکردنـی خزمەتـی سەربازی، دەستبەرداری فەرمانبەریەکەم بووم لە شاری چۆڕووم.

## هەتیوو ئیسماعیل، تۆ لە کوێی؟!

لە سەرەتای ساڵی ١٩٧١، لە سەردەمی ڕژێمی دوازدەی ئازار، لە کۆلێژی زانستە سیاسییەکان کارم دەکرد. لەوان ڕۆژانـدا، زوو زوو پـۆلیس دەهـاتن و ئۆپەراسـیۆن و پشـکنینیان دەکـرد. لە ڕادیۆش لیستی ١٠٠ کەسی و ١٥٠یی ئەو کەسانە بڵاو دەکرانەوە، کە فەرمـانی دەسـتگیرکردنیان بـۆ دەرچـووە. ئەوان لەگەڵ هەر هاتنێکیـان، خوێنـدکار و مامۆسـتای زانکۆیـان دەسـتگیر دەکـرد و دەیانبردن. لەوێ دەمێ سەندیکای مامۆستایانی یاریدەدەری زانکۆ هەبوو؛ منیش ئەندامی ئەوێ بووم. ڕۆژێك، دوای نیوەڕۆ، چەند مامۆستایەکی برادەرم بە درە کوتە هاتنە لام و گوتیان "ئیسماعیل، پۆلیس بە دواتا دەگەڕێت". دیار بوو پۆلیسێك هاتبوو و لە منی پرسی بوو و دواتر ڕۆیشتبوو.

چەند ڕۆژێك دواتر، برادەرێکی دیکە هات و گوتی "ئیسماعیل، پۆلیسێك هاتووە و بە دوای تۆ دەگەڕێ". ئێمەش پێمان گوتووە لێرە نییە و پۆلیسەکەمان بە ڕێکرد. منیش پرسیم "ئایا پۆلیسەکە، هیچ کیتاب و نووسراوی فەرمی پێبوو؟". وەلێ وەڵامێکی دڵنیاکەرەوەم لەوبارەوە چنگ نەکەوت.

بە بەردەوامی، پۆلیس نهۆمی سەرەوەی باڵەخانەی کۆلێژ و، ژێرزەمینی ئەوێی دەپشکنی. لە هەر ئۆپەراسیۆنێکیش، کە خوێندکار و قوتابی دەستگیر دەکران، دەبووە هەڵا و هوریا و فەرتەنە. بیرمان لەوە دەکردەوە، چی بکەین باشە؟ ئەو ڕۆژە دوای نیوەڕۆ، لە هۆڵێکی کۆلێژ، لەگەڵ مامۆستایانی یاریدەدەر دانیشتبووین و لەسەر هەمان مژار دەدواین. لەو سەروبەندە، بینیمان پۆلیسێك بەرەو ڕووی ئێمە دێت. پازدە بیست مەترێك نزیك بۆوە، بینیم پۆلیسێکی گەڕەکەکەی ناوچەی ئیسکلیپمانە، هەر ئەوەندەش نا، بەڵکوو پۆلیسەکە ناسیاویشمان بوو. کاکی پۆلیس هەر کە چاوی پێم کەوت، بە دەنگێکی بەرزەوە گوتی "هەتیوو ئیسماعیل، من دە ڕۆژە بەدوای تۆدا دەگەڕێم و ناتدۆزمەوە، تۆ لە کوێی هەتیوو؟".

مامۆستاکان کە چاویان بە پۆلیسەکە کەوت، گوتیان ئا ئەوە خۆیەتی، بەڵام پۆلیسەکە هێشتا شرق و هۆڕی هاوار کردنی بوو و لەسەر گارە گاری خۆی بەردەوام بوو "لە ناوچەی ئێدرەوە، گواستراومەتەوە بۆ ئەنقەرە. ئێستا ماڵ و حاڵمان هێناوەتە ئێرە. منداڵەکانیش لە ماڵەوە دەڵێن، یان برۆ مامە ئیسماعیلیش بینەوە و بیهێنەوە، یانیش تۆش مەیەوە ماڵ. بۆیە تۆ لە کوێی هەتیوو".

منیش وەڵامم داوە "ئەرێ کاکە، لەو ڕۆژە ڕەشەی، کەس ئاوا، بە دوای کەسدا دەگەڕێ؟".

لە کۆلێژ دەرچووین، بڕیار بوو بچینەوە ماڵەکەی ئەو، بەڵام سەرەتا سەرێکمان لە بنکەی پۆلیسی کوڕتولوش دا، کە ئەو پۆلیسەی ناسیاومان کاری لێدەکرد. لەگەڵ ئەوەی من نەمدەویست لەگەڵی بچم، بەڵام دیار بوو کارێکی زۆر گرنگی لە شوێنی کارەکەی هەبوو. لەوێ منی بە برادەرەکانی ناساند و پێی گوتن "کابرایەکی خوێندەواری زۆر بە زانست و مەعریفەتە". پۆلیسەکانیش لێیان پرسیم "لە کوێ کاردەکەی؟" کە وەڵامم دانەوە و گوێیان لە ناوی کۆلێژی زانستە سیاسییەکان بوو، یەکسەر گوتیان "ئەوێ شوێنی ئانارشیستانە".

دوای بنکەی پۆلیس، چووینە ماڵەوەیان. کە چوومە ژوورەوە بینیم، لە ناوەراستی ماڵەکە، منداڵەکانی گۆڤاری (ئایدنلك)یان لەبەر دەم بوو و یارییان پێدەکرد. ئەوسا بەشێك لە مامۆستایانی زانکۆکەمان لە گۆڤاری ئایدنلك کاریان دەکرد. بەشی ڕاگەیاندنی کۆلێژیشمان، وەکوو نووسینگەیەکی گۆڤارەکە وابوو. بەڵام لە ئۆپەراسیۆنێکدا، پۆلیس هەموو گوڤارەکانیان دەست بەسەردا گرتبوو و لەگەڵ خۆیانیان بردبوو. ئەو پۆلیسەی ناسیاویشمان، بۆ ئەوەی منداڵەکانی وازی پێبکەن، چەند دانەیەکی لە ژمارە جیاوازەکانەوە لەگەڵ خۆی بردبووە ماڵەوە. لەبەر ئەوەی گۆڤارەکە ڕەنگاوڕەنگ بوو و هەموو مانگێکیش ڕەنگێکی جیاوازیان بۆ بەرگەکەی بەکار دەهێنا، بۆیە ئەویش چەند دانەیەکی لەو گۆڤارە ڕەنگاوڕەنگانە بۆ منداڵەکانی هێنابۆوە. بەڵام دڵنیام هیچ ئاگاییەکی لە نووسین و ناوەڕۆکی گۆڤارەکە نەبوو.

## میوانێك لە ساسۆنەوە

لێرە، دەمەوێ باسی سەردانێکتان بۆ بکەم، کە ساڵی ١٩٧١، لە گرتووخانەی دۆخی لەناکاوی دیاربەکر ڕوویدا. پێم وابێ ناوەڕاستی مانگی حەفت بوو، کە هاتنە لام و گوتیان."کاك ئیسماعیل میوانت هەیە" منیش هەڵستام و لەگەڵ مووسا عەنتەر بەیەکەوە چووینە شوێنی سەردانیکردنی زیندان.

لەوێ بینیم، کەسێکی خاوەن بەژن و باڵا ڕێك و جوان وەستاوە. ئەو زۆر بە شان و شەوکەت دیاربوو. دەست و پلێکی گەورەی هەبوو. گەنجەکە لە دوورەوە، ڕوومەت و ڕەنگە ئەسمەرەکەی سەرنجی ڕادەکێشای.

کاتێك لەگەڵ کاك مووسا گەیشتینە شوێنەکە، کابرای لاو، خۆی بە ئێمە ناساند و گوتی "خەڵکی ساسۆنم و هەر لەوێشەوە هاتووم. داوام کردووە چاوم بە ئیسماعیل بێشکچی بکەوێت، ئەگەر ڕێگام پێبدەن" دوای ئەو قسەیە، کاك مووسا بە گەنجەکەی گوت "ئەوەش بێشکچی". دوای ئەوە منیش گوتم "من بێشکچیم فەرموو...".

بۆ ماوەی چرکەیەك لەگەڵ گەنجەکە چاومان کەوتە سەر چاوی یەکدی، بەڵام کابرا زوو ڕووی خۆی وەرگێڕا و و لەگەڵ مووسا عەنتەر دەستی بە دوان کرد. کاك مووساش سەبارەت بە ساسۆن پرسیاری لێ دەپرسی و گەنجەکەش بەرسڤی دەداوە. کاتێك ئەوان خەریکی ئەو گفتوگۆیە بوون، گەنجەکە دیسان "من

هاتوومە سەردانی ئیسماعیل بێشکچی، تکایە دەتوانن هەواڵی پێبگەیەنن؟" دوای ئەوە، کاك مووسا دیسان هێمای بۆ من کرد و دەستێکی لەسەر شانم دانا و بە لاوەکەی گوت "کاکە ئەوە ئیسماعیل خۆیەتی". منیش گوتم بەڵێ فەرموو، من بێشکچیم، بەڵام کابرا دیسان چاوی کەوتەوە سەر چاوم و بەپەلە ڕووی خۆی لە مووسا عەنتەر کردەوە.

کاك مووسا، پرسیاری ئەو کەسانەی لێدەکرد، کە لە ساسۆن دەیناسین، ئەویش باسی ناوچەکەی خۆیانی بۆ دەکرد. لەناو ئەو قسانە گەنجەکە هەمدیسان گوتی "دەتوانن بڵێنە بێشکچی هاتوومە دیدەنی؟".

ئەمجارەیان مووسا عەنتەر بە هەڵچوونەوە دەنگی بەرزکردەوە و بە لاوەکەی گوت "هەتیووی زل، بۆ ئەوەی باوەڕت بێ دەبێ بێشکچییش وەکوو تۆ کەترە و گەورە بێت؟ ئەی وا ناڵێم ئەوە بێشکچی خۆیەتی، کەچی تۆ باوەڕ ناکەیی و پرسیارەکەی خۆت سێبارە دەکەیەوە. کابرا خۆشی دەڵێ فەرموو من ئیسماعیل بێشکچیم، وەلێ هەر باوەڕت نایەت، پێت وایە بێشکچی وەك خۆت هێندەی ورچێکە؟".

دوای ئەو تووڕەبوونەی مووسا عەنتەر، کابرا سەیرێکی کردم و لێم ورد بۆوە؛ پێدەچوو تووشی خەیاڵ شکان بووبێ! لەگەڵ ئەوەی ئەو قسانەی مووسا عەنتەر بۆ شکاندنەوە و بێڕێزی کردنی لاوەکە نەبوو. بەڵکوو تۆنی دەنگ و قسە و وشەکانی ناو ئاخافتنەکەشی، تەنیا بۆ ئەوەبوو گەنجەکە بە هۆش خۆی بێتەوە و بزانێ ئەوە بێشکچی بەرامبەریەتی.

کابرا قڕ و قەپ، دەنگی لێ دەرنەدەچوو، بۆیە کاك مووسا پێی گوت "ئەوەش پێشکچی، چیت دەوێ پێی بڵێ؟ بێژە بۆچی هاتوویە دیدەنی؟".

چەند خولەکێك دواتر گەنجەکە زاری کراوە و دەستی بە قسەکردن کرد "لە ڕادیۆ گوێم لە هەواڵێك گرتبوو، کە پێشکچی بەرامبەر بە دادگای تورك دەئاخڤی و بڕیارەکانی دادگاشی ڕەتدەکردەوە... منیش بووە مەرەقم تا بزانم ئەو کابرایە کێیە و حەزم کرد بێم و ببینم و بیناسم. هەروەها برادەرانی ساسۆنیش ببووە حەزرەتیان و منیان بۆ ئەوە ناردە ئێرە".

***

سەردەمێکی درێژ دوای ئەو بوویەرە، ساڵی ٢٠١٨، چووینە باتمان و لەوێ سەردانی بەهمەن دۆغووی دۆستمان کرد. لەوێ سەردانی هەڤاڵ و هاوڕێیانی دیکەشمان کرد. چەند ڕۆژێك لەوێ ماینەوە و گەشتێکی خۆشمان کرد. دواتر چووینە ناوچەی ساسۆن. لەوێ کاتێك لە باخچەیەك دانیشتبووین، کاك فەخرەدین و کاك نیهادمان بینی. دوای چاك و چۆنی، باسی سەردانی ئەو گەنجە ساسۆنیەم بۆ کردن، سەر و سەکوت گەورەیی و بەژن و باڵابەرزیی و قەد و قیافەت زلی کەسەکەم بۆ وێنا کردن و داوام لێکردن ئاخۆ دەشێ ئەو کابرایە بدۆزینەوە؟

برادەران بە تەلەفۆن پەیوەندییان بە چەند شوێنێکەوە کرد. دوای ماوەیەك گوتیان وابزانین دۆزیمانەوە. بۆیە ڕاستەپێ هەڵستاین و بەرەو یەکێك لە گەڕەکەکانی ساسۆن بە ڕێ کەوتین. چووینە کۆڵانێك، تژی دار گوێز و هەنار، لەوسەری کۆڵانەکەوە

بۆ ئەوسەری، جۆگە ئاوێکی جوان و سازگار ڕێی دەکرد. لەوێ چووینە ماڵی ئەو کابرایەی بەدوایدا دەگەڕاین. کابرا ناوی وەستا شەعبان بوو، کەسێکی پتەوی گەورەی بەقەد لا شاخێك بوو. نزیکەی ٤٧ ساڵ بەسەر دیداری نێوانمان تێپەڕی بوو، بەڵام جەستەی هەر وەك خۆی بوو. لێ ئەویش وەك من بەتەمەندا چووبوو.

دوای دانیشتن، وەستا شەعبان باسی لەوە کرد، دوای دیدارەکەی من چووەتە ئیستانبووڵ و پاشان بەسەرهاتە سەیر و سەمەرەکانی ئەوێی دەگێڕاوە.

کاتێك باسی ساسۆن دەکەین، بێ هیچ گوومانێك سەرهەڵدانی ساسۆن و مەلا عەلیێ ئونیس لە ساڵی ١٩٣٥، دێتەوە بیری مرۆڤ. وەك چۆن لەگەڵ ناوی ساسۆن، داوای حەق و حقوقیش دێتە هزرمان. کە چۆن چۆنی تیرۆری دەوڵەت هەموو ڕێگەیەکی گرتەبەر بۆ لەناوبردنی ئەو شۆڕشە. لەگەڵ ئەو زوڵم و زۆرداری و پەڕاگەندەکردنەی خەڵك و شۆڕشگێڕەکانی ناوچەکە. لەگەڵ هەموو ئەمانەش ڕۆمانی (قەومی چیای) عەبدوڵڵا کایاشمان دێتەوە خەیاڵ.

## چاکەتەکەی وەستا نیازی و مەهدی زانا

زستانی ساڵی ١٩٧٢، لە گرتووخانەی فەرماندەیی دۆخی لەناکاوی دیاربەرکر بووم. لەوێ، وەستا نیازی و مەهدی زاناشمان لەگەڵ بوو. ئەوان هەردووکیان بەرگدروو بوون. بۆیە کارگێڕی زیندان، ڕێگای پێدابوون تا کاری خۆیان لەناو زیندانیش بکەن.

جل و بەرگیان بۆ برادەران دەدرووی. ڕۆژێك، وەستا نیازی و مەهدی زانا، چاکەتێکیان لە خووری بۆ دروویم. سەرتا پێوانەیان گرتم و هەموویان بە سانتیم و میلم نووسییەوە، پاشان چاکەتەکەیان زۆر بە وردی و بە جوانی درووی. بیرمە تا ماوەیەکی زۆر چاکەتەکەم لەبەرکرد، دەتوانم بڵێم هەر دامنەدەکەند.

وەستا نیازی، ساڵی ١٩٧٧، بە هۆی تێکچوونی باری تەندروستییەوە، دەچووە چیکۆسلۆڤاکیا. لە دیاربەکرەوە هاتە ئەنقەرە، لەوێشەوە بڕیار بوو گەشتەکەی بکات، چونکە تووشی نەخۆشی شێرپەنجە ببوو. بە ڕێککەوت لەگەڵ ئومێد فورات لە پەرتووکخانەی بارش، تووشی وەستا نیازی بووم. ئەو ڕۆژەش ئەو چاکەتەم لەبەر بوو، کەلەسەرەوە چۆنیەتی چێکردنەکەیم بۆ باسکردن. کاتێك وەستا نیازی منی ئاوا بینی، زۆر دڵتەنگ بوو و ئاخێکی قوڵی هەڵکێشا و عێدز بوو. گەستنی لێویی و گرژکردنەوەی برۆکانی و دەرچوونی هەناسە ساردەکانیم خوێندەوە و پێم گوت "وەستا نیازی، زۆر خۆشیم لەو چاکەتە دێت و یەکێکە لە پۆشاکە دڵخوازەکانم؛ بۆیە بەردەوام لەبەری دەکەم و نامەوێت دایکەنم. ئەمە جگە لەوەی، هەر کاتێك لەبەری دەکەم و دایدەکەنم، ئێوەم بیردێتەوە. بۆیە چ شتێك لە گۆڕێ نییە تا خۆتانی پێوە عێدز بکەن". وەستا نیازی ماوەیەك ئاوا بە سەرسامیەوە لێمی ڕوانی و پاشان بەری خۆی لە ئومێد فورات کرد و گۆتیێ "براله بۆچی چاکەتێك بۆ مامۆستا دابین ناکەن؟ چونکە بای پێویست ئێمەی بیر هاتووەتەوە و، ئیدی بەسە". لە وەڵامدا ئومێد فورات گوتی "بێشکچی نزیکەی حەفت هەشت

ساڵە ئەو چاکەتە لەبەر دەکات، پێم وابێ تا حەفت هەشت ساڵی دیکەش دایناکەنێ. پاشان بەردەوام بە چاکەتەکە هەڵدەدا و دەڵێ بەرگێکی چاکی دەستی وەستا نیازییە".

## مامم، زۆر کاری خراپی کردووە

دوای ئەوەی لە مانگی نۆی ساڵی ۱۹۹۹ لە زیندانی بورسای تایبەت ئازاد کرام، لە ئەنقەرە ئافرەتێکی مامۆستای گەنج بەسەرهاتێکی ئاوای بۆ گێڕامەوە "لە ناوەندی پارێزگای چۆروم، لە قوتابخانەیەکی سەرەتایی مامۆستابووم و وانەم بە پۆلی دووەم دەگوتەوە. ڕۆژێك، ئەوکاتەی بەسەر ناوی قوتابییەکاندا دەچوومەوە، چاوم کەوتە سەر ناوی قوتابییەك، کە پاشناوەکەی بێشکچی بوو. هەمان ڕۆژ دوای تەواو بوونی وانەی ئەو ڕۆژە، قوتابیەکەم بانگکردە لای خۆم و لێیم پرسی: ئایا ئیسماعیل بێشکچی دەناسی؟ ئاخۆ هیچ ناسیاوییەکتان لەگەڵی هەیە یان نا؟".

قوتابییەکە نەوەی براگەورەکەمە. دوای پرسیاری مامۆستاکە بە گریانەوە گوتبووی "مامم زۆر کاری خراپی کردووە، بۆیە ئەویان خستۆتە زیندان".

دوای ئەو وەڵامە، مامۆستاکە زار بەش بووە؛ بۆیە پێی گوتووە "سەرلەبەری ئەوانەی تۆ دەیزانی هەڵەیە، چونکە مامت مرۆڤێکی زۆر چاکە و گەلێکیش کاری باشی کردووە. بۆیە ئێمەش ئەومان پڕ خۆشدەوێ". دواتر مامۆستاکە بەو شێوەیە درێژەی دابووێ "جا کێ دەڵی باوکت ئاوا کاری خراپی کردووە؟ تۆ ئەمانەت لە

کوێوە گوێ لێبووە؟". قوتابییەکەش لە وەڵامدا گوتبوی "لەماڵەوە، دایك و باوکم ئاوا لەسەر ئەو پرسە دەدوێن".

ئەو برازایە بچکۆلانەم، دوای ئەوەی گوێی لەوە ببوو، مامۆستاکەی وەکوو ئەوانەی ماڵەوەمان باسی من ناکا، بۆیە ماوەیەکی زۆر حەپەسابوو بە دیار وتەکانی مامۆستاکەیەوە.

## ئەحمەد کورد: "بە ئێمە دەڵێن بابە، بەڵام..."

لە مانگی دەی ساڵی ١٩٩٠، لە زیندانی ساغماجلار ئازادکرام. لەناو ئەوانەی پێشوازییان لێکردم لەبەر دەرگای زیندان، سەرحاد بوجاکی پارێزەریشم بینی. دوای باوەش و چاك و چۆنی، برادەران گوتیان "ئەمشەو، شەوانەی دێرسیم هەیە، ئەگەر بچینە ئەوێ شتێکی چاك دەبێ".

مەراسیمی شەوی دێرسیمیان، لە هۆڵێکی نزیك ناوچەی باڵات بوو. لە دەرەوە، بە پلیکانە بەسەر دەکەوتی بۆ هۆڵەکە. لەسەرەوە شوێنەکە گەورە و فراوان بوو. لە زیندانەوە ڕاستەوخۆ چووبووینە ئەو هۆڵە. بۆیە باول و کۆمەڵێك کتێبیشم پێبوو، بەڵام لە چوونە ژوورەوە هیچ ئاریشەیەکیان بۆ چێنەکردم.

لەگەڵ برادەران، لەسەر مێزێکی نزیك دەرگای چوونە ژوورەوە دانیشتین. ماوەیەك دوای گەیشتنمان، یەکێك لە هەڤاڵان گوتی "کاك ئیسماعیل، ئەو کابرایەی لەو سەرەوە، لەتەك پەنجەرەکە دانیشتووە، ئەحمەد کوردە. با تۆ بەو بناسێنین". لەسەر ئەو پێشنیارە، هەستاینە سەرپێ و چووینە لای مێزی کابرا و منیان پێ

ناساند. وەلێ کاتێك باسی منیان بۆ ئەو کرد، زیاد لە پێویست گەورە و بە شانوباڵیاندا هەڵدام و منیان وەکوو پاڵەوانێك دەناساند و دەیانگوت "هیچ کات نەدۆڕاوە و پشتی بەر زەوی نەکەوتووە".

پێم وابێ ئەحمەد کوردی، کەم یان زۆر، لە دوورەوە گوێبیستی ناوی من ببوو. بۆیە شل شل گوێی بۆ ئەو برادەرە گرت و خۆشحاڵی خۆی بۆ ئەو یەکدی ناسینە دەربڕی. کاتێك لەگەڵ ئەو برادەرە خەریکی گفتوگۆ بووین، دوندار کلێچ و چەند پیاوێك هاتنە ناو هۆڵەکە. هەر کە چاوی بە ئێمەش کەوت، ڕاستەڕاست هاتە لای ئەو مێزەی لەگەڵ ئەحمەد کورد یەکدیمان لێ ناسی. کە گەیشت بەرامبەر ئەو برادەرە تازەیەمان دانیشت. دوای سڵاو و چاك و چۆنی، ئەحمەد کوردی منی بە دوندار کلێچ ناساند. وەك چۆن کاتێك ئەو برادەرانەمان زیاد لە پێویست باسی منیان بۆ ئەحمەد کوردی کرد، ئەویش کاتێ منی بەو میوانە تازەیە ناساند، زۆر زیاتری خستە سەر، بە شێوەیەك خەریك بوو خۆم نەناسمەوە.

ئەحمەد کوردی کەسێکی گاڵتەچی بوو؛ پێکەنینەکانیشی بە قاقا بوو. جا لەکاتی دوان، دەست و پەنجەی زۆر بەکار دەهێنا. چونکە کاتێك باسی لە هەست و دەروونی خۆی کردبا، بەردەوام بە ئاماژەی جەستەوە دەپەیڤی و بێ ئەوە شتێکی لە دەم دەرنەدەچوو. وەلێ بە پێچەوانەی ئەو، دوندار کلێچ، کەسێکی هێمن و بێدەنگتر بوو. خەندەیەکیشی بۆ ئەو بەسەرهات و ڕووداوانە دەکرد، کە بۆیان دەگێڕاوە.

لەکاتی ئەو دەمەتەقێیەدا، ئەحمەد کوردی شتێکی پڕ بایەخی

بەو شێوەیە بۆ باسکردین "بە ئێمە دەڵێن (بابە) لەناو کۆمەڵگاش وەکوو باوك دەناسرێین. بەڵام هەر کاتێك دەوڵەت و حکوومەت هەڕەشەمان لێبکات و بڵێ: ئێمە دەزانین چ شتێك بە قاچاغ دەهێنن و دەبەن و، لەسەر سنوور خەریکی چ کارێکن. هەموومان خۆمان لە کونێك دەنێین و خۆمان حەشار دەدەین و لەوێ نایەنە دەرەوە. لە کاتێکدا بە ئێمە دەڵێن بابە و کەچی ئەو کارانەش دەکەین. بەڵام کاك ئیسماعیل بێشکچی، هیچ نەڕووخاوە و بەردەوام دەستی لە بەرخووودان هەڵنەگرتووە و لە هیچ شوێنێکیش خۆی حەشار نەداوە. بە پێچەوانەی ئێمەش، بەردەوام لەبەرچاوان بووە و مافەکان خۆی لە ڕێگای یاساوە داواکردەوە و بەرگری لە کارەکانی کردووە. بۆیە (باوکی) ڕاستی ئەم پیاوەیە خۆیەتی، نەك ئێمە". ئەم قسەیە سەرنجی برادەرانی دیکەشی بۆ لای خۆی پەلکێش کرد.

شەوی دێرسیم زۆر قەرەباڵخ بوو. جا بە گۆرانی و میوزیك و شیعر و ئاهەنگ و شایی، جۆش و خرۆشێك دروست ببوو، ئەوسەری دیار نەبێ. ئەو منداڵانەی لەوێ بوون، زۆر هەڵپەڕ و داپەڕیان کرد و کەیفێکی زۆریان لە شەوەکە وەرگرت. لەوێ دیارییەکیان پێدام و داوەتی دێرسیمیشیان کردم. منیش لەوێ باسی کورد و کوردستانم کرد. جا لەوێ گوتم هەر کاتێك پرسەکە لەسەر کورد و کوردستان بێت من ئامادەم، بۆیە ئەو داوەتەش قبووڵدەکەم.

## عەلی ڕزا سەپتی ئۆغڵوو "پاڵەوانە چۆرووملیەکە"

زولکوفور بیلگینی دۆستم، لە دەیەمین ڕۆژی مانگی شەشی ساڵی ١٩٨٩، کۆچی دوایی کرد. ئەوسا، عەبدولڕەحمان بیلگینی کوڕی، نووسینگەی ئەندازیارییەکەی لە شەقامی ئیزمیر بوو. لە نهۆمی یەکەمی هەمان باڵەخانە، لە ساڵانی حەفتاکانی سەدەی بووری، وەشانخانەی کۆمەڵ کارەکانی خۆی لەوێ ڕایی دەکرد.

چەند ڕۆژێك دوای وەفاتی کاك زولکوفور، بۆ تازییە چووینە نووسینگەی کوڕەکەی. چوار پێنج کەسێکی دیکەش لەوێ بوون. یەکێك لەو برادەرانەی لەگەڵیشمان هاتبوو، شاکر ئەپۆزدەمیر بوو.

ماوەیەك دوای دانیشتنمان، عەلی ڕزا سەپتی ئۆغڵوو هات. ئەو بە کورتی سەلام و کەلامێکی لەگەڵ برادەرانی ئەوێ کرد. زولکوفور بیلگین و عەلی ڕزا سەپتی ئۆغڵوو، دوو ئەندامی ماڵباتی شێخ سەعید بوون.

لەوێ، شاکر ئەپۆزدەمیر، منی بە عەلی ڕزا ناساند؛ وەلێ بە خەسڵەتی نووسەر و نووسین و پەرتووك نا، بەڵکوو بە تایبەتمەندی پاڵەوان و قارەمانانە "ئەو پاڵەوانە چۆرووملییە، هیچ نەشکاوە و پشتی بەر زەوی نەکەوتووە و...". کاك شاکر ئاوا باسی منی بۆ عەلی ڕزا کرد.

دوای ئەو قسانە، عەلی ڕزا ڕووی لە من کرد و گوتی "بەڕێزم سەرێك لە ئەنجومەنی وەزیران بدەن، تا خانووێك

وەرگـرن، بـۆ ئەمەش بە واژوویەك دەتـوانین ئەو کـارە خێراتـر بکەیـن" مـن زاربەش بـووم و چـاوم ئەبـڵەق بـووا ئەنجـومەنی وەزیرانی چی و خانووی چی! لەو سەروبەندەدا، کاك شاکر لە بن سمێڵان دەخەنیەوە، من هەر زوو هەستم بەو خەندە شاراوەی بن سمێڵی کەوت، پاشان دۆخەکەم بۆ ڕوون بۆوە.

ئەوساڵە پاڵەوانییەتی زۆرانبازی جیهانی لە ئەنقەرە بەڕێوەچووە. لە پـاڵەوانیەتەکەدا زۆرانبـازێکی خەڵکـی چۆرووم وەکـو نـوێنەری تورکیا بەشداری یارییەکانی کردبوو. یاریزانەکە، ڕکابەرە کازاکی و سربی و چەندانی دیکەی لە زەوی داوە و سەرکەوتنی بۆ تورکیا بە دەسـتهێناوە. لە یەکێـك لە یاریەکانـدا ڕووبەرووی ئەمـریکیەك دەبێتەوە، بۆیە بەر لە یاریەکە پێی دەڵێن "ئەگەر بەسەر ئەو یاریزانە ئەمریکییە سەرکەوی، خانوویەکت پێدەدەین".

لە یاریەکەدا کابرای چۆرووم، ڕکابەرە ئەمریکیەکەی لە زەوی داوە و یـاریەکەی بـردووەتەوە و مەدالیـای زێـڕی وەرگرتـووە. بـۆیە کاك عەلی ڕزا کاتێك گوێی لە مەدح و سەنای پاڵەوان و شتی وا بـوو، وای زانـی مـن مەدالیـا زێـڕەکەم وەرگرتـووە و بە کـابرای زۆرانبازم تێگەیشتووە.

عەلــی ڕزا، لە نێــوان ســاڵانی ١٩٧٨-١٩٧٩ لە حکــوومەتی بوڵەنـت ئەجەڤیـد، وەزیـری کەش و هەوا و ژیـنگە بـووە، لە ٤٢ مین کـابینەی حکـوومەتی تورکیـا. سـاڵی ١٩٨٩ بـووە پەرلەمانتـار، بەڵام پێم وابێ ئەوسا هیچ بەرپرسیاریەتێکی حکومی نەبوو. ساڵی ١٩٩١ جارێکی دیکە لە شاری ئەل عەزیزەوە خۆی هەڵبژاردەوە و بـــووەوە ئەنـــدامی پەرلەمـــان. بە هـــۆی ئەوەی لە زۆربەی

پەرلەمانتارە هەڵبژێردراوەکانیش تەمەنی زیاتر بوو، بۆیە وەکوو سەرۆکی کاتی پەرلەمانی تورکیا هەڵبژێردرا و سەرپەرشتی مەراسیمی سوێندخواردنی پەرلەمانتارانی خولەکەی کرد. ئەو خولەی پەرلەمان، بە سوێند خواردنە ناودارەکەی لەیلا زانا بەناوبانگە، کە ئەو خانمە ناوی چووە ناو دێڕ و لاپەڕەکانی دیرۆك. جا هەڵوێست و بەرچەکرداری ئەو دوانە تا ماوەیەکی درێژ، بووە باس و خواسی سەر زاران.

ئیسماعیل بێشکچی و کۆمەڵێك لە زیندانیانی گرتووخانەی ئولوجانلار، ساڵی ١٩٩٦.

.لە چەپەوە: ئیسماعیل بێشکچی، ئەحمەد عارف، ئومێد فوڕات. ئەرشیفی ئومێد فوڕات

# بەشی یازدە
# ڕووەکانی دیکەی ڕێبواریم

## یڵماز ئۆزتورك، ئەو کەسەی دۆستایەتییەکەی کۆتایی نایەت

دوای ئەوەی لە مانگی شەشی ساڵی ١٩٦٢، کۆلێژی زانستە سیاسییەکانم تەواو کرد، دوای دەرچوونم ڕاستەوخۆ لە چۆرووم وەکوو فەرمانبەر دامەزرام. وەلێ زۆر نەمامەوە و چوومە خزمەتی سەربازی.

قوتابخانەی هێزی پیادە، لە ناوچەی توزلای ئیستانبووڵ بوو. لە مانگی دەی ساڵی ١٩٦٢، لە بەشی بلۆکی هەشتی ئەفسەری یەدەگ بووم. لەوێوە لەگەڵ یڵماز ئۆزتورك هەڤدوومان ناسی. بە هۆی باڵا کورتیمان، بەردەوام لە دواوەی بەشەکەی خۆمان بووین. کاك یڵماز ڕۆژنامەڤان بوو. هەر ئەوساش، لەگەڵ ئایدن ئایبان و سایم تەکجان ئاشنایەتیمان پەیداکرد. ئێمە وەکوو خولی پەنجاونۆکان دەناسراینەوە. لەوێ زۆر برادەر و دۆستمان هەبوو، ئەوان هەریەکە و لە پیشەیەك درێژەیان بەکارەکانی خۆیان دەدا.

ئەو برادەرانەی خەڵکی ئیستانبووڵ بوون، هەموو کۆتایی هەفتەیەك دادەبەزین و دەچوونە ماڵەوە. یڵماز چەند جارێك، منیشی داوەتی ماڵەکەی خۆیان کرد. لەوێ منی بە باوان و

خوشك و براكانی ناساند. ئەوان خانوەكەیان لە ناوچەی كارتاڵی شەقامی بەغدا بوو لەبەری ئاسیای ئیستانبووڵ.

لەوێ دەمێدا، ماوەی خوێندنی قوتابخانەی ئەفسەری یەدەك، شەش مانگ بوو. دوای كۆتایی هاتنی ئەو ماوەیە، هەر كەسە و لە ڕێگای ڕاكێشانی تیر و پشكەوە، ناوی لە شوێنێكی توركیا دەهاتەوە، بۆ ئەوەی دەست بە ماوەی خزمەتی سەربازییەكەی بكات. وەلێ دوو یان سێ برادەر، دەیانتوانی شوێنەكانی خۆیان، لە نێوان خۆیاندا بگۆڕنەوە. لە تیروپشكەكەدا، من ناوم لە تڕابزۆن و یلْماز لە بەدلیس و سلێمانیش لە چۆرلوو ناوی هاتەوە. لە كاتێكدا من دەمویست ناوم لە شارەكانی ڕۆژهەڵات بێتەوە، چونكە تڕابزۆن دەكەوتە سەر دەریای ڕەش لە باكووری توركیا. دوای دەرچوونی ناوەكان، ئەو سێ برادەرە لە نێوان خۆماندا گۆڕانكاریەكمان بە شوێنی یەكدی كرد و ناوچەكانمان گۆڕیەوە؛ ئیدی من چوومە بەدلیس و یلْماز چووە چۆرلوو و سلێمانیش تڕابزۆنی هەڵبژارد.

یلْماز، ئەوسا لەگەڵ توركان دەستگیراندار بوون. دوای تەواو كردنی ماوەی سەربازی، هاوسەرگیریان كرد و لە ڕۆژنامەی (یەنی گازەتە) دەستی بە كاری ڕۆژنامەڤانی كردەوە. ساڵی ١٩٦٥، كچێكیان بوو و ناویان لێنا ئەلیف. جا ئەلیف هەر لە بچووكیەوە، لە جیاتی بە یلْماز بڵێ بابە، وەكوو توركانی دایكی بەردەوام بە یلْماز بانگی باوكی دەكرد. ئەمەش بە مانای دیموكراسی و خۆشەویستی و ڕێزگرتنی ناو ئەو ماڵباتە بوو.

***

ساڵی ١٩٩٨، ئەوکاتەی لە زیندانی بورسای تایبەت بووم، پەرتووکی (گۆلگەدا کالان یلّلار- ئەو ساڵانەی لەژێر سێبەر مانەوە)ی مەهمەت فوئادم دەخوێندەوە. لەناو بەشێك لە پەرتووکەکە باسی لە نازم حیکمەت[١] دەکرد، کە لە کۆشکی نازم پاشا، لە کوچەی ئەتەم ئەفەندی، شەقامی بەغداد دەماوە. ئێمە ساڵانی شەستەکانی سەدەی بووری لە زۆر کوچە و کۆلانی ئەو ناوچەیە پیاسە و گوزەرمان دەکرد. ماڵی یلّبەرووش هەر لەوێ بوو. بۆیە لەکاتی ڕێکردندا بەردەوام بە هێما کردن بۆ چەند باڵەخانە و خانوویەك دەیگوت "ئەمە کۆشکی فلانە کەسە و ئەمەش ماوەیەك بەر لە ئێستا ناوی کۆشکی فلانە کەس بووە و شوێنی ئەو خانووەش پێشتر کۆشکی فلانە کەسی لێبوو تاد... " جا لەوێ دەمێدا، ماڵی بەشێك لە مامۆستایانی زانکۆی ئیستانبوول و ڕۆژنامەڤان و سەرنووسەری ڕۆژنامەکان و بازرگانان لە کۆشکەکانی کۆلانی ئەرتەم ئەفەندی بوو. یلّماز دانە دانە باسی ئەو شوێنانەی بۆ دەکردم و بازی بەسەر هیچ وردە زانیارییەك نەدەدا. لەوێ دەمێدا ژمارەی ئەو کۆشك و تەلارانەی ئەوێ گەلێك زۆربوون. بە هۆی ئەو زانیارییانەی باسم کرد، پەرتووکەکەی مەهمەت فوئادم بە سەرنجەوە دەخوێندەوە، بەشێوەیەك لە هەندێك شوێن، باسی زۆر ناوچەی گەلێك نزیکی ماڵی یلّبەروو دەکرد، بەشێوەیەك ئیدی دەگەیشتمە ئەو هەستەی،

---

[١] نازم جیکمەت (١٩٠٢-١٩٦٣) شاعیری ناوداری تورک، ساڵێک یان دوو ساڵ بەر لە مردنی، لە ڕێی کەسایەتی و ڕووناکبیری کورد کامەران بەدرخانەوە نامەیەک ئاڕاستەی گەلی کورد دەکات و تیایدا بۆچوونی خۆی لەمەڕ دۆزی کورد لە تورکیا دەخاتە ڕوو. (وەرگێڕ).

ڕەنگە دوای یەك دوو لاپەڕەی دیکە، باسی یڵماز وماڵباتەکەیان بکات.

***

## ڕوانینێکی ڕەخنەگرانە بۆ پێڤاژۆی سیاسی و کۆمەڵایەتی

بەر لە ڕژێمی دوازدەی ئازار، لە کۆتاییەکانی ساڵانی شەستی سەدەی ڕابردوو، زۆر باوەڕم بە سەربەخۆیی زانکۆ و دامەزراوەکانی دیکە دەکرد؛ کەچی یڵماز بەردەوام ئەوەی بە گوێچکەمدا دەچرپاند، کە زانکۆ و زۆربەی دامەزراوەکانی دیکە جێگای باوەڕ نین؛ بۆیە ڕووانینێکی بە گومان و ڕەخنەییانەت بۆ ئەو دۆخە سیاسی و کۆمەڵایەتییە ڕاسترە، وەك ئەوەی باوەڕێکی یەقینت هەبێ.

ساڵی ١٩٤٨، هەریەکە لە، باهیجە بۆران و نیازی بەرکەس و مەدیحە بەرکەس و پەرتەڤ نایلی بۆراتاڤ و چەندان مامۆستای دیکە، کە ئێستا هیچیان لە ژیان نەماون، لەبەشی زمان و مێژوو و جوگرافییا دەرکران و لە وانە گوتنەوە دوورخرانەوە. وەك چۆن لە ناوەڕاستی چلەکانی سەدەی بووری، لە هەمان کۆلێژ، مزەفەر شەریفیش دەرکرابوو.

ساڵی ١٩٥٦، تورهان فەیز ئۆغلووی ڕاگری کۆلێژی زانستە سیاسییەکان، لە وتاری کردنەوەی وەرزی نوێی خوێندن، لە ئاخافتنێکیدا بۆ مامۆستایان و خوێندکاران گوتی "بە ویست و خواستی هیچ کەسێك، مەدوێن و مەنووسن". لەسەر ئەو وتەیەی،

لە وەزارەتەوە فەرمانی ڕاگیرانی بۆ دەرکرابوو. جا ئەمەش ببووە هـۆی ئەوەی دەنگـدانەوەیەکی گەورە لەنـاو کـۆلێژی زانسـتە سیاسییەکان و بەشەکانی دیکەی ناو زانکۆش دروست بکات.

لـە سـەردەمی ٢٧ مـایس[1] (میللـی بیرلیـك کۆمیتەسـی – کـۆمەڵەی یەکگرتـووی نەتەوەیـی) فەرمـانی دەرکردنـی بـۆ ١٤٧ مامۆستای زانکۆ بڵاوکردەوە. بەڵام بە هۆی کاردانەوە توندەکانی دژ بەو هەنگـاوە، بڕیـارەکە هەڵوەشـێندرابۆوە و مامۆسـتاکان گەڕابوونەوە سەر کارەکانی خۆیان.

من وەك خۆم، لەو باوەڕەدابووم، ئیدی ئەو جۆرە ئۆپەراسیۆنانە ڕوونـادەنەوە. بـۆیە هەوڵـی ئەوەم دەدا، ئـازادبوونی دامەزراوەی زانکـۆ زیـاتر بە گـوێی دۆسـتاندا بـدەم؛ وەلـێ یلماز بێ پسانەوە باسی لەوە دەکرد، ناشێ باوەڕ بەو دامەزراوانە بکەین.

لەگەڵ هاتنی ڕژێمی دوازدەی ئازار، بە هۆی نووسین و وتار و پەرتـووك و نـاوەڕۆکی وانەکـانی زانکـۆم، چەنـدان دۆسـیەی دادگایی کردن و سزای دادگا و زیندانی کردنم ڕووبەڕوو بۆوە. بـۆیە مـاوەیەکی زۆر لە بەنـدیخانەکانی دۆخـی لەناکـاو و چەنـدان گرتووخـانەی دیـکە مـامەوە. لە یەکەم ڕۆژی چـوومە زینـدانمەوە،

---

[1] کودەتـای ٢٧ مـایس، لە مێـژووی کۆمـاری تورکیـا بە یەکەمـین کودەتـای سـەربازی دادەنرێـت، دوای دروسـتکردنی کۆمـار. کودەتـاکە سـاڵی ١٩٦٠ بە سەرپەرشتی لیوا جەمال مادان ئۆغلوو سازکرا. لە ئەنجامدا عەدنان مەندەرێسی سـەرۆك وەزیـران و جەلال بەیـاری سـەرۆك کۆمـار دەسـتگیردەکرێن و دەخـرێنە زینـدان و حکـومەتی پارتی دیمـوکراتیش هەڵدەوەشـێتەوە و حکـومەتی سـەربازی شوێنی دەگرێتەوە (وەرگێڕ).

بەهەموو گرتووخانەکانەوە، تا دوا ڕۆژی زیندانم، یڵماز بەردەوام سەری لێ نەبڕیم و هاتە لام و نامەی بۆ ناردم و بەهەموو شێوەیەك، لە ڕووی ماددی و مەعنەوی پاڵپشتم بوو.

## ئاژانس ۷۰

ئاژانس دامەزراوەیەکی گرنگ بوو، کە یڵماز لە ڕێگەیەوە هەست و هزری خۆی لێ بڵاودەکردەوە. شوێنەکە لە کۆتایی حەفتاکانی سەدەی ڕابردوو وەکوو نووسینگەیەکی ڕیکلام کردن کرابۆوە. بەو بۆنەیە لە هەموو سەری ساڵێك، یان لە جەژنەکانی قوربان و ڕەمەزان، چەندان کارتی زۆر جوانی هونەری بۆ دۆستەکانی دەنارد. جا بەشێك لەو نامانەی لە پەرتووکی (گەواهیدەری ڕابردوو، ئاژانس ۷۰، نامەکانی نێوان ئیسماعیل بێشکچی و ئیسماعیل ئۆزتورك). باسکردووە. لە بڵاوکردنەوەی ئەو پەرتووکەش، مەناف ئاڤجی، ڕۆڵێکی گەورەی هەبووە. جا لە حەلیم یەشیل لەگەڵ کاك مەناف ئاڤجی، کاریان بۆ بڵاوکردنەوەی پەرتووکێ (نووسراوەکان)ی کاك یڵماز ئۆزتورکیش کرد.

کاك یڵماز وازی لە ڕۆژنامەڤانی هێنابوو، وەلێ هەموو ڕووداوەکانی هەر بەو چاوەوە دەبینی. پایزی ساڵی ۱۹۸۷، لە ئیستانبووڵ بەشداری ناشتنی تەرمی باهیجە بۆرانی سەرۆکی پارتی کرێکارانی تورکیامان کرد لە گۆڕستانی زنجیرلیکۆی.

## بۆمبڕێژکردنی، پایەکانی دەوڵەت

لە سەردەمی ڕژێمی دوازدەی ئازار لە ساڵی ١٩٧١، لەلایەن دادگای سەربازی دۆخی لەناکاوی دیاربەکر، فەرمانی بەندکردنم دەرچوو. لە کۆتایی دادگاش، سزام بەسەردا سەپێندرا و کەوتمە زیندان. ئەو دۆخەی بەسەر مندا هات، وای کردبوو ئەلیفی کچی یلماز ئۆزتورکی هاوڕێم زۆر نارەحەت بکات و بەردەوام بڵێ "مامە ئیسماعیل لە زیندانە..." ئەمەش ببووە دەرد و کەسەر لە دڵی ئەو کچە. پێم وابێ ئەوسا تەمەنی حەفت ساڵان بووە.

بیرمە، یلماز مامێکی، فەرمانداەی سوپای خانەنشینی هەبوو. منیش جارێك بینیی بووم و یەکدیمان دەناسی. بۆیە ڕۆژێك لە سەردانێکیدا بۆ ماڵی یلماز، مامی دەبینێ ئەلیفی کچی یلماز زۆر دڵ تەنگ و دووره پەرێزە! کاتێك هۆکاری ئەو دۆخەشی لێدەپرسن، لە وەڵامدا دەڵێ چونکە مامە ئیسماعیل لە زیندانە. ئاپی یلماز چاوێك دەداتە ئەلیف و دڵی پێی دەسووتێ و ڕوو لە یلماز دەکا و دەڵێ "من زۆر برادەر و دۆستم لە دادگای سەربازی و دۆخی لەناکاو هەیە. لەگەڵ ئەوان قسە دەکەم و فەرمانی ئازادکردنی بۆ ڕێك دەخەین...". پاشان داوای ژمارەی دۆسیەی دادگایی کردنەکەم لە یلماز ئۆزتورك دەکا، ئەویش ژمارەکەی دەداتێ.

مامی یلماز، ڕۆژێك دەچێتە ئەنقەرە و لەوێوە بە ژمارەی دۆسیەی دادگایی کرا، دەچێتە دادگای سەربازی تورکیا. لەوێ دۆخەکە بە برادەرە سەربازییەکانی دەڵێ و ژمارەی دۆسیەکەی منیشیان دەداتێ. ئەوانیش بەڵێنی بەدواداچوون بۆ دۆسیەکەی

پێدەدەن.

پشتی تێپەڕینی دە پازدە ڕۆژێك بەسەر سەردانەکە، بەر لەوەی مامی یلماز تەلەفۆن بۆ برادەرانی دادگای سەربازی بکاتەوە، هەڤالانی ئەوێی، تەلەفۆنی بۆ دەکەن و پێی دەڵێن "جەنابی فەرماندە، نە تۆ هاتییە ئێرە و نە ئێمەش تۆ دەناسین. چونکە ئەوە دۆخ و دۆسیەیەکی زۆر جیاوازە. ئەو پیاوە پایەکانی دەوڵەتی بۆمبڕێژ کردووە. بۆیە چەندی لەو کارە دوور بیت، ئەوەندە باشە".

## ئومێد فورات و ئەحمەد عارف

لەگەڵ ئومێد فورات، یەکەمجار، لە مانگەکانی بەهاری ساڵی ١٩٦٣، لە شاری بەدلیس یەکدیمان ناسی. ئەوسا سەربازی هێزی ٣٤ی پیادە بووم، کە بارەگای لە ناوشاری بەدلیس بوو. چاغلاری برا گەورەی ئومێد فوراتیش، لای ئێمە ئەفسەر بوو، ئومێدیش قوتابی ئامادەیی بوو. بۆیە هەندێك ڕۆژ، لە کاتی فراڤین، یان شیڤی دەهاتە لای براکەی، بۆلای ئێمە. ئیدی لەو هات و چۆیەدا ئومێد فوراتم ناسی. بۆیە من و برا گەورەکەیی و ئومێد زۆر دادەنیشتین و کاتمان بەیەکەوە بەسەر دەبرد. ئومێد کەسێکی زیرەك و زیتەڵە بوو؛ دەیتوانی زۆر بە ڕوونی بۆچوونەکانی خۆی، لەسەر مژارەکان بەیان بکات. ئەوسا برادەرایەتیشمان لەگەڵ هەندێك مامۆستای ئامادەییش هەبوو.

پێم وابێ ئومێد فورات تەجروبەی ئامادەیی سەربازیشی هەبوو. بەڵام دوای سەرهەڵدانەکەی بیستی مایسی ١٩٦٣ی

تەڵعەت ئایدەمیر، سەرجەم ئامادەییە سەربازیەکان داخران. جا ئەو قوتابیانەی لەو ئامادەییانەش بوون، بۆ ئامادەیی ئاسایی نا سەربازی گوازرانەوە. پێم وابێ ئومێدیش یەکێك بوو لەوان. بەڵام کە یەکدیمان ناسی، پاشان بۆی باسکردم کە ئەو هیچ کات قوتابی ئامادەیی سەربازی نەبووە.

ساڵی ١٩٦٤، دوای ئەوەی ماوەی سەربازیم تەواو کرد، لە زانکۆی ئەتاتورك لە شاری ئەرزڕووم، وەکوو مامۆستای یاریدەدەر لە بەشی کۆمەڵناسی دەست بەکاربووم. ساڵی ١٩٦٩، لە چوارچێوەی خەباتی ئەکادیمیم، چوومە ئەنقەرە. لەوێ سەروبەندێدا، گەنجەکانی ناوچە کوردییەکان لە ڕێکخراوی (دەڤ گەنج) جیا ببونەوە و کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی کولتووری ڕۆژهەڵاتیان دامەزراندبوو. من ئەو نووچەیەم لە ڕۆژنامەکانەوە خوێندبۆوە. بۆیە کەلکەلەی ئەوەم کەتبووە سەرم، تا سەردانیان بکەم و لە نزیکەوە دانیشین، بۆ ئەمەش ناونیشانی بارەگاکەیانیانم لە ڕۆژنامەوە وەرگرتبوو و لای خۆم تۆمارکردبوو.

ڕۆژێك هەڵستام و چوومە بارەگاکەیان، کەلەجانێکی زۆر، سەرتاپای گیانمی تەنی بوو، نەمدەزانی لەوێ کێ دەبینم و تووشی چی دەبم و چی ڕوو دەدات! بەر لەوەی بێمە ئەنقەرە لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵات بە هۆی سەربازی و لێکۆڵینەوەی مەیدانی و میتینگەکانەوە، لەگەڵ زۆر کورد، یەکدیمان ناسی بوو، بەڵام دامەزراندنی کۆمەڵەیەکی وەها لەلایەن قوتابییە کوردەکانی خوێندکاری زانکۆ، بە دڵنیاییەوە جیاوازی زۆر بوو. کە زەنگی سەر دەرگاکەم لێدا، لە دیوی ژوورەوە، ئومێد فورات دەرگاکەی

کردەوە. بە بینینی ئەو زۆر ئارام بوومەو و گەلێکیش دڵخۆش بووم. جگە لەمە، ئەمە بۆ من بووە پێشهاتێکی چاوەڕوان نەکراو و لەوەش تێگەیشتم، کە هاتوومە شوێنێکی ڕاست و تەواو.

لە سەردەمی ڕژێمی دوازدەی ئازار، لە زیندانی سەربازی دۆخی لەناکاوی دیاربەکر، لەگەڵ زۆر هەڤاڵ و ئەندامی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی کولتووری ڕۆژهەڵاتی شارەکانی ئیستانبووڵ و ئەنقەرە و دیاربەکر و سیلڤان و ئەرگەنی و باتمان، یەکدیمان ناسی. بەڵام لەناو ئەواندا ئومێد فورات نەبوو، چونکە ئەو ناوی لە سکاڵانامەی دادگایی کردنی ئەو ئەندامانەشدا نەبوو. تەنیا ئەوەمان دەزانی کە دۆسیەی دادگایی لەبارەوە کراوەتەوە و پێڤاژۆی دادگایی کردنی بەردەوامە.

لە دوای لێبووردنە گشتیەکەی ساڵی ١٩٧٤ لەگەڵ ئومێد فورات پەیوەندییەکانمان زێدەتر لەیەك نزیك کردەوە. کاك ئومێد چەند کتێبفرۆشیەکی بە ناوەکانی (کتێبخانەی بارش و کتێبخانەی ڕەمزی) هەبوو.

## ئەحمەد عارف و کتێبخانەی بارش

کتێبخانەی بارش، بەردەوام زۆر قەرەباڵغ بوو. چونکە شوێنێکیش بوو بۆ پرسین و هاتنی هەواڵی دیاربەکر و وان و ئاگری و جۆلەمێرگ و چەند ناوچەیەکی دیکە... هەروەها شوێنی هەڤدوو بینینش بوو. دەرێکی وەهابوو، هەموو کەسێك پێی دەزانی و سەری لێدەدا. یەکێك لە ڕووداوە گرنگەکانی ئەو

سەردەمە، یەکدی ناسینی من و ئەحمەد عارف بوو؛ لە ڕێگای ئومێد فوراتەوە.

لە نێوان ساڵانی ۱۹۷۳-۱۹۷٤، ئەو دەمەی لە گرتووخانەی ئەدەنە بووم، ئەحمەد عارف زوو زوو، ڕۆژنامەی (هالکچی) بۆ دەناردم. لە ڕۆژنامەکە چەندان کورتە چیرۆکی ناوازەی موراتان مونگانی تێدابوو سەبارەت بە ناوچەکانی (نسێبین و مێردین و میدیەت). دواتر زانیم، کاك ئەحمەد وەکوو هەڵەچن لە ڕۆژنامەکە کاری دەکرد. ئەحمەد عارف، زوو زوو دەهاتە کتێبفرۆشی بارش. ڕێز و خۆشەویستیەکی زۆری بۆ ئومێد هەبوو، وەك چۆن زۆر باوەڕیشی پێدەکرد. منیش زۆربەی کات، ڕۆژانی شەممە دەچوومە ئەوێ.

باسم لەوە کرد، کتێبفرۆشی بارش بەردەوام قەرەباڵخ بوو؛ ڕۆژێك لە کاتی گفتوگۆکانماندا، باسی عەبدوڵڵا ئۆجەلان کرا؛ منیش گوتم خۆیانم نەبینیووە. ئومێدیش وەڵامی دامەوە "ناسینی ئەو کەسە گرینگە". پاشان بەو شێوەیە درێژەی دایێ "ئۆجەلان بە تەنیا دێت و لەوسەری کورسیەکەوە دادەنیشێ". مەبەستی ئومێد ئەو شوێنە بوو کە عەبدوڵڵا ئۆجەلان لە کتێبفرۆشی بارش دوای سەردانیکردنی لێی دادەنیشت.

لە کۆتاییەکانی ساڵی ۱۹۷۰، باڵەخانەیەکی ناوچەی باخچەلی ئێڤلەرم بیردێتەوە. لەوێ ئەحمەد تورك و ئەحمەد عارف، لە دوو ماڵی جیاواز دەرگایان بەرامبەر یەکدی بوو. دواتر کاك ئەحمەد

عارف ماڵەکەی بۆ ناوچەی چانکایا گواستەوە. لەگەڵ کاك ئومێد چەند جارێك لە ماڵەکەی خۆی سەردانمان کرد. ئەحمەد عارف چەند جارێك لە کتێب فرۆشی بارش و ڕەمزی، پەرتووکی (لە حەسرەتی تۆ، زنجیری پێبەندم دارزان)ی چاپ کردبۆوە. بە واژووی خۆشی چەند جارێك، چەند چاپێکی جیای ئەو پەرتووکەی پێ بەخشی بووین.

ئەوسا زۆر بێ پارە بووم. بەڵام کاك ئومێد، گۆڤارە هەفتانە و مانگانەکانی، لەگەڵ چەندان پەرتووك بێ بەرامبەر پێدەدام. جا کاك ئومێد هاوکاری وەشانخانەی کۆمەڵیشی دەکرد. منیش ئەو پەرتووکانەی خۆم، کە لە وەشانخانەی کۆمەڵ دەردەچوو، بە واژووی خۆم دەدا کاك ئەحمەد. بیرمە هەردوو پەرتووکی (پەیڕە و پرۆگرامی پارتی گەلی کۆماری ۱۹۲۷ – کێشەی کورد) بە واژووی خۆم دا ئەحمەد عارف. هێشتا لە خەیاڵمە، ئەوسا، کاك ئەحمەد داوای لێکردم دانەیەکیش لە پەرتووکەکانم بۆ لەیلا ئەربیل[1] واژوو بکەم. منیش داواکاریەکەم بۆ جێبەجێکرد و ئەویش بۆی برد.

یەکێك لە بوویەرە گرنگەکانی ئەوێ دەمێ، بەشداری کردنی

[1] لەیلا ئەربیل (۱۹۳۱-۲۰۱۳) نووسەرێکی دیاری تورکیابوو. ئەحمەد عارف و لەیلا ئەربیل، لەگەڵ ئەوەی یەکدیان باش دەناسی، بەڵام ئەحمەد عارف ئەڤینێکی تاك لایەنەی ئاشکرای بۆ لەیلا هەبوو. ئەم عەشقە بووە هەوێنی نووسینی چەندان بەرهەمی ئەدەبی، لەناویشیاندا سەرچاوەی ناردنی دەیان مەکتووبی دڵداری بوون بۆ لەیلا ئەربیل. (وەرگێڕ).

ئومێد فورات بوو لە جەژنی کرێکارانی ساڵی ١٩٧٧. جا بۆیە ئەو بە چاوەکانی خۆی، کۆمەڵکوژی (هەورازی کازانجی)[1] بینیی بوو.

تا شتێکی دیکە نەهێنمە زمان، نامەوێ لێرەوە تێپەڕم. برادەرێکی زۆر نزیکم لە کافتریایەکی تایبەت، لە دیدارێکماندا گوتی "بێشکچی تۆ زۆر باس لە کورد و کوردستان و زمانی کوردی دەکەی، زۆر پێداگری لەسەر ئەوە دەکەیەوە، دەبێ کورد بە کوردی بدوێ، هەروەها زۆر باسی عەشیرەت و شێخەکانیشیان دەکەی، بەڵام ئەمانە مژار و بابەتی گرنگ نین؛ بەڵکوو قسەکردن لەسەر سۆسیالیزم و خەبات کردن لەو پێناوەدا زۆر گرنگترە. چونکە کاتێك سۆسیالیزم کەوتە سەر پێی خۆی، ئەو مژارانەی تۆ باسیان دەکەی، بۆخۆی چارەسەر دەبێت. لە کاتێکدا شێخایەتی و ئاغایەتی و ئەو چەمکانە، دەرخەری دواکەوتووین، بۆیە لێیانەوە مەدوێ. بەڵکوو نووسین و پەرتووکەکانت با دەربارەی لینین و مارکس و ستالین بێت. جا لە پەرتووکەکانی ئەوانەوە نووسین و بیرۆکە بخەرە ناو نووسینەکانتەوە". ئەو بۆچوونەی ئەو برادەرەمان

---

[1] لە رۆژی جەژنی کرێکارانی ساڵی ١٩٧٧ نزیکەی ٥٠٠ هەزار کەس لە هەر چوار لای تورکیاوە هاتنە مەیدانی تەقسیم لە ئیستانبوڵ، بۆ پیرۆزکردنی ئەو رۆژە. بەڵام لە کۆتایی رۆژەکەدا لەلایەن چەندان کەسی نەناسراوەوە دەستڕێژی گولە لە بەشداربوان کرا، ئەمەش بووە هۆی دروستبوونی پەشێویی و ئاڵۆزیەکی زۆری خەڵکەکە. لە ئەنجامدا نزیکەی ٣٤ کەس گیانیان لەدەستدا و ١٣٦ کەسیش بریندار بوون. (وەرگێڕ).

گوتی، بە بێ هیچ کێماسییەك بۆچوونی چەپی تورکی تورکیایە.

با ئەوەشم لەسەر کاك ئومێد بیر نەچێت، کە ئەو لە ماڵەکەی خۆی لە نهۆمی سەرەوەی ئەو باڵەخانەیەی لێی دەماوە، چەندان کەوی هەبوو، چونکە زۆر خۆشی لێیان دەهات و بەردەوام بەخێوی دەکردن.

لە بیست و پێنجەمین ڕۆژی مانگی پێنجی ساڵی ١٩٨٧، کاتێك لە زیندانی عەنتابی تایبەت ئازادکرام، لەبەر دەرگا، هەریەکە لە پارێزەر سەرحاد بوجاك و ئومێد فورات و چەند برادەرێکی دیکە لە پێشوازیمدا بوون، ئومێد بەر لە من لە زیندان دەرچووبوو. لە ئەنقەرە لە ڕۆژنامەی (یەنی ئولکە) کاری دەکرد. کە دەرچووم دەمێك بوو دایکم کۆچی دوایی کردبوو، بەڵام ئەو ڕۆژە هەواڵەکەیان بە من ڕاگەیاند. بۆیە لاپەڕەی یەکەمی ژمارەی ئەو هەفتەیەی ڕۆژنامەی (یەنی ئولکە)یان کردە وێنەیەکی من.

کاك ئومێد زۆر چاکە و پیاوەتی، ماددی و مەعنەوی لەسەر من هەیە. لە زۆر شوێن و کات و دەمی جیاواز هاوکار و پاڵپشتم بووە. چاکە و دۆستایەتی لەبیر ناکەم.

## نازیف کالەلی: "دەسەڵاتی پڕۆلیتاریا نزیک دەبێتەوە"

لە سەردەمی ڕژێمی دوازدەی ئازار، کاتێک لە دادگای سەربازی دۆخی لەناکاوی دیاربەکر دادگایی دەکرام، نامەکان، بە بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگر دەژمێردران. لەناو دۆسیەی دادگایی کردنەکەمدا، سەرجەم ئەو نامانەی بۆم هاتبوون، لەگەڵ ئەوانەی من ناردبووم، یەکە و وێنەیەکیان لەبەر گیرابۆوە و لەبەردەستی دەستەی دادوەران داندرابوو.

یەکێک لەو ڕۆژانەی دانیشتنی دادگام هەبوو، دادوەر مەکتووبێکی خۆمی پیشان دام و لێی پرسیم "ئایا تۆ ئەو نامەیەت نووسیوە؟" منیش بە بەڵی بەرسڤم داوە. دواتر پرسی "ئایا ئەو کەسە دەناسی کەئەو نامەی بۆ ناردووی؟" من وەڵامی ئەویشم بە بەڵێ داوە. ئیدی دانیشتنی ئەوێ ڕۆژێی دادگا لەسەر ئەو نامانە بوو و هیچی دیکە.

کاتێك دانیشتنەکە تەواو بوو، منیان خستە ناو قەفەسی ئاسنینی دادگا. کەمێک دواتریش سەرباز، منیان دەبردەوە گرتووخانە. کاتێك لەوێ لە چاوەڕوانیدا بووم، دەرگای هۆڵەکەی بەرامبەرم کرایەوە. بینیم، خوالێخۆشبوو نازیف کالەلی لە هۆڵی دادگا دەهێندرا دەرەوە. لەگەڵ چەند کەسێك بەرەو دەرگای دەرچوون دەرۆیشت. منیش ئاگاداری ئەوە بووم، کە کاك نازیف بەبێ گرتن، دۆسیەیەکی دادگاییکردنی لەسەرە.

دادگای سەربازی دۆخی لەناکاوی دیاربەکر، لە ڕۆژەکانی

سەرەتای دەسەڵاتداریەتی ڕژێمی دوازدەی ئازار دامەزرێندرا. بە هۆی زۆربوون و کەڵەکەبوونی دۆسیەکانی دادگایی کردنیش، بڕیاری کرانەوەی دادگایەکی دیکەش درا. داواکەی کاك نازیف، لەو دادگایە تازەیە بەڕێوە دەچوو.

کاك نازیف کاتێك چاوی بە من کەوت، بەر لەوەی زیاتر لێم دوور بکەوێتەوە، هاتە لام و دەستی خستە سەر ئاسنەکانی قەفەسەکە. لە کاتێکدا ئەو جۆرە دیدارانە قەدەغە بوو و سەرباز ڕێگایان پێ نەدەدا. وەلێ ئەو لەبەر ئەوەی بەندکراو نەبوو، بۆیە بە ئاسانی خۆی گەیاندە من و بە کەلەجان و حەماسێکەوە گوتی "لە دانیشتنی دادگا، ئەو نامانەیان پیشان دام کە بۆتۆم ناردبوو. منیش بۆم باسکردوون، کە ئەو نامانە هی من نییە و من نەمنووسیوە و ئیسماعیل بێشکچیش ناناسم". من بەو قسەیە حەپەسام، چونکە تۆزێك بەر لە ئێستا، ئەو نامانەی کە باسم کردن دادگا لێیان پرسی بووم هی کێیە، لە ڕاستیدا نامەکانی نازیف کالەلی بوون. لێشیان پرسی بووم، ئاخۆ دەیناسم یان نا؟ منش وەڵامم دابوونەوە کە دەیناسم و خوێندکاری بەشی کۆمەڵناسییە.

ئەو دوو ئیفادە جیاوازەی دوو کەسی جیاواز لە دوو دادگای جیا، منی زۆر بەخۆیەوە سەغلەت کرد. چونکە بەو هۆیەوە ئەگەری ئەوە هەبوو نازیف تووشی سزایەکی قورس ببێت. چەند ڕۆژێك دواتر، ئەو مژارەم لەگەڵ پارێزەرەکانم ڕاڤە کرد و شەن و کەوی باسەکەمان کرد. مێشکم بەوەوە مژوول کرد، ئاخۆ چۆن دەتوانین ئەو دوو ئیفادە جیاوازە، لەسەر نامەیەکی هاوبەش، یەك

بخەین و لەگەڵ یەك بیگونجێن. یەکێك لە پارێزەرەکانم گوتی "دەشێ بڵێین، پۆلەکەمان زۆر قەرەباڵغە و نازیف کالەلیم لەگەڵ خوێندکارێکی دیکە لێ تێکەڵ بووە، ئەگینا من نازیف ناناسم".

ئیدی ئەوەی بە نیاز بووین بیکەین، بۆ یەکخستنی ئیفادەکان، سەری نەگرت، دادگاش بڕیاری بەندکردنی بۆ من و نازیف دەرکرد و هەردووکمان سزادراین؛ بەڵام بڕیاری دادگا هۆکاری سزادانەکەی بۆ جیاوازی ئیفادەکانی ئێمە و ناوەڕۆکی مەکتووبەکان نەگەڕاندبۆوە.

بە دڵنیاییەوە نازیفم زۆر لە نزیکەوە دەناسی. دوای ئەوەی زانکۆی تەواو کرد، وەکوو مامۆستا لە ئامادەییەکی ناوچەی تاتوان دامەزرا. هەروەها لە نێوان سالآنی ١٩٦٩-١٩٧٠ نازیف زۆر نامەی ڕادیکاڵی بۆ من دەنووسی. لەوێ باسی لەوە دەکرد "دەسەڵاتی پرۆلیتاریا نزیکە و با بورژوازیەت هۆشی بێتەوە سەرەخۆ" یان "دەنگی قاچی پرۆلیتاریا دەگاتە بەر گوێمان و با بورژوازیەکانیش ببیستن". منیش کاتێك ئەو نامانەم دەخوێندەوە، زار بەش دەبووم، ئاخۆ نازیف لە تاتوانەوە چۆن گوێی لە دەنگی قاچی پرۆلیتاریا دەبێ!

## پارێزەر شەرەفەدین کایا "لەسەرم مەدەن، ڕۆژێک دێت، پێویستتان پێی دەبێت!"

لە سەردەمی ڕژێمی دوازدەی ئازار، لە دادگا سەربازیەکانی دۆخی لە ناکاوی شارەکانی دیاربەکر و سیرت، زۆر دانیشتنی دادگا، بۆ چەندان دۆسیە بەڕێوەچوو. لەو داوایانەدا، هەریەکە لە یوجەل ئۆنەن و شەرەفەدین کایا و یەحیا مەهمەت ئۆغڵوو و ئەشرەف ئینجەئۆغڵوو و فیکری یڵدزرخان و وەیسی زەیدان ئۆغڵوو و گوڵفەر تاشەر و ئەدیب ئاڵتنکار و ئەسەم میازی بوداك و تورگوت ئاکن و نیازی ئاغرناسلی و ئۆرهات عیزەت کۆك و شاکر کەچەلی و خەلیل ئیبراهیم ئەرسۆز و عەبدولڕەحمان ئالاّجا و چەندان پارێزەری دیکە، بەرگریان لە دۆسیەکانی ناو ئەو دانیشتنانە دەکرد. دواتر ڕوشەن ئارسلانیش هاتە ناو ئەو دەستە پارێزەرە. دوای ئەویش عەلی ئۆڕوچ، وەکوو پارێزەری سەندیکای مامۆستایانی تورکیا، بەرگری لە دۆسیەی مامۆستاکان دەکرد.

بەرگری کردن لە دۆسیەکانی دانیشتنی دادگا، بەشێوەی کۆمەڵ بۆ ئەو دۆسیە جیاوازانەی لەسەر یەك مزار دادگایی دەکران، لەلایەن ڕوشەن ئارسلانەوە سەرپەرشتی دەکرا. هەمووشیان بەیەکەوە کاریان بۆ ئامادەکردن و نووسینی بەرگرینامەکان دەکرد. وەلێ کاتێك ڕوشەن ئارسلان لەسەر دۆسیەی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی کولتووری ڕۆژهەلاّت، تۆمەتبار

کرا، ئیدی نەیتوانی وەکوو پارێزەر بەردەوامی بەکارەکانی بدات؛ بۆیە هەموو ئەرکەکە بە تەنیا کەوتە سەر ئەستۆی شەرەفەدین کایا.

شەرەفەدین کایا، لە یەك کاتدا، لە پاڵ ئەوەی پارێزەری چەندان تۆمەتباربوو، لەگەڵ ئەوەش پارێزەری دۆسیەکانی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی کولتووری ڕۆژهەڵات و پارتی دیموکراتی کوردستانی تورکیا و پارێزەری منیش بوو. جگە لەوەی پارێزەری بۆ ڕەجەب مارشاڵ و حوسێن مووسا ساغنج و خەلیل ئاغاش دەکرد. ڕووشەن ئارسلانیش، دوای ئەوەی ماوەی سەربازی تەواو کرد و لە تاقیکردنەوەی پارێزەری دەرچوو، لە پاڵ شەرەفەدین کایا دەستی بە کاری پارێزەری کرد.

شەرەفەدین کایا، چەندان ساڵ پارێزەری دۆسیەکانی من بوو، هیچ کاتێکیش کار و بەرگرینامەکانی دوانەدەخست. لە هەموو دانیشتنەکانی دادگا ئامادە دەبوو. وەك چۆن لە کارەکەی خۆی بۆ دۆسیەکانی دیکەش هەر وەها بوو.

لە دانیشتنەکانی دادگادا، بەرگرینامە زارەکیەکانی کاك شەرەفەدین زۆر بەهێز بوون. جا لە پاڵ ئەمە، بەرگرینامە نووسراوەکانیشی بەردەوام لەگەڵ خۆی دەگێڕا و دوای بەرگریکردنی زارەکی، بەرگرینامە نووسراوەکانیشی پێشکەشی دادگا دەکرد. دوای بڕیارەکانی دادگا، لە نزیکەوە چاودێری ڕاگەیاندراوەکانی دادگای باڵای دەکرد بۆ پێداچوونەوە بە بڕیارەکان. جگە لەمانە، لە نزیکەوە مژوولی چارەسەرکردنی کێشەی تۆمەتبارەکان دەبوو. هەموو هەوڵێکیشی دەدا تا ئاریشەکانیان بۆ دەرەتان بکات. بیرمە هەندێك کات، هەوڵی چارەسەرکردنی کێشەی ماڵباتی تۆمەتبارەکانیشی دەدا.

بە هۆی ئەوەی لە دانیشتنێکی دادگا سزام بەسەردا سەپێندرا، لە نـۆیەمین ڕۆژی مـانگی سـێی سـاڵی ١٩٧٣، لە گرتووخـانەی سەربازیەوە، گواسترامەوە زیندانی دیاربەکر. دوای چەند ڕۆژێك زانیاری ئەوەم پێگەیشت، هەریەکە لە شەرەفەدین کایا و ڕوشەن ئارسـلانیش، لەلایەن دادگـای سـەربازی دۆخـی لەناکـاو، بڕیـاری دەستگیرکردنیان بۆ دەرچووە. دادگا ئەو دوو پارێزەری بە تۆمەتی بەرگریکـردن لە دۆسـیەکانی مەهـمەت سـیراچ و خەلیـل ئاغـا دەسـتگیرکرد. وەلـێ دیـار بـوو، هۆکـاری دەرکردنـی بڕیـاری دەسـتگیرکردنیان، بـۆ ئەو ڕق و قینەی دادگـا دەگەڕاوە، بەرامبەر ئەو بەرگرینامە بەهێزانەی لە دانیشتنەکان دەیانکرد.

دەمزانـی هۆکـاری دەرکردنـی ئەو بڕیـارە دادگـا بەرامـبەر شەرەفەدین کایا، تەنیا بۆ ئەو بەرگرینامە بەهێزانە دەگەڕاوە کە لە دۆسیەکانی ئێمەی دەکـرد، چونکە بەرگرینـامە زارەکیەکـانی ئەو پـارێزەرە بـۆ دۆسـیەی کـۆمەڵەی شۆڕشـگێڕی کولتـووری ڕۆژهەلأت و دۆسـیەی مـن و ڕەجەب مارشـاڵی، دەسـتەی دادوەرانـی خسـتبووە دۆخێکـی نـاهەموار و هـیچ بەهـانەیەکی پـێ نەهێشتبوون، بۆ تاوانبارکردنمان.

لە ڕۆژانـی دوو و سـێی مـانگی دووی ١٩٧٢، دانیشـتنەکانی دادگایی کردنم تایبەت بوو بە گوێگرتنی دادگا لە (گەواهیدەر-زمانلێـدەرە) پرۆفیسـۆر و سـەرۆکی زانکـۆ و ڕاگـری کـۆلێژی زانکۆکەم دژ بە من. دوای ئیفادەکانی ئەوان، شەرەفەدین کایا بە جیا، لەسەر چەند مژارێك پرسیاری لە هەریەکێك لەوان کرد، بێ وەڵامـی ئەوانیش، دەسـتی دادوەر و داواکـاری گشـتی بەرامبەرم لاواز و بێ بەڵگەکرد.

هەرچۆنێـك بێـت، شـەرەفەدین کایـا و ڕوشـەن ئارسـلان، دەستگیرکران و نزیکەی سێ مانگ لە زیندانی دۆخی لەناکاو مانەوە. دوای دەرچوونیشیان، هەمدیسان دەستیان بەکار و پیشەی خۆیان و پاریزەری و بەرگری کردن کردەوە.

لە نێـوان سـالانی ١٩٧٣-١٩٧٤ ئەوکـاتەی لە زینـدانی ئەدەنە بـووم، شـەرەفەدین کایـا، وەکـوو پـارێزەر، چەنـد جارێـك هـاتە دیدەنی من و خەلیل ئاغا.

سـاڵی ١٩٧٤، بەبـۆنەی ٥٠ سـاڵ تێپەڕین بەسـەر دامەزرانـدنی کۆمـاری تورکیـا، لێبـووردنێکی گشـتی دەرکـرا. کـوردیش لەو لێبـووردنە گشـتییە سـودمەند بـوون. ئیـدی دوای ئەو قۆنـاغەش، پەیوەنـدییەکانمان لەگەڵ کـاك شـەرەفەدین و ڕۆشـەن ئارسـلان لە وەشانخانەی کۆمەڵ و گۆڤاری ڕزگاری درێژە پێدا.

لە پـازدەمین ڕۆژی مـانگی دووی سـاڵی ١٩٧٥، میتینگێـك لە شـاری مـوش سـازکرا. لەوێ شـەرەفەدین کایـاش یەکێـك بـوو لە بەشـداربوان. لە میتینـگەکە، کۆمەڵێـك کەسـی نەناسـراو، کە دواتـر ڕوون بـۆوە لەلایەن پارێزگـاوە هانـدرابوون بـۆ ئەو کـارە، لەنـاو میتینـگەکە هێرشـیان کردبووە سـەر شـەرەفەدین کایا و برینـداریان کـرد. لە کـاتی لێـدانەکەدا، کـاك شـەرەفەدین کاتێـك هەوڵـی پاراسـتنی سـەر و کەلەی خـۆی دەدا، بە هێرشـبەرەکانی گوتبـو "لەسەرم مەدەن، چونکە ڕۆژێك ئێوەش پێویستیتان پێی دەبێت".

## پارێزەر سەرحەد بوجاك

یەکەم جار لە زینندانی سەربازی دۆخی لە ناکاوی دیاربەکر ناسیم. ئەوسا، سەرحەد وەکوو (موتەبیق – ستاژیەر) لای پارێزەر محەمەد عەلی ئاسلان، لە ئیدر کاری دەکرد. ئەوەی ڕاستی بێت، کاتێك خوێندکاریش بوو، چەند جارێکم چاو پێ کەوتبوو. وەلێ دانیشتن و ئاخافتن لە نێوانمان چێ نەببوو. ئەوسا قوتابی کۆلێژی یاسا بوو لە ئیستانبووڵ.

ڕووناکبیری پایەبەرزی کورد، فایەق بوجاك[1] لە چوارەمین ڕۆژی مانگی حەفتی ساڵی ١٩٦٦، شەهید کرا. سەرحەد ڕۆژی شەهیدکردنی باوکی، لەناو ترومبێل لە تەك ئەو دانیشتووە. لە کوشینی دواوەش، سەرتاچی برا بچووکی و مندالە مامەکانی دانیشتوون. دوای ئەوەی بە فیشەك لێی دەدەن، فایەق بوجاك سەری دەکەوێتە ناو کۆشی سەرحەدی کوڕی.

لە مانگی سێی ساڵی ١٩٧٣، سزاکەمان یەکلایی کراوە. دوای ئەویش، لەگەڵ خەلیل ئاغا، سەرەتا ئێمەیان گواستەوە زیندانی دیاربەکر، لەوێشەوە ئێمەیان بردە گرتووخانەی ئەدەنە. سەر بوجاك، وەکوو پارێزەرمان، لە هەردوو بەندیخانەدا سەری لێمان نەبڕی.

---

[1] فایەق بوجاك (١٩١٩-١٩٦٦) دامەزرێنەر و سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستانی تورکیا. بوجاك لە سیڤەرەکی باکووری کوردستان لە دایك بووە، وەلێ بە دەستێکی نادیار و ڕەش ، ئەو سیاسەتمەدارە کورده دەکوژرێ. (وەرگێڕ).

لە ساڵانی ١٩٧٨، ١٩٧٩، ١٩٨٠، چەند داوایەکی یاساییم لە دادگای ڕاگەیاندنی سزایی ئیستانبووڵ لەسەر کرابوو. لەو داوایانەشدا، سەرحەد بوجاك و عەلی یلماز باڵکاش پارێزەری دۆسیەکانمیان کرد. جا لەناو ئەو داوایانە، یەکێکیان بە سزادان کۆتایی پێهات و خرامە زیندانی تۆپتاشی لە ئیستانبووڵ. لەوێ دەمێشدا، سەرحەد بوجاك وەکوو پارێزەر بەردەوام دەهاتە گرتووخانە بۆ سەردانم. جگە لە من، پارێزەری بۆ چەندین دۆسیەی کەد خوراوی کوردیش دەکرد، کە لە قاوش لەگەڵ من زیندان بوون.

سەرحەد بوجاك لە زۆر دۆسیە و دادگایی کردنمدا وەکوو پارێزەر لەگەڵم بووە و بەرگری لە دۆسیەکانم کردووە. پەیوەندیشمان بێ پچڕان بەردەوام بوو. ئیدی ئەوەندە بەیەکەوە بووین، ناسیاوەتیم لەگەڵ ماڵ و منداڵەکەشی پەیدا کردبوو. تا ساڵی ١٩٩٢ چووە ئەڵمانیا. ٢٢ ساڵ دوای ئەو کۆچەی، لە ساڵی ٢٠١٤ لەگەڵ شەڕەفەدین کایا گەڕاوە تورکیا. ساڵێکیش دوای گەڕانەوەی، بۆ هەڵبژاردنەکانی حەفتی حوزەیرانی ٢٠١٥ پەرلەمانی تورکیا، لەلایەن پارتی دیموکراتی گەلان، هەدەپەوە، لە شاری ڕوها وەکوو بەربژێری بەربژێر دیاریکرا، بەڵام دواتر نەبووە بەربژێری ئەو پارتە بۆ پەرلەمان. بیرمە ساڵی ١٩٩١، وەکوو پاڵێوراوی پاڵێورێو لەلایەن پارتی (هەپ)وە هەڵبژێردرابوو. لەوێ توانی ببێتە بەربژێر، بەڵام نەیتوانی بچێتە پەرلەمان.

***

سەرحەد بوجاك، لە چوارەمین ڕۆژی مانگی تەباخی ساڵی

٢٠١٩، لەگەڵ ڕۆژنامەنووس کامیل سومبول، سەردانی گۆڕستانی سیویڕەگ دەکەن. قەبرستانەکە بە شوێنێکی مێژووی گرنگ دادەنێت و لەوبارەیەوە دەڵێ "ئایا هیچ گۆڕستانێکی دیکەی لەو چەشنە هەیە کە تێیدا بە سەدان ڕووناکبیر و کەڵەپیاوی دیاری حەفتا ساڵی ڕابردووی کوردی لێ خەوتبێ؟ لێرە لە هەرچوارلای ئەم گۆڕستانەوە، بۆنی گەورە پیاوانی کورد دێ". پاشان سەرحەد بوجاك لەوێ بە جیا سەر لە گۆڕی هەریەك لە کازم کەرەهان و عەلی کەرەهان و ڕەمزی بوجاك[١] و فایەق بوجاك و نەجاتی سیاهکان و فەرید ئوزون و نەجمەدین بویوك کایا و جەمیلە بویوك کایا و ئەکرەم کەرەهان و چەندان کەسایەتی دیکە دەدات. لەسەر گۆڕی هەر یەکێکیشیان وتارێکی درێژ دەدا. پێم وابێ بۆچوون و فەلسەفەی ژیانی سەرحەد بوجاك بۆ دنیا لە وتاری سەر گۆڕەکانی ئەو گۆڕستانە بە ئاسانی دەبیندرێت.

لە حەفتەمین ڕۆژی مانگی دوازدەی ساڵی ٢٠١٤، لە سیویڕەگ کۆڕبەندێك هەبوو. ئێمەش چووین و بەشداریمان کرد و دواتریش سەردانی گۆڕستانی سیویڕەگمان کرد. ئەوێ ڕۆژێ، مەلا بەختیاریش لە باشووری کوردستانەوە هاتبوو بۆ بەشداری کردن لە کۆڕبەندەکە؛ دواتریش بەیەکەوە چووینە گۆڕستان.

---

[١] مستەفا رەمزی بوجاك (١٩١٢-١٩٨٥) نووسەر و پارێزەر و سیاسەتمەدارێکی کوردە. کوڕی محەمەد تەوفیق ئەفەندییە. رەمزی بوجاك لە نێوان ساڵانی (١٩٥٠-١٩٥٤) ئەندامی پەرلەمانی تورکیا بووە لەسەر شاری دیاربەکر. (وەرگێڕ).

## باهیجە بۆران، یەکەم کەسی قبووڵنەکراو، لەلایەن زانکۆکانی تورکیا

ساڵانی چلی سەدەی ڕابردوو، بەشێك لە مامۆستایانی کۆلێژی ئەدەبیات، هەوڵی کرانەوەیەکی ڕێژەیی هزرییان دەدا لە بۆچوونی تورانیدا[1]. لەگەڵ ئەوەی ئەوانیش، لە ژێر کاریگەری بۆچوونی فەرمی و هزری دەوڵەتدابوون، لە ڕوانینیان بۆ کێشە بنچینەیەکانی وەکوو پرسی کورد و کوردستان و ئەرمەن و عەلەویەکان. بە بێ دوودڵیش، لەو بارەیەوە خۆیان نەبان و کەڕ و کوێر دەکرد. بەڵام هەوڵێکی دیار دەبیندرا لە گۆڕینی بیرۆکەی تورکایەتی بۆ هزری چەپگەری.

ئەوسا چەند ئەکادیمیسەنێکی وەکوو باهیجە بۆران (١٩١٠-١٩٨٧) و نیازی بەرکەس (١٩٠٨-١٩٨٨) و مەدیحە بەرکەس و پەرتەڤ نایلی بۆراتاڤ (١٩٠٧-١٩٩٨) و مزەفەر شەریف باش ئۆغڵوو (١٩٠٦-١٩٨٨) دوو گۆڤاری مانگانەیان بە ناوەکانی (یورت-دنیا) بڵاودەکردەوە. سەرنووسەری گۆڤارەکانیش باهیجە بۆران بوو. ئەو دوو گۆڤارە لە نێوان ساڵانی (١٩٤١-١٩٤٤)

---

[1] تووورانیزم یان پان تووورانیزم بزووتنەوەیەکی کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای سەدەی بیستەمە بۆ یەکخستنی بزوتنەوەی سیاسی و جوڵانەوەی نەتەوەکانی تورک، تەتەر، ئۆرالیک و خەڵکانی تر کە لە تورکیای ئێستا دەژین. وشەکە خۆی لە فارسییەوە هاتووە، توران بە واتای تورکستان یان وڵاتی تورکان دێت. یەکێك لەو ناوە دیارانەی سەرکردایەتی ئەو هزرەی کردووە و بە داڕێژەری بناغەی تورانییەت دادەنرێ، زیا گۆك ئالپی کوردە. پایەی سەرەکی بیرۆکەکە بریتییە لە سەردەستە بوونی گەلی تورك بەسەر گەلانی دیکەی جیهان و ڕەپ کردنی هەستی دەمارگیری نەتەوەیی (وەرگێڕ).

نزیکەی ٤٢ ژمارەی لێ بڵاوکراوە و لە ساڵی ١٩٤٤ داخرا.

هەمان ئەو کەسانەی لەو دوو گۆڤارەی سەرەوە کاریان دەکرد، لە ساڵی ١٩٤٣، گۆڤارێکی دیکەی مانگانەیان بە ناوی (ئادملار) بڵاوکردەوە. دوای بڵاوکردنەوەی ١٢ ژمارە، لە ساڵی ١٩٤٤، ئەویش داخرا.

باهیجە بۆران، لە دەوروبەری شاری مانیسا، لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانی گرنگی هێنابووە بەرهەم، بەناوی (توێژینەوەی ژێرخانی کۆمەڵایەتی - وردبوونەوە لە بەراوردکردنی دوو لادێی جیا). ئەو پەرتووکە لەگەڵ ئەوەی چاپیش کرا، بەڵام بڵاو نەکراوە و لە کۆگای کۆلێژی ئەدەبیات هەڵگیرا.

بەرواریچوارەم ڕۆژی کۆتا مانگی ساڵی ١٩٤٥ ڕۆژێکی گرنگە لە مێژووی چەپی تورکیدا. لەو ڕۆژەدا، کۆمەڵێك کەسی نەناسراو هێرشیان کردە سەر چاپخانەی تان و سەرجەم ئەرشیف و ئامێر و کەلوپەلەکانی ئەوێیان کەرت و پارچە کرد و هەموویان بێ کەڵك کرد. ئەو چاپخانەیە ڕۆژنامەی (تان) و گۆڤاری (گۆروشلەر)یان چاپ و بڵاو دەکردەوە. ئەو دوو بڵاوکراوەیەش، لەلایەن سەبیحە سەرتەل (١٨٩٥-١٩٦٨) و زەکەریا سەرتەل (١٨٩٠-١٩٨٠) سەرپەرشتی دەکرا. دوای ئەو ڕووداوە، عەزیز نەسین (١٩١٥-١٩٩٥) لەو بارەیەوە وتارێکی نووسی و ئەوسا ئەو نووسینە بووە ڕۆژەڤی تورکیا. لێرەوە دەمەوێ بەشێك لەو وتارەتان بۆ بنووسمەوە: "ئەی نەژادپەرستانی تورك! یەکەم ئەرکتان بریتییە لە سووتاندنی چاپخانەی تورکی و پارچەپارچەکردن و خوردکردنەوەیی و بەراست و چەپ دادانی... ئەگەر پێویستتان بە

تەور و قازمە هەیە، لە کۆگای پارتی گەلی (هالك پارتیسی) چەندی بتانەوێت بەردەستە".

باهیجە بۆران و برادەرانی، لە دوای داخستنی بڵاوکراوەکانی (یورت، دنیا، ئادملار) دەستیان بە بڵاوکردنەوەی گۆڤاری (گۆروشلار) کرد. بەڵام یەکەم ژمارەی، بەر لەوەی بڵاوببێتەوە، ئەوکاتەی لە ژێر چاپ بوو، بە هۆی هێرشی سەر چاپخانەکە، ڕووناکی نەبینی.

لە دوای ئەو ڕووداوە، کاردانەوەیەکی چڕ و فراوان لە ناوەندەکانی میدیا و زانکۆ، بە تایبەتیش لە کۆلێژی ئەدەبیات دژی ئەو مامۆستایانە دەستی پێکرد. ئەو دژایەتیکردنەش ئاشکرا بوو، کە لەلایەن دەوڵەت و حکوومەتەوە پشتگیری دەکرا و دنە دەدرا.

ئیدی کاردانەوەکان گەیشتنە ئاستێك، دەست بە هەوڵێکی چڕ و پڕ کرا، بۆ ئەوەی ئەو مامۆستایانە لە زانکۆ دەربکەن. بۆ ئەمەش ڕۆژانە زمانیان لێدەدرا و سکاڵایان لەسەر تۆمار دەکرا؛ ئەمەش وایکرد لەلایەن دادگاوە دۆسیەی یاساییان لەسەر بکرێتەوە و لێکۆڵینەوەیان لەبارەوە بکرێ. لەگەڵ ئەوان هەندێك لەو کەسایەتیانەی لەدەست هەڕەشەی نازیەکان، لە ئەڵمانیاوە هەڵاتبوون و لە تورکیا ببوونە پەنابەر و هەندێك لەوانە لە کۆلێژی ئەدەبیات ببوونە مامۆستا، ئەوانیش بە تۆمەتی (چەپ و کۆمۆنیستی) زمانیان لەو مامۆستایانەی تورکیا دابوو.

دەسەڵاتی تورکیا، وەك ئەوەی خواستی بوو، نەیتوانی دۆسیەی ئەو مامۆستایانە بگەیەنێتە ئەنجام. بەڵام ساڵی ١٩٤٨، لە بودجەی

گشتیدا، ناوی ئەو کەسایەتیانەی لە لیستی مووچەی مامۆستایانی زانکۆ دەرهێنا.

دوای ئەو هەنگاوەی سەرەوەی حکوومەتی تورکیا، نیازی بەرکەس چووە کەنەدا و پەرتەڤ نایلی بۆراتاڤیش بەرەو فەرەنسا کۆچی کرد. زۆر دواتریش مزەفەر شەریف باش ئۆغلوو تورکیای جێهێشت و چووە ئەمریکا و جارێکی دیکە نەگەڕاوە. باهیجە بۆران و نەوزاد هاتکۆش لە تورکیا مانەوە.

ساڵی ١٩٤٨، جگە لەو مامۆستایانەی لەسەرەوە باسم کرد، چەندان مامۆستای دیکەی زانکۆ، لە بەشە جیاکاندا، لە کارەکانیان دوورخرانەوە. بۆ نموونە هەریەك لە ئازرا ئەرهات (١٩١٥-١٩٨٢) و ئۆرهان بوریان (١٩١٤-١٩٥٣) و عەدنان جەمگیل (١٩٠٩-٢٠٠١) لەناو لیستی دوورخراوەکان بوون.

ئەو مامۆستایانەی لەسەرەوە ناوم هێنان، کە بە هۆی هەڕەشەکانی حکوومەتەوە لە زانکۆ دەرکران، ڕووبەڕووی کێشەی داهات بوونەوە بۆ بژێوی ژیانی ڕۆژانەیان. بۆ ئەو مەبەستە ئەو کۆمەڵە مامۆستایە بەیەکەوە، هەڵسان بە کردنەوەی چێشتخانەیەك لە ناوچەی (بەی ئۆغلوو) لە ئیستانبووڵ. ئەوان هەر خۆیان کەلوپەلی چێشتخانەکەیان کڕی و خۆیان خواردنەکانیان دروست دەکرد و خۆشیان خزمەتی کڕیارەکانیان دەکرد. بەڵام لەوێش دەزگا هەواڵگریەکان بەدوایانەوە بوون و ڕێگایان نەدا کارەکەیان سەرکەوتوو بێت. دوای ئەو کارە هەمان کۆمەڵ، هەڵسان بە کردنەوەی نووسینگەیەکی وەرگێڕان.

دواتر هەریەکە لە باهیجە بۆران و عەدنان جەمگیل و

وەحدەدین باروت و عوسمان فوئاد تۆپراك ئۆغلوو و ڕەشاد سەڤینچ سۆی و نەوزاد کەمال ئۆزمەریچ و موڤەکەر گوران (کۆمەڵەی ئاشتیخوازانی تورك)یان لە ساڵی ١٩٥٠ دامەزراند. باهیجە بۆرانیش بە سەرۆکی کۆمەڵەکە هەڵبژێردرا.

ئامانجی دامەزراندنی کۆمەڵەکە، بریتی بوو لە هەوڵێك بۆ تواندنەوەی بەستەڵەکی سیاسیی ئەمریکا و یەکێتی سۆڤیەت و نەهێشتنی مەترسیەکانی بەکارهێنانی چەکی ئەتۆمی لە جیهان و بەرقەرارکردنی ئاشتی و سەرکۆنەکردنی جەنگە جیهانیەکان.

ئەو مانگەی ئەو کۆمەڵەیەی لێ دامەزرا، حکوومەت لە بیست و پێنجی مانگی حەفت، بڕیاری ناردنی سەربازانی سوپای تورکیای دا بۆ کۆریا. بۆ پرۆتێستۆکردن و دەربڕینی ناڕەزایەتی دژی ئەو بڕیارە، کۆمەڵەکە تەلەگرافێکی ناڕەزایەتی بۆ پەرلەمانی تورکیا نارد و دواتر ئاگادارییەکیان بڵاوکردەوە و لە ئیستانبووڵیش دژی بڕیارەکە ڕژانە شەقامەکانی ئەو شارە.

لەناو ئەو کەسانەی ئاگاداریەکانیان بە کوچە و کۆڵانەکاندا بڵاودەکردەوە، باهیجە بۆران دەستگیرکرا و لە دادگای سەربازی دۆسیەی لەسەر کراوە. دواتر لەلایەن دادگاوە بە تۆمەتی (زیان گەیاندن بە بەرژەوەندی نەتەوەیی و هەوڵی تێکدانی بەرخودانی نیشتیمانی) سزای پازدە مانگ زیندانی کردنی بەسەردا سەپێندرا و لە زانکۆ دەرکرا و ناونیشانی پرۆفیسۆریشی لێ وەرگیراوە. باهیجە بۆران لە بەندیخانە (دوورسوون)ی کوڕی هێنا دنیا.

پارتی کرێکارانی تورکیا، لە سێزدەمین ڕۆژی مانگی دووی

ساڵی ١٩٦١ لەلایەن چەند سەندیکایەکی جیاوازی تورکیاوە دامەزرێندرا. ساڵێك دوای دامەزراندنیان، بانگهێشت و داوەتی ڕۆشنبیران و ڕووناکبیرانیان کرد بۆ ناو پارتەکە. ئەوسا هەریەکە لە محەمەد ئایبار (١٩٠٨-١٩٥٥) و باهیجە بۆران و سەعدوون ئارەن (١٩٢٢-٢٠٠٨) لەسەر ئەو داوەتنامەیە چوونە ناو ڕیزەکانی پارتی کرێکارانی تورکیا.

***

لە نێوان ساڵانی ١٩٦٩-١٩٧٠ لە زانکۆی ئەتاتورك، لە شاری ئەرزڕووم کارم دەکرد. بیرمە بۆ بەشداری کردن لە کۆبوونەوەیەك، چووبوومە ئەنقەرە. ئەوکاتەی لەوێ بووم، مامۆستایەکی یاریدەدەری دۆستم لە کۆلێژی ئەدەبیات، بە کەلەجانەوە پێی گوتم "ئیسماعیل شتێکت پێدەدەم. بەڵام لای کەس باسی مەکە..." پاشان لەناو زەرفێك، پەرتووکێکی پێدام. دواتر کە کردمەوە، بینیم کتێبی (توێژینەوەی ژێرخانی کۆمەڵایەتی: وردبوونەوە لە بەراوردکردنی دوو لادێی جیا) باهیجە بۆرانە. ئەو پەرتووکەی دوای چاپکردنی بڵاو نەکراوە. دۆزینەوەی کتێبەکە بۆ من شتێکی زۆر چاوەڕوان نەکراو بوو؛ بۆیە بە بینینی زۆر دڵخۆش بووم.

دواتر ئەو برادەرەم، باسی لەوە کرد، چۆن چۆنی چووەتە ناو کۆگاکە و چۆن توانیویەتی چەند پەرتووکێك لەوێوە دەربهێنێت. بۆیە جارێکی دیکەش ئاگاداری کردمەوە، تا ئەو باسە لای کەس نەدرکێنم.

ساڵی ١٩٦٧، لە سەردەمی میتینگەکانی ڕۆژهەڵات، لەگەڵ

محەمەد عەلی ئایبار و تارق زیا، لەگەڵ باهیجە بۆران بووین. ئەوسا لێکۆڵینەوەیەکم کردبوو، سەبارەت بە میتینگەکانی ڕۆژهەلآت. جگە لەوە، توێژینەوەیەکم لەسەر عەشیرەتیە کۆچەرییەکانی کوردیش کردبوو. کاتی خۆی، ئەو لێکۆڵینەوانەم، لە گۆڤاری (فۆرم) بلآوکرابوونەوە.

ئەو دوو لێکۆڵینەوەی سەرەوەم، لەگەڵ ئەوەی بە چەندان کێماسیەوە بلآوبیوونەوە، هاوکات لە ڕێگای پۆستەوەش، بۆ هەر یەکە لە محەمەد عەلی ئایبار و تارق زیا ئەکینجی و باهیجە بۆران و سەعدوون ئارەن و چەتین ئاڵتان و عادیل کوڕتەڵ و یەحیا کانبۆلآتی پەرلەمانتارانی پارتی کرێکارانی تورکیام ناردبوو. باهیجە بۆران، لە چاپی دووەمی پەرتووکەکەی بە ناوی (تورکیا و کێشەکانی سۆسیالیزم) باسی ئەو لێکۆڵینەوانەی کردبووم.

## سەردانی باهیجە بۆران

ڕۆژێکی پایزی ساڵی ١٩٦٨، بە حوسێن ئەرگونم گوت، دەمەوێ تا لەگەڵ باهیجە بۆران بە یەکدیمان بناسێنی و دەمەوێ قسەی لەگەڵ بکەم و لە نزیکەوە یەکدی ببینین. کاك حوسێن ئەوسا، سەرۆکی فراکسیۆنی یانە هزریەکان بوو. هەروەها چووبووە ناو پارتی کرێکارانی تورکیاش. دوای ئەوەی کاك حوسێن کاتێکی دیاری کرد، بەیەکەوە چووینە ماڵی باهیجە بۆران. ماڵەکەی باهیجە خانم لە نهۆمی دووەمی باڵەخانەیەکی غازی عوسمان پاشا بوو لە ئیستانبوڵ. کە لەدەرگاماندا، خۆی قاپیەکەی

کردەوە. کە یەکەمجار بینیم، بەروانکەی کارکردنی لەبەر بوو، بۆیە گوتی "خەریکی دروستکردنی دۆشاوم، ئێوە کەرەمکەن و لە ژووری دانیشتن ڕۆنیشن، منیش تۆزێکی دیکە دێمە لاتان".

لەگەڵ کاك حوسێن، لەسەر دوو کورسی ژوورەکە دانیشتین. دوای کەمتر لە خولەکێك، باهیجە خانیش هاتە لامان. کە لامان دانیشت پێی گوتین " دەتوانین نزیکەی ٥٥ خولەك دانیشین و قسە بکەین. دواتر دەبێ پانتۆڵەکانی نەوزاد ئوتوو بکەم. پاشتریش دەچمە پەرلەمان و لە کۆمسیۆن کۆبوونەوەم هەیە". لەوێ دەمێدا، باهیجە خانم، پەرلەمانتاری شاری ڕوها بوو. سەبارەت بە کار و کۆبوونەوەی کۆمسیۆنەکانی پەرلەمانیش گوتی "پارتی عەدالەت و حکوومەت، لەبەرچاوی گەل، زۆر بە خراپە باسی پارتی کرێکارانی تورکیا دەکەن و بە تۆمەتی جیا جیا، تۆمەتبارمان دەکەن. بەڵام لە کۆبوونەوەی کۆمسیۆنەکانی ناو پەرلەمان، زۆر بە وردی گوێمان لێدەگرن و سەرجەم پێشنیارەکانمان بە گرنگییەوە لێ وەردەگرن".

ئەوێ ڕۆژێ، لەسەر زۆر مژار دواین. لەسەر پرسی ئافرەتانیش ئاخفتین. باهیجە خانم لەوێ ئاماژەی بەوە کرد، لە یەکێتی سۆڤیەتیش تاوەکوو ئێستا کێشەی ئافرەت چارەسەر نەکراوە.

لە کۆنگرەی ساڵی ١٩٧٠، پارتی کرێکارانی تورکیا، لەسەر داوای کورد، سەبارەت بە گەلی کورد بڕیارێکیان دەرکرد. بە هۆی ئەو بڕیارەشەوە لە ڕژێمی دوازدەی ئازار، لە دادگای دەستووری تورکیا، دۆسیەی داخستنی پارتی کرێکارانی تورکیا کرایەوە. لەگەڵ ئەوەی لە دادگا، پارتی کرێکارانی تورکیا دژی

ئەو بڕیارە وەستایەوە، بەڵام سەرەڕای ئەوەش، پارتەکە بە بڕیاری دادگـا، داخـرا و سـەرجەم ئەنـدامانی ناوەنـدی بەڕێـوەبردنی دەسـتگیرکران، بە بـاهیجە بۆرانیشـەوە. دواتـر هەموویـان خـرانە زیندانەوە. پاشان جیا جیا سەرجەم دەستگیرکراوان دادگایی کران. باهیجە بۆرانیش دوای دادگایی کردنی لەلایەن دادگای سەربازی دۆخـی لەناکـاو، سـزای ١٥ سـاڵ زینـدانی قورسـی بەسـەردا سەپێندرا.

بـاهیجە بـۆران و هاوڕێیـانی، لە دوای دەرچـوونی لێبـووردنە گشـتیەکەی سـاڵی ١٩٧٤، ئـازاد کـران. لەسـیەمین ڕۆژی مـانگی چواری سـاڵی ١٩٧٥، پـارتی کرێکـارانی تورکیـا، جارێکی دیـکە دامەزرێنـراوە. بەر لە داخستنی پـارتەکە، سیاسـەتمەدارانی کـورد، لەنـاو پـارتی کرێکـارانی تورکیـا زۆر کـاریگەر بـوون؛ وەلـێ لە دامەزراندنەوەی دووەمدا لە هیچ شوێنێکی ڕێکخستنەکانی پارتەکە بەشدار نەبوون. لە چەند کوردێکی دۆست و ناسیاو بترازێ.

بـاهیجە بـۆران، دوای ئەوەی لە زینـدان ئـازاد کـرا، نەخـۆش کەوت و لە بیمارسـتان خەوێنـدرا. دوای دەرچوونیشـی لە نەخۆشـخانە، ڕاسـتەوخۆ چـووە دەرەوەی وڵات و تورکیـای جێهێشـت. دوای ئەوەی ٧ سـاڵ لە هەنـدەران لە وڵاتـی بەلجیکـا ژیـا، لـە دەیەمـین ڕۆژی مـانگی دەی سـاڵی١٩٨٧ کـۆچی دوایـی کـرد. دوای مردنیشی تەرمەکەی هێنراوە تورکیا. بیرمە ئەو ڕۆژەی جەنازەکەی هاتەوە، لە پەرلەمانی تورکیا بۆرێزلێنان لەو کەسایەتیە، مەراسـیمێك بەڕێوەچـوو، ئەوێ ڕۆژێ، منـیش یەکێـك بـووم لە بەشـداربووان. دواتـریش تەرمەکەیـان بـردەوە ئیسـتانبووڵ. مـن لە ڕێورەسمی بە خاك سپاردنیشی یەکێك بووم لە ئامادەبوان.

لێرەوە دەمەوێ باس لە هەستێکی خۆم بکەم: کۆچی دوایی کردنی باهیجە بۆران لە دەرەوەی وڵات و هێنانەوەی تەرمەکەی بۆ تورکیا، لە ناخی مندا، ناسۆرێکی گەورەی کردەوە. بە دڵنیایەوە بە هۆی ڕژێمی دوازدەی ئازار و دوازدەی ئەیلوول، زۆر دۆست و برادەر هەستیان بە پێویستی جێهێشتنی تورکیا کردووە. بە دڵنیاییشەوە هۆکاری ڕاست و لە شوێنی خۆیان هەبووە بۆ ئەمە. وەلێ باهیجە بۆران پێویست نەبوو بچێتە دەرەوەی تورکیا. ئەو قسەیە بۆ هەموو کەسێك ناکەم، چونکە بۆ هەموو لایەك ڕاست نییە، بەڵام لەو بڕوایەدام بۆ باهیجە بۆران ڕاست بێت. ئەگەر دەستگیردەکرا و دەخرا زیندان، با بخرێتێ، چونکە لەوە بە ئازارتر نییە لە دەرەوەی وڵات کۆچی دوایی بکەی. چونکە پێم وایە بەرگری کردن لە چالاکی و شۆڕش و بیرۆکەکانمان لەبەردەم دادگا، زۆر لەوە ڕاستترە، تا وڵات جێبهێڵین و لێی ڕا بکەین. چونکە باهیجە ئافرەتێکی قارەمان و بە توانا بوو و توانای بەرگرییکردنی ژیانی زیندانی هەبوو. پێشم وابێ، پێشنیازی چوونە دەرەوەی، لەلایەن هەڤاڵانی پارتەکەیەوە بۆ کرا.

## کازم یلدرم و 55 ئاغاکە

مانگەکانی هاوینی ساڵی ١٩٦٢، لە چۆڕووم فەرمانبەر بووم. لە مانگی تەباخی هەمان ساڵ، کابرایەك هاتە لام و داوای دیداری پارێزگاری کرد. کابرا یەکێك بوو لەو ٥٥ ئاغایەی بۆ چوۆرووم ڕاگوێزرابوون. هاتبوو داوای ئەوەی دەکرد، دەبێ بە زووترین کات لە چۆرووم دەرچێ، بۆ ئەوەش داوای ڕێگاپێدانی فەرمی

پارێزگای دەکرد. ئەوسا حەسەن بەسرِی کورد ئۆغلۆو، پارێزگاری شارەکە بوو.

من ئاگاداری ئەوە هەبووم، کە لە بەرەبەیانی بیستوحەفتەمین ڕۆژی مانگی پێنجی ساڵی ١٩٦٠، نزیکەی ٤٨٥ کوردیان لە ماڵەکانی خۆیان دەستبەسەر کرد و ڕاپێچی ناو ئۆتۆمبێلە سەربازیەکانیان کردن و ئەوانیان لە کامپێکی سیواس جێگیرکرد. جا بە شێوەیەکی گشتی بەوانەیان دەگوت ئاغاکان. دوای نزیکەی شەش مانگ، ٥٥ لەو ئاغایانەیان بەرەو شارەکانی ڕۆژئاوای تورکیا و ناوچەکانی ئەنادۆلوو ڕاگواست و ئەوانەی دیکەشیان ئازادکردن. بیرمە لەوێ دەمێدا، گۆڤاری هەفتانەی (یۆن) و بڵاوکراوەی مانگانەی (بارش دوونیاسی) سەبارەت بەو ئاغایانە، چەندان هەواڵ و ڕاپۆرتیان بڵاوکردبۆوە.

ئیدی ساڵی ١٩٦٢، بەو شێوەیەی لەسەرەوە باسم کرد، لەگەڵ کازم یلدرم یەکدیمان ناسی. دواتریش، پەیوەندییەکانمان لە سەردەمی میتینگەکانی ڕۆژهەڵات، بەهێزتر و گەرمتر بوو. جا ئەوسا ئەوەم لێپرسی، ئاخۆ لە بیری ماوە کە ساڵی ١٩٦٢، هاتبووە پارێزگای چۆرووم و داوای مۆڵەتی کردبوو؟ ئەویش بە بەڵێ وەڵامی دامەوە و دیار بوو زۆر چاکی بیر مابوو.

لەوێ سەردەمێدا، لەگەڵ هاوڕێیانم، بەردەوام سەردانی شار و شارۆچکە و گوندەوارییەکانی دەوروبەری ئەرزڕوومم دەکرد. بیرمە چوومە شاری ئاگریش. ڕۆژێکی پایزی ساڵی ١٩٦٩، لەگەڵ عومەر پۆلات، چووینە لادێیەك بە ناوی (ئۆمەرگیلین) گوندەکە لەسەر ڕێگای شاری ئاگری بوو، کاتێك بەرەو پانتۆش دەڕۆی،

دەکەوێتە دەستە چەپت. نزیك لە ناوچەی توتاك، لە دەوروبەری چەمی زیلان.

لە ئاگری سەردانی کازم یڵدرمم کرد. بیرمە، لەوێ دەمێدا، کاك کازم، سەرۆکی لقی پارتی کرێکارانی تورکیای شاری ئاگری بوو. دوای ئەوەی لە بارەگای پارتەکەیان میوانداری کردین، پاشان لەوێوە چووینە لادێکەیان. بە کەنار ڕێگا ڕووباری موراد دەبیندرا. لە شوێنێك بەرامبەر لادێکە لاماندا و هاتینە خوارەوە، چونکە بۆ گەیشتن بە گوندەکە، پێویست بوو لە ڕووبارەکە بپەڕینەوە. لەگەڵ ئەوەی پایز بوو و ئاستی ئاوی ڕووبارەکە نزم ببۆوە، وەلێ هێشتاش، ئاوی ڕووبارەکە بە خوڕ بوو، بە هۆی نەبوونی هیچ پردێکیشەوە لە شوێنەکە، دەبوو ئیلا بە مەلە بپەڕینەوە. ئەو برادەرانەی لەگەڵمان بوون، بە باسکە مەلە لە ڕووبارەکە دەرباز بوون، وەلێ من نەمتوانی. بۆیە کازم یڵدرم، منی لەسەر پشتی خۆی دانا و بە زەحمەت لە ڕووبارەکە پەڕینەوە.

هەموو کەسێك بە کازم یڵدرمی دەگوت ئاغا؛ بەڵام لە ڕاستیدا کەسێکی کەم دەرامەت و هەژار بوو. چونکە ماڵباتەکەیان، بە هۆی ئەو کارەساتانەی بەسەریان هاتبوو، لە ڕاگواستن و بەشداری کردن لە شۆڕشەکانی کورد، ماڵ و موڵکیان لەدەستدابوو. وەلێ کوردێکی نیشتیمان پەروەر بوو و دەیزانی ناسنامەکەی لەژێر هەڕەشە و گوڕەشە دایە. لەگەڵ ئەوەی دەوڵەمەندیش نەبوو، بەڵام هەموو لایەك ڕێزیان دەگرت و دەست لەسەر سینگ بوون بۆی. باسی لادێکەی وەك لادێ بۆ کردبووین، وەلێ ئەو شوێنەی بۆی چووین، باخێکی گەورە و

فراوان و تایبەت بوو. لەناویشیدا چوار پێنج ماڵی لێبوو. چەند خانوویەکی یەك نهۆمی لە کەرپووچ و قوڕ دروستکراوبوون.

دوای گەڕانەوەی مەلا مستەفا بارزانی بۆ عێراق، لە ساڵی ١٩٥٨، سەردەمی ئاشتی لە نێوان کورد و حکوومەتی عێراق دەستی پێکردبوو. لەوێ دەمێدا، کازم یلدرم، بەخۆیی و مێگەلێکی گوندەوە چووبووە عێراق. کاتێکیش لە پارکی موسوڵ بێهنێك دەدا، لەلایەن دەزگای هەواڵگری تورکیاوە (میت) وێنەی دەگیردرێت. بۆیە لە کامپی سێواز، دەیخەنە ژێر لێکۆڵینەوە و لێی دەپرسن "بۆچی چوویە عێراق و کێت لەوێ بینی و باسی چیتان کرد و چ لایەنێك بانگهێشتی کردی؟" بە هۆی ئەوەوە زۆر ئەشکەنجە دەدرێ و دەخرێتە ناو بیری پیسایی و گوی مرۆڤەوە. لەناو بیرەکەش تا پیساییەکە نەگەیشتبووە نزیك دەوی، ڕایان نەگرتبوو، ماوەیەکیش بەو حاڵەوە لەناو ئەو بیرە، هەڵیانواسی بوو. دواتر، بە کەلبەتان، دوو ددانیان دەرهێنابوو. ئیدی ئەوەی مرۆڤ بە هزریدا نایەت، ئەو، لەژێر ئەو ئەشکەنجانە بەسەریدا هاتبوو.

لەگەڵ کازم یلدرم، باسی کێشە نەتەوەیەکانمان دەکرد. ئەو ژوورەی لە گوندەکەی ئەوان لێی دانیشتبووین، بنمیچەکەی بە قوڕ سواق درابوو. لە ژوورەکە چەند دەلاقەیەك هەبوو، کە بە جاجمی دەستچن داپۆشرابوون. کاتێك باسی مژارە نەتەوەیەکانمان دەکرد، کازم یلدرم هەستا سەر پێ و جاجمی سەر یەکێك لە دەلاقەکانی لاداو پەرتووکی (مارکسیەت و مەسەلەی نەتەوەیی) ستالینی دەرهێنا. دواتر لچکێکی جاجمەکەی جارێکی دیکە لادا و ئەمجارە چەند ژمارەیەکی گۆڤاری (یۆن)ی دەرهێنا. ژمارەکانی

ئەو گۆڤـارە، ئەوانە بــوون کە باســیان لە ڕووداوی ٥٥ ئاغــاکە دەکرد.

کاتێك کازم یلْدرم، لەبارەی ئەو شتانەوە دەدوا، درووشمێکی زۆر ناوداری چەپی تورکم بیرکەوتەوە کە دەڵێ "تورکیا لەلایەن بورژوازیە سەرمایەدارەکان و ئاغا فیوداڵەکانەوە بەڕێوەدەبردرێ". بیرمە لەوێ دەمێدا، کوردە شۆڕشگێڕەکانیش ئەو درووشمەیان دەگــوتەوە. بە شــێوەیەکی گشــتیش، ئەوە تەنیــا درووشــمی شۆڕشــگێڕەکان نەبــوو، بەڵکــو، درووشــمی هــزری تــورانی و سیاسەتمەدارانی تورك بوو.

راســتە ئەو درووشــمە لە بەرژەوەنــدی و لایەنگیــری ئاغــا و فیوداڵیە، وەلێ هێشتا کازم یلْدرمیش دەگرێتەوە، کە هەر بە ئاغا دادەنرێت و ئاوا ناوی دەهێنن. وەلێ ئەوانیش بە هۆی ناسنامەی کوردایەتیــانەوە ئەو زوڵــم و ســتەمەیان بینیــووە. بەڵام بەشــەکەی دیــکەی ئەو درووشــمە، کە بــاس لە بــوژواز و ســەرمایەدارەکان دەکا، بە دڵنیاییەوە وەکوو ئاغا کوردەکان، ئەو ئەشکەنجە و زوڵم و نەهامەتییەی کاك کازم و ئاغاکانی کوردیان نەبینیووە لە تورکیا.

ئەو زوڵم و ئەشکەنجەیەی لەسەر کوردی باکوور هەبوو، بۆ دروســتبوونی ئەو جــوڵانەوەیە دەگەڕێــتەوە کە کــە مەلا مســتەفا بــارزانی بانــدۆری بەســەرەوە هەبــووە. جــا بــۆ ئەوەی کــوردیش نەکەوێــتە ژێــر کــاریگەری جــوڵانەوە کوردییەکــان، بەردەوام چاوترسێن کراون و چی خراپ بووبێ، بەسەریان هێناون.

# لەبری دوایین پەیڤ
# دیاردە و بۆچوونە گۆڕاوەکان و ڕەخنە

## حەتمیبوونی گۆڕانی هزری

دەتوانم بڵێم کە، کار و پرۆژە و لێکۆڵینەوە زانستییەکانم، سەبارەت بە کورد و، نزیك بوونەوەم لەو گەلە، لەگەڵ دەستپێکی ژیانی خوێندکاریم و خوێندنی کۆلێژی زانستە سیاسییەکان لە زانکۆی ئەنقەرە، بە شێوەیەکی زۆر سروشتی و لە خۆوە دەستی پێکرد. وەلێ هەوڵەکانم، بۆ کارکردنی زانستیانە و بەردەوامیدان بە توێژینەوەکانم لەسەر پرسی کورد، لەگەڵ ئەوەی لەلایەن ناوەندەکانی زانکۆ و بیرمەندانی تورك هیچ گرنگییەکی پێنەدرا، بەڵام لەگەڵ پەراوێزخستنمیشیان، دژایەتی کردنم و هەڵوێستە توندەکانیان و تۆمەتبارکردنم لەلایەن ئەوانەوە، وای لە من کرد، بە پێی تێپەڕینی کات، بچمە ناو ئاقارێکی دیکە، کە وا لە من بکەن لە پەیوەندی نێوان ئایدۆلۆژیای فەرمی و پێشاژۆی وەبەرهێنانی زانستیش بکۆڵمەوە. بە هۆی ئەو توێژینەوانەی ئەنجامم دا و ئەو وتار و پەرتووکانەی نووسیم، لەگەڵ ئەو کۆڕبەند و پانێلانەی بەشداریم تێیاندا کرد، ڕووبەڕووی چەندان بەربەست بوومەوە، کە دواتر بوونە هۆکاری ئەوەی دۆسیەی لێکۆڵینەوەم لەسەر بکرێتەوە و لە ژیانی ئەکادیمی ناو زانکۆ دوورم بخەنەوە و سزای

کارگێڕی و گیانیم بەرامبەر جێبەجێ بکەن و دەستگیر بکرێم و ناچاری بەسەربردنی ژیان بم لە کونجی زیندانەکان و بە چاوی خۆم چەندان نا دادی و نا یاسایی ببینم؛ لە پاڵ ئەوەی توندوتیژی زۆرم بەرامبەر کرا؛ جا هەر قۆناغێك لەو قۆناغانە، چەندان کەسی تازەم ناسی و پەیوەندی نوێم بنیاد نا، کە بێگومان، ئەمانە بە شێوازی جیا جیا، ڕۆڵی گرنگیان بینی لە گۆڕانی بیر و بۆچوون و هزری مندا.

یەکەم نووسینم دوای ناسینی کورد و کەوتنە زیندانم لە ساڵانی حەفتاکان و ئاشنا بوون بە زیندانیانی کورد، لە چەندان ئاست و کاتی جیاواز و زانینی بیر و بۆچوون و ژیانی ئەوان، بوونە هۆی ئەوەی ڕۆڵێکی گرنگ ببینن، لە گۆڕانکاری میتۆدی کاری زانستیم. جا لەگەڵ ئەوانە، دەستپێکی بەرخودانی چەکداری کورد لە ساڵی ١٩٨٤ و دواتر، کاریگەری لەسەر هزر و نووسینەکانم زۆر بوو؛ وەك چۆن گۆڕانی سیاسەتی پەکەکەش هەر ئاوابوو...

## نووسین دەربارەی پەکەکە

لە دوای ساڵی ١٩٨٤ وە، نووسینەکانم سەبارەت بە بەرژەوەندیی و بەرگریکردن لە پەکەکە، لەناو هەندێك لایەنی کوردی ڕووبەڕووی ڕەخنە بۆوە. بێگومان، منیش هەر بە ڕەخنە، وەڵامی ڕەخنەکانم دەداوە. ڕووداو و پێشهاتەکانی دوای ساڵی ١٩٩٠ و ناسینی چەندان کەسی تازە لە بەندیخانە، لەلایەك و، لەلایەکی دیکەش ڕووداوەکانی دەرەوەی زیندان و بوویەرەکانی

دوای دەستگیرکردنی عەبدوڵڵا ئۆجەلان، وایکرد، منیش بە پێی کات، ڕەخنە لە پەکەکە بگرم؛ وەك چۆن، لەوێشەوە ڕەخنەم لێگیرا. بە شێوەیەك لە ماوەی دوایدا، هەندێك نووسین چوارچێوەی ڕەخنەیان تێپەڕاند و چوونە ناو ئاقاری هێرشکردنەوە. منیش بە پێی کات، پێشاژۆی گۆڕانی هزریم بەسەردا هات، لێکدانەوە و بۆچوونی لایەنی سیاسیی کوردیش بۆ ئەو گۆڕانکارییە بەلای منەوە زۆر گرنگە. لەو بارەیەوەش لە گۆڤار و پەرتووك و بلاوکراوە جیاوازەکانی ئینتەرنێتەوە، نووسینم هەیە. بەڵام لێرەوە دەمەوێ بە کورتی بخزێمە ناو مژارێکی گرنگەوە، چونکە پێم وایێ باسکردنی بە سوودە.

لەو چوارچێوەیە هەست بە گرنگی نووسینی ڕوونکردنەوەیەك دەکەم، سەبارەت بە یەکەم پەیوەندی من لەگەڵ پارتی کرێکارانی کوردستان.

لە سەردەمی دەستپێکردنی بەرخودانی چەکداری لەلایەن پەکەکەوە، منیش لە نووسینەکانی خۆمەوە هاوکاری و پشتگیریەکی سیاسییانەم بۆ ئەو پێشاژۆیەیان هەبوو. ئەمەش بە ویست و ئارەزووی هیچ کەس و لایەنێك، یاخود لەژێر کاریگەری و گوشاری چ کەسێکەوە نەبوو. بەڵکوو تەواو بە بیر و بۆچوون و ئیرادەی خۆمەوە ئەو کارەم کرد.

ئەو کاتەی بەرخودانی گەریلا دەستی پێکرد، لە زیندانی چەنەقەلە بووم. لە سەرەتای مانگی نۆی ساڵی ١٩٨٤، لە قاوشی D-٩ دوو ڕۆژ لەسەریەك لەسەر ئەو بەرخوودانە گفتوگۆ کرا؛ قسەکەریش من بووم. برادەران لەو بارەیەوە پرسیاریان لا چێ

دەبوو، منیش ئاوا وەڵامم دەدانەوە، "ئەو بەرەنگاربوونەوە تازەیە، سەرهەڵدانێکی ئاسایی نییە، بەڵکوو شۆڕشی ڕزگارکردنی نەتەوەییە. لە قاوشەکە نزیکەی ١٢٠ هەڤاڵ هەبوو. دەتوانم بڵێم لە هەموو لایەنە سیاسییەکان، گیراوی لێبوو. لە کاتێکدا، لەوێ دەمێدا هیچ پەکەکەییەك لە زیندانی چەنەقەلە نەبوو.

لە مانگی پێنجی ساڵی ١٩٨٧، گواسترامەوە گرتووخانەی عەنتابی تایبەت، لە ڕۆژەکانی گواستنەوەم، لەناو کۆمەڵگادا بۆچوونێك گەلاڵە بوو کە پێی وابوو "پەکەکە، ڕێکخراوێکی تیرۆرستییە". جا ئەو بۆچوونە لەلایەن دەوڵەت و تورکە چەپ و بەشێکی زۆری کوردیش پشتگیری دەکرا. بە جۆرێك لە جۆرەکان، ئەو کوردانەی لە ئەورووپاش گەڕابوونەوە هەر ئاوا بیریان دەکردەوە. بەڵام من، لەو وتارانەی بۆ کۆمەڵە چوار پێنج کەسییەکان و کۆبوونەوە پێنج شەش کەسیەکان و دیمانەکانم بۆ میدیا بیانیەکان و جڤینەکانم لەگەڵ باڵیۆزانی وڵاتان دەدا، پێداگریم لەسەر ئەوە دەکردەوە کە، بەرخوودانەکە، شۆڕشێکی نەتەوەییە. وەك چۆن باسم لەوە دەکرد، لە ماوەیەکی زۆر نزیکدا، بەرخودانی گەریلا، لەلایەن خەڵکیشەوە پشتگیری دەکرێ. چونکە ئەو زوڵم و ستەمەی دەوڵەت و حکوومەت بە شێوەیەکی پیلان بۆ داڕێژرا و بە بەرنامە لە ناوچە کوردیەکان دژ بە کورد دەیکرد، ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو لەوەی جوڵانەوەکە بلەز فراوان و گەورە بێت. ئۆپەراسیۆنەکانی کۆماندۆ، لە بەهاری ساڵی ١٩٧٠، جێگای سەرنج و هەڵوەستە لەسەرکردنە. چونکە هێزەکانی کۆماندۆ، لە پاڵ ئەوەی لە ناوچە کوردییەکان ئەشکەنجەیەکی زۆری خەڵکی دەدا، لە هەمان دەم، هەوڵی شکاندنی غرور و

کەسایەتی خەڵکەکەی دەدا. لە تورکیا هێزی کۆماندۆ لەناوچە کوردییەکان، پەتی لە کۆئەندامی نێرینەی کوردە ئیختیارەکان دەبەست، کە خاوەنی کچ و کوڕ و بوك و زاوا و چەندان نەوە بوون. جا دوای ئەوە، پەتەکانی دەدا دەستی ئافرەتەکان و بە زۆر، لەناو گوند، بەبەرچاوی خەڵك دەیسووڕاندنەوە. ئەو جۆرە ئۆپەراسیۆنانەی کۆماندۆ، لە دوای بەرواری دوازدەی ئەیلوولی ساڵی ١٩٨٠ هەر بەردەوامی هەبوو. ئەم ئۆپەراسیۆنانەش، مەحاڵ بوو، نەبێتە هۆکارێك بۆ چاندنی هەستی ڕق و قینە دژی دەوڵەت و حکوومەت. لە ئاخافتنەکانیشمدا زوو زوو باسی ئەو جۆرە ڕووداوانەم دەکرد.

لە مانگی سێی ساڵی ١٩٩٠، بە هۆی کتێبێکەوە سزادرام و لە ئیستانبووڵ خرامە کونجی زیندانی بایرام پاشا. لەوێندەر لە قاوشی برادەرانی پەکەکە مامەوە. ئەوانم لە نزیکەوە ناسی؛ لەناویاندا چەندا هەڤاڵ هەبوون چووبوونە ڕیزەکانی گەریلا و دواتر دەستگیرکرابوون.

لە دوای دەرچوونم لە زیندان، چەندان دیمانە و نووسین و وتارم لە بلاوکراوەکانی وەك (یەنی ئولکە و ئۆزگور گوندەم و ئوزگور ئولکە و ئۆزگور هاڵك و دیموکراسی و ئەڵتەرناتیف) بلاو دەکردەوە. لە چەند گۆڤارێکیشیاندا چەند پەرتووکێکم بلاو بۆوە. وەك چۆن چەندان نووسینم لە (بەرخودان و سەربەخۆبوون و ئۆزگور هاڵك)یش بلاوبوونەوە. لەسەر زۆربەی نووسینەکانیشم، لە دادگا دۆسیەم لەسەر کرایەوە و زۆربەی دۆسیەکانیشم بە سزادان کۆتاییان دەهات. ئەمەش لە نزیکەوە دەزاندرێ.

دوای نیوەڕۆیەکی، ڕۆژێکی پایزی ساڵی ١٩٩٨، منیان بردە دادگای بورسا. لەو ژوورەی منیان بۆی برد، دادوەرێکی لێبوو. لەسەر مێزی بەردەم دادوەرەکە گۆڤارێك داندرابوو. دوای دڵنیابوونەوە لە ناسنامەکەم، دادوەر نووسینێکی ناو گۆڤارەکەی پێ پیشان دام و لێی پرسیم "ئەو وتارە هی تۆیە؟" گۆڤارەکە ژمارەیەکی تازەی (ئۆزگور هاللك) بوو، نووسینەکەش هی من بوو. خۆی لە سەرەوەی نووسینەکەش نووسرابوو، ئیسماعیل بێشکچی. بۆیە لە وەڵامدا گوتم "بەڵێ ئەوە نووسینی منە و تایبەتە بە خۆم". دوای ئەو بەرسڤەم، دادوەرەکە هیچی دیکەی لێ نەپرسیم و شەش حەفت خولەك خەریکی خوێندنەوەی وتارەکەم بوو. جا زۆر بە سەرنجەوەش دەیخوێندەوە. لەبەر خۆشی دەیگوت "هممممم... " کابرا سەری بە ڕاست و چەپدا دەسووڕاند و دەستی بۆ نێوچاوانی دەبرد و هەندێکجاریش دەستێکی بە قژ و سەریدا دەهێنا و جارێکی دیکە سەیری مانشێتی وتارەکەی دەکردەوە و هەمدیسان لاپەڕەکانی هەڵدەداوە و سەیری کۆتاییەکەی دەکرد؛ جارێکی دیکەش هاتەوە سەرەتای نووسینەکە، ئەو کارەشی چەند جارێك دووبارە کردەوە.

پێم وابێ، بۆ ئەوە سەیری وتارەکەی نەدەکرد، تا بە یاسای بەرەنگاربوونەوەی تیرۆری ببەستێتەوە، بەڵکو لام وایە لە خەیاڵی خۆیدا دەیگوت "ئەو وتارە چۆن نووسراوە و لە زیندان چۆن نێردراوەتە دەرەوە و دوای بڵاوبوونەوەشی ئەو گۆڤارە چۆن بردراوەتەوە زیندان؟" ئیدی خەریکی دۆزینەوەی وەڵامی ئەو پرسیارانە بوو کە مەراقی لێ دەخوارد.

وتارەکە ساڵ و نیوێك پێشتر نووسرابوو. بۆیە بە هۆی ئەو نووسینەوە، داوای یاسایی لەسەر من و بەڕێوەبەری (ئۆزگور هالك) لە دادگای ئاسایشی دەوڵەتی ئیستانبووڵ کرایەوە. دواتر دادوەرەکە لە ڕاپۆرتی ئیفادەکەی مندا بۆ دادگای نوسیبووی "تۆمەتبار ئاماژەی بەوە کردووە کە خۆی ئەو وتارەی نووسیوە". دواتر دادوەر دۆسیەکەی داخست. کە لە دەرگا چوومە دەرەوە، کابرا هەستاوە سەرپێ و گوتی "پرسیارێکت لێدەکەم پەیوەندی بە دۆسیەکەتەوە نییە، بەڵام بووە مەراقم، ئەو وتارەت چۆن ناردە دەرەوەی گرتووخانە؟" منیش وەڵامم داوە "لەرێگای پۆستەی زیندانەوە" دوای بیستنی ئەو بەرسڤە، دادوەرەکە لەبەر خۆی خەنیەوە.

## ڤیتۆی تیرۆری پەرتووکەکانی بێشکچی، لەلایەن پسپۆرانی کوردەوە

لە بابەتی نووسین و پەرتووك و پەیوەندییەکانم بە پارتی کرێکارانی کوردستانەوە، دەمەوێ بیرەوەریەکی دیکەشم بهێنمە زمان:

لە نێوان ساڵانی ١٩٩٢-١٩٩٣، وەشانخانەی (یورت کیتاب) لە رووی ماددیەوە تووشی کێشە ببوو. لەبەر ئەوەی لەگەڵ بڵاوبوونەوەی هەر پەرتووکێك، بە بڕیاری دادگا، فەرمانی کۆکردنەوە و قەدەغەکردنی دەردەچوو، دواتریش دۆسیەی دادگایی کردنی لەبارەوە دەکراوە. بە شێوەیەك هەندێك لە

پەرتووکەکان، لە چاپخانە، بەر لەوەی ڕووناکی و ڕەفی پەرتووکخانەکان ببینن، کۆکرانەوە و ڕێگا بە بڵاوکردنەوەی نەدرا. دەزگای بڵاوکردنەوەی ناوبراو، پارەی چاپکردنی پەرتووکەکانی دەدا، بەڵام بە هۆی ئەو قەدەغەییانەی بەسەر کتێبەکە دەسەپێندرا، نەدەتوانرا، بفرۆشرێ و پارەی چاپکردنەکە کۆبکرێتەوە.

ڕۆژێك، لە پێشانگای کتێبی توویاب لە ئیستانبوولّ، ئێوارەیەك لەگەڵ ئونساڵ ئۆزتورك، چووینە ماڵێك. لەوێ گونەی ئاسلانیشی لێبوو. ئەو دۆخەی بەسەر وەشانخانەکە هاتبوو، بۆ گونەی ئاسلانمان باسکرد. بیرمە ئەوسا کاك گونەی لەگەڵ ئافرەتێکی ئەڵمانی هاوسەرگیری کردبوو. هەر هەمان ئێوارە، ئیلکای ئاڵپ تەکین دەمیر و نەجمی دەمیریش لەوێ بوون. من ئەو دووەم لە دۆسیەکانی دادگاییکردنی سەردەمی دوازدەی ئازارەوە دەناسی.

دوای ئەوەی حاڵ و حیسابی وەشانخانەی (یورت کیتاب)مان بۆ باسکرد، گونەی ئاسلان پێشنیازێکی ئاوای بۆ کردین "لەسەر پەرتووکە قەدەغەکراوەکان و دۆسیەکانی دادگایی کردن و دۆخی وەشانخانەکەتان ڕاپۆرتێك بنووسن و بۆ باڵیۆزی وڵاتانی بنێرن لە ئەنقەرە. ئەوانیش هەریەکە و ڕێژەیەك لە پەرتووکەکانتان لێدەکڕن".

ئێمە بۆچوونەکەمان پێ باش بوو و دەستمان بە ناردنی نامەکان کرد، ماوەی یەك دوو مانگیش چاوەڕوانی وەڵاممان کرد، بەڵام ج دەنگێك لە هیچ لایەکەوە نەبوو. ئەوەشمان بە گونەی ئاسلان ڕاگەیاند. دوای ئەمە جەنابیان پێشنیازی بیرۆکەیەکی وەهای بۆ کردین "لەگەڵ ئەو ڕاپۆرتەی بۆ باڵیۆزخانەکان ئامادەتان کردبوو، سێتێك پەرتووکیش بۆ وەزارەتی ڕۆشنبیری سوید بنێرن. چونکە

وەزارەتـی ڕۆشـنبیری سـوید، پەرتـووکی تـورکی دەکـڕێ و بـۆ پەرتووکخانەکـانی وڵاتەکەی دەنێرێـت. بـۆیە دەکـرێ بەشـێك لەو پەرتووکانەش لە ئێوە بکڕێت".

ئەو پێشنیازەشـمان وەك خـۆی جێبەجێکـرد، بەڵام سـێ چـوار مانـگ بەسـەر هەوڵەکەمـان تێـپەڕی و لەوێشـەوە هـیچ وەڵام و دەنگێك نەبوو. دوای ئەوە من لە مانگی یازدەی ساڵی ١٩٩٣، لە ئیسـکلیپ دەسـتگیرکرام. مـاوەیەکی کـورت دوای مـانەوەم لە ئیسکلیپ، منیان بۆ گرتووخانەی ئولوجانلاری ئەنقەرە گواستەوە.

لە سوید دۆسـتێکم هەبـوو بە نـاوی گابـار چیـان، ئەو هەمـوو سەری ساڵێك، نامەی پیرۆزبایی ساڵی تازەی بۆ دەنووسیم. سەری ساڵی ١٩٩٤ یش نامەی پیرۆزبایی بۆ ناردم. منیش دوای نامەکەی ئەو، مەکتووبێکم بۆ نارد و لە ناوەڕۆکەکەی پرسیاری ڕاپۆرت و کـۆمەڵە کیتـابەکەم لێکـرد کە بـۆ وەزارەتـی ڕۆشـنبیری سـویدمان نـاردبوو و لـێم پرسـی، ئـاخۆ دەتـوانێ هەواڵێـك لەو بـارەیەوە دەسـتبخات؟ بیسـت ڕۆژ دوای نـامەکەم، لەلایەن گابـار چیـانەوە مەکتووبێکی بەم شێوەیەی خوارەوەم بەدەست گەیشت "ڕاپۆرت و پەرتووکەکانتـان گەیشـتۆتە وەزارەتـی ڕۆشـنبیری سـوید. دوای ئەوە، وەزارەت لە سێ کورد، دەستەیەکی ڕاوێژکاری پێکهێناوە و داوای لێکـردوون، لەسـەر ئەو پەرتووکـانە ڕاپۆرتێـك بنووسـن و پێشکەشـی وەزارەتـی ڕۆشـنبیری بـکەن. وەلـێ ئەو کەسـانە، ڕاپۆرتێکی نەرێنیان لەسەر کیتابەکانی تۆ نووسیوە و ئاماژەیان بەوە کـردووە کە ئەو پەرتووکـانە هاوکـاری و پشـتگیری ڕێکخـراوی تیرۆرسـتی پەکەکە دەکـات. چـونکە ئەگەر وەڵام و ڕاپـۆرتەکەی

ئەوان، ئەرێنـی بـوایە، وەزارەت ژمـارەیەکی زۆری پەرتووکەکـانی دەکڕی".

من سەیرم بەو ڕاپۆرتەی ئەو سێ کوردە هات، چونکە پێنج لەو کیتابانە، بەر لە ساڵی ۱۹۷۰ نووسرابوون. هەشتیشیان، لە نێوان ساڵانی ۱۹۷۵-۱۹۸۰ نووسرابوون و لەلایەن وەشانخانەی کۆمەڵەوە بڵاوکرابـــوونەوە. ســـێ پەرتـــووکیش لە دوای ســـاڵی ۱۹۹۰ نووسرابوون. بەڵام هەموویان لە ساڵی ۱۹۹۱ و بە دواوە، جارێکی دیـــکە لەلایەن وەشـــانخانەی (یـــورت کیتـــاب) چـــاپ و بڵاوکرابوونەوە.

ئەگەر سـەرنج بـدەن، بەشـی هەرە زۆری پەرتووکەکـان بەر لە ساڵی ۱۹۸۰ نووسـراون. وەلێ بە هۆی ئەو ڕەخنە و ڕق و قینەی بەرامـبەر پەکەکە هەیـانبووە، پـارتی کرێکـارانی کوردسـتانیان، بە ڕێکخراوێکـی تیرۆریسـتی چووانـدوە. بە هـۆی ئەو هاوکـاری و پشـتگیریەی بـۆ پەکەکەشـم هەبـووە، منـیش کەوتـوومەتە نـاو چوارچێوەی ڕەخنە و هەستە نەرێنیەکانیانەوە.

بە دڵنیـاییەوە، پەکەکەش هەنـدێك کـاری هەیە، کە دەشـێ ڕەخـنەی لـێ بگـرین. بە دڵنیـایەوە ڕەخـنە لە هەنـدێك پێشـهاتیان دەگیردرا.

لەوێ دەمێـدا، پێناسـەی تیـرۆری دەوڵەت، لەلایەن وڵاتـانی ئەوروپا و دامەزراوەکانی ئەورووپاشەوە پشتگیری دەکرا. وەك چۆن ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنیش هەر ئاوابوون.

گابـار چیان، لە نامەکەیـدا، نـاوی ئەو سـێ کـوردەی نەنووسـی بـوو کە وەك لیـژنەیەك لەلایەن وەزارەتـی ڕۆشـنبیری سـویدەوە

دەستنیشانکرابوون. وەلێ سالآنی دواتر من بە ناوەکانیان کەوتمەوە. ئەوان چەند کەسێکی دۆستی نزیکی ئێمە بوون. بۆیە پێویستە ئەوە بلێین، دوو لەو سێ کوردە، لە سالآنی ۲۰۰۰ گەڕانەوە تورکیا و لەو ناوەند و دامەزراوە میدیایانە دەستیان بە کارکرد، کە لەلایەن پەکەکەوە دامەزرێنران. هەرچی من بووم، ئیدی لە دوای سالآنی ۲۰۰۰ وە ڕەخنەم لە ئەدای پارتی کرێکارانی کوردستان دەگرت.

## بە هۆی ڕەخنەگرتن لە پەکەکە "کرامە زیا گۆك ئالپی کورد!"

کاتێك پێشهاتەکان وەك ئەوەی باسم کرد، دەچوونە پێش، لە نۆیەمین ڕۆژی مانگی دەی سالی ۱۹۹۸، عەبدوڵلا ئۆجەلانیان لە سووریا دەرهێنا. لە پازدەمین ڕۆژی مانگی دووی سالی ۱۹۹۹ لە کینیا دەستگیرکرا و ڕادەستی تورکیا کرا. لەناو فڕۆکەش هەر لە ئاسمان بەر لەوەی بگاتە سەر زەوی یەکەم قسەی ئەوەبوو "ئامادەی خزمەتکردنی دەوڵەتم".

ئەو لێدوانەی ئۆجەلان، بووە خالێکی زۆر گرنگ، لە تێکچوونی پەیوەندییەکانم لەگەڵ پارتی کرێکارانی کوردستان. لە دوای ئەوەش ڕەخنەکانم دەربارەی عەبدوڵلا ئۆجەلان و پەکەکە دەستی پێکرد و ئیدی لە ئۆرگانە میدیاییەکانی پەکەکە نووسین و وتارم بلاو نەدەکردەوە. پاشان ئاماژەم بەوەکرد، نابێ ئۆجەلان لە زیندانەوە بدوێ، بەڵکوو لە بڕی ئەو، دەبێ ئەو ئەرکە لەلایەن

ئەوانەی لە دەرەوەی گرتووخانەن، لەگەڵ کەسانی ناو حیزبەکەوە لە ئەستۆ بگیردرێ. پاشان تۆزێك خۆم بە دوور گرت، لە هەندێك لە دامەزراوەکانیان. ئەو ڕەخنانەم، لەلایەن ئۆجەلان و پەکەکەوە زۆر بە توندی وەڵام دراوە؛ هەتا، عەبدوڵڵا ئۆجەلان لەوبارەیەوە گوتی "دەیەوێ ببێتە زیا گۆك ئالپی کوردان".

ئیتیحاد و تەرەقی[1] چ لە دەسەلات بن، یانیش لە بەرەی ئۆپۆزسیۆن؛ یەکێکن لە ڕێکخراوە گرنگەکانی دەوڵەت. ڕێکخراوێك بوو، بە هۆی کۆبوونەوە نهێنیەکانی و ئەو ڕوونکردنەوانەی بۆ ڕای گشتی دەریدەکرد، یەکێك بوو لەو لایەنانەی، دەوڵەت لەدەست خۆی نەدەدا. ئەو سەردەمانەی ئیتیحاد و تەرەقی لە دەسەلات بوو، پێکهاتە نهێنیەکەی خۆی هەر پاراستبوو. ئەمرۆ لە تورکیا بەم پێکهاتەیە دەڵێن (دەوڵەتی قوڵ). زیا گۆك ئالپ، تیۆرستی وەها ڕێکخراوێك بوو.

لە مانگەکانی هاوینی ساڵی ١٩٢٢، ڕزا نوری وەزیری تەندروستی ئەوسا، بۆ لێکۆڵینەوە لە عەشیرەتە کوردییەکان، زیا گۆك ئالپ دەنێرێتە کوردستان. لەوێ دەمێدا بڕیار لەسەر ئاسیمیلەکردن و تواندنەوەی کورد درابوو. بۆیە دەیانویست زانیاری لەسەر ژێرخانی کۆمەلایەتی و پێکهاتەی عەشیرەت و پەیوەندی خێزانی و دۆخی کولتووری ئەو کۆمەڵگایە کۆبکەنەوە کە فەرمانی ئاسیمیلەکردنی دەرچوبوو. بۆ ئەمەش ٣٠٠ لیرەیان بۆ

---

[1] کۆمەڵەی ئیتیحاد و تەرەقی، بزوتنەوە و پارتێکی سیاسی بوو، لە ساڵی ١٨٨٩ دامەزرا. لە دوای ڕاگەیاندنی مەشروتیەتی دووەم، لە نێوان ساڵانی (١٩٠٨-١٩١٨) لە تورکیا دەسەلاتیان گرتەدەست. (وەرگێڕ).

زیا گۆك ئاڵپ ناردبوو. بە پێی دۆخی ئەوسا بێ، لە ساڵی ١٩٢٢، مـووچەی مانگـانەی مامۆسـتایەك، کە خزمەتـی مامۆسـتایەتی ١٥ ساڵ با، تەنیا ٤ لیرە بوو، واتا لە ساڵێکدا ٤٨ لیرەی وەردەگرت.

دەمەوێ وردتر بزانـدرێت، کە من ویستوومە چی بگەیەنـم و چیم باسکردووە. چونکە بەبۆچوونی من، گەورەترین بەربەستی بەردەم هـزر و بیـر، بـریتییە لە دامەزراوەی ئایـدۆلۆژیای فەرمـی. بۆیە من بەردەوام ویستوومە لە ڕێگای ڕێکاری زانستییەوە، ڕەخنە لە ئایدۆلۆژیای فەرمی بگرم. بۆیەش کورد یەکێکە لەو بابەتانەی کە زۆر بە وردی ئایـدۆلۆژیای فەرمـی پێـیەوە سـەرقاڵ بـووە؛ ئەمەش دەبێـتە ڕۆژەڤێکـی زەق و دیـار. دەوڵەت تـا سـاڵی ١٩٩١، زۆر مژوولـی هـزری چەپڕەویـی و شـەریعەتی بـوو. لە مـانگی چواری ١٩٩١، بە ماددەی ٣٧١٣ یاسای بەرەنگاربوونەوەی تیرۆر، بیـری چەپگەرایـی و شـەریعەتی، بە یاسـا لە ڕیزبەنـدی تاوانەکـان دەرهێنــدران. لە کاتێکــدا، هەر بەو یاســایە، ســزای مــاددی و مەعنەوی و کارگێڕی زیاتر خرایە سەر مژاری تایبەت بە کورد. هەر ئەوەندە نا، بەڵکوو ئیدی لەوێ ڕۆژێ بەدواوە، بیری چەپ و ئاینیش، وەکوو دوو بانگەشەی جیا خرانە خزمەتی هزری دژایەتی کردنـی گەلـی کـورد. منـیش ڕەخـنەم لەو پێڤـاژۆیە دەگـرت و نووسین و پەرتووکم بڵاو دەکردەوە؛ لەو بارەیەوە خوێنەرانم ئەوە لە نزیکەوە دەزانن و ئاگادارن.

هەرچی تایبەت بوو بەو ڕەخنانەی لە من دەگیرا، سەبارەت بە پارتی کرێکارانی کوردستان، بەو شێوەیە وەڵامم دەدانەوە "پەکەکە

پێویستی بە پێداهەڵدان نییە، بەقەد ئەوەی پێویستی بە ڕەخنە لێگرتنە".

***

لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٨٠ بە دواوە، پەکەکە زمانی تورکی فێری ئەو کوردانە دەکرد، کە لە ناوچە جیاکانی کوردستان و چین و توێژە جیاکان دەچوونە ڕیزەکانی گەریلا. لە شاخ خولی فێربوونی زمانی تورکی کرایەوە. وەلێ هیچ بەدەمەوە چوونێك بۆ زمانی کوردی نەبوو. لەوێ دەمێدا وام بیر دەکردەوە، ڕەنگە ئەوە بۆ ماوەیەکی کورت بێت. وەلێ ساڵ لە دوای ساڵ، هەستم بەوە کرد، هەنگاوەکە بووەتە هەڵوێستێکی گرنگی عەبدوڵڵا ئۆجەلان و پەکەکە. هەروەها، بەردەوام سەرکۆنەکردنی "بنەماکانی نەتەوەپەروەری" و تاوانبارکردنی ئەوانەی پێیان وابوو دەبێ "بە کوردی بدوێین و بە کوردی بنووسین و لێکۆڵینەوەی زیاتر لە زمان و وێژەی کوردی بکەین". زوو زوو دەهاتە بەر گوێمان. ئەمەش بێ هیچ گومانێك هاوکار و ڕێگاخۆشکەرێکی گرنگی هەڵمەتی ئاسیمیلەکردن بوو. بۆیە لەوێ دەمێدا، ڕەخنەکانم لەسەر پەکەکە هێ زێدەتر بوو.

لە باشووری کوردستان، ساڵی ٢٠٠٥، کاتێك حکوومەتی هەرێمی کوردستان دادەمەزرێت، پەکەکە و کەجەکە (پارتی کرێکارانی کوردستان و کۆما جڤاکێن کوردستان) جۆرێك لە هەوڵی بچووك کردنەوە و داشۆڕینی سەردەم و حکوومەت و بە تایبەتیش بارزانیەکانیان دەدا. ئەمە لە کاتێکدا، دەبوو تواناکان لەوەدا چڕ بکرێتەوە، کە ڕێگا نەدرێ سوپای تورك، بچێتە ئەوێ،

بەڵام من لەو باوەڕەم، وەك پێویست، ئەو مژارە گرنگی پێ نەدرا. بۆیە پێشهاتەکانی ئەوێ دەمێش، بەلای منەوە بابەتێك بوون بۆ ڕەخنە لێگرتن.

## دووبارە سەبارەت بە ڕێکاری زانستی

چەمك و وشەی (زانست) یەکێکە لەو چەمکانەی، لە ئاخافتنی ڕۆژانە و گفتوگۆ سیاسی و هونەریی و ئەدەبی و نووسینەکانی تایبەت بە کۆمەڵگا و سیاسەت، زۆر بەکار دەهێندرێت. وەلێ ئەو جۆرە بەکارهێنانە، بۆ چەمکی زانست، بە پێی پێویست هەڵگری مانا و دەلالەتی ڕاستەقینەی زانستی نییە. واتە دەتوانین بێژین، زۆر بەکارهێنانی وشەی زانست، بە مانای ئەوە نایەت، ڕێزێکی زیاتر بۆ زانست و کەسانی زانستی دابندرێت. چونکە ئەمڕۆ زانست و میتۆدەکانی، لە ناواخنی ڕاستەقینەی خۆی داماڵراون و بە شێوەیەکی هەڕەمەکی و بێ بنەما، ئەو چەمکە بەکار دەهێندرێت. چونکە زۆر بەکارهێنانی، بەو مانایە نایەت، کە زانست بە شێوازە زانستی و ڕاستەقینەکەی خۆی، بوونی هەیە.

بۆ نموونە، فەرمانبەرێکی حکوومەت کە تۆمەتی وەرگرتنی بەرتیلی درابووە پاڵ و لێکۆڵینەوەی لەسەر دەستپێکرابوو، گوتبوی "پۆلیس، بە شێوەیەکی زانستیماڵەکەمیان پشکنیووە". واتە ئەو ڕستەیە بەو مانایە بەکارهێنراوە، کاتێك پۆلیسەکان چوونەتە ماڵەکەی، پێڵاوەکانیان داکەندووە، پاشان چوونەتە ژوورەوە. لە هوندوریش کاتێك گەڕان و پشکنینیان کردووە، کەلوپەلی ماڵەکەیان پەرش و بڵاو نەکردووە و هیچ شتێکیان نەشکاندووە. ڕۆژێك گوێم لێبوو گوتیان "شەو مەراسیمی باڵیۆزخانەکە، بەشێوەیەکی زانستی ڕێك خرابوو". لێرە چەمك و وشەی زانستی،

بـۆ ئەوە بەکارهـاتووە، کە هەمـوو شـتێك بە پێـی ڕێکارەکـانی پرۆتۆکـۆڵ، لە کـات و جەم و شـوێنی خـۆی ڕێـك خـراون و بەڕێوەچوون. یان دەڵێن "یاریەکە بە شێوەیەکی زانستیانە دەستی پێکرد و هەر ئاواش کۆتایی هات". لێرەش دەیانەوێت بڵێن، لە یـاریەکەدا چ شـەڕ و ئـاژوە و ڕووبەڕووبوونەوەیـك لە نێـوان یاریزانـان و نـاوبژیوانی یـاریەکە ڕووی نەدا. یـاخود دەڵـێن "لە هەمـوو ئۆپەراسیۆنەکاندا، ڕەچاوی پاراستنی مافەکـانی مـرۆڤ و بنەماکانی دەوڵەت کراوە و بە پێی شێوازی زانستی هەڵسوکەوت کراوە". لەوێشدا بەکارهێنانی وشەی زانستی، بە مەستی ئەوەیە کە لە ئۆپەراسیۆنەکەدا هیچ کەسێك ئەشکەنجە نەدراوە.

لەو نمونـانەی لەسـەرەوە هێنـامەوە، بە ئاشـکرا دیـارە کە ناوەڕۆکی چەمکە زانستییەکە بە شێوەیەکی گونجاو و لە شوێنی خۆی بەکار نەهێندراوە. چونکە ئەوانەی وشەی زانست لەو جۆرە ڕستە و گوزارشتانە بەکار دەهێنن، مەبەستیان تەنیا ئەوەیە کە ڕێز و گرنگـی و بـایەخێکی زیـاتر بـدەنە کارەکەیـان. بۆیە ئەوانەی لە هەوڵـی ئەوەن ڕەوایەتـی بـدەنە کارەکانیـان، بە بێ پسـانەوە چەنـد دەربڕینێکـی وەك "بە پێی بیرۆکەی زانسـتی" یـان "لەژێـر ڕۆشـنایی زانسـتی" یـاخود "بە پێی دوایـن ژمـارە زانسـتییەکان" بەکـار دەهێنن. ئیدی ئەو وشە و ڕستە زانستییە، لە نووسین و کۆڕ و کۆبوونەوە و جڤینەکانیـان، زوو زوو دەهێنـنە زمـان و لەنـاو ئاخافتنەکانیـان بەکـاری دەهێـنن. بـۆ نمـوونە دەڵـێن "پەرتـووکێکی زانسـتی"، "ئاخـافتنێکی زانسـتی"، "سـیمینارێکی زانسـتی". ئەو جـۆرە دەربڕینانەش بێ وەستان و بیرکردنەوە بەکار دەهێنن. لە کاتێکدا بە هـیچ جۆرێـك ڕەچاوی نـاوەڕۆکی ڕێکـار و میتـۆدە زانسـتییەکان

ناکرێت و بە پێی زانستیش هەڵسوکەوتی لەگەڵ ناکرێت. چونکە هەر بە شێوەیەکی هەڕەمەکی و زارەکی و بەبێ بوونی هیچ پەیوەندییەك بە هزر و بیرۆکەی زانستی بەکار دەهێندرێت. جا هۆکاری ئەو جۆرە بەکارهێنانەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە، لە زانکۆ و دام و دەزگا میدیایەکان و دامەزراوەکانی حکوومەت و زانست و کارگێڕی زانستی، بیرۆکەی زانستی بە شێوەیەکی تەندروست و پێویست پێشنەکەوتووە.

زانکۆ ئەو شوێنە گرنگەیە کە زانستی لێ بەرهەمدێت. وەلێ لە زانکۆکان، جۆرێك لە نارێکخراوەیی هەیە لە بەکارهێنانی چەمکی زانست. دەگوترێ "زانست واقیعە" وەلێ ئەو واقیعیەتانەی ناو زانست، هەڵدەخەڵەتێندرێن و بەلارێدا دەبردرێن و، لە شوێنی ئەوان، بنەماکانی دەوڵەت و ئایدۆلۆژیای فەرمی بایەخی پێدەدرێت. بۆیە ئەگەر ئەمڕۆ لە نێوان مامۆستا و پرۆفیسۆرەکانی زانکۆدا، سەبارەت بە زانست و ڕێکارە زانستییەکان تاقیکردنەوەیەك بکرێ، ئەوانەی دەتوانن وەڵامی ڕاست بدەنەوە، پێم وایە ژمارەیان زۆر کەم بێ. چونکە وەڵامی زۆربەیان لەوە تێپەڕ ناکات کە بڵێن "بانگی مزگەوت بێدەنگ ناکرێ و ئاڵامان نایەتە خوارەوە". بە تایبەتی لە بەشی زانستە مرۆڤایەتیەکان و بەشە یاساییەکان و بەشەکانی شەریعە، دۆخەکە زۆر مەترسیدارە.

## ناوەندی زانست و ڕەخنەی ئازاد و ئایدۆلۆژیای فەرمی

زانست، پێڤاژۆیێکی هزرییە. میتۆلۆژیا و میتافیزیك و ئاین و هونەر و ئەدەبیاتیش، وەك ڕێکاری زانستی پەسند دەکرێت. چونکە ئەوە لە مێژووی گەشەسەندنی کۆمەڵگاکان و سروشتی مرۆڤایەتی و دیرۆك و کۆمەڵگا و مانا مرۆڤایەتیەکاندا دەبیندرێت. ئەوەی واشدەکات ئەوە لە هزر و بیرۆکە زانستییەکان گرنگتر و بە نرختر بکات، زانیارییە پێشکەشکراوەکانی سیستەماتیکی زانست و مانەوەیانە.

گرنگترین تایبەتمەندی ڕێکارە زانستییەکان، لە کەشێکی ڕەخنەگرانەی ئازاد بەرهەمدێت. بە مانایەکی دیکە، زانست، تەنیا لە دۆخێکی ئازادی بێسنووردا دەتوانێ ئەرکی خۆی جێبەجێ بکات و بیهێنێتە کایەوە. بۆیە لەو کۆمەڵگایانەی قەدەغەیی بیرکردنەوە بە دامەزراوەیی کراوە و قەدەغەکان ڕۆڵیان لە دیاری کردنی سیستەمی سیاسی هەیە، زانست لەوێ بە هیچ شێوەیەك خونچە ناکا و توانای کرانەوە و گەشەکردنیشی نابێت. بۆیە لە وەها جڤاتێکدا کە بنەمای دەوڵەت ئایدۆلۆژیای فەرمی و قەدەغەیی بیر و هزر بێت، ئەو قەدەغەکارییەش بەشێوەیەکی مکوڕانە لەهەموو دام و دەزگایەکی وڵاتدا بەردەوامی خۆی بچەسپێنێت، ئەوە بە دڵنیاییەوە پێشکەوتنی زانستی دەخنکێندرێ و هیچ ڕۆڵێکی بەرچاوی نابێت. بۆیە پیادەکردنی بۆچوونی فەرمی

لە کۆمەڵگا نادیموکراتەکاندا، زۆر کاریگەری زیاتر و چەتوونترە. بەو پێیەی لە کولتووری سیاسی کۆمەڵگا دیموکراتەکاندا، ئایدۆلۆژیای فەرمی خاوەنی ئەو هێزی داپڵۆسینە نییە لەسەر دامەزراوە و تاکەکانی کۆمەڵگا. کەچی لە هەندێك جڤات، وەك ئەوەی لە ڕاستیدا بوونی هەبێت، لە پێناو شاردنەوەی هەندێك دۆخ و گۆڕانی سیاسی و ئامانجی تایبەت، باس لە زانست و ناوەندەکانی زانست و دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤ و یاساکان دەکرێت و لەزاران نابڕێتەوە. جا دەبێ لەوە ئاگادار بین، ئازادی لە ڕەخنەگرتن، تەنیا سوود بە زانست ناگەیەنێت، بەڵکو پایەیەکی گرنگی ژێرخانی دیموکراسیش پێکدەهێنێت. وەك چۆن ڕۆڵێکی گرنگ لە فەلسەفە و هونەر و وێژەشدا دەگێڕێ. بۆیە ئەگەر لەهەر کۆمەڵگایەك، ئازادی تانەگرتن هەبوو، ئەوە بە دڵنیاییەوە چەتە و مافیاش لەناو دام و دەزگاکانی حکوومەت و دەوڵەت بوونیان نابێ. وەك چۆن بەرپرس و دەسەڵاتدارانی حکوومەت و دەوڵەتیش، تێکەڵی کاری بەرتیل وەرگرتن و هەڵخەڵەتاندن و ڕکابەری ناشەریفانە و تاوان کردن نابنەوە و، بە دوای کۆکردنەوەی ماڵ و سەروەتێکی نا ئەخلاقیش نابن. چونکە کارکردنی دامەزراوەی ڕەخنەگرتنی ئازادانە، وادەکات ئەو جۆرە پەیوەندییە مەترسیدارە نهێنییانە، بە پەنهانی نەمێننەوە و هەر ڕووداوێکی وەهاش، لەگەڵ ئاشکرابوونی، لە ماوەیەکی زۆر کورتدا ڕووبەڕووی دادگا دەکرێتەوە و ئەوانیش بە پێی یاسا و ڕێسای وڵات، لەماوەیەکی دیاری کراودا ئەنجامی دادگایی کردن بەسەر ئەو بەرپرسانەدا بڵاو دەکەنەوە.

ناوەندی زانستی بە مانای چی دێت؟ یاخود دامەزراوەی

زانستی چۆن پێشدەکەوێت؟ دەمەوێ لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا بڵێم، ئەگەر لەسەر هەر مژارێك ئێوە بیرۆکەیەکی خۆتان بەیان دەکەن و بەرامبەر ئاشکراکردنی ئەو بیرۆکەشتان بە هیچ جۆرێك سزا نادرێن، هەروەها بەرامبەر ئەوەش هەر یەکێك بتوانێت ڕەخنە لەو بیرۆکەیەی ئێوە بگرێت، هەروەها ئەو ڕەخنەگرتنە بە شێوەیەکی ئازادانە بکرێت و بڵاو بکرێتەوە، بە هۆی تانەکانیشەوە، ئەو کەسەی ڕەخنەی گرتووە، ڕووبەڕووی هیچ سزایەکی دەوڵەت نەبێتەوە، ئەوا لەناو ئەو کۆمەڵگا و سیستەمی سیاسی ئەو دەوڵەتەدا ئازادی و دیموکراسی هەیە. بە لایەکی دیکەدا، ئەمانەی سەرەوە دێنە ئەو مانایەی، لە کولتووری سیاسی ئەو نەتەوەیەدا، ناوەندی زانستی گەشەی کردووە و قۆناغی خونچەکردنی تێپەڕاندووە.

## وەبەرهێنانی زانست و زانکۆ تورکییەکان

مژاری سەرەکی ئەوەی لەو بەشە دەینووسم، تایبەت نییە بە ڕێکارەکانی زانست. بەڵکوو بریتییە لە دەرخستنی، هەڵوێستی هێزی دەوڵەت و زانکۆ و دەزگا میدیایەکان و دادگا و نووسەران، دژی بوونی ڕەخنەی ئازاد، کە بە بنەمایەکی گرنگی زانست دادەندرێت. هەروەها لێرە باس لەوەش دەکەین بۆچی ناوەندە زانستییەکان پێشناکەون و زانکۆ تورکییەکان لەوبارەیەوە چۆن کاردەکەن؟

ئەمڕۆ لە تورکیا، ئاشکراکردنی بیر و بۆچوونەکانمان، وەکوو

ئەنجامدانی تاوانێکی زۆر گران سەیردەکرێ. بۆیە دەتوانین بڵێین، لە دۆخی سیاسیی ئەمڕۆی تورکیادا، گرانترین تاوان، بریتییە لەو لێکۆڵینەوە و نووسینانەی سەبارەت بە کورد دەنووسرێن و ڕەخنە لە ئایدۆلۆژیای فەرمی دەگرن. وەلێ لێرە ئەو کێشەیەی پێویستە ئێمە لەسەری بووەستین، لایەنێکی خەمهێن و تراژیدی هەیە. بۆیە پێویستە ئاوڕ لەو لایەنەش بدەینەوە و، بچینە ناواخنییەوە. مرۆڤەکان دەبێ هەندێك شت هەیە بیزانن لەسەر ئەو مژارەی بە (تاوانی بەیانکردنی بیر و بۆچوون) دادەنرێت. ئەو کەسانەی هیچ شتێك لەبارەی ئەو بابەتەوە نازانن، بەیانی هزریشیان نابێ. جا بۆ فێربوونی بابەتێکیش، دەبێ سەرەتا مەراقی زانینی ئەو مژارە لەناخیاندا چەکەرە بکات و، دواتر لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەن و، بپرسن و بەدوایدا بگەڕێن و لەبارەیەوە گفتوگۆ بکەن. ڕووداوە سروشتی و کۆمەڵایەتیەکان، لەسەر مژارە جڤاتیەکان، بە هەوەس و تاسەوە دەست پێدەکات؛ پاشان دەست بە پرسیارکردن دەکات لە خودی خۆی، جا لەو بارەیەوە دەست دەکاتە بنکۆڵکاری، بۆ دۆزینەوەی وەڵامی ئەو پرسیارانەی لە خۆی کردووە لەسەر ئەو مژارە. دواتر پێویستی بەوەیە، بۆ گەیشتن بە ڕاستی بویەرەکان، دەست بە لێکۆڵینەوە بکات. ئەمەش پێویستی بە شەقی بوونێکی زۆری هزری و ماندووبونێکی زۆری مەیدانی و تێچوونێکی زۆری دارایـیە. بە پێچەوانەوە، ئەگەر هات و مژارێك سەرنجی کەسێك ڕانەکێشێت و مەراقی لا چێنەبێت و لەسەر ئەو مژارە هیچ نەزانێت و لەوەش خراپتر، نەزانێت کە هیچ لەو مژارە نازانێت، بۆیە بەیانی هزری ئەو کەسە لەسەر مژارەکە دەبێ چۆن بێ؟ بۆیە لێرە دەگەینە ئەو باوەڕەی، ئەوەی تووشی سزا و تاوان

دەبێتەوە، بریتیە لە قۆناغەکانی زانین لەسەر مژارەکان و فراوانکردنی زانیارییەکان بۆ گەیشتن بە ڕاستی و ناواخانی ڕاستی بابەتەکە. بەڵام ئەوەی لە ڕاستیدا سزا دەدرێت، بریتیە لە داهاتووی کۆمەڵگا و وڵات. چونکە هەست بە بوونی وەها سیاسەتێك دەکرێت، کە نایەوێت هەندێك بابەت هەیە بزاندرێت، بۆ ئەوەی تاکەکانی ناو کۆمەڵگا لەو بارەیەوە بەردەوام بێ زانیاری و زانین بمێننەوە. بۆیە لەهەمبەر ئەمە کار بۆ ئەوە دەکەن، بیروبۆچوونی دەوڵەت و ئایدۆلۆژیای فەرمی زاڵ و دەسەڵاتدار بێت بەسەر هەموو بیر و بۆچوونەکانی دیکە.

بیرکردنەوەی زانستی و سزای تاوانەکان و چاودێری خودی

هەرەشەی سزادان، بۆ ئەوەیە تا، لێکۆڵەرەوان نەتوانن بە ئازادی بیر و هزری خۆیان بەیان بکەن. ئەمەش بۆ ئەوە دەکەن تا لێکۆڵینەوە سەبارەت بە هەندێك بابەت نەکەن و ببنە ڕێگر لەبەردەمیان. یانیش زۆر چاودێری و ڕێگری دەخەنە سەر خودی توێژەرەکان. جا ئەو جۆرە لە چاودێری کردن و سانسۆر کردنە، وا دەکات مێشکی مرۆڤ لە کار بخا و هەرچی هزری ناویەتی بیخنکێنێ، واتە بە جۆرێك لە جۆرەکان مردوو بێ و لەسەر پێیانی خۆی بێ. لە وەها دۆخێکدا، ڕەنگە توێژەر ڕووبەڕووی سزای ڕاستەوخۆ نەبێت، بەڵام ئاوای لێدەکەن تا قسە و ئاخافتنەکانی لەناو کۆمەڵگا کەس لێی تێنەگات و بەهایان نەمێنێت. جا ئەوەش بۆ وڵات و کۆمەڵگا زۆر مەترسیدارە. هەر ئەمەش وادەکات ژیانی هزری کوێر و بێ ڕووح بکات و بەرەو لەناو چوونی ببات.

قەدەغەییەکانی بیرکردنەوە، لەسەر خۆم و کەسانی دەوروبەرم چەندان سزای گران و سزای ماددی بەسەردا سەپاندووین. هەندێك نووسەر و میدیاکار و توێژەر، کاتێك باسی ژیانی خۆیان دەکەن و لەسەر مژاری جیاواز دەدوێن، باس لەوە دەکەن "هەموو کات هزر و بیری باوەڕپێکراوی خودی خۆم هێناوەتە زمان و یەك بست لە باسکردنی ڕاستییەکان لام نەداوە و پاشەکشەم لە گوتنیان نەکردووە. وەك چۆن هیچ کات لە وتنی بیروباوەڕەکانمدا سڵم نەکردووەتەوە". لە ڕاستیدا بەشێکی زۆری ئەو ڕوونکردنەوە و ئاخافتنانە ڕاست نین. چونکە ئەوە هەڵەیە ئەگەر بڵێین هەڕەشەکانی سزادان بێ کاریگەری بووینە. ها، ئەگەر هات و ئەو ڕوونکردنەوانەی لەسەرەوە باسم کردن، لە سەر بنەما و هاوتەریبی ئایدۆلۆژیای فەرمی بووبێ، ئەوە ڕاستە. بەڵام بۆ بەرگری کردن لە بۆچوونی فەرمی دەوڵەت، خۆ پێویستت بە ڕەخنەگرتنێکی ئازادانە نییە.

من زۆرێك لەو میدیاکار و نووسەر و لێکۆڵەرەوانە دەناسم، کە خۆیان پێ کەسی دیموکرات و شۆڕشگێڕ بوو، بەڵام دوای ئەوەی سزایەکی زۆر بچووك دران، ڕاستەوخۆ خۆیان ڕادەستی دەسەڵاتی سیاسیی سەردەمەکەی خۆیان و تەوژمی ئایدۆلۆژیای فەرمی کرد. یانی ماوەیەکی کورتی خستنە زیندانی ئەو جۆرە کەسانە، بەس بووە بۆ ئەوەی خۆیان ڕادەستی ناڕاستیەکان بکەن و لە ڕاستییەکان دوور بکەونەوە.

ماوە ماوە لە ڕێگای میدیا فەرمیەکانەوە هەندێك ڕوونکردنەوەی لەو شێوانەی خوارەوە بڵاو دەکرێتەوە "هیچ کەسێك نییە بە هۆی دەربڕینی بۆچوونەکانیەوە ئێستا لە زیندان

بێ..." یان "بەو دواییانە ژمارەی ئەو کەسانەی بە هۆی دەربڕینی بۆچوونەکانیانەوە دەخرێنە زیندان، ژمارەیان زۆر کەمی کردووە". "ژمارەی ئەو کەیسە یاساییانەی بە هۆی ئازادی ڕادەربڕینەوە لە دادگاکان دەکرێنەوە، ژمارەیان زۆر دابەزیووە". ئیدی چەندان بەیانی وەها دەخوێنینەوە و بەرگوێمان دەکەوێت. با وا گریمان بکەین، ئەو جۆرە ڕوونکردنەوە و بەیانانە ڕاستن! ئایا دەکرێ ئەوە وەکوو قۆناغێکی چوونە پێشی دیموکراتی بوونی دەوڵەت لێك بدەینەوە؟ لە کاتێکدا چەندان نووسەر و توێژەر و میدیاکار و مامۆستایانی زانکۆ بە گوتنی "دوور بن لە کارکردن لەسەر مژارە هەستیارەکان". خۆیان سانسۆری خۆیان دەکەن؟ پاشان بەبۆچوونی خۆشیان، ئەو وتەشیان بەوە پشتگیری دەکەن، گوایە ئەو جۆرە بابەتانە، لە دەرەوەی بازنەی زانستی و یاسان. بۆیە دەبێ ئەو جۆرە هەڵوێست و بۆچوونانە، بە مەوقیفێکی خزمەتکارانەی سیاسەتی دەوڵەت لێك بدرێتەوە، جا ئەو شێوەیەش لە لێکدانەوە، لایەنە ڕاستییەکەی بابەتەکەیە. من پێشتریش، ئاماژەم بەوەکردبوو کە ئەمانە هۆکاری کوێرکردنی زیهن و وەبەرهێنانی بیرکردنەوەی تازە و شەل کردنی پێڤاژۆی هزرین. هەر بۆیەش دەمەقاڵێیەکانی نێوان ڕێکخراوی مافی مرۆڤ و ئەنجومەنی میدیایی لەسەر "ژمارەی ڕۆژنامەنووسانی زیندان" لەو بارەیەوە مایەی بایەخ نییە. چونکە ئەگەر هەموو کەسێك بە پێی قەدەغەکاریەکانی بیرکردنەوە جوڵە بکات، دەشێ ژمارەی ڕۆژنامەنووسانی زیندان بگاتە سفریش. چونکە ملدان بۆ قەدەغەکاریەکانی بیرکردنەوە، دەبێتە هۆی وشك کردنی مێشکەکان و بێ کەڵك کەوتنیان. بۆیەش ئەنجومەنی میدیاکاران بە پێوەرێکی جیاواز، ژمارەی ئەو ڕۆژنامەنووسانەی زیندان دەخاتە ڕوو.

لە ماوەی بە دامەزراوەیی کردنی چاودێری کەسی، ئیدی قەدەغەییەکانی بیرکردنەوە، دۆخێکی دەروونی وەرگرتبوو. کاتێکیش قەدەغەکاری، حاڵێکی خودی وەرگرت، ئیدی بەر لەوەی مژارەکان بهێنرێتە زمان، بەر لە دەسەڵاتداران، ئەو کەسەی خاوەن بیرۆکەکەیە، قبووڵی ئەو جۆرە قەدەغەییە دەکات لەسەر هزری خۆیدا.

ئەو ڕۆژنامەنووسانەی لە زیندانن، پێك هاتوون لە پەیامنێران و بەڕێوەبەری نووسینی ڕۆژنامەکان و وتار نووسان و کاریکاتۆریستەکان و خاوەن ئیمتیازی ڕۆژنامەکان و خاوەنی وەشانخانەکان. وەلێ ناونیشانی (توێژەر و نووسەر) ناچێتە ناو ئەو خانەیەوە. ژمارەیەکی زۆر هەن، کە توێژینەوە و بنکۆڵکاری زانستی دەکەن، بەڵام ڕۆژنامەڤان نین. دەمەوێ ئەوەتان بۆ باس بکەم، کە چاودێری خودی و کەسی، یان ئەگەر بڵێین ئۆتۆسانسۆر، مەترسیەکی زۆر گەورەیە لەسەر داهاتووی هەر کۆمەڵگایەك. بۆیە لە وەها دۆخێکدا، ئەگەر هەبێت، ژمارەیەکی زۆر کەمی نووسەران لەسەر بیر و نووسینەکانیان دەخرێنە زیندانەوە. لەلایەکی دیکەوە، ئەوانەی لە زیندانەکان دەبینین، زیاتر، بەڕێوەبەری نووسینی ڕۆژنامەکان و خاوەن ئیمتیازەکان و خاوەنی وەشانخانەکانن، کە زیاتر کاری بەڕێوەبەردنی کارگێڕی ئەو شوێنانە دەکەن.

دەبێ ئەوە بڵێین کە، وەستان لەسەر هەندێك بابەت و بیرکردنەوە لە وەڵامی هەندێك پرسیار و لێکۆڵینەوە و بنکۆڵکاری لەسەر ئەو جۆرە مژارانە، ئەگەر ڕەخنەگرتن بێت لە ئایدۆلۆژیای فەرمی، ئەوە بە دڵنیاییەوە دەچێتە ناوچوارچێوەی قەدەغەکاری. بۆ

ئەمەش دەسەڵاتداران بە بەردەوامی، دەستوور و یاساکانی سزادان و یاسای بەرەنگاربوونەوەی تیرۆر، دەهێننە زمان و بە گوێماندا دەیچرپێنن. بۆیە بە بۆچوونی من، ڕێك دەبێ لە وەها کاتێکدا، لێکۆڵینەوە بۆ ئەوە بکەین، ئاخۆ کامە جۆر لە بیرکردنەوە قەدەغەیە و کامە هزر دەبێتە هۆی سزادان؟ چونکە هەندێك لە بۆچوون هەیە، لەلایەن دەوڵەتەوە بە پێداگیریەوە داوای بەیان کردنی لێدەکرێ و هەر دەوڵەتیش ڕێگا خۆش دەکات بۆ بڵاوکردنەوەیان، چونکە بە وردبوونەوە و لێکۆڵینەوەیان کارێکی سوود بەخش دێتە بوون، بە دڵنیاییشەوە لەبەرژەوەندی بۆچوونی فەرمی. لە کاتێکدا قەدەغەیی بیرکردنەوە، لە کاری سیاسیدا مژارێکی دیکەیە. جا پێداگیری کردن لەسەر بەردەوامی دان بە قەدەغەیی بیرکردنەوە، بە واتای ئەوە دێت، کە هانی ئەو کەسانە بدرێت تا بەرەو ئەنجامدانی تاوانی بڕۆن لە هەمبەر کۆمەڵگا و چێکردنی پەیوەندی نهێنی و شاراوە. جا ئەگەر هات و دەوڵەت تاوانە کۆمەڵایەتی و سیاسی و کەسیەکان نەخاتە بواری جێبەجێکردنەوە، ئەوە قەدەغەیی بیرکردنەوەش وەك پێویستیەکی دەوڵەت گرنگی نامێنێ.

قەدەغەیی بیرکردنەوە، بۆ هەندێك لە میدیاکاران و توێژەران و مامۆستایانی زانکۆ، زۆر بە کارێکی سروشتی لێك دەدرێتەوە. ئەوان بەردەوام دەڵێن "من-ئێمە، نیشتیمان پەروەرین، گەل و وڵاتی خۆمان زۆر خۆشدەوێ، بۆیە گوێڕایەڵی ئەو قەدەغەکاریانە دەبین کە دەوڵەت سەپاندوویەتی. لە ڕاستیشدا زانستێکی ڕاست هەر ئاوا دەبێ. چونکە زانستی ڕاستەقینە ناتوانێ چاوپۆشی لەو جۆرە قەدەغەکارییە مرۆییانە بکات. بە دڵنیایەوە دەوڵەت شتێك

دەزانیٚ، بۆیە ئەو جۆرە قەدەغەکارییانەی داناوە. جا ئەو شتانەی دەوڵەت دەیزانێت، نابێ کەس و لایەنی دیکە بیزانن. جا ئەگەر بشیانەوێت، ئەو جۆرە بابەتانە بشزانن، بەڵام زانیارییەکان شتێك نین، هەموو کەس توانای تێگەیشتنی هەبێت...". دەبینین بەهانەیان بۆ ڕووبەڕوونەبوونەوەی ئایدۆلۆژیای فەرمی بریتیە لە خۆشەویستی نیشتیمان. جا لە ڕاستیدا بەو بۆچوونە دەڵێن حیکمەتی حکوومەت، یان، حیکمەتی دەوڵەت. ئەو بۆچوونەی پێی وایە پرسیار لە حیکمەتی دەوڵەت ناکرێ، لە بارێکدا بنەمای هەرە سەرەکی ڕێکاری زانستی بریتیە لە ڕەخنەی ئازاد، لە کاتێکدا ئەوانەشمان لێ دیارە کە دەڵێن "ئێمە نیشتیمان پەروەرین" جا لەناو ئەو توێژە، زۆربەیان سیاسەتمەدار و کاربەدەستانی حکوومەتن و بینیشمان، لە لیستی پێشکەشکردنی فۆرمی سەروەت و سامانیان بۆ سەرۆکایەتی پەرلەمانی تورکیا و دام و دەزگاکانی دیکە، ئەوان بە ڕاستی چیان خۆشویستووە!

لەبەشەکانی پێشوو باسم لەوە کرد، لە هەل و مەرجی ئەمڕۆی تورکیا، دەربڕینی بیروبۆچوونەکانمان، ڕووبەڕووی سزا دەبێتەوە؛ جا تاوانی دەربڕینی هزر و بیریشمان بە تاوانێکی زۆر گەورە هەژمار دەکرێ؛ هەتا دەتوانم بڵێم کە بە گەورەترین تاوان دادەنرێت. دەشتوانرێ ئەو بۆچوونە بەو شێوەیە زیاتر ڕوون بکەینەوە. بۆ نموونە: با بیر لە کەسێك بکەینەوە کە تاوانێکی کۆمەڵایەتی وەك دزی، هەڵخەڵەتاندن، دەستبەسەرداگرتنی بە زۆرە ملێ، برینداركردن، یان هەر تاوانێکی دیکەی جڤاکی کردبێ. ئەو کەسەی تاوانەکە دەکات، بە جارێك بە ئامانجەکەی دەگات، بۆیە ڕەنگە پێویست نەکات جارێکی دیکە تاوانەکە

دووباره بکاتەوە. له کاتێکدا، لەهەر مژارێکی دیکەدا، بۆ نموونه لەسەر پرسی کورددا، کەسێك که بۆچوونی خۆی دەربڕێت، له جارێك زیاتر پێویستی به نووسینی وتار و ڕاپۆرت هەیە. لەسەر هەمان مژار، چەندان پەرتووك بڵاو دەکاتەوە و لەبارەیەوە دەدوێت. هەروەها به پێویستی دەزانێ تا بەردەوام وەڵامی ئەو ڕەخنانه بداتەوە که سەبارەت بەبیروبۆچوونەکەی ڕەخنەیان لێگرتووە. بۆیه ئەگەری ئەوەی لەسەر هەر پەرتووك و وتارێکی، دۆسیەیەکی دادگایی کردنی لەهەمبەر بکرێتەوە و سزای جیا جیا بدرێت، زۆرە، کەم نییه.

کاتێك باس له (تاوانی بەیانی هزری) دەکرێت، گرنگه باس له ڕۆڵی دادگاش بکەین لەو پێڤاژۆیەدا. ئەو کەسەی دۆسیەی لەسەر دەکرێتەوە، به تۆمەتی ئەوەی بیرۆکەکانی تاوانن، دەتوانێ بەرامبەر دادگا بەرگری له خۆیی و تاوان نەبوونی بیرۆکەکانی بکات. جا له دادگا و دانیشتنەکانیدا، له ڕێگای ئەو بەرگریانەی دەیکات، دەتوانێ بەرگری لەو هزره بکات که ئەو بەیانی کردووە و داواکاری گشتی به تاوانی داناوە. کەسی داوا لەسەر کراوە، دەتوانێ ئەو بەرگرینامانه و بەڵگەکانی پێڤاژۆی بەڕێوەچوونی دادگایی کردنەکەشی بڵاو بکاتەوە. بەڵام ئەمه به تێگەیشتنی لۆژیکی سزای تورکی، بریتیه له ئەنجامدانی تاوانێکی دیکه، بۆیه ڕەنگه هەر بەو لۆژیکه داوایەکی دیکەشی لەسەر بکرێتەوە. بەو شێوەیه بەرگرینامەکانیش تۆمەتبار دەکرێنەوە و سزا دەدرێنەوە. بۆیه بەو شێوەیه تا کۆتا هاتنی پێڤاژۆی دادگایی کردنەکە، پێویستی بەرگری کردن له بەرگرینامەکان، درێژ دەبێتەوە. بەم شێوەیەش، تا تەمەن ماوە هەستی تۆمەتبار کردن دێته ئاراوە. جا ئەمه بەلای کەمی له ڕووی تیۆرییەوە ڕاسته.

گـرتن لەژێـر چـاودێری ئەولەکـاری گشـتی و سـزای مـاددی گران .

لە وەهـا دۆخ و بـارێکی وەك ئەمـڕۆی تورکیـا، هەژمـارکردنی بەیــانی بیــر و بۆچــوون بە تــاوانێکی زۆر گەورە دادەنــرێ و سزادانێشـی بە زینـدانیکردن کۆتـایی دێ؛ لەپاڵ خسـتنە زینـدانیش سەپاندنی چەندان سزای دیکە، کە پەیوەندی بە دۆخی سیاسی و کـۆمەڵایەتییەوە هەیە. بەر لە سـاڵی ١٩٩١، بـۆ دادگـایی کـردن و سـزادانی تـاوانی بیروبۆچـوون، مـاددەی ١٤١-١٤٢ بەکـار دەهـات. لەوێ دەمێدا، دەربڕینی گرتن لەژێر چاودێری ئەولەکاری گشتی، وەکوو سزای دوورخستنەوە و ڕاگواستن دیاری دەکرا. هەرچی تـایبەتە بە دوای سـاڵی ١٩٩١، سـزای لێبـارکردن، بە سـزایەکی ماددی زۆر بڕیاری لێوە دەدرا. بـۆ نموونە لە پرسـی کـورددا، لە مژاری ئەو کێشـانەی کـورد ڕووبەڕوویـان دەبـۆوە، ئەو تـوێژەر و لێکـۆڵینەوانەی ئاخـافتن و نووسـینەکانیان بە دژی ئایـدۆلۆژیای فەرمی هەژمار دەکرا، جگە لە سزای ماوە درێژەی زینداني کردن، سزای ماددی بە بڕی ٢٥٠ ملیۆن تا ٤٠٠ ملیۆن لیرە سزا دەدران...

لە دوای سـاڵی ١٩٩١، دوای ئەوەی کـار بە یاسـای بەرەنگـاربوونەوەی تیـرۆر کـرا، ئیـدی بۆچـوون و بیروبـاوەڕی هزری، لەسەر پرسی کـورد و کێشـەکەیان، لە چوارچێوەی تیرۆر شرۆڤەی بۆ دەکرا. بۆیەش ئەو سزایانەی بەسەر ئەو کەسایەتیانە دەسـەپێندرا کە کاریـان لەسـەر ئەو مـژارە دەکـرد، لەژێـر بارودۆخێکی زۆر قورس، لە زینداني تایبەت جێبەجێدەکرا.

یەکێکـی دیـکە لەو هۆکـارانەی وایکـرد (تـاوانی بەیـانی

بیروبۆچوون) بکاتە تاوانێکی گەورە، بریتی بوو لە بەڕێوەچوونی دۆسیەی سزادان لەسەر چەندان کەسایەتی؛ چونکە کاتێك پەرتووکێك قەدەغە دەکرا و نووسەرەکەی داوای لەسەر دەکراوە، لەپاڵ ئەو، خاوەنی وەشانخانەکەش دۆسیەیەکی لەسەر هەمان مژار بۆ دەکراوە؛ ئەگەر لەسەر نووسینی وتار، یان ڕاپۆرتێکیش، دوای بڵاوبوونەوەی لە میدیای نووسراو، نووسەرەکە ڕووبەڕووی دادگا کرابــاوە، لە پــاڵ ئەو، بەڕێــوەبەری نووســینی ئەو دەزگــایە و بەرپرسانی کارگێڕیش هەمان چارەنووسیان بەسەردا دەهات، واتا کارەکە تەنیا بە سزادانی نووسەرەکە کۆتایی نەدەهات.

بۆ نموونە، ئەگەر هات و سزایەکی گران، یاخود سزایەکی ماددی بەسەر نووسەرەکە سەپێندرابا، لەهەمان کات ئەو سزایە بەســەر خــاوەنی وەشــانخانەکە، یــاخود بەســەر سەرنووســەر و بەرپرسانی ڕۆژنامە یان گۆڤارەکەش دەهات. لە کاتێکدا سەرەتا بڕیــاری قەدەغەیــی بــۆ پەرتــووکەکە دەردەچــوو و ڕێگایــان لە بڵاوکردنەوە و فرۆشتنی دەگرت. جا لە پاڵ ئەمانە، بۆ نموونە، ئەگەر هات و سزایەکی ماددی بەسەر نووسەرێك سەپێندرابا، لەسەر بڵاوکردنەوەی پەرتووکێك، کیتابەکە ئەگەر هەموو ژمارەی تیراژەکەشی لێ فرۆشرابا، کەچی ئەو بڕە پارەیەی لە فرۆشتنی تەواوی پەرتــووکەکە دەســتدەکەوت، نەیــدەکردە بەشــێکی زۆر بچووکی ئەو بڕە پارەی دادگا وەك سزا بەسەر نووسەر و خاوەنی وەشانخانەکەی سەپاندبووی.

**ئایا سەربەخۆیی زانکۆ، دەشێ هیچ دەرفەتێکی بیرکردنەوەی ئازادی تێدا نەبێ؟**

بە دڵنیاییەوە و بێ هیچ گومانێک، قەدەغەیی بیرکردنەوە، پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە پرۆسێسی بیرکردنەوەوە هەیە. زانکۆ و میدیا و نووسەران و ناوەندە جیاکانی هونەر و فەرهەنگ، ئەو شوێنانەن کە پەیوەندیان بە ژیانی هزرییەوە هەیە؛ بۆیە فکر، لەو شوێنانەوە نەش و نما دەکات، خونچە دەردەکات و پێدەگات. وەلێ زانکۆ تورکییەکان، بەرامبەر بە قەدەغەیی هزر و ڕا، هیچ هەڵوێستێکیان نییە. بۆیە من پێم وانییە کە زانکۆ تورکییەکان لەو باوەڕەدابن، کە دامەزراوەی ڕەخنەی ئازادانە، بنەمایەکە بۆ دامەزراوەی زانستی ڕاستەقینە. بەو پێیەی، زانکۆ تورکییەکان هیچ هەڵوێست و نوزەیەکیان نییە، لەسەر ئەو لێکۆڵەر و نووسەرانەی بە هۆی بیروباوەڕەکانیانەوە، بەردەوام و بێ پسانەوە، لەژێر هەڕەشەی دەوڵەتدان. ئەوان لەو پێشاژۆیەدا، چاو و گوێچکە و زاری خۆیان داخستووە و نایانەوێت هیچ ببیستن و هیچ ببینن و شتێکیش بێژن. جا هەر ئەوەندە نا، بەڵکو هەندێك نفیسکار و پرۆفیسۆریان هەیە، دژی ئازادی دەربڕینی بیروباوەڕن و بەیانی هزریان پێ تاوانە. بۆیە دەشێ بڵێین، زانکۆکانی تورك، لەهەمبەر پرۆسێسی ئازادی بیروباوەڕ و ئازادی ڕەخنەیین و بۆ ئەمەش بە شێوەیەکی کارا لە چالاکیدان. بۆیە زانکۆ تورکییەکان، هەست بەوە ناکەن و نازانن، کە دەبێ بەرامبەر ئەوە بووەستنەوە کە نابێ هزر بخرێتە ژێر هەڕەشە و ڕەخنەگرتنی ئازادانە قەدەغە بکرێ و ڕێ لە بۆگەنکردنی بیری زانستی بگیردرێت و بەرامبەر ئەو سیاسەتانەی دەوڵەت بووەستنەوە. بۆیە دەبینین ئێستا زانکۆکان مژوولی

هەڵبژاردنی سەرۆکی زانکۆ و ڕاگری کۆلێژ و جیاکردنەوە بەش و پەیمانگاکان و مووچەی مامۆستاکانی و هەندێك کاری دیکەی تەکنیکی ناو زانکۆن. جا لەپاڵ ئەو کارە تەکنیکیانە، تا ساڵی ٢٠١٠، جار نا جارێك، بە دەنگێکی کز هەندێك هەڵوێستیان دەردەخست، بەڵام لەوێ ساڵێ بەدواوە، ئیدی ئەو تروسکاییەش نەما و هیچ دەسەڵاتێکیان بە دەستەوە نەما و قڕ و قەپ لێی کەوتن. لەهەمبەر بێدەنگکردنی ڕەخنە و هزری ئازادیش دەستەوەستان مانەوە، لە کاتێکدا پێشکەوتن و وەبەرهێنانی زانستی بە بێ بوونی ڕەخنەی ئازاد و هزری ئازاد، کاری نەکردەیە. بۆیە ئیدی لە هەر شوێن و وڵاتێك ڕەخنەی ئازادانە نەبوو و قەدەغەکاری شوێنی گرتەوە، بە دڵنیایەوە ئەو مێشکانەی بە مێشکی زانست و پێشکەوتن دادەنرێن، لەو وڵاتە زیاد ناکەن و بەرەو پاشەوە دەبنەوە.

تاوەکوو ئێستا لە ماددەی ٤ و ٥ ی یاسای خوێندنی باڵای ژمارە ٢٥٤٧ی دەرچووی بەرواری ٠٦-١١-١٩٨١ تێناگەین و پێویستی بە ڕوونکردنەوەی زێدەترە. ئەو ماددانە بەیانی هزری بەرتەسك دەکاتەوە و دەیخاتە ناو چوارچێوەیەکی تەنگ و بە ئایدۆلۆژیای فەرمی و چەند حوکمی دیکە، دەوری تەم و تاریك دەکا. بۆیە بەو هەموو حوکمە نا ڕوون و قەدەغەکاریانە، پێشکەوتنی زانست و زۆربوونی لێکۆڵەرەوەی خاوەن هزر و مەعریفە و پرۆفیسۆری ئەکادیمی قابیلی بوون نییە. لە شوێنێکی وەهادا، کە ئازادی بەیانی هزری لە وەها حاڵێکدا بێت و چوارچێوەی کارە بەرتەسکەکەی بە زنجیر و تەناف دەورەدرابێ، ئازادی زانستیش بە هیچ کلۆجێك نایەتە بوون. چونکە بنەمای

پێشـــکەوتنی زانســـت، بە بـــێ نیقـــاش و هـــیچ بێـــنە بەردەیەك ســـەرچاوەکەی لە بـــوونی ئـــازادییەکی هـــزری بـــێ ســـنوور و ڕەخنەگرتنی ئازادانە دەستپێدەکات. بۆیە لەم ڕووەوە شەن و کەو کردنی یاسای خوێندنی باڵای ژمارە ٥٣/ C-7 کارێکی گرنگە؛ چـونکە بەو هەمـوو قەدەغەکـارییەوە، یەڵا دەتـوانرێ تـوێژەر و پرۆفیسۆری خاوەن زیهنیەتـی مەئموری، بەنـاو کەسانی زانستـی دروست بکا و هیچی دیکە. چونکە یاسای خوێندنی باڵا، هیچ مەرام و ئامـانجێکی نیـیە بـۆ وەبەرهێنـانی ناوەنـدێکی وا، بـۆ پێشکەوتن و وەبەرهێنانی زانستی سەربەخۆ و ئازادانە. لە کاتێکدا بە پێی یاسای زانکۆکانی ژمارە ١٧٥٠ی دەرچووی ٠٧-٠٧-١٩٧٣، کاری لەسەر ئەوە دەکرد چۆن دەتوانرێ کار لەسەر پێگەیاندنی خوێنـدکار بکـرێ لەســەر چـۆنیەتی بـاوەڕ و پرەنسـیپ. بـۆیە وردبوونەوە لە ماددەی ژمارە سێی ئەو یاسایە زۆر گرنگە. لەبەر ئەوەی دەبـــێ پێـــداگیری لەســـەر ئەوە بکـــرێ، ئەم یاســـایانە لەسەردەمێکی حوکمی سەربازی، یاخود کەمێك پاش، یان پێش، سەردەمی سەربازی دەرچووە. چونکە ئەگەر سەیری ماددەی سێی یاسای زانکۆکانی ژمارە ٤٩٣٦ی ساڵی ١٩٤٦ بکەین، ناوەڕۆکەکەی تۆزێك جیاوازترە. بۆیە دەبێ ئەو یاسایە لەگەڵ دوو یاساکەی دوای خـــۆی بەراورد بکرێـــت. چـــونکە لەو بـــاوەڕەدام، لەو بەراوردکـــردنەدا، زانیـــاری گرنـــگ لە ڕووی پێشـــکەوتنی کۆمەڵایەتی و سیاسی، لە کاروباری زانکۆکان دەردەخات.

هەمـوو لایەك لەو بـاوەڕەدان زانکۆکـان لـە سـەردەمی ئـاك پارتییەوە، بە تایبەتیش لە ماوەی نێوان ٢٠١٥ تا ٢٠٢٠ ئاوای لـێ بەسەر هێندراوە. لە کاتێکدا، بەر لەو سەردەمەش بەڕاستی شتێك

نەمابوو بە ناوی زانکۆ. چونکە بە بێ هیچ گومانێك، هەر حکوومەتێك، لەگەڵ هاتنی، هەوڵی ئەوەی داوە بیروهزر و کاروکردەوەی زانکۆکان لە پێناو بەرژەوەندی خۆی ڕێك بخات و لە قاڵبیان بدات. بەڵام لە وەها بارودۆخێکدا کە زانکۆیەکی ڕاستەقینە بوونی هەبووبا، مەحاڵ بوو (دامەزراوەی خوێندنی باڵا) لە ساڵی ١٩٨١ بێتە بوون.

یاسای زانکۆکانی ژمارە ١٧٥٠، لە ساڵی ١٩٧٣ زانکۆیەکی ڕاستەقینەی وەبەرنەهێنا.

یاسای زانکۆکانی ژمارە ٤٩٣٦ی ساڵی ١٩٤٦ دەرگایەکی نەکردەوە بۆ زانکۆیەکی ڕاستەقینە.

ساڵی ١٩٣٣ گواستنەوەی دارول فنوون بۆ زانکۆ، نەبووە هۆی ئەوەی دامەزراوەیەکی ڕاستەقینە، بە ناوی زانکۆ دروست بێت. جا لە هەموو سەردەمەکان، بە سەردەمی کودەتا سەربازیەکانیشەوە، بەرپرسانی دەسەڵاتداری سیاسی، دەبوونە ڕێبەری بەرپرسانی سەرەکی زانکۆ.

## دەستنەبردن بۆ مژارە "هەستیارەکان"

لە سەردەمی کۆماردا، دەسەڵاتی سیاسی ئاڕاستەیەکی گرنگی بە ئەکادیمیا دابوو. بەوەی ڕێگا نەدەدرا بۆ ئەنجامدانی توێژینەوە و لێکۆڵینەوە لەسەر مژاری، (ئەوەی لە تورکیا دەژی تورکە و، شتێك نییە بە ناوی کورد و ئەو کارەساتانەی بەسەر گەلی کورد هات لە دوای دامەزراندنی کۆمار؟) ئاڕاستەی دووەم تایبەت بە ئەرمەنیەکان بوو، سەبارەت بە مژاری ئەوی (لە ساڵی ١٩١٥ چی

بەسەر ئەرمەنیەکان هاتبوو و ماڵ و موڵکی ئەرمەنیەکان کەوتبووە بەر دەستی کێ؟). ئیدی نەدەبوو هیچ توێژینەوە و لێکۆڵینەوەیەك لەسەر ئەو مژارانەش بکرێ. ئەو فەرمانانەش بە نهێنی و بە شێوەی نووسراو ئاڕاستەی زانکۆکان کرابوو.

ناوەندە ئەکادیمیەکان، بە بێ هیچ کێماسییەك، سەتا سەت، پەیڕەوییان لەو فەرمانە دەکرد. ئیدی دوای کۆمار، ئەو شەرم و دزێوییە، لەناو ڕێکخستنەکانی زانکۆ و ناوەندە ئەکادیمیەکان هێ بوونی هەبوو. لەگەڵ ئەوەش بە وردی و حەساسیەتەوە بەدواداچوونیان بۆ جێبەجێکردن، یان نەکردنی ئەو فەرمانە دەکردەوە.

لێرەدا، نادادییەکی ئاشکرا و ڕوون هەیە. وەلێ بە هۆی ئەوەی پاڵەپەستۆیەکی ئەوەندە زۆر لەسەر بیرکردنەوە هەبوو، لەپاڵ ئەمەش ترس و هەڕەشەیەکی ئەوەندە زیدە هەبوو کە ببووە ڕێگر لەبەردەم هێنانە زمانی ئەو نادادپەروەرییە. بەشێوەیەك کاریگەری و گوشار لەسەر ژیانی ئەکادیمی و هزری هەبوو، نا دادییەکان لەناو تاریکییەکی بێدەنگ حەشار درابوون و ویژادنیان زمان بڕ کردبوو. لەلایەکی دیکەوە، بۆ ئەوان ئەو جۆرە لە پاڵەپەستۆیە، وایکردبوو و مرۆڤەکان و پرۆفیسۆرەکان بە هێسانتر بێنە ژێر باری ئەو کولتوورەی دەسەڵات دەیویست بیسەپێنێت، جا بە شێوەیەکی سەرنج ڕاکێشتر.

ژمارەیەك پرۆفیسۆری زۆر، دوای ئەوەی ئازادییەکانیان بەرتەسککراوە، ساڵی ١٩٣٣ لەدەست زوڵمی نازیەکان، ئەڵمانیایان جێهێشت و بە هەموو دنیادا وەکوو پەنابەر بڵاوبوونەوە. بەشێك

لەوان، هاتنە تورکیا. دەتوانین بڵێین، ئەو پرۆفیسۆرانە، لە قۆناغی ڕاگوزاری لە دارل فنونەوە بۆ زانکۆ ڕۆڵێکی گەورەیان هەبوو، لە دروستکردنی ڕێکخستنی زانکۆ لە تورکیا. ئەوسا، بەرامبەر چەپ و کوردەکان، بە تایبەتیش لەسەر کوردەکان، هەڕەشەیەکی ئێجگار زۆر هەبوو. جا هەر ئەو پرۆفیسۆرە ئەڵمانانە، لە ناوەندی ئازادی ڕادەربڕینی زانستیدا، هیچ شتێکیان لەو بارەیەوە نەگوت. ئەوان بە هۆی ئەوەی ئازادییەکانیان بەرتەسك کرابۆوە، وڵاتی خۆیان جێهێشتبوو، وەلێ لە تورکیا ئەوەیان بە ئاریشەیەك لە قەڵەم نەدا. هەر ئەوەندەش نا، بەڵکو هاوکاریش بوون لە ئۆپەراسیۆنی (ئاسیملاسیۆنی — بە تورك کردن) دەوڵەت بەرامبەر بە کورد و سیاسەتی لەناوبردنی گەلی کورد و بە تورك کردنیان.

لە ڕاستیدا، ئازادی بەیانی هزری، وەکوو بنەمای سەرەکی زانستی دادەنرێت. بۆیە ئەگەر ئازادی دەربڕینی بیروباوەڕ نەبێت، یاخود بەرتەسك کرابێتەوە، ئازادی ئەکادیمی هیچ قەدر و قیمەتێکی نییە. جا با ئەوەش بڵێین، لە تورکیا لە هیچ سەردەم و کاتێك، شتێك نەبووە بە ناوی ئازادی ڕادەربڕین.

. هەر لەو چوارچێوەیەدا، پێویستە ئاماژە بە مژارێکی دیکەش بکەین. ئیسماعیل گاسپراڵی، (١٨٥١-١٩١٤) ئەحمەد ئاغا ئۆغلوو (١٨٦٩-١٩٣٩) یوسف ئاکچورا (١٨٧٦-١٩٣٥) زەکی ڤەلیدی تۆگان (١٨٩٠-١٩٧٠) سەدری مەکسودی ئارسال (١٨٧٨-١٩٥٧) عەبدولقادر ئینان (١٨٨٩-١٩٧٦) لە ناو قەیسەری ڕووسیا لە دایك بوون و گەورە بوون. ئەوان سکاڵایان لەو ئاسیملاسیۆن و زوڵم و نادادیە کرد، کە ڕووس بەرامبەر بە تورکەکان لە ڕووسیا

جێبەجێی دەکرد، بۆیە ڕووسیایان جێهێشت و بەرەو تورکیا کۆچیان کرد. وەلێ هەر ئەمانە دوای هاتنیان، بوونە زۆر پایەی گرنگی جێبەجێکردنی سیاسەتی زوڵم و تاوان و ئاسیمیلەکردن و تواندنەوە و بە تورك کردنی گەلی کورد.

## سازیا پسپۆری و زانکۆکان

یەکێک لە ئاماژە دیارەکانی پێنەگەیی زیهنیەتی زانستی لە زانکۆ تورکییەکان و کەسانی زانستی خاوەن مانتێلتالیەتی زانستی، بریتیە لە (سازیا پسپۆری). لە دادگاکانەوە پەرتووک و وتار، بۆ پرۆفیسۆرانی بەشەکانی یاسای سزادان و یاسای باری کەسی و یاسای دەستوور و کۆمەڵناسي و دیرۆک و مرۆڤناسی و فەلسەفە و ئابووری و زمان و ئەدەبیاتی تورکی و چەند بەشێکی دیکەی ناو زانکۆکان دەنێردرێت. دادگا دوای ناردنی پەرتووکێک، بۆ پرۆفیسۆرێك، یان کۆمەڵێکی پێك هاتوو لە چەند پرۆفیسۆرێك، داوایان لێدەکات پێداچوونەوە بۆ ئەو پەرتووکە، یان ئەو نووسینە بکەن، لەسەر ئەوەی ئاخۆ (بنەماکانی تاوانی تێدایە، یان نا؟) ئەوانیش ڕاپۆرتی کۆتایی خۆیان لەسەر ئەوەی ئایا ئەو بنەمایەی تێدایە یان نا، بۆ دادگای دیاری کراو دەنێرنەوە. لە کاتێکدا ئەوە زۆر شەرم و دزێوییە، کە کتێبێك بە پرۆفیسۆرێکی زانکۆ بخوێننەوە بۆ ئەوەی بزانێت، ئەو پەرتووك یان نووسینە، بنەمای تاوانی تێدایە یان نا؟ گەڕان بە دوای دۆزینەوەی تاوان، لەناو دێڕە نووسراوەکانی هزردا، بە دڵنیاییەوە پێچەوانەی بنەماکانی میتۆدی زانستییە. بۆیە ئەوە زیهنیەتی زانستی نییە و بە پێچەوانەوە، زیهنیەتی مەئموری دەوڵەتە. یان زیاتر لەوە، ئەو کارە دەرخەری ئەو هاوکێشەیەیە کە فەرمانبەرانی دەوڵەتیان لەسەر بنەماکانی ئایدۆلۆژیای فەرمی پێگەیاندووە. جا ئەو ڕێکارە تا ساڵی ٢٠١٠

لە دادگای سزا گرانەکان و دادگای سزای بەرایی و دادگای ئاسایشی دەوڵەت زۆر بە چڕی جێبەجێ دەکرا.

گەڕانەوە بۆ کەسانی ئەکادیمی، لە پێناو دۆزینەوە تاوان لە پێشاژۆی هزری و، دواتریش دادگایی کردن و سزادانی، وەك پەڵەیەکی ڕەش لە مێژوودا نووسراوە. بە دڵنیاییەوە هەر ئەو پرۆفیسۆرانە، دەیانتوانی ئەو پەرتووکانە بخوێننەوە و ڕەخنەی لێبگرن و پێشنیار و سەرنج و ڕەخنەکانیشیان بە نووسین بڵاو بکەنەوە، وەلێ نەك لەژێر فەرمانی دادگا، بۆ گەڕان بەدوای دۆزینەوەی تاوان و سێرە گرتن لە نووسەرەکەی. چونکە ناساندنی نووسینی کەسانێك بە تاوان، کە وەك تۆ بیر ناکەنەوە، بۆ ئەوەی ئەو نووسەرە دادگایی بکرێ و بکەوێتە زیندان، دەرخەری ئەوەیە، کە زیهنیەتی زانستی بۆگەن بووە و ئەو مێشکانەی لە ناوەندەکانی ئەکادیمیشن، وشك و برینگ و نابینا کەوتوون. چونکە وەك گوتمان، زانست پێویستی بە ئازادی بیرکردنەوە و ئازادی سەربەستی ڕەخنەگرتن هەیە، بۆ ئەوەی بتوانێ پێنگاف بەرەو پێش باوێت. بە داخەوە لەو بارەیەوە دۆخێکی زۆر دڵتەزێن هەیە، چونکە زانکۆ تورکییەکان، لەگەڵ سازیا پسپۆری، بوونەتە شێوازێکی کاری نەپچڕاوی دادگاکان، بۆ بە تاوانبار کردنی نووسەرێك. جا هەندێك پرۆفیسۆر، کاتێك سەرسامی خۆیان بە گالیلۆ و برونۆ دەردەبڕن، لە ڕاستیدا دەرخەری ئەوەیە کە ئەوان ئاگایان لەو کارە نییە کە بۆ دادگاکانی دەکەن. بەو پێیەی، قەدەغەیی هزری زیاتر برەو پێدەدا و فەرمانبەرێکی دامەزراوەی قەدەغەیی هزر و باوەڕ، وەك پۆلیسێك، ئەگەر باس لە گالیلۆ و برونۆ بکات، شتێکی دژبەر و سەیرە.

یەکێك لە قۆناغە هەرە گرنگەکانی ڕێکارەکانی زانستی، بریتیە لە تـویژینەوە و ئاشـکراکردنی ئەنجامەکـانی لێکـۆڵینەوەکە لە کۆمەڵگـادا. بە پـێچەوانەوە، ئەو ئەنجامـانەی لە تـویژینەوە زانسـتییەکان دەسـتدەکەوێت و بـڵاو نـاکرێتەوە و کۆمەڵگـا پێـی نازانێـت و بە نهێنـی دەهێڵـدرێتەوە، هـیچ قیمەتێکـی زانسـتی نییە. چونکە بڵاوکردنەوەی ئەنجامەکانی تویژینەوە و خستنە بەر چاوی خـوێنەران، بەو واتـایەش دێـت، کە ئەو ئەنجامـانە دەخەیـنە بەر دەستی کەسی پەیوەندیدار بۆ ڕەخنەگرتن لێیان. ئەمەش بە دوایین هەنگـاوی کـاری زانسـتی دادەنرێـت. چـونکە دوای دەرچـوونی ئەنجامەکـان، ئەگەر هـات و ڕووناکی نەبینێت، ئەوە بە مانای ئەوە دێـت، زانسـت هێشـتا ئەرکـی خـۆی تەواو نەکـردووە. بەڵکـوو ئەو ئەنجامانە، لەناو ناوەندی ڕەخنەیی ئازاد و نیقاش و شرۆڤەکردنەوە تەواو پێدەگەن. چەمکی میتۆد و ڕێکاری زانستی، لەناو زانکۆ و دەرەوەی زانکـۆ زۆر بەکـار دەهێنـدرێت، هەروەهـا زوو زوو ئەوە دەهێننە زمان، بەوەی دەبێ پەیوەست بین بە زانست و میتۆدەکانی و ئەکادیمیەکـانیەوە، وەلـێ بە گـوتنی "ماینـدەی دەوڵەت و گەل" یاخود بە هێنانە زمانی "بەرژەوەندییە باڵاکانی دەوڵەت" یانیش بە گـــوتنی "بەرژەوەنـــدیەکانی کۆمەڵگـــا، لەلایەن دەوڵەتەوە دەپارێزرێـت" قەدەغەکارییەکـانی هـزری، لە خـۆ دەگیردرێـت و ڕەخـنەی ئـازادانە ڕەتـدەکرێتەوە؛ بەم شـێوەیەش، کرۆکـی زانسـت نکۆڵی لێدەکرێت و بەرپەچ دەدرێتەوە. منیش دەمەوێ لێرە ئەوە ڕوون بکەمەوە، کە زانکۆ و پرۆفیسۆرەکانی هەست بەو پێشاژۆیە ناکەن و لێی بە ئاگا نین؛ بۆیە دواجار تابلۆ گەورەکە بە هۆی ئەمـانەی لەسـەرەوە باسـم کـرد، وێـنەی ئەوەمـان پیشـان دەدا، لە

زیهن و زاکیرەماندا، لە بری تێگەیشتن بۆ زانست، ئایدۆلۆژیای فەرمی و ئەو شتەی دەوڵەت باوەڕی پێیەتی دێتە بوون.

## زانیارییە بەرژەوەندی خوازەکان، لە هەمبەر زانیارییە واقعیەکان

زانست شتێکی واقعیە، هەر بەو جۆرەش دەبزوێ و هەنگاو دەنێ. ئەوەی یەژێ، بەپێی واقیع و ڕاستی هەنگاو مەنێن و خۆتان مەخەنە پاڵیان، بە هیچ چەشنێك، بۆچوونێکی زانستی نابێژێ. هزری زانستی، بریتییە لە بیری واقیع و ئەو پەیوەندییەی لە نێوانیاندایە. تـوێژەران، لە هەوڵـی ئەوەدان، لـە واقیعە کۆمەڵایەتیەکان تێبگەن، کە لە هزری ئەواندا شوێنی گرتووە؛ جا هەنگاو بۆ شیکردنەوەی باوێن. بۆ ئەمەش گریمانە دادەنێن، پاشان خۆیان دەخەنە پاڵ ئەو گریمانانە، بە ڕێگای واقیعیەتی دیکەوە. لەو پێڤاژۆیەدا، هزری زانستی، هزرێکی وەبەرهێنراوە. جا نابێ ئەوە لەبیر بکەین، کە بیری زانستی دۆخێکی دینامیکی هەیە و خۆی ڕەخنە لە خۆی دەگرێ و خۆی تازە دەکاتەوە و کراوەیە بۆ ڕەخنەی هەموو کەسێك. بۆیەش هزری زانستی، دوای هەوڵ و کۆششێکی زۆر پێدەگات و دێتە بوون.

لەگەڵ ئەمە، هزرێکی ئامادەش هەیە، مەبەستم لەو هزرانەیە کە سەروچاوەکەیان لە ئایدۆلۆژیای فەرمییەوە هەڵدەقوڵێ، بەمانە دەڵێن هزری ئامادە. ئەم جۆرە هزرانە لەلایەن هەندێك لە دەسەڵاتدارانی دەوڵەتەوە وەبەرهێنراون. کە بەهەندێك میکانیزمی دیاری کراو، وەکوو دەرزی لە مێشك و زیهنیەتی هەندێك کەس

دراون. ئەو جۆرە بیر و هزرانە ڕەخنەیان لێ ناگیردرێت، ڕاڤە ناکرێن و لە ڕاستی بوونیان هیچ گومانێك ناکرێ!ا جا هەر ئەو هزرە، بە هیچ شێوەیەکیش دەستکاری ناکرێ. خاوەنی ئایدۆلۆژیای فەرمی، داوای فێربوون و گەیاندنە شوێنی ئەو جۆرە هزر و بیرکردنەوانە دەکەن. ئاخر ئایدۆلۆژیای فەرمی، وەکو ئایدۆلۆژیەکانی دیکە نییە، لەبەر ئەوەی بە سزاکانی دەوڵەت پارێزراوە و بەرگری لێ دەکرێ، بۆیە بۆچوون و ئایدۆلۆژیای فەرمی، وەکوو ئاین بە پیرۆزی هەژمار دەکرێ و دوورە لە ڕەخنە و گومانکردن لێیەوە. بەو هۆیەوە گەورەترین هەڕەشە و مەترسی لەسەر بیری زانستی و ڕێکارەکانی زانست، ئایدۆلۆژیای فەرمییە. لەو شوێنانەی زانست ناتوانێ ئایدۆلۆژیای فەرمی ڕەخنە بکات، ئایدۆلۆژیای فەرمی مانا و دەلالەتەکانی زانست دەخنکێنێت.

لەسەرەوە ئەوەمان خستە بەر دید، کە زانست بە ڕووی ڕەخنەگرتنەوە ڤالآیە و ئایدۆلۆژیای فەرمیش بە ڕووی ڕەخنەگرتنەوە گاڵە دراوە. بۆیە دەشێ هزری زانستی ڕەخنەی لێ بگیردرێ و شرۆڤە بکرێ و بەراورد بکرێ؛ هەتا دەشێ بەردەوام شایەنی ڕەخنە لێگرتن بێ؛ بە پێچەوانەوەش، بۆچوونی فەرمی، ناشێ ڕەخنەی لێبگیردرێ و ڕاڤە بکرێ و بە هیچ ئایدۆلۆژیایەکی دیکە بەراورد بکرێ. هەر واقیع و ڕاستییەکیش، دوور بێت لە ڕەخنە و شرۆڤە و بەراوردکردنەوە، ئەو کەسانەی ئەو جۆرە هزرە دێننە بوون، لە ئایدۆلۆژیا و هزرێکی دۆگماو و چەق بەستوو زیاتر هیچی دیکەیان وەبەرنەهێناوە. لە نێوان دۆگمایی ئاینی و ئایدۆلۆژیای فەرمی، جیاوازیەکی وا گرنگ نییە لە سزاداندا. بۆیە ناشێ لەو ڕووەوە، دەستبەرداری پرۆسێسی ڕەخنەگرتنی ئازاد بین.

بەو پێیەی ڕەخنەی ئازاد، هزریش ئازاد دەکات، بۆیە ناشێ دەستبەرداری بین. جا ئەو شتەی ناشێ دەستبەرداری بین، دەبێ ببێتە هۆکارێك بۆ ئازادی توێژەران و ناوەندەکانی زانست و زانیاری.

هزری زانستی، هزرێکی واقعییە، بە واتایەکی دیکە، بیر و بۆچوونێکە لەگەڵ واقیع مامەڵە دەکات و هەوڵی ڕوونکردنەوەی واقیعیەتی زانستی و پەیوەندی نێوان واقیعیەت دەکات. بۆیە ئەرکێکی زۆر گرنگە کە لە وەها دۆخێکدا، ڕاستگۆ بین لەگەڵ واقیعیەت. ئایدۆلۆژیەکانیش، لەو ناوە ئایدۆلۆژیای فەرمی، بەدوای زانیاری بەرژەوەندی خوازانەیە. چونکە بۆ پاراستنی بەرژەوەندیەکانی دەوڵەت، یانیش بەرژەوەندی هەر لایەنێکی سیاسی، بۆ دەستخستنی زانیاری بەرژەوەندی خوازانە، خۆیان لە هەندێك واقیع نەبان دەکەن و ڕووی خۆیان لێ وەردەگێڕن و بەرێ و بانێکی دیکەی، ناڕاستی دەبەن. چونکە زانیاری بەرژەوەندیخوازانە تەنیا بە وەها شێوەیەك وەبەر دەهێندرێت. بۆیە ئاشکرایە کە وەها کارێك، ڕێکارەکانی زانست لەناو دەبات.

دەمەوێ ئەوە دووبارە بکەمەوە، سەبارەت بە وەبەرهێنانی زانیاری زانستی، سەرەرای بڕیاردان لێیەوە، بەڵام ئەو نووسینە، کارێك نییە سەبارەت بە میتۆد و ڕێکارە زانستییەکان. بەڵکوو مەبەست لێی هەڵسەنگاندنی ڕێکارە زانستییەکان و گۆڕانکاریەکان و ئەو دۆخەی دەگوزەرێت و پەیوەندیەکانی نێوان هزر و باوەڕەکانە. بۆیە ئەوانەی لەسەرەوە، هێنامە زمان، هەڵسەنگاندنی ڕێکاری زانستی و ژێرخانی سەرەکی زانستە.

دوای نووسینی هەڵسەنگاندنێك بۆ شرۆڤەکردنی ڕێکاری زانستی و ئایدۆلۆژیای فەرمی و ڕەخنەگرتنی ئازادانە و قەدەغەیی هزری، لەم پەرتووکەدا باسم لە بەسەرهاتەکانی ژیانی ئەکادیمیم کرد. هەوڵ و تەقەلاکانم، بۆ توێژینەوە و بنکۆڵکاری و ئەو ڕووداو و بەسەرهاتانەی لەو ڕووەوە بەسەرم هات، هەر لە کردنەوەی دۆسیەی دادگا و ڕێکارەکانی چاودێری سڤیل و ئەو سزایانەی بەسەرمدا سەپا و چەندان بوویەری دیکە. بە هۆی ئەو گۆڕانکاریە هزریانەی بەسەرمدا هات و هەڵسەنگاندنم بۆ زانست، بە پشت بەستن بە واقیعیەت نووسراوە، لە ماوەی پێڤاژۆی سزادانم. هەر بۆیە لە هەوڵی ئەوەدام بە نووسین باس لەو واقیعیەتانە بکەم، کە هەندێك دۆخ و سەردەمیان دیاری کرد.

سینەمخان جەلادەت عالی بەدرخان و ئیسماعیل بێشکچی، لە ماڵی سینەمخان لە هەولێر، ساڵی ٢٠٢١. فۆتۆ: محەمەد عزەدین.

ئیسماعیل بێشکچی لە ماڵی سینەمخان جەلادەت عالی بەدرخان، لە هەولێر، ٢٠٢١.
ئەرشیفی محەمەد عزەدین

ئیسماعیل بێشکچی و محەمەد عزەدین، لە وەقفی ئیسماعیل بێشکچی لە ئیستانبوڵ، هاوینی ساڵی ٢٠٢١. لە کاتی گفتوگۆکردن لەسەر وەرگێڕانی ئەم پەرتووکە.

کۆڕی ناساندنی چاپی یەکەمی کتێبی "یادەوەرییەکان"ی بێشکچی فەرهاد پیربال،
ئیسماعیل بێشکچی، محەمەد عزەدین
٢٠٢٢ هەولێر

Mohammed Ezaldîn Sadraddin'e

Söz Konusu Vatansa Bilim Teferruattır, kitabını Soraniceye çevirmen için sana yetki veriyorum.

Sağlık diliyorum, başarılar diliyorum

İsmail Beşikçi

19 Ekim 2021

ڕێگا پێدانی ئیسماعیل بێشکچی بۆ محەمەد عزەدین بە دەست و خەتی خۆی، بۆ ئەوەی پەرتووکەکە لە تورکیەوە بکاتە کوردی.

## ئیسماعیل بێشکچی کێیە؟

ئیسماعیل بێشکچی، لە حەفتەمین ڕۆژی مانگی یەکی ساڵی ١٩٣٩، لە ناوچەی ئیسکلیپی سەر بە شاری چۆرووم، لە خێزانێکی تورکی حەنەفی لە دایك بووە. ئەو، بچووکترین منداڵی دایك و باوکی بووە. حوسنووی باوکی (١٨٩٩-١٩٧٨) لەسەردەمی عوسمانیەکان مامۆستا بووە، دواتر لە ساڵانی سیەکانی سەدەی ڕابردوو، دەستی دابووە کاری بەقاری. بێشکچی دایکی ناوی زاهیدە بووە (١٨٩٨-١٩٨٧). لە ماڵەوەیان دوو برای لە خۆی گەورەتری هەبوو بە ناوەکانی وەسفی و محێدین و دادەیەکیشی بە ناوی ساتی.

ئیسماعیل بێشکچی، قوتابخانەی سەرەتایی لە مەکتەبی (عەزمی میللی و میساقی میللی) تەواو کردووە. دواتر بۆ خوێندنی ناوەندی، دەچێتە قوتابخانەی (ئیسکلیپ). پاشتریش ئامادەیی لە قوتابخانەی (چۆروم) تەواو دەکات. بێشکچی، ساڵی ١٩٥٨، بە نمرەیەکی بەرز، لە بەشی کارگێڕی کۆلێژی زانستە سیاسیەکانی زانکۆی ئەنقەرە وەردەگیردرێت. ساڵی ١٩٦٢، هەمان بەش تەواو دەکا.

یەکەم ڕووبەڕووبوونەوەی ئیسماعیل بێشکچی، لەگەڵ کورد، بۆ ساڵی ١٩٦١ دەگەڕێتەوە؛ ئەوکاتەی وەکوو ڕاهێنانکار (موتەبیق) دەچێتە شاری ئەلعەزیز، بۆ کارکردن لەپاڵ پارێزگار و قائیمقام. دواتریش بۆ بەجێگەیاندنی ماوەی سەربازی ناچاری، لە نێوان

سالانی ۱۹٦۲-۱۹٦٤ دەچێتە بەدلیس و شەمزینان. بێشکچی لەوێ دەرفەتی ئەوەی دەبێ، زیاتر کورد لە نزیکەوە بناسێ. سالی ۱۹٦٤ بێشکچی وەکوو مامۆستای یاریدەدەر لە بەشی کۆمەلناسی زانکۆی ئەتاتورك لە ئەرزڕووم دادەمەزرێ. سالێك دواتر، دەست بە نووسینی نامەی دکتۆراکەی دەکات بە ناوی (ژێرخانە کۆمەلایەتیەکانی عەشیرەتی ئالیکانی کۆچەر) تێزەکەی قبوول دەکرێ و ناونیشانی دکتۆرا وەردەگرێ.

ئیسماعیل بێشکچی بە ڕەخنەگرتن لە دەوروبەرە ئەکادیمیەکەی لەسەر ئەوەی جەسارەت ناکەن تا لێکۆلینەوە لەسەر کۆمەلگای کوردی بکەن، خۆی دەستدەکاتە کارەکە و لە ڕێگای چەندان توێژینەوەوە، چەندان بەرهەم دەنووسێت و سەرنجەکان دەخاتە سەر مژارەکە. بە پێی بۆچوونی ئایدۆلۆژیای فەرمی، گەلێك نیبە بە ناوی کورد و زمانێك نیبە بە ناوی کوردی. ئاخۆ چۆن دەبێ کەسێك لە چوارچێوەی سنوورەکانی ئەو ئایدۆلۆژیایە دەرچووبێ؟ بۆیە دەبوو حیساب و کیتابی لەگەل بکرێ!

لە ئەنجامدا، هەر لە چواردەورەی خۆیەوە لە زانکۆ، زمانی لێ دەدرێ. دواتر بەوهۆیەوە لێکۆلینەوەی کارگێڕی لەسەر بێشکچی دەکرێتەوە. لە بیستەمین ڕۆژی مانگی حەفتی سالی ۱۹۷۰ بە تۆمەتی "کتێب و وتاری نووسیووە دژی دەستوور و یاسا..." لە زانکۆ دەریدەکەن و کۆتایی بە ژواتە ئەکادیمی دەهێنن. لە دوای ئەو بڕیارە، بێشکچی سەر لە دادگای بالای کارگێڕی دەدات. دوای پێشکەشکردنی داوای تانە گرتنەکەی، دادگا بڕیاری ڕاگرتنی دۆسیەکەی بێشکچی دەدات لە زانکۆ، وەلێ زانستگاکەی ئەو بڕیارە ناخەنە بواری جێبەجێکردنەوە. بۆیە

لەسەرتای ساڵی ١٩٧١، لە زانکۆی ئەتاتورك نامێنێ و دواتر لە ڕێگای تاقیکردنەوەیەکەوە دەچێتە زانکۆی ئەنقەرە و لە کۆلێژی زانستە سیاسییەکان دەست بە مامۆستایەتی دەکاتەوە.

لە سەردەمی دوازدەی ئازار، بە سەرنجدان لە هەمان دۆسیەی لێکۆڵینەوەی کارگێڕی، ئەوجارە لەلای فەرماندەی دۆخی لەناکاو زمان لە ئیسماعیل بێشکچی دەدرێت. لەسەر ئەو بنەمایە، لەلایەن فەرماندەی دۆخی لە ناکاوی دیاربەکردەوە، دۆسیەی لێکۆڵینەوەی بەرامبەر دەکردیتەوە و بڕیاری دەستگیرکردنی نا ئامادەکی بۆ دەردەکرێت. لە نۆزدەمین ڕۆژی مانگی شەشی ساڵی ١٩٧١، بێشکچی دەستگیردەکرێ. لەوێ دەمێندا، ئەو لە کۆلێژی زانستە سیاسیەکان بوو. بۆیە دوای دەستگیرکردنی لەناو حەرەمی زانکۆ، ڕاستەوخۆ دەنێردرێتە دیاربەکر و لەوێ لەگەڵ سەدان دەستگیرکراوی کورد، دەچنە بەردەم دادوەر.

لەوێ دەمێوە، بێشکچی نزیکەی ٣٧ پەرتووکی نووسیووە و بڵاوی کردۆتەوە.

دوای ئەوەی بۆ یەکەمجار دەستگیردەکرێ و دەخرێتە زیندان، تا دوا زیندانیکردنی، زیاتر لە ١٧ ساڵ لە بەندیخانە ژواتە بەسەر بردووە. لەگەڵ سەدان دۆسیەی دادگایی کردنی. بە شێویەك کە بووەتە نمونەیەك بۆ هەموو کەسایەتیەکی زانستی لە جیهاندا. سەرباری ئەو زوڵمەی لێی کرا، سەری خۆی بۆ هیچ لایەنێك شۆڕ و نەوی نەکرد و لە ڕێگای زانست لای نەدا. هەر وەك مرۆڤێکی زانستی ماوە و ئەمڕۆش خاوەن هەمان هەڵوێست و بۆچوونی خۆیەتی.

## کتێبەکانی دیکەی محەممەد عزەدین

١- بیرەوەرییەکانم، مووسا عەنتەر، وەرگێڕان لە تورکییەوە. دەزگای فام، (سێ چاپ).

٢- یادەوەرییەکان، ئیسماعیل بێشکچی، وەرگێڕان لە تورکییەوە، دەزگای فام، (دوو چاپ).

٣- برینا ڕەش، مووسا عەنتەر، گۆڕین لە کورمانجییەوە بۆ سۆرانی، دەزگای فام.

٤- مەکتووب بۆ ئەتاتورك، جەلادەت عالی بەدرخان، وەرگێڕان لە تورکیی عوسمانلییەوە، دەزگای فام.

٥- کورتەی ژیانم، ئەکرەم جەمیل پاشا، وەرگێڕان لە تورکییەوە، دەزگای فام.

٦- ژیانی مەلا سەعیدی کوردی (سەعید نوڕسی)، عەبدولڕەحمان نوڕسی، وەرگێڕان لە تورکییەوە، دەزگای فام

٧- تیرۆری دەوڵەت لە ڕۆژهەڵاتی ناڤین، ئیسماعیل بێشکچی، وەرگێڕان لە تورکییەوە.

٨- هاواری من، یاشار کەمال، وەرگێڕان لە تورکییەوە، دەزگای فام.

هێزەکانی کۆماندۆ، لەپاڵ ئەوەی لە ناوچە کوردییەکان ئەشکەنجەیەکی زۆری خەڵکیان دەدا، لە هەمان دەم، هەوڵی شکاندنی غروور و کەسایەتیی خەڵکەکەشیان دەدا. لە تورکیا هێزی کۆماندۆ لە ناوچە کوردییەکان، پەتی لە کۆئەندامی نێرینەی کوردە ئیختیارەکان دەبەست، کە خاوەنی کچ و کوڕ و بووک و زاوا و چەندان نەوە بوون. جا دوای ئەوە، پەتەکانی دەدا دەستی ئافرەتەکان و بە زۆر، لەناو گوند، بەبەرچاوی خەڵک دەیسووڕاندنەوە.

---

"ساڵانی هەشتای سەدەی بووری، پێشمەرگە بووم، بە فەرماندەیی جەلال تاڵەبانی لە دەوروبەری سلێمانی خەریکی بەرخودان و شۆڕش بووین. ئەوسا تورکیا لە ناوچەکە خەریکی دروستکردنی بەنداوێک بوو؛ هەموو کرێکار و ئەندازیارانیشی تورک بوون. ڕۆژێک چوار ئەندازیاری تورکی بەنداوەکەمان دەستگیر کرد و هێنانمانە لای خۆمان. دواتر ئاگادارییەکی کراوەمان بۆ حکوومەتی تورکیا بڵاو کردەوە، لەوێ جەختمان لەوە کردبۆوە، ئەو ئەندازیارانە ئازاد ناکرێن، تا ئیسماعیل بێشکچی لە زیندان سەربەست نەکرێ."